## ب ـ ئیسلامییەت وەکو هێزی شۆڕشگێڕی سەردەمی دەرەبەگایەتی

ئیسلامییەت لە بواری مێژوویی و رۆژگاری ئەمرۆشماندا یەکێکە لە بابەتە سەرەکییەکانی پێشکەوتن گفتوگۆ تیۆری و پراکتیکیەکان. هۆکارەکەشی بۆ ئەوەی دەگەڕێتەوە کە بە ئەندازەی ئەوەی ئەو راستینەیەی کە ئیسلامییەت دەپچڕێنێ شینەکراوەتەوە، ئەوا پڕ نەکردنەوەی جێگاکەی بە ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی تێر و تەسەل یاخود بە گوێرەی قۆناخ بە وەرچەرخاندا دەرباز نەبووە. لەسەردەمی لە دایکبوونیشدا ئیسلامییەت بە واتای خۆی نەگەیشت. حەزرەتی مەحەممەد کە لە نزیکەوە هەوڵی دەدا دەرکی پێبکات، شەڕی خۆی وەکو **"دژی نەزانی" (جەهالەت)** رادەگەیەنێ. ئەو نەزانییەی مەبەستیەتی ئایدیۆلۆژیای باوکسالاری تیرەیە. ئەمە بابەتێکی زۆر گرنگە. لە کاتێکدا موسا پێهەڵگرتنی ئایینی تاکخودایی لە پێناو یەکێتی تیرە عیبرانیەکان ئەنجامدا، حەزرەتی مەحەممەد لە پێناو پچڕاندنی ئەم یەکێتیە پێشی خست. بە واتایەکی دیکە هەوڵی تێپەڕکردنی کۆمەڵگای تیرەگەرێتییە. تیرەگەرێتی سەرەکیترین فاکتەری کۆسپ خستنە پێش بەهێز بوون و شارستانی بوونە. ناسنامەی ئایدیۆلۆژی جیاواز لە کەعبەدا هەن کە لەمیانەی ٣٦٠ بتی گەورە و بچووك نوێنەرایەتیان دەکرێت. تاوەکو ئەم دیاردەیە بەلاوە نەنرێت کە تاوەکو دوایی بەسەر هزردا زاڵە، ناشێ پێشکەوتن بە دیبێت. دووەمین دیاردەی گرنگ شوێنگەی مەککەیە کە ناوەندێکی گرنگی بازرگانییە. شاری (مەککە) لەسەر بنەمای بازرگانی بەردەوامی بە هەبوونی خۆی دەدات. دەتوانرێ بگوترێ هەروەکو چۆن شارستانییەتی میسر و سۆمەردیاری نیل، دیجلە و فوراتن، ئیسلامیەتیش دیاری بازرگانییەکە مەککە ناوەندەکەیەتی. بە شێوەیەکی بنچینەیی داب و نەریتی عیبرانی بەرهەمێکی ئەو بازرگانیەیە کە لە نێوان ناوەندەکانی شارستانییەت پێشکەوت. کاتێك زاڵبوونی ئەمرۆی یەهودیەکان بەسەر بازرگانی و ئابووری جیهان بێنینە بەرچاوان، ئەوا رۆڵی مەزن و پڕ بایەخی بازرگانی لەپێشکەوتنی شارستانییەتدا زیاتر دەرکی پێدەکرێت.

رۆڵی بازرگانی لە پێشکەوتنی شارستانییەت و پاشڤەرۆیەتی و سەرەتایی بوونی دەمارگیری تیرەگەرێتی و لە دەرکەوتن و قەڵەمبازی حەزرەتی مەحەممەد، زەمینەی سەرەکی بابەتی کۆمەڵگا پێك دێنن. لە کاتێکدا لایەنێکیان پێشکەوتن و بە شارستانی بوون دەسەپێنێ، ئەوەی دیکەیان بێ بەرهەم و نەزۆکە، لەمیانەی بەردەوامبوونی شەڕ و پێکدادانە تیرەگەرییەکان، رێگا لەپێش رزین و پاشکەوتن دەکاتەوە. حەزرەتی مەحەممەد دەرکی بە ناوەندی سێ شارستانییەتی مەزن کردووە. هەڵکشانی بێزەنت لە رۆمای رۆژهەڵات، لە رۆژهەڵات ساسانییە بە تواناکان، لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیاش حەبەشە، بەردەوام سەرچاوەی ئیلهامن. مەحەممەد بە خۆی چەندین جار لەگەڵ کاروانە بازرگانییەکان بە رێگای مەککە ـ شام ـ قودس دا هاتووچۆی کردووە. لە رێگادا گەلێك شت لە راهیبە مەسیحییەکان بە تایبەتیش لە راهیبە ئاشووریە نەستۆرییەکان فێر بووە. تیرە یەهودیەکان زۆر لێی نزیکن. لە نزیکەوە باوەڕی یاهۆڤا دەناسێت کە ئایینی قەومی یەهودیەکانە. حەنەفییە بە رەچەڵەك سامیەکان کە تەریقەتی سۆفیگەراییی پڕوپاگەندەی ئایینی تاکخوداییان لە مەککە دەکرد. هەروەکو چۆن عیسا کاریگەری تەریقەتی ئەسەنییەکانی لەسەر هەبوو، حەزرەتی مەحەممەدیش کاریگەری حەنەفییەکانی لەسەر هەبووە. شتێکی ئاستەم نییە کە داب و نەریت و زاراوەکانی زەردەشتی لە راهیبەکانی ساسانیەکان بیستبێت. لەسەردەمی دەرکەوتنی حەزرەتی مەحەممەد، مەسیحییەت، موسەوییەت، زەردەشتییەت ئایدیۆلۆژیای فەرمی بوون. هەر سێکیشیان ناسنامەی ئایدیۆلۆژین کە گەیشتوونەتە دەسەڵات. خوداوەندەکانی کەعبەش کە لە تەنیشت سەریەوە بوون، ناسنامەی مەعنەوی زاڵ و رەوای تیرەکانە. ئەم ئابلۆقە ئابوورییەی لەهەر چوار لاوە لە ئارادایە، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە زیاتر مەیلداری گروپی سۆفیگەرایی حەنەفییەکان بێت و ئەو مەیلە تایبەتییەی خۆشی کە پێکدێت، وەکو رەوتێکی نوێی سۆفیگەراییە. لەسەدەی پێنجەمی پ.ز نموونەی ئەم جۆرە تەریقەتانە لە جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناویندا دەبینرێت و گینۆستیزم (رۆحگەرایی) ناوێکی گشتییە لەو تەریقەتانە نراوە کە ئایدیۆلۆژیا و ئایینی کۆیلەداری دابڕاون، بچووکن بەڵام لەلایەنی ویژدانییەوە ئازادن.

ئەم قۆناخە مێژووییە، قۆناخی دەرباز بوونە کە تێیدا وەرچەرخانی کۆیلەداری بۆ دەرەبەگایەتی خێرا دەبێت. ئەمەش هەروەکو قۆناخی وەرچەرخانی دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری ئەوروپا وابووە. تیرە عەرەبەکانی بیابان لەوەدا وەستان کە لەمیانەی تاقیکردنەوە، ئەو شارستانییەتانەی کە جێگای چاو تێبڕین بوون لە سەردەمی لاواز بوونیاندا دەستیان بەسەردا بگرن. پێشتریش ئەو تیرە سامیانەی کە لە هەمان رەچەڵەکەوە دێن، هەندێ جار بە ئامانجی تاڵان، هەندێ جاریش وەکو نیو کۆیلە، بەرەو ناوەندەکانی شارستانییەتی سۆمەر و میسر ئاراستەیان دەگرت. لە کاتێکدا یەکەمین نموونە کە بەرەو شارستانییەتی سۆمەر ئاراستەیان گرتووە، ئەکەدیەکان بوون، ئەوا عیبرانیەکانیش لەو تیرە سامیانە بوون کە بە هەمان شێوە بەرەو میسر چوون. دیسان لەگەڵ ئەوەی لە هەمان رەچەڵەکی سامیەوە دێن، بۆیە لەژێر ناوی عەرەبەکان ئامادەکاری هەڵمەتێکی مێژوویی دەکەن و هەنگاو دەهاوێژن. ئەمەش ئەو کاتەیە کە مێژوو دەڵێ **"برۆ سەردەکەویت"**.

شیکردنەوەی زاراوەی **"ئەڵلا"** کە حەزرەتی مەحەممەد هەڵمەتێکی مەزنی مێژوویی لە ژێر ناوی ئەنجامدا کێشەیەکە بایەخ و رۆڵی کلیل دەبینێ. لەگەڵ ئەوەی دەستنیشان کردنی زەمینە مادەییەکانی گرنگە. ئەوەی ئاستەمترە، شیکردنەوەی ئەڵلایە کە سەرەکیترین زاراوەی ئایدیۆلۆژییە. هەرچەندە رەوت و لێشاوە فەلسەفی و زانستییەکانی خوداناسی هەوڵیانداوە ئەڵلا پێناسە بکەن، بەڵام ناتوانرێ بگوترێ بەهایەکی زانستی هەیە؛ چونکە شیکردنەوەی کۆمەڵناسی زاراوەکە نەکراوە.

لەگەڵ ئەوەی بەڵگە و سەرچاوەکانیش سنووردارن، **"ئەل EL"** (رۆح) زاراوە و ناوی خودایەکی سامیەکانە. شیمانەی ئەوە دەکرێت نیگای خوداوەندی مەزنی ئاسمان بێت کە دوای قۆناخی ئایینی تەوتەمی تیرەکان، لە ژێر کاریگەری شارستانییەوە پێشیان خست. لە هەر شوێنی نیمچە دوورگەی عەرەبیدا لەمیانەی زاراوە جیاوازەکانەوە، بە شێوەی جیاوازتر ناوزەد دەکرێت. دەتوانرێ بگوترێ کاتێك جیاوازی و گۆرانکاری لە ناو کۆمەڵگای تیرەگەرێتیدا زیادی کرد، دەزگای شێخایەتی شێوەی گرت و سیستەمێکی تاك شێوەی بێ سەروبن پەیڕەو دەکرا، ناسنامەیەکی سەرەکی ئایدیۆلۆژی هاوتەریب لە شێوەی تیرە = شێخ، سروشت = ئەل هاتە ئاراوە. دانانی ئەل بە خاوەنی گشتی سروشت، هاوکات و بەرامبەری گۆڕانکاری و پێشکەوتنی تیرەیە. هەروەکو چۆن شێخ خاوەنی تیرەیە، ئەوا خاوەنی گشتی سروشت ئەل، ئەڵلایە. شێخ بۆ تیرە لە جێگای سەرۆکی سیاسی و مەعنەویشدایە. بەهێز بوونی تیرە لە کەسایەتی شێخ و دەسەڵات و هێزەکەیدا رەنگ دەداتەوە. هەروەکو بڵێی پادشایەکی سەرەتاییە. ئەو هزرەی لە ئەنجامی ئەم رەوشە لای شێخ گەڵاڵە دەبێت. هەروەکو چۆن ئەو لە نێو تیرەدا بەهێزە و فەرمانڕەوایە، ئەوا خوداش لە سروشت باڵاترە و خاوەنەکەیەتی. هەر دوو زاراوە تازە پێشکەوتوون و جێگای بایەخن. رۆحی مەزن بە "EL" ناوزەد دەکرێت. لە قۆناخێکدا کە تیرە لە ژیانی خشۆکی (گەرۆکی) و گرێدانێکی زێدە بە هەلومەرجەکانی سروشت رزگاریان بوو، بە هەلومەرجێکی ئازاد و ئارام تر گەیشتن و لەمیانەی گۆڕانکاری و جودا بوون پەیوەندییەکانی نێوان ژێر و ژوور پێکهات، لەهەمانکاتدا باوەڕی تەوتەمی لاواز بوو، بە هەمان رێچکە سروشتیش بۆ دوو لایەن، ئاسمان و زەوی جیا دەبێتەوە؛ تەسەوری ئەوە دەکەن (هەروەکو چۆن شێخ فەرمانڕەوایەتی تیرە و خەڵکەکەی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەکات) "EL"یش وەکو خودایەکی نوێی ئاسمان دادەهێنن.

جگە لە مەزنایەتی تایبەتمەندی تری گرنگی ئەڵلا خاوەنداریێتی و حوکمڕانییە. وشەی مالیك و مەلیك سەرچاوەکەی لە **"موڵك"** وەرگیراوە. موڵکداری بە واتای خاوەنداریێتیە. لە تەواوی زمانە سامیەکان مالیك و مەلیك بە واتای پەیوەندییەکانی موڵکداری دێت؛ شێخایەتی تیرە واتای پادشایەتی دەگەیەنێ و تاوەکو مەلیکایەتی بەرز دەبێتەوە. مەزنایەتی و مەلیکایەتی تیرە، لە پەیوەندی سەرەکی زەوی ـ ئاسمانی سروشتیدا رەنگدەداتەوە، بە شێوەی فەرمانڕەوایەتی ئەڵلا بەسەر زەوی و خاوەنداریێتی کردنی دەگۆڕدرێ.

هەر لە سەرەتاوە هزری تاکخودایی **"ئەل"** لە نزیکەوە گرێدراوی هەنگاوە سست و لەسەرخۆکانی بیابانە. خودای سامیەکان رەنگدانەوەی پەیوەندی تیرە و شێخە لەسەر پەیوەندی زەوی و ئاسمان. هاوتەریب بوونێکی بەمجۆرە، زاراوەکە روون دەکاتەوە. ئەمەش مسۆگەرە کە پەیوەندی نێوانیان چڕە. لە شوێنی وەکو میسر، سۆمەر و یۆنان کە چەندین هێزی جیاواز بە سەر ژیاندا باڵادەستن لەپێشکەوتنی کۆمەڵگادا فرەخودایی بە بنەما دەگیردرێت. ماوەیەکی درێژ دوای ئەوە، کاتێك دەسەڵاتی سیاسی بە لوتکەی قۆناخی ناوەندیبوون گەیشت، بە زاراوەی تاکخودایی دەگەن. ئەم تێروانینەش رۆڵێکی بایەخداری لە روون کردنەوەی ئەم مەسەلەیەدا هەیە.

ئەڵڵا کە داهێنانێکی نیمچە دورگەی عەرەبە، نزیکەی ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز وەکو ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی جێگای خۆی لە هزری تەواوی تیرە سامیەکاندا گرتووە. بە شێوەیەکی سەرەکی بەرز بوونەوە و بڵاوبوونەوە و بەهێزبوونی ئەم ناسنامەیە لەسەر بنەمای ئیلهام گرتن لە جیاوازی ناو تیرە و یەك سیستەمی سروشت، ئاستی پێشکەوتنی تیرەش نیشاندەدات. لە نزیکەوە ببینین و ناسینی زاراوەی ئەڵڵا بۆ تەواوی وڵاتە ئیسلامییەکان و جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین سوودبەخش دەبێت. بەر لە هەموو شتێك پێویستە زۆر چاك دەرك بەهێزەکەیان بکرێ و بزانرێ. لە قۆناخی منداڵێتی مرۆڤایەتیدا، زاراوە نوێکان هەروەکو خودی راستی واتایەکی سیحراوی هەیە. زاراوە و راستی وەکو یەك دانراوە (هەمان شت)، زاراوەکە لە جێگای راستی دانراوە (بەکارهێنراوە) و تەنانەت فەیلەسۆفێکی وەکو ئەفلاتونیش رۆڵی لەپێشینە بە جیهانی "ئیدیا" دەدات. جیهانی ماددی بچووك و وەکو خەیاڵ و سەراب دەبینن. بێگومان هۆکاری هەرە سەرەکی ئەمە، پێشکەوتن و بەهێزبوونی هێزی لۆژیك و دەرك پێکردنی مرۆڤە. گەیشتنی هێزی دەرك پێکردن بەم ئاستە دیاردەیەکی نوێیە و بەرووداوێکی نائاسایی دەبینرێت. قۆناخی دەرك کردن دەستی پێکردووە. مێشك ئیتر بەرهەم دێنێ. لەمیانەی هزری ئایینی تاکخودایی هێزی دەرك کردنی شێوازی هزری فەلسەفی دەگاتە لوتکە. لە رێگای ئەم هزرەوە مرۆڤایەتی بەرەو سەردەمی هەرزەکاری دەچێت. کامە زاراوە، بۆ کۆکردنەوە و یەکبوون و روونکردنەوە لەبار بێت، ئەم زاراوەیە دەبێتە زەمینەی واتایەکی خوداوەندی یاخود رەوتێکی فەلسەفی. ئافراندنی زاراوە و بەکارهێنانی بە شێوەیەکی گونجاو، کاری سەرەکی و پیرۆزی راهیبەکان و ئەو فەیلسوفانەیە کە تازە هاتونەتە دونیاوە. زاراوەیەکی زۆر سوودی لێ ببینرێ و رێگا لەپێش یەکبوون و بەهێز بوونی کۆمەڵگا بکاتەوە، وەکو بەهادارترین کاڵا و ئامرازی ئاڵوگۆر بەکار دەهێنرێت.

لەگەڵ قۆناخی بەشارستانی بوون، مرۆڤایەتی پرشنگدارترین قۆناخی گەیشتنی زمان بە ئاستی زاراوەکان و پێشکەوتنی ژیری (مێشك) دەستپێدەکات. لە بوارێکی دیکەدا شارستانییەت، چالاکی جیابوونەوەی زاراوە سەرەکییەکان و ئەو دیاردانەیە کە نیشانیدەدات و جێگیرکردنیەتی لە بیری کۆمەڵگادا. بە شێوەیەکی گشتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا شانبەشانی پێشکەوتنی ئاستی زاراوە و زمان بەرێوە دەچێت. راستینەی زمان و هزری سات چالاکی (کرداری) بەناو کردنی کۆمەڵگا و ناسینی خۆی و بە وشیاری بەرێوە بردن و سەرلەنوێ بەرهەم هێنانە. کۆمەڵگا بە بێ مێشك و بیرکردنەوە لە ئان و ساتدا، ناتوانی سەرلەنوێ بەرهەمدار بێت. تەنیا لە ئاستی ئاژەڵەکان و زێدە بوونێکی غەریزیانەدا دەمێنێ. بە کۆمەڵگابوون و بەرێوەچوون، تەنیا دەشێ لە رێگای زمان و مێشکەوە ئەنجام بدرێت. کۆمەڵگایەك زمان و مێشکی خۆی لە دەست دابێت، واتە کۆتایی پێهاتووە یاخود بووە بە شتێکی جیاوازتر. هەربۆیە وەکو ئاژەڵێك درێژەدان بە هەبوونی ماددی زیاتر، ئەوەی بۆ کۆمەڵگایەك سەرەکییە و پێویستە، پێشکەوتنی هزرییە کە لەمیانەی هێزی زمان و مێشك رێگا لەپێش گەیشتن بە حافیزەی کۆمەڵگا و داب و نەریت، ئایین، فەلسەفە و زانست دەکاتەوە. زمان و زاراوە، بەردی سەرەکی بناخەی پێشکەوتنی هزری و بیری کۆمەڵگان. بەبێ گەیشتن بەم بەردانە (زمان و زاراوە)، ناتوانرێ هیچ چالاکی و کردارێکی کۆمەڵگا ئەنجام بدرێت و ئاوا بکرێت. لە ئاواکردن و بەرێوەچوونی تەواوی دەزگاکانی ئابووری تاوەکو دەگاتە سیاسی؛ دەشێ لەمیانەی زمان و زاراوە و ئەو هێزە هزریە ئەنجام بدرێت کە لەسەر بنەمای ئەم دووانە پێشدەکەون. ئەم هێزە هزریە یەکەمین یاسا و بەهایە کە بە شێوەی داب و نەریت یاخود هەڵوەستەی ئەخلاقی لە بیری (حافیزە)ی کۆمەڵگادا وەکو دەزگایەکی سەرەکی و یەکەمین هەبوونی هاتە ئاراوە. بە شێوەی خەیاڵ و یۆتۆپیای سەبارەت بە داهاتوو دەبێتە خاوەن بەهایەکی هێزی ژیان. لەبەر ئەوەی ئایینی کۆمەڵگا وەکو داب و نەریت و ئەخلاق هەم بیری رابردوو هەم خەیاڵەکان و ئومێدی ئایندە لە خۆ دەگرێت و بە یەکەوە نوێنەرایەتی یۆتۆپیای سەرەکی دەکات؛ هەربۆیە هەر لەسەرەتاوە وەکو دەزگایەکی سەرەکی کۆمەڵگا جێگایەکی گرنگ و پڕ بایەخی گرتووە. پەیوەندییەکی دیالەکتیکی و ژیانی لە نێوان ئایین و کۆمەڵگادا جێگای باسە. واتای سەرەکی کۆمەڵناسی بەمجۆرەیە.

کاتێك بە گوێرەی ئەم ناوەڕۆکە پێکهاتنی زاراوە ئایینیەکان هەڵسەنگێنین، ئەوا روون دەبێتەوە ئەمانە هێزی دەرکپێکردنی کۆمەڵگان. لەمیانەی چەمکێکی قەبەی ماتریالیستیانە مەسەلەکە داخرێتە ئاستی **"ئایین درۆیە، خودا نییە"** تا دوایی مەترسیدارە و بە لانی کەم بە ئەندازەی گوتنی **"خودا بەمجۆرەیە، لە فلان شوێنە"** چەنەبازییە و گوزارشت لە زانستی بوون ناکات. شتی راست ئەوەیە کە بڵێین لە راستینەی کۆمەڵگادا ئایین چ رۆڵێکی بینیوە و نوێنەرایەتی چ جۆرە هێز و دەزگایەکی کردووە. پرسیاری**"چی گەردوون بەرێوە دەبات؟"** کە دواتر پێشکەوت، بابەتێکە فەلسەفە و فەلسەفەی ئایینی پەیوەندیدار دەکات. کاتێك بە قۆناخی زانست گەیشتین، وەڵامی ئەم پرسیارانە لە شێوەی یاساکانی زانست دەبێت. قۆناخێکن یەکتریان خولڤاندووە. ئەم پێشکەوتنەی زاراوەکان بەبێ کۆتایی بەردەوام دەبێت. پاشڤەرۆیەتی و موحافەزەکاری و زۆربڵێیی راستەقینە ئەوەیە کە ئاستی واتا و دەرك پێکردنی قۆناخێك، وەکو راستینەیەکی رەها پەسند بکرێت و بەسەر هەر کەسێکدا بسەپێنرێ. هەروەکو چۆن دۆگماتیزمی ئایینی دەرکەوت، قۆناخی ئەنگیزاسیۆن ـ دادگایی ئەنجامێکی سروشتی ئەم چەمکەیە (ئەنگیزاسیۆن؛ دەزگایەکی دادگایی گرێدراوی پاپایە، سەمبۆڵێکی چەرخی ناوینە ـ و). نکۆڵی کردنێکی قەبەی ئایین لەناو کۆمەڵگادا، دەبێتە هۆکاری دەرکەوتنی ئەو دژە جەمسەرانەی کە قۆناخی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرن. تەنیا کاتێك کۆمەڵناسی لەم چوارچێوەیەدا راستینەی کۆمەڵگا تاوتوێ بکات و وەڵامی ئەوە بداتەوە دەزگابوون و واتاکانیان چۆن دەرکەوتن و چ رۆڵێکیان بینی و خاوەنی چ جۆرە هێزێکی بوون، ئەو کاتە دەشێ بگات بە پلەی زانستێك.

زاراوەی ئەڵڵا یەکێکە لە دەزگا ئایینیە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا کە لەم چوارچێوەیەدا دەرکەوتووە و بەردەوام پێشکەوتووە و بۆتە خاوەن هێز. میسر و سۆمەریەکانیش نزیکی ئەم زاراوەیە بوونەتەوە. هەروەها پێشکەوتنێکی هاوشێوە لە زەردەشتیەتیشدا دەبینرێت، چەندەی لەناو کۆمەڵگادا هێز بەرەو بە ناوەندیبوون دەچێت، ئەوا وەکو شێوەی سەرەکی هزر لە زاراوە ئایینیەکاندا پەرەسەندنێك بەرەو تاکخودایی و توحید پێشدەکەوێت. لەبەر ئەوەی شێوەی راستەقینەی هزری قۆناخ ئایینە، پێشکەوتنەکانی زاراوە لە کۆتاییدا بە تاکخودا ئەنجامگیر دەبێت. ئیتر بە هاوکێشەی باڵادەستی پادشا لەسەر زەوی، لە ئاسمانیشدا بە خودا دەگات.

کاتێك تاکخودایی بوونی نیمچە دورگەی عەرەب لەمیانەی ئەڵڵا دەگات بە زاراوەیەك، لە راستیدا گەلێك پێشکەوتنی گرنگی کۆمەڵایەتی لە خۆوە دەگرێت. لەگەڵ ئەوەی بەر لە هەموو شتێك ئەم زاراوانە تا رادەیەکی گرنگ سەرچاوەی خۆی لە داب و نەریتی سۆمەر و میسرەوە دەگرێت، ئەوا خاوەنی سیمایەکی رکابەری و تایبەتیشە. بە گوێرەی کولتووری سۆمەر و میسر مرۆڤ ـ خودا، بوونە بە یەك. نەمرود و فیرعەونەکان بە رادەیەکی زیاتر خۆیان وەکو پادشای ـ خوداوەند راگەیاندووە. چەرخی سەرەتایی کۆیلەدارییان لەمیانەی پادشایەتی ـ خوداوەند بەرێوە بردووە ـ بە گوێرەی ئەو بەڵگانەی لە گۆڕستانەکانی ئەهرامەکان و سۆمەر سەلمێنراوە، بەندەکان وەکو ئەندامێك و خزمەتکاری خۆیان دەبینن. کاتێك پادشاکان مردوون ئەوانیش بە مردوو لە قەڵەم دەدرێن و ئەوانەی زۆر پێویستن بە زیندوویی لەگەڵیاندا زیندە بە چاڵ دەکرێن. ئەمە رەوشێکی تۆقێنەرە. دۆزینەوەی چارەسەری ئەم رەوشە سەرەکیترین ئەرکی مرۆڤایەتییە. بەڵکو درێژخایەنترین و پیرۆزترین تێکۆشانی مێژوو، ئەو شەڕە ئایدیۆلۆژیەیە کە بەرامبەر پادشا ـ خوداوەندەکان کراوە کە خۆیان بە پیرۆزترین و گەورەترین هەبوون دادەنا. مەزنایەتی حەزرەتی ئیبراهیم و دانانی بە باپیرەی هەموو ئایینە پیرۆزەکان، بناخەکەی بۆ ئەم تایبەتمەندێتیە دەگەڕێتەوە و بەمجۆرە پەسند دەکرێت. چالاکی ـ کرداری شکاندنی بتەکان لە لایەن ئیبراهیمەوە، گەورەترین و کوشندەترین لێدانە بەر زاراوەی پادشای ـ خوداوەند دەکەوێت، هەربۆیە بەردەوام بە پیرۆز دادەنرێ. چونکە رێ گرتن لەپێش زیندە بەچاڵکردن، تەنیا لەمیانەی سەرخستنی هەڵوێستێکی بەمجۆرەوە بەدیدێت. تاکو ئێستا لە هەرێمی ئورفا پیاو بە هەزاران جار کاری خراپ بکات، دەڵێن خوێڕی و مێ بازە و بەمجۆرە بە رەوا نیشاندەدرێ، بەڵام ئەگەر کچێك تەنانەت بە چاوێکی ئارەزوومەندانە تەماشای یەکێك بکات، ئەوا بە گوێرەی داب و نەریت لەلایەن بنەماڵەوە رووبەڕووی فەرمانی کوشتن دەبێتەوە، ئەمەش یەکێکە لە دواترین پاشماوەکانی نەمرود. داب و نەریتێکی پێنج هەزار ساڵە درێژە بە چەمکی فەرمانڕەوایەتی پادشای ـ خوداوەند دەدات، هەڵسوکەوتێکی سروشتی مرۆڤ لە گۆڕنان و کوشتنیەتی. کەواتە حەزرەتی ئیبراهیم لە خۆڕا لەم ناوچەیە نەهاتۆتە دونیاوە. ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیمی خولڤاندووە یاسای تایبەت بە خشۆکەکانە (خشۆکەکان، تیرەکانی بیابان ـ و) سەبارەت بە مەترسیدارترین چەمکی بەندایەتی کە بۆ سۆمەر و میسر تەنانەت بۆ ماوەیەکی دوورتریش دەگەڕێتەوە.

بەرزکردنەوەی ئەڵڵا کە لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم یەکانگیر کراوە، مسۆگەر گرێدانی خۆی بە راگەیاندنی لەکارکەوتن و بەسەرچوونی ئەم یاسایەوە هەیە. یەکەمین تایبەتمەندێتییەکەی یاسای "**مرۆڤ نابێت بە خودا، ئەڵڵا**". لەمیانەی جیابوونەوەی پێکهاتەی کۆمەڵگای تیرەکان و ئەو جوگرافیایەی تێیدا دەژیان، هەوڵدراوە پەیوەندی زاراوەی ئەڵڵا شیبکرێتەوە. بەڵام واتا و لایەنی تایبەتی ئەوەیە کە دژی چەمکی ئایین و خوداوەندی میسری و سۆمەریەکانە. کاتێك دەڵێ مرۆڤ نابێتە خوداوەند، ئەمە بە واتای ئەوە دێت کە نەمرود و فیرعەونەکان ناتوانن ببن بە خوداوەند و بەها ئایدیۆلۆژییەکەی یەکجار بەرزە. چالاکی و شۆڕشی بت شکاندنی ئیبراهیم گەورەترین و بەهادارترین واتای لێرەدا شاراوەیە. رادەگەیەنێ کە قۆناخی ئەوە بەسەرچوو نەمرود و فیرعەونەکان خۆیان لەگەڵ خودا بکەن بە یەك. ئەو ئەڵڵایەی لە چەمکی ئیبراهیم دا بەرزکراوەتەوە، لەمیانەی ئەم گەوهەرەیەوە لێدانێکی بەکاریگەر لە کۆیلایەتی رەها دەدات. تا وەکو بڵێی پێشکەوتووخواز و ئازادیخوازە. ئەمە لە حەزرەتی موسادا زیاتر بەرجەستە بووە. کاتێك وەکو خودای گشت تیرەکان، بانگەوازی ئەڵڵا هەموو شوێنێکی پڕ کردەوە، لەلایەك سیستەمی پادشای خوداوەندەکان، لە لایەکی دیکەشەوە قۆناخی تەوتەمی تیرەکان پارچە دەکرێت کە تاوەکو دوایی بەرەو موحافەزەکاری رۆیشتبوون و بەلاوە دەنرێن. گەوهەری بەرزی شۆڕشگێڕێتیەکەی لێرەدا شاراوەیە و هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە جێگایەکی گرنگی لە مێژوودا گرتووە. ئەو ئەڵڵایەی کە بەرزکراوەتەوە و بەهێز کراوە، ئەو کۆمەڵگایەیە کە بەهێز بووە و ئاستی ئازادییەکەی پێشکەوتووە. بانگەوازییەکانی "**ئەڵڵا، ئەڵڵا**" تاوەکو گەیشتن بە قۆناخی پاشڤەڕۆیەتی و موحافەزەکاری، لە تەواوی چالاکی و کردار و شەڕەکاندا رۆڵی دروشمێکی شۆڕشگێڕێتی گرنگ دەبینێ. لە قۆناخی سەرمایەداریدا دروشمەکانی "**بژی لیبرالیزم، بژی سۆسیالیزم، بژی گەل**" چ مانایەکی هەیە، بانگەوازییەکانی "**یا ئەڵڵا، ئەی خودایە**"ی کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی هەمان واتای هەیە. کاتێك  شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی قووڵبکرێتەوە، شتێکی ئاستەم نییە کە ئەو راستینەیەی لەژێر ئەم دروشمانەدا شاراوەتەوە، بەمجۆرە دەستنیشان بکرێت. تەنیا دڵسۆزییەکی زانستیانەی ئاسایی تێری ئەمە دەکات.

لە بەرزکردنەوەی ئەڵڵادا دەشێ سێ قۆناخ دەستنیشان بکرێت. قۆناخی یەکەم قۆناخی کارتێکردنی کاریگەری میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر و ئەو  پێکهاتانەیە کە دوای تەوتەمی تیرەکان هاتنە ئاراوە. پەیوەندییەکانی کۆلۆنی و بازرگانی کە لە نێوان ناوەندەکانی هەر دوو شارستانییەت چڕبوونەتەوە، لە بواری ئایدیۆلۆژیدا وەرچەرخانی ناسنامە دەکەنە ناچارییەك. پێبەپێ خوداوەندی گشت تیرەکان بایەخدار دەبێت و لە رێگای حەزرەتی ئیبراهیمەوە هەڵمەتێکی مێژوویی ئەنجام دەدات. دووەمین قۆناخ بەدەرکەوتنی عیساوە ئەنجام دەدرێت. سەرەڕای ئەوەی لە قۆناخی موسادا بووە ئایین و خودای قەومێك و لەمیانەی یەهودیەتەوە تا ئاواکردنی پادشایەتییەکی عیبرانی پەرە دەسێنێ، بەڵام داب و نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ دەرکەوتنی عیسادا تەقینەوەی سەرەکی خۆی ئەنجام دەدات. هەروەکو چۆن کۆیلایەتی سۆمەر و میسر لەمیانەی ئیبراهیم و موساوە وەڵامێکی دژایەتیان بە خۆیانەوە بینیوە، ئەوا کۆیلایەتی یۆنان ـ رۆماش لەمیانەی دەرکەوتنی عیسا دژەکەی خۆی ئافراندووە. لە کاتێکدا ئیبراهیم و موسا وەکو فەرمانڕەواکانی قەوم، خوداوەندەکانی خۆیان بەرز کردۆتەوە، عیسا ئەم خوداوەندە دەکات بە موڵکی تەواوی چەوساوەکانی رۆما. خودای عیسا، لەهەمانکاتدا باوکی عیسایە. لەم لایەنەشدا دەبینرێت تا دوایی کاریگەری داب و نەریتی سۆمەریەکانی کراوەتە سەر. مەردۆکی خوداوەندی بابل، کوڕی خوداوەندی زانا و فێڵبازی ئەریدۆ ئەنکییە. بەردەوام کردنی داب و نەریت جێگای باسە. دژەکەی دەسەڵاتی سۆمەر لە بابل، لە کەسایەتی مەردۆکدا بە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی دەگات. عیسا وەکو وەڵامێکی جیهانی چەوساوەکانی ئەم داب و نەریتە، وەکو شێوەیەکی قودس وایە. ئەگەر داب و نەریتی سۆمەریەکان بە بناخە بگرین، ئەوا سێیەمین قۆناخی گرنگی سەردەمی خوداوەندەکانە. ئایینی تاکخودایی لە خۆوە دەگرێت. لە کاتێکدا خوداوەندەکانی پێشوو زیاتر خوداوەندی شار، قەوم و ناوچە بوون، خودا "**رەب**"ی عیسا وەکو خوداوەندی تەواوی مرۆڤ و زەوی ـ ئاسمان بەرز و مەزن دەکرێت. رۆما کە دەوڵەتێکی جیهانی بوو رێگای لەپێش گەردوونی بوون کردبۆوە، تاوەکو بڵێی کاریگەری لەسەر گۆڕینی زاراوەی خودا کردووە. رەنگدانەوەی هەلومەرجە ماددییەکانی بەسەر بواری مەعنەویدا جارێکی دیکە رێگای لەپێش قۆناخێکی گرنگی مێژوویی کردۆتەوە.

عیسا ئەم وەڵامەیە کە لەمیانەی داب و نەریتی ئەڵڵاوە بۆ ئەو فشارە دراوەتەوە کە دەسەڵاتدارێتی رۆما کردبوویە سەر هزر و رۆحی مرۆڤ. بە شێوەیەکی گشتی نوێنەرایەتی ئەو قۆناخە نوێیە دەکات کە لایەنی ویژدانی و ئەخلاقی لەپێشە و لە هەموو چەوساوەکان بە خاوەن دەردەکەوێ و موخاتەبەیان دەکات. هەروەها نوێنەرایەتی دابڕان لە خودا و ئایینی موحافەزەکاری تایبەت بە قەومی یەهودی دەکات. رێ کردنەوەی لەپێش کاریگەرییەکی مەزنی بەمجۆرە لە نزیکەوە گرێداوی ئەو پێکهاتانەیە کە سەرچاوەی لێوە گرتووە، یاخود ئامانجیەتی. ویژدانی مرۆڤایەتی کە رۆما هەناسەی لەبەر بڕی بوو، لەمیانەی عیسا و باوکەکەی (رەب) هەڵوێستێکی رادیکالانە بەرامبەر کاهینەکان وەردەگرن و ئەڵڵا مەزن دەکەن، بەمرەنگە دەبێت بە دابڕانێکی مێژوویی و دەرفەت و توانای کارییەکی راپەڕین و رزگاری، وەکو گەورەترین ناسنامەی نوێی ئایدیۆلۆژی زایین جێگای خۆی لە مێژوودا دەگرێت و مێژوویەکی نوێ دەست پێدەکات.

بەهۆی قۆناخ و ئەو توێژانەی پشتی پێدەبەستن رەبی (خودا)ی عیسا لە جیاتی پادشایەتی سیاسی، پادشایەتی رۆح و ئەخلاق دەکاتە ئامانجی لەپێشینەی خۆی. هێز و ئامادەکاری بۆ دەسەڵاتی سیاسی نییە. بەڵام زەمینە بۆ پادشایەتی ویژدان زۆر لە بار و گونجاوە و ئەم ئاراستەیە بۆتە ناچارییەك. گەلێك نیشانە هەن کە لە سەرەتادا عیسا چاوی بڕیوەتە پادشایەتی قودس. بەڵام کاتێك بە لە خاچدان وەڵامی دەدرێتەوە، ئەوا جولانەوەکە ناچارە وەکو گروپێکی درێژخایەنی باوەڕی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ئاراستە بگرێت. بەرامبەر بە کاهینە فەرمییەکانی یەهودی یاخیبوونێك جێگای باسە. لە رێ لادان و بە کرێگیراوێتی کاهینەکان بۆ رۆما رێگا لەپێش ئەم یاخیبوونە دەکاتەوە. لە سەرەتادا لەو باوەڕەدایە کە لە ئەنجامی پشتگیری خەڵك دەبێت بە خاوەنی قودس. بەڵام خیانەتی یەهودا ئیسکاریۆت کە یەکێکە لە حەوارییەکانی، رێگا لەپێش ئەمە دەکاتەوە کە بە سانایی دەسگیر بکرێت. والی رۆما دەخوازێ ئازادی بکات. لەبەر ئەوەی کاهینەکان مەترسی لەسەر بەرژەندییەکانیان دەبینن، لەمیانەی هەڵوێستێکی لە پادشا پادشاتر لەسەر لە خاچدانی کۆك و هاوبیر دەبن. ئەگەر سزادانێکی بەمجۆرە نەبوایە، ئەوا لە یاخیبوونێکی ئاسایی بەولاوە شتێکی دیکە نەدەبوو. بەڵام هەلومەرجی بابەتی پێگەیشتوو ئەو تەقینەوەیەی لە دەرئەنجامی لە خاچدان رێگای لەپێش کراوە، رێگا لەپێش یەکێك لە بەهێزترین جولانەوەی ئایینی مێژوو دەکاتەوە. لەمێژوودا زۆر جار قۆناخی بەمجۆرە رووبەڕوومان دەبێتەوە تەنانەت تروسکەیەکی بچووك کڵپە بگرێت و بوونێت بە ئاگرێکی مەزن. لە شوێنێك کە چقڵی داری وشك کەڵەکە بووبێت رێگا لەپێش ئاگرێکی مەزن دەکاتەوە.لەخاچدانی عیسا بەزێدەییەوە ئەم رۆڵەی پێکهێناوە.

ئەم رەوشە سادەیەی سەرەتای مەسیحییەت، لە بن کاریگەری رەوتە فەلسەفییەکانی گریك بەتایبەتیش فەلسەفەی ئەفلاتوون دەبێت بە تیۆلۆژیایەك. لەرێگای شرۆڤەی جۆربەجۆرەوە هەوڵدەدرێ چەمکی خوداوەندی سێیانە روون بکرێتەوە. شوێن پەنجەی (سەرچاوەی) ئەم شرۆڤانەش زیاتر لە میتۆلۆژیاکانی سۆمەردا دەبینرێ. لە میتۆلۆژیای (ئەفسانەی) ئەنکی و بابل ـ مەردۆك چەمکی خوداوەندی باوك، خوداوەندی دایك و کوڕی بە توانا دەبینرێ و ئەمەش لە ئاستی چەمکێکی سەرەکی دایە. سێیانەی کۆنترین باپیرە و ئەو نەوەیەی نوێنەرایەتی داب و نەریت و قۆناخ دەکات و کوڕ، بناخەی ئەمە پێك دێنن. هیگڵ شرۆڤەیەکی فەلسەفی هاوچەرخی پێشخستووە. ئەم شرۆڤەیە بە شێوەی تێز ـ ئەنتی تێز ـ سەنتێز وایە ئاماژە بە یاسای دیالەکتیکی دەکات کە یاسای سەرەکی پێشکەوتنە. لە راستیدا ئەم یاسایە لە تەواوی پێکهاتەکانی سروشتدا حوکم دەکات و بەڕێوە دەچێت. دوالیزمی هزری زەردەشتیش یەکەمین شێوەی هەست کردنە بەم بۆچوونە. تێز و دژە تێز (بیرۆکە و دژە بیرۆکە)ی زەردەشتایەتی بە سەنتێزێك ئەنجامگیر نەبووە. لە فەلسەفەی یۆنانی لە رێگای (هەرەکلیتس) کەمێکی دیکەش پێشدەخرێت. لەمیانەی هێگلیشەوە بە هاوچەرخترین واتای خۆی دەگات.

ئەو رۆڵەی دواتر بە "**مەریەم**"ی دایك دراوە زۆر سەیرە. مەریەم تا رادەیەکی مەزن لە خوداوەند ئینانا و ستار دوور خراوەتەوە. هەرچی لێدانی کوشندەی مەردۆك بێت کە لە داستانی بابل بەرخوداوەندی دایك تیامات دەکەوێت، یاخود لەلایەن موساوە داخستنی دەرگاکانی ماڵەوە بەسەر ژندا بێت، ئەمانە رۆڵێکی گرنگیان هەیە لەوەی دواترین شوێن پەنجەیان لە مێژوودا بسڕێتەوە و نەمێنێ.

لەم قۆناخەشدا بە تایبەتیش بە گوێرەی داب و نەریتی سامیەکان توندی یاساکانی کۆمەڵگای باوکسالاری پشت ئەستوور بە پیاو، لە نزیکەوە پەیوەندی خۆی بەوە هەیە کە لە گەوهەری خۆیدا لەگەڵ یاساکانی دایکسالاری و کولتووری عەشتاری خوداوەندی کشتوکاڵ و سەردەمی نئۆلیتیك ناکۆکە و لە قۆناخی بابلیەکاندا کولتووری خوداوەندی ژنی سۆمەریەکان بەلاوە نراوە. ئیتر لەم قۆناخە بەدواوە خوداوەندە ـ ژنی رابردوو، ئیتر لە ماڵی خۆیدا ژنێکی گوێڕایەڵە و بە نامووسە. ئەمە لەولاوە بمێنێت کە لەگەڵ خوداوەندەکاندا یەکسان نییە، کەوتۆتە نێو رەوشێك ناتوانێ دەنگ هەڵبڕێ و پێچەکەی لابدات، هێدی هێدی پێچەی لێ دەئاڵێنرێ، وەکو موڵکی تایبەتی پیاوی بەهێز وایە و لە ژووری تایبەتدا بەند دەکرێت. لە داب و نەریتی ئیبراهیم دا موسا ئەمە زیاتر بەرەو پێش دەبات. ئاستی بەرز و کاریگەری قووڵی کۆیلایەتی ژن لە عەرەبستان، گرێدراوی ئەو پێشکەوتنە مێژووییەیە.

مەریەمی دایکی عیسا بە گوێرەی کۆنترین شێوەی داب و نەریتەکان خوداوەندە. بەڵام بەردەوام لە دەستدانی پایە و ستاتۆی ژن، لەسەردەمی لە دایکبوونی عیسادا بە تەواوەتی کەوتووە و بووە بە ئامرازێکی زاوزێ (زایین). لە ئاستی گشتیشدا بەمجۆرەیە. لە ماوەی نێوان ٢٠٠٠ پ.ز تاوەکو ٢٠٠٠ زایینی بەرامبەر بە شکانەوەی دەسەڵاتی سیاسی بە لای پیاو پێشکەوتنی لەمیانەی چەوسانەوە و زەبر و تەڵەکەبازییەوە، مێژووی ژن مێژووی ژێرترین (نزمترین) چینە. بە گوێرەی کۆیلایەتی پیاو، بە هۆی تایبەتمەندێتی رەگەزیەوە ژن دووچار و مەحکومی کۆیلایەتییەکی زۆر سەختتر هاتووە. لە قۆناخی بابلدا خوداوەند تیامات لە یەك ئاست و رووبەڕوو لە شەڕدایە، تەنانەت لە سەردەمی موساشدا شەڕێکی دژواری لەگەڵ ماریامی خزمی لە ئارادایە. بە سانایی ملکەچی بۆ موسا نەکردووە.

گەرچی مەریەمی دایکی عیسا هیچ کاریگەری و رۆڵێکی نییە. خودا (رەب) فووی تێکردووە ئەویش منداڵی بووە. ئەمەش واتای باڵادەستی رەهای پیاوە. فوو کردن گوزارە لە زاڵ بوون دەکات. ئەوە دەکات بە رەمز کە جگە لە باوەش کردن و بەخێو کردنی منداڵ هیچ رۆڵێکی دیکەی نەماوە. خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە، لەمیانەی ناوبردنی ئەم فووکردنە بە رۆح ئەلقودس (رۆحی پیرۆز)، هەوڵدەدرێت ئەو هێزە خوداییەی کە لە ژندا نوێنەرایەتی دەکرێت چەواشە بکرێت، لە کەسێتی مەریەم ئەم هێزە دەدزرێ. ئەوەی لە سۆمەریەکاندا لەگەڵ ئەمەدا کۆکە، خوداوەندی دایکە. لە راستیدا ئەم بابەتە گرنگییەکی مەزنی ئایدیۆلۆژی هەیە. ئەم ناسنامە ئایدیۆلۆژیە رۆڵێکی دیاریکراوی لەوەدا هەیە لە قۆناخی دەرەبەگایەتیدا کاریگەری و رۆڵی زیاتر لە دەست بدات و ژن بسڕدرێتەوە. لەو رۆژە بە دواوە مەریەمەکان (ژنان) بەردەوام پاسیف و بێ کاریگەرن، بە بێ دەنگی بەسەر منداڵەکانیاندا دەگرین، بە تەواوی بە پیاوەوە گرێدراون، هەروەکو بەندکراوێکی ئەبەدی وان. هەروەکو چۆن ئەم رەوشە هیچ پەیوەندییەکی بە سروشتی ژنەوە نییە، ئەوا پەیوەندی لەگەڵ باڵادەستی مەزنی سیاسی پیاودا مسۆگەرە. هەروەکو چۆن لە قۆناخێکدا سەردەمی خوداوەندە ژنەکان زاڵ و باو بوو، لە قۆناخی دەوڵەت و کۆمەڵگای چینایەتیشدا قۆناخی خوداوەندە پیاوەکان زاڵ و باوە. ئەم راستینەیەی کە لە قووڵایی مێژوو لەناو تاریکاییدا بە جێ هێڵدراوە و لەلایەنی پیاوەوە لەمیانەی چەمکی دووڕوویی ناموس ـ ماڵ دەمامك و پەردەپۆش کراوە، بەڵام ئەمە لەمیانەی ئاستی ئازادی کۆمەڵگا کە لە ئەنجامی تێکۆشانی ئازادییەوە دەخوڵقێندرێ، ئاشکرا و واتادار دەبێت.

ئەوە مسۆگەرە کە لە سەدەی پێنجەمی زایینی بەدواوە بە دەستی پاپاکانی کڵێسە، مەسیحییەت بە واتایەکی فەلسەفی و ئاواکردنی تیۆلۆژیا گەیشت و بوو بە ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی بەهێزی سەردەمی دەرەبەگایەتی. لەم قۆناخە بە دواوە، بوونی بە ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت هەم وەکو هێزی ئایدیۆلۆژی خوڵقێنەری سەردەمی دەرەبەگایەتی دانی پێدادەنرێت، هەم گوزارشت لەم سازشکاری و رێککەوتنە دەکات کە دوای قۆناخێکی درێژی تێکۆشان و ململانێ لەگەڵ کۆیلەداری رۆما هاتە ئاراوە. ئیتر نە ئیمپراتۆرییەتی رۆما ئیمپراتۆرییەتە کۆیلەدارییەکەی جارانە، نە مەسیحییەتیش ئایینە پیرۆز و یەکسانیخواز و سادەکەی جارانی عیسا و حەوارییەکانە.

ئیتر لەمیانەی مەسیحییەتەوە قۆناخی زاڵ بوونی دۆگما ئایینیەکان بەسەر جیهانی هزردا دەستپێدەکات. لە سەدەی پێنجەمی زایینەوە تاوەکو سەدەی پانزدەهەمی زایینەوە نزیکەی هەزار ساڵ دەسەڵات و باڵادەستی شێوازی هزری ئایینی بەڕێوە دەچێت. لە قۆناخی سەدەی پێنجەمی پ.ز تاوەکو سەدەی پێنجەمی زایین لەم هەزار ساڵەدا زیاتر فورسایی کلاسیکیە فەلسەفییە مەزنەکان زاڵە. ئاشکرایە کە پاشکەوتنێکی یەکجار زۆر روویداوە. هۆکاری هەرە لەپێشینەی ئەم رەوشە بۆ هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگای شار و جارێکی دیکە دەرکەوتنە پێشی ئابووری لادێ دەگەڕێتەوە. شار گوزارشت لە کۆمەڵگای ئاڵۆز و مەزن دەکات. هزری ئاقڵمەندانە دەکاتە ناچارییەك. کۆمەڵگای ناوچە لادێیەکان کە بەڕێوەبەرایەتی و دابەشکردنی کاری پێشکەوتووتر دەکات بە پێویستییەك؛ کۆمەڵگایەکی یەك ئاست و تەنگە و شێوەی هزری کە بۆ دۆگماتیزم کراوەیە، لەگەڵ شێوەی ئەو ئابوورییە یەکتر تەواو دەکەن کە خۆی بەڕێوە دەبات، زێدە پێویستی بە دابەشکردنی کار نییە. ئەم تایبەتمەندییانەی پێکهاتەکەی، زەمینەیەکی کراوە پێشکەش بە دۆگماتیزمی ئایینی دەکات. ناوزەدکردنی چەرخەکانی ناوین بە سەردەمی تاریکی لە لایەنێکەوە سەرچاوەی خۆی لەم رەوشەیەوە دەگرێت. لە راستیدا چەرخی کلاسیك شوێن پەنجەی هەمیشەیی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەجێهێشتووە. لە دەرکەوتنی چەرخی نوێدا رۆڵێکی سەرەکی هەیە. نوێنەرایەتی گەورەترین وشیار بوونەوەی ئەقڵ و ئیرادەی مرۆڤ دەکات. هەرچی ئەو چەرخەی کە دۆگما و قاڵبە ئایینیەکان زاڵن، رۆڵێکی مەزنیان لە بەربەست کردنی هەڵوەشانەوەی کۆیلەداری و زیاتر بەرەو دواوە نەچوون و ئامادە کردنی چەرخی نوێ هەیە. ئەو تێکشانەی کە زێدە پێشکەوتنی کۆمەڵگای شار رێگای لەپێش کردەوە، ئەنجامێکی ئەو کەلێنەیە کە نەیتوانی بەرگەی بگرێت. هەرچەندە هەندێ جار وەکو گەڕانەوە بۆ نئۆلیتیك وا بێت، بەڵام رەوش جیاوازترە. ئیتر ئەو سەردەمەی نئۆلیتیك بە لاوە نراوە کە کۆیلایەتی هێنایە ئاراوە. تەنانەت کۆمەڵگای نوێ ئەگەر چی زیاتر لە ناوچە شاخاوی ـ لادێیەکانیش بێت، بە گوێرەی کۆمەڵگای کۆیلەداری گەوهەرێکی پێشکەوتووانەتر لە خۆوە دەگرێت. ئیتر مرۆڤایەتی بۆتە خاوەنی پێکهاتەیەکی هزری و ئەخلاقی و خۆناسین کە جارێکی دیکە ناتوانێ کۆت و بەندی کۆیلایەتی لێبدرێت.

لەگەڵ هەنگاونان بۆ چاخەکانی ناوین، هیچ کاتێك مرۆڤ وەکو ئەو مرۆڤەی سەردەمی سۆمەر و میسر نییە. ئەگەرچی لە ژێر باڵادەستی باوەڕییە ئایینیەکاندا بێت، وەلێ تەنیا بەندایەتی بۆ خوداوەندی ئاسمان دەکات. بەندایەتی کردنی بۆ پادشا ـ خوداوەندی سەر زەوی بە گەورەترین تاوان (کفر) دادەنێت. بە پێی پێویست بەرامبەر بە کۆیلەداری ئایینەکان مرۆڤیان پەروەردە کردووە و پێگەیاندووە. پاشکەوتن زیاتر لە رووخانی شارەکان و لاوازبوونی هزری ئاقڵمەندانە دەبینرێت. گوزارە لە قۆناخێك دەکات کە لەم ناوچانەدا شاری زۆر لەسەردەمی نئۆلیتیك پێشکەوتووتر هەبووە و شاری نوێ ئاوا کراوە و شاکارەکانی ئاقڵمەندی لە چەندین کتێبخانەدا بە شاراوەیی هێڵدراوەتەوە. ئەگەر لە نزیکەوە تەماشا بکرێت ئەوا روون دەبێتەوە کە تاوەکو بە پەروەردەی چەرخی باوەڕیدا دەرباز نەبێت ناشێ بە چەرخی نوێ بگەیت.

دەشێ بەمجۆرە گەوهەری ئەو قۆناخ و جیهانە پێناسە بکرێت کە ئایدیۆلۆژیای ئیسلام ئافراندوویەتی. هەرچەندە مەسیحییەت تا رادەیەك دەستی لە هەندێ تایبەتمەندێتی گەوهەری خۆی بەردابێت، وەلێ ئیمپراتۆرییەتی مەزنی رۆمای لە ناوەوە هەڵوەشاندۆتەوە و لە رۆژهەڵاتی رۆمادا بووە بە خاوەنی ستاتۆی ئایدیۆلۆژیای فەرمی بێزەنتیەکان. بەرامبەر بە ئیمپراتۆرییەتی پارس ـ ساسانییەکان باڵاتر و پایەدارتر دەبێت. ئەم ئایینە نوێیە لە رێی ئەوروپاوە دەربازی قۆناخێکی نوێی بڵاوبوونەوە بووە. هەرچەندە لەسەر بنەمای باوەڕیش بێت لە واتایەکدا توانیویەتی نزیك بوونەوەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا ئەنجام بدات. ئەو کاتە رۆڵی ئیسلامیەت چییە؟ ئایا بۆ مێژوو نوێبوونەوەیە یاخود دووبارە بوونەوە؟ کامە بۆشایی پڕ دەکاتەوە و رێگا لەپێش کام شەپۆلی شارستانییەت دەکاتەوە؟ ئەم هێزە لە قەڵەمبازە نوێخوازییەکەی خۆی دەگرێت یاخود لە زیندوو کردنەوەی هەندێ داب و نەریتی کۆنەوە وەردەگرێت؟ ئایا تەنیا بۆشاییەکی جوگرافی پڕ دەکاتەوە یاخود نوێنەرایەتی هێزی وەرچەرخاندنی شارستانییەتی کۆن دەکات؟ وەڵامدانەوەی ئەمجۆرە پرسیارانە سەبارەت بە پێناسەکردنی ئیسلامییەت گرنگە.

هەڵکشانی ئیسلامییەت لە مێژوودا گرێدانی بە هەڵوێستی شۆڕشگێری و رادیکالانەی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، واقیعی ترە. ئەگەر مەسیحییەت رێبازی ریفۆرمخوازی دەرەبەگایەتی بێت، ئەوا ئیسلامییەت رێبازی رادیکالی و شۆڕشگێڕانەیەتی. بە پێی پێویست ئەوە روون کرایەوە کە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا لە هەمان سەرچاوەوە بناخەیان گرتووە. ئینجیل

و قورئان گرنگترین بەڵگەی هەمان سەرچاوەن. بە بێ هەبوونی تەورات، ناشێ بیر لە ئینجیل و قورئان بکرێتەوە. بەڵام ئەگەر میتۆلۆژیای سۆمەر و میسریش نەبێت، مەحاڵە بیر لە تەورات و پارچە کۆنەکانی بکرێتەوە. لەو باوەڕەدام کە ئەو هەڵسەنگاندنانەی تاوەکو ئێستا سەبارەت بە شارستانییەت ئەنجامیمان داوە، بە پێی پێویست ئەو راستینەیەی روون کردۆتەوە.

بەڵام لە قەڵەمدانی ئیسلامییەت وەکو بڵاوکردنەوە یاخود شرۆڤە کردنی کتێبی پیرۆز، دەبێتە هەڵەیەکی مەزن. دەبێ بە شێوەیەکی ئاشکرا ئاماژە بەوە بکرێت بە ئەندازەی ئەوەی کاریگەری کردۆتە سەر، لەهەمانکاتدا گوزارشت لەو وەرچەرخانە دەکات کە بە گوێرەی تایبەتمەندێتی سەردەمەکانی خۆی ئەنجامیداوە. ئەمە راستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە حەزرەتی مەحەمەد کەسایەتییەکی شۆڕشگێڕی بە گوێرەی قۆناخ نیشانداوە. کاتێك لەگەڵ هەرسێ پێغەمبەری سەرەتا ـ ئیبراهیم، موسا، عیسا ـ بەراورد بکرێت، دەبینرێ کەسایەتییەکی بەرجەستەیە کە بە شێوەیەکی بەهێز و کاریگەر لۆژیك و ئیرادەی خۆی نیشانداوە و رێکخستووە و خستویەتییە بواری پراکتیزە کردنەوە. لەمیانەی هەوڵە سەرکەوتووەکانی کاتێك پێکهێنانی رێباز و رێکخستن و پراکتیزە کردن زیندوو بوو، توانی ببێتە هێزێکی باڵادەستی نیمچە دورگەی عەرەب. لەم بوارەدا لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی دەگمەن، دەتوانرێ لەگەڵ ئەسکەندەر و لینین بەراورد بکرێت. ـ ئەگەر لەمیانەی چەمکێکی زانستی مێژوو کۆمەڵگا تەماشا بکرێت نەك لەمیانەی دۆگما ئایینیەکان ـ دەبینرێ کە حەزرەتی مەحەمەد تا دواڕادە کەسایەتییەکی ئایدیۆلۆگ و سیاسی و کرداری بووە. حەزرەتی مەحەمەد پێویستی بەوە نییە لەمیانەی پەردەی پیرۆزییەوە تەماشای بکرێت و هەڵسەنگێنرێت. یەکێك لەو کەسایەتییە هەرە لەپێشانەیە کە دەتوانرێ لە رێی زانستەوە هەقەکەی بدرێتێ. بە پێچەوانەی شیمانە و مەزندەکان، پێشکەوتنی دۆگماتیکانەی ئیسلام حەزرەتی مەحەمەدی مەزن نەکردووە، بە پێچەوانەوە لە ناسنامەی کەسایەتیەکەیدا نیشانی داوە کە لە ناو دۆگما ئایینیەکاندا خنکاوە.

یەکێك لە کار و ئەرکە هەرە سەرەکییەکانی کە لە رێگای شۆڕشی سەرلەنوێ لە دایکبوونی رۆژهەڵاتی ناوین (رێنسانس) ئەنجام بدرێت، رزگار کردنی حەزرەتی مەحەمەدە لەبەردەستی سەرەڕۆ و دۆگما مێژوویی و هەنووکەییەکان. ئەم مێژووە مێژووی نیشاندانی ئەو دۆگما ناکۆك و کردارە پێچەوانانەیە لە ژێر ناوی حەزرەتی مەحەمەدەوە. ئەو رووداو و بەسەرهاتانەی بەسەر **ئەهلی بەیت** هاتووە، لە کاتی وەفات کردنیش سێ رۆژ مانەوەی تەرمەکەی، ئەوە دەسەلمێنێت کە چۆن لە رۆژگاری یەکەمدا خیانەت بە بوێری هەڵوێست نیشاندەدات. **بوویەری کەربەلا** تەنیا تراژیدیایەکی مێژوو نییە، هێزی راستەقینەی تەقینەوەی ئەو خیانەتەیەکە لە هەناوی ئیسلامییەتدایە. هێرشکردن و خیانەتێکی بەمجۆرە بۆ سەر ئەو بەهایانەی کە لەبەرەبەیاندا پیرۆز دەبینرا، نموونەی ئەوە نیشاندەدات کە لە قۆناخەکانی دواتری مێژوودا رێگا لەپێش چ جۆرە کوێرایەتی (فەناتیزم) و هۆڤێتیەك دەکاتەوە و تەنانەت وشیار بوونەوەیەکی ئاسایی زانستی سەرلەنوێ شیکردنەوەی راستینەی ئیسلام و مێژووەکەی تاوەکو بچووکترین ووردەکاری، دەکات بە مەرجێکی لەپێشینە. تاوەکو ئەم قاڵب و کلسە پاك نەکرێتەوە کە هزری تەواوی وڵاتانی ئیسلام و رۆژهەڵاتی ناوینی داخستووە، ناشێ کەسایەتی ـ **تاکی هاوچەرخ** ـ پێکبێت. علمانییەتێکی راستەقینە و نوێخوازی ئیسلام؛ کاتێك بەرامبەر بەم راستینەیە دەرك بە رۆڵی خۆیان بکەن و پێویستییەکانی جێبەجێ بکەن، ئەو کاتە واتادار دەبن. رێز گرتنێکی واتادار و راستەقینە بەرامبەر بە کەسایەتی حەزرەتی مەحەمەد کاتێك مسۆگەر دەبێت کە ئەو نەمرود و فیرعەونە هاوچەرخانە بەلاوە بنرێن کە ئەم راستینانە نابینن و بە پێچەوانەوە هزریان کۆنکرێت کردووە و لەمیانەی سەرەڕۆیی و دۆگماکانەوە فەرمانڕەوایی دەکەن.

وەکو پێویستییەکی ئەم رێزگرتنە و گرێدان بەو کەسانەی لەم بارەیەوە رەنجێکی زۆریان داوە، هەوڵدەدەین رۆڵ و جێگای خۆمان لە شیکردنەوەکانی سەبارەت بە ئیسلامییەت بگرین.

١ ـ سەرەکیترین زاراوە کە پێویستی بە رۆشنکردنەوە هەیە **تەوحیدە**، واتە کێشەی یەکبوونی ئەڵڵایە. واتە هەبوونی خودا و یەکبوونی و بوونی حەزرەتی مەحەمەد بەدوا پەیامبەر، رۆڵ و گرنگی کلیل بەم زاراوە دەبەخشێ. هەبوون و یەکێتی بەرامبەر بە چی و کێ، بۆچی دوا پەیامبەر؟ تیۆلۆگەکانی (زانایانی خوداناسی) ئیسلام تاوەکو ئێستا لە چوارچێوەی سنوورە ئایینیەکان، بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا گەڕان. هەرچی شیکردنەوە زانستییەکانە لەبەر ئەوەی بە تایبەتی لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکان بێ ئاگان و من منێتی ناوەندێتی شارستانییەتی ئەوروپای تێپەڕ نەکردووە، لە هەندێك روون کردنەوەی سنووردار بەولاوە، تێپەڕیان نەکردووە. رۆژهەڵاتی ناوین ناتوانێ خۆی لەم ئەرکە بدزێتەوە کە لەمیانەی توانستە خۆییەکانی ئەنجامی بدات. تاوەکو ئەم یاسا و تابۆ پیرۆز کراو و دەست لێنەدراوانە پارچە نەکرێن ناتوانرێ ئەم ئەرکە بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە جێبەجێ بکرێت.

لەو بەڵگەنامانەی کە بە دەستەوەن دەبینرێ لە قۆناخی نئۆلیتیکی کە مۆری ژنی پێوە بووە پێشکەوتنی ئایینی فرە خوداییەکان، لەمیانەی شارستانییەتی سۆمەر و میسر، زاراوەی خوداوەند بە قەڵەمباز و وەرچەرخانێکی گرنگدا دەرباز بووە. پێکهاتەی کۆمەڵگای پشت ئەستوور بە جیابوونەوەی چینایەتی و رەگەزی، کاتێك لەمیانەی بەرهەمهێنانێکی زێدەی بەرهەم، خۆی سەلماند، ئیدی باوەڕی و متمانەیەکی مەزن بەو میتۆلۆژیانە پێشکەوت کە راهیبەکان پێکیان هێنا بوو. لەبەر ئەوەی پەرستگای راهیبەکان لەهەمانکاتدا رۆڵی ناوەندی بەرهەم هێنانیشیان دەبینی، بۆیە رۆڵێکی مەزنی لەم باوەڕی و متمانەدا هەبوو. دەرکەوتنی ئایینە ئاسمانییەکان، لەم قۆناخەدا رێگا لەپێش قۆناخێکی ریشەداری باوەڕییە ئایینیەکان دەکاتەوە. ئەو ئارامی و نەگۆڕیەی لە سیستەمی ئاسماندا هەیە. وەکو باوەڕییەکی سەرەکی بەنموونە وەردەگیردرێت. کاریگەریەکی سەرەکی ئەم جێگیریەی سیستەمی ئاسمانی لەسەر پێشکەوتنی دەمارگیری لە بیر و باوەڕیەکانی رۆژهەڵاتی ناویندا هەیە. زاراوەی لە جۆری نەگۆڕی، ئەبەدی و هەتاهەتایی هەموویان گرێدراوی ئەم کاریگەریەن. مەزنترین سوودی ئەم هزرە نەگۆڕە بۆ پێشکەوتن و پێکهاتەی هزری مرۆڤایەتی، ئەوەیە کە پێکهاتەیەکی کراوەی بۆ بیری یاسای هەمیشەیی هەیە. لەسەر زەویشدا بە دوای سیستەمی ئاسماندا دەگەڕێن. لەگەڵ ئەوەی کە پێکهاتەی فرەخودایی بەردەوامە، پێبەپێ ژمارەیان کەم دەبێتەوە، هەندێ خوداوەند کە نوێنەرایەتی دیاردەی وەکو زەوی، ئاسمان، ئاو، هەوا و گەردەلول دەکەن، وەکو مەزنترین خودا بەرز دەبنەوە. لەگەڵ ئەوەی بە شێوەی ـ رووخساری مرۆڤ بەردەوام دەبێت، هاوکات وەکو ئەنجامێکی سروشتی جیابوونەوەی چینایەتی، ئەم زاراوەیە سەرلەنوێ رۆڵی خوڵقاندن و دابەش کردنی مرۆڤایەتی بۆ خوداوەندەکان و بەندە خزمەتکارەکان جیا دەکاتەوە. بە تایبەتیش وەستای هەرە کارامە و مەزنی خوڵقاندنی و جیا کردنەوەی خودا ـ بەندە، خوداوەند و زانای فێڵباز ئەنکییە. لەم بارەیەوە رێنومایی خوداوەندەکانی دیکە دەکات، پەسندی دەکات. خوداوەند نین هورساك و شێوەی دواتری کە ئینانایە، رۆڵی کەمتر و نزمتر دەبێت، لەمیانەی ئاواکردنی دەستەی خوداوەندەکان (پانتائۆن) کە زیاتر مۆری پیاوی پێوەیە خزمەتکارەکانی لێ بەدەرنراوە و لەمیانەی رێککەوتن و تەباییەکی بێدەنگ خوڵقاندوویەتی، هەروەکو ئەوە وایە کە شێوەیەکی سیستەمی ئاسمانی لەسەر خاك ئاوا کردووە. دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت و مەحکوم کردنیان بە خزمەتکارێتی ئەبەدی، وەکو چارەنووسێکی مرۆڤایەتی نەخشێنراوە. راهیبە سۆمەریەکان لەمیانەی گرێدانی پێکهاتەی کۆمەڵگای چینایەتی کە بە شێوەی خودا ـ کۆیلە جیا کراوەتەوە بە یاسا و رێورەسمە ئایینی و میتۆلۆژییەکان، بە شێوەیەکی زۆر بەهێز بناخەی پێشکەوتنی ئایینی رۆژهەڵاتی ناوین و تەنانەت تەواوی جیهانی بەردرێژ کردووە. پێویست دەکات مێژووی ئایینەکان ئەم راستینەیە پەسند بکەن. تاوەکو ئەمە پەسند نەکرێت، هیچ شرۆڤە و شیکردنەوەیەکی ئایینی لەسەر بنەمایەکی راستی مێژوویی و بە پشت بەستن بە راستینە و واقیع روون ناکرێتەوە و بە ناتەواوی دەمێنێتەوە و لەوە رزگاری نابێت چەندین  واتای هەڵە لە خۆوە بگرێت و بۆ قۆناخەکانی دواتری خۆی بگوازێتەوە. ناتوانرێ نکۆڵی لەمە بکرێت کە ئایینە ئاسمانییەکان لە زۆر لایەنەوە قەرزاری راهیبە سۆمەریەکانن کە بنەمای ئەم ئایینەیان داناوە. پەرستگای راهیبەکان هەم لە بواری بەرهەمی ماددی هەم لەمیانەی داهێنانە ئایدیۆلۆژییەکان ئەرکی منداڵدان دەبینێ، ئەو شارستانییەتەی لێرەدا خوڵقێنراوە رۆڵێکی سەرەکی لەپێشکەوتنی مرۆڤایەتی و دەستپێکردنی مێژوودا دەبینێ.

گەورەترین رۆڵ و داهێنانی راهیبە سۆمەریەکان بۆ زاراوەی خودا، بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان و پێ بەخشینی هەموو هێزە سەرەکییەکانی سروشت، لەناو کۆمەڵگاشدا لە کاتێکدا تایبەتمەندێتیەکانی خودا ـ کۆیلەی بەرز و پیرۆز کردووە، مرۆڤیشی لە ستاتۆی بەندەکانی خودا داناوە. ئاشکرایە کە بناخەی ئایدیۆلۆژی دەسەڵاتی سیاسی بونیاد دەنرێت. لە ئیلاهییات

(خوداناسی)ی سۆمەریەکاندا خودا شانبەشانی پێویستی کۆمەڵگا بە سیاسی بوون پێشدەخرێت و بەڕێوە دەبرێت. بە گوزارشتێکی دیکە ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژی یاخود بەرامبەرەکەی دەسەڵاتی سیاسی کە دیاردەیەکی ماددییە، ئەو خودایەیە کە مرۆڤی وەکو خزمەتکار خوڵقاندووە. بەمجۆرە زاراوەی خودا و دیاردە سیاسییەکەی لە گەوهەردا دەکرێن بە یەك. زاراوەی خودا دەبێتە هاوتا ئایدیۆلۆژییەکەی سیاسەت. بە بێ خوڵقاندنی هاوتاو بەرامبەرە ئایدیۆلۆژییەکە هیچ سیستەمێکی سیاسی شانسی بەڕێوەچوونیان نییە. سیاسەت بەردەوام لە ژێر سایەی سێبەری خوداوەندەکان بەڕێوە چووە. سیاسەت لەگەڵ دۆگما ئایدیۆلۆژییەکانی وەکو گۆشت و نینۆك بەناویەکدا چوون. تاوەکو هێزی سیاسەتی کلاسیکی شینەکرێتەوە ئەوا هەرگیز علمانییەت بەدی نایەت.

پرەنسیپی یەکێتی و تەوحید کە حەزرەتی ئیبراهیم بە باپیرە گەورەی دادەنرێت، لەناو لەیەکچوونێکی چڕ لەگەڵ پێویستی تیرەکان بە یەکێتی و یەك ئاستی و ڕەوشی جوگرافیا پێشدەکەوێت. لێرەدا دەبینرێ کە دوای قۆناخی تەوتەمی سیستەمی تیرەکانی عەرەبستان هەوڵدەدرێ لەمیانەی زاراوەی "ئەل" وەڵامی زاراوەی خوداوەند بدەنەوە، کە "ئەل" گوزارشت لە بەرز بوون و مەزنبوونی خوداوەندەکانی سۆمەردەکات. بەڵام چەندین تیرە "ئەل"ی تایبەت بە خۆی هەیە. هەروەکو چۆن ئەم ڕەوشە ڕێگا لەپێش ئاڵۆزی دەکاتەوە، ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کە پێویستی یەکبوون خۆی بسەپێنێ. شتی هەرە ڕاست ئەوەیە کە واتا و ڕوون کردنەوەی سۆسیۆلۆژیانەی پرەنسیپی تەوحید لە پێویستی یەکبووندا ببینرێت. بۆچی لە کاتێکی ئاسایی نابێ، بەڵام کاتێك تیرە بۆ خۆ پاراستن یان هێرش کردن پێویستی بە یەکبوون دەبێت، بۆ "ئەل"یش بیر لە تەوحید دەکرێتەوە؟ لە تەوراتی کۆندا دەبینرێ ئیبراهیم لە نێوان تیرە نزیکەکانی خۆیان پێویستی یەکێتی دەبینێ. تاوەکو تیرە زۆرەکانی دەورووبەر هەر یەکەو "ئەل"ێکی جیاوازیان هەبێت، یەکبوون بە دینایەت. بۆ ئەوەی ئیبراهیم بتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ، پێویست دەکات "ئەل"ی تیرەکان بکات بە یەك کە پاشماوەی قۆناخی فرە خودایین. بە لایەنی کەم ئەنجامدانی ئەمە لە پێناو تیرەکانی خۆی و دانانی خۆشی بە نزیکترین کەسی تاکخودا، واتە بە دەزگاکردنی خۆی وەکو پێغەمبەر، لە پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەکەدا ڕۆڵی کلیل دەبینێ. لەمیانەی ئەو کێوماڵە ئایدیۆلۆژییەدا هەم "ئەل" دەکات بە خوداوەندی تایبەت، هەم لە ئەنجامی پەیوەندی نزیکی خۆی لەگەڵ ئەل دا قەڵەمبازی چاوەڕوانکراو ئەنجامدەدات. لە مێژووی ئایینەکاندا دەتوانرێ بە دووەمین شکستی مەزن یاخود وەرچەرخان ناوببرێت. ناسنامەی نوێی خودایی، هەم لە ڕێگای تایبەتمەندێتی تەوحید دەکرێت بە تاکخودایی، هەم لەمیانەی پرەنسیپی **"مرۆڤ نابێت بە خوداوەند"** بەرەو **پەیامبەر ـ نوێنەر** هەنگاو دەهاوێژرێت.

لە واتای سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەیدا، گەیشتنی ئەرستۆکراتییەتی تیرەیە بە دەزگای شێخایەتی. شێخ وەکو سۆمەریەکان ناتوانێ ببێتە پادشا ـ خوداوەند. چونکە تیرە تەواو بە جیابوونەوەی چینایەتیدا تێپەڕ نەبووە و یەکلانەبۆتەوە. ڕاستینەیەکی کۆمەڵایەتی بەمجۆرە زاڵە کە شێخ یەکێکە لە ئەندامانی تیرە و لە ژیانی ڕۆژانە بەیەکەوە لە ناو کۆمەڵگادا دەژی و هێشتا بە تەواوەتی مەودایان لە نێواندا نەبۆتەوە. لە ڕەوشێکی بەمجۆرە دا نییە بکرێت بە خوداوەند. بوون بە خوداوەندا تەنیا وەکو تایبەتمەندێتیەکی پادشاکان جێگای خۆی لەناو کولتووری قۆناخدا کردۆتەوە. ئایدیۆلۆژیا و پراکتیزە کردنەکەی زۆر بەر لەم قۆناخە لەناو کۆمەڵگای میسر و سۆمەریەکان بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێشانە ئەنجامدراوە. ئیبراهیم کە بە خۆیشی شێخێکە سەمبۆڵی یاخیبوونە دژ بە نەمرودی خوداوەند. بناخە و واتا ئایدیۆلۆژییەکەی بە شێوەی پرەنسیپی مرۆڤ نابێت بە خوداوەند. هەوڵدەدات لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی مرۆڤی خوداوەند، ئایدیۆلۆژیا و ناسنامەی نوێی خودا دیاری بکات. لە ئەنجامدا ئەم شەڕە ئایدیۆلۆژییە بە تەوحید ئەنجامگیر دەبێت، واتە بە یەکبوونی خوداوەندەکان و نوێنەری ـ پەیامبەر کە نزیکی خودایە ئەنجامگیر دەبێت و ئەمەش بە مانای بەدیهاتنی قۆناخێکی مەزنی مێژووی ئایینەکانە. بە گوێرەی کۆیلەداری وەرچەرخانێکی نەرم و مرۆڤ پەروەرانەتر ئەنجام دەدات. لە ئەنجامی یەکتر بڕینی کاریگەری میتۆلۆژیای میسر و سۆمەر لەگەڵ تەوتەمی تیرەکان، لە ئەنجامی ئەم تێز و دژە تێزەدا سەنتێزێکی نوێ پێکدێت. ئەمە ڕاستینەی تەوحیدە. بە گوێرەی زانستی کۆمەڵناسی تەوحید گوزارشت لە یەکبوونی قەومی تیرە لەیەك نزیکەکانی دەکات. لە بواری سیاسیشدا گوزارە لە سنووورداری دەسەڵاتی شێخ دەکات. تەوحید ناسنامەی ئایدیۆلۆژی مەزن و بەجۆشی ئەو تیرانەیە کە لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی شێخ و خودا **"الله"**، بوونەتە یەك. ئیتر ئەڵلا وەکو نازناوی قەوم وایە. سەرچاوەیەکی هێزە. **"یا الله، بە واتای فریام کەوە، هێزم پێ ببەخشە"** دێت. بە واتایەکی دیکە دروشمی ژیانە لەپێناو یەکێتی. بانگەوازیەکانی "یاالله" کە چەرخەکانی پڕ کردبۆوە کلیلی سیحراوی و موعجیزەیی فۆرمیلی یەکبگرین ـ بەهێز بین ـ سەرکەوین.

ئەگەر تەماشای چۆنیەتی پێشکەوتنی لە مێژوودا بکەین دەبینین لەمیانەی پەرستنی خودا "الله" خواستویانە بە یەکێتی بگەن و بەهێز ببن. زاراوەی لە جۆری چوونی بەندە خۆشەویستەکانی خودا بۆ بەهەشت، بواری ئەدەبی و فەنتێزی مەسەلەکەیە. گەوهەری باوەڕی و زاراوەی خودا، بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکی بەهێز و یەکێتیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە کە پێویستییەکی ژیانییە. دەبێ زۆر بە باشی جیاوازی نێوان شێوەی ئایدیۆلۆژیا، واتە بەشی ئەدەبیاتی سەردەمی پێشنەکەوتنی هزر لەگەڵ گەوهەرەکەی بکەین، کە پێویستییەکی سەرەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا جێبەجێ دەکات. بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەمە ئەنجام نەدرێت، ئەوا لەو دۆگماتیزمە ڕزگار نابین کە بە شێوەیەکی چڕوپڕ و فراوان و بە ئامانج ئەنجامدراوە. هەر دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی گوزارشت لە ڕاستینەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات کە لە ناواخن و بناخەکەیدا شاراوەیە. لە دوا شیکردنەوەدا دەردەکەوێت کە جیاوازی سەرەکی ئابووری و بەرژەوەندی لە ژێر ئەمەشدا شاراوەیە. بە بێ ئەوەی لەم چوارچێوەیەدا شیکردنەوەیەکی یەکپارچەیی و هەمە لایەنە ئەنجام بدرێت، تەنیا سنووردارکردنی لە یەك بواردا، ئەگەر بە ئەنقەست بێت یان لەخۆڕا، لەکار و چالاکییەکانی سۆسیۆلۆژیدا ڕێگا لەپێش کەوتنە ناو هەڵەی پێرەوکاری دەکاتەوە.

ئەم وەرچەرخانە ئایدیۆلۆژییە مەزنەی کە حەزرەتی ئیبراهیم بە باپیرەی پەسند دەکرێت لەسەردەمەکانی عیسا و موسا زیاتر پێشدەخرێت. لە گەوهەردا نزیکی یەکدین. هەر لەبەر ئەمەشە بە داب و نەریتی ئایینی تاکخودایی دێت. بە گوێرەی کتێبە پیرۆزەکان لە ماوەی نێوان هەزار ساڵ تاوەکو سەردەمی عیسا ١٢٤٠٠٠ پێغەمبەر ژیاون. لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە هەر کەسایەتیەکی وریا، خاوەن ویژدان و ڕۆشنبیری ناو کۆمەڵگا وەکو پێغەمبەر ڕێزیان لێگیراوە و بەهادار بینراون. ئەرکی سەرەکی ئەم پێغەمبەرانە ئەوەیە رابردوو و داب و نەریتەکانی کۆمەڵگا درێژە پێبدات و ئومێدەکانی ڕزگاری یاخود ئەو بەهەشتەی خەیاڵ دەکرێت و ئەو وڵاتەی پەیمانی پێدراوە بەزیندوویی بهێڵێتەوە. هەروەکو چۆن لە هەندێ قۆناخدا پێغەمبەری وەکو موسا، داود، سولەیمان، یرمیا، عزرا، یەحیا، عیسا دەرکەوتن، کە گرنگ و جێگای بایەخ بوون، بە ڕادەیەکی زیاتر ئەوانەی وەکو مامۆستایەکیش دەرکەوتوون ئەلقەکانی هەمان زنجیرەن. پێغەمبەرایەتیش وەکو باوەڕی دێرینی باب و باپیران داب و نەریتی پیرۆزی کۆمەڵگایەکە زیاتر پێشکەوتووە و تایبەتمەندێتی خودایی بەدەست هێناوە. ئەم داب و نەریتە لە هەموو کاتێکدا نوێنەری خۆی هەیە. هیچ قۆناخێك نییە بێ پێغەمبەر بێت. لەسەردەمی ئیبراهیم بەدواوە لە هەموو قۆناخێکی قەیرانی سەختدا پێویستی بە قەڵەمبازی پێغەمبەرانە دەبینرێت. ئەوانەی بە پلەی دووەم خاوەن کتێبن و شرۆڤە دەکەن لە ئایینی موسەوی بە کاهین ناو دەبرێن، لە مەسیحییەتدا پاتریارك و لە موسوڵمانێتیشدا بە (شێخ الاسلام) شێخەکانی ئیسلام ناوزەد دەکرێن. ئەوانە زیاتر ڕاڤەکار و نووسەری ئەو پێغەمبەرانەن کە خاوەن کتێب و سونەتن (فەرمووده)ن.

تەواو لەو هەلومەرجانەدا سەردەمی ئیسلامییەتی حەزرەتی مەحەمەد وەکو بورکان دەتەقێتەوە. ئەگەر پێشکەوتنی خێرای ئیسلام و بڵاوبوونەوەی تەنیا لە میانەی هێزی شمشێرەوە هەڵبسەنگێنرێ، ئەوا ئەمە واقیعی نییە. ئەگەر هەلومەرج پێنەگات، هیچ توند و تیژیك، چەندە بە دژواریش پراکتیزە بکرێت هەروەکو چۆن ڕێگا لەپێش پێشکەوتنی کۆمەڵگا ناکاتەوە، هاوکات لە نانەوەی ئەنجامی تێکدەرانە بەولاوە تێپەڕ نابێت. ڕۆڵی زەبروزەنگی ئیسلامییەت لە پەرتەوازە کردن و هەڵوەشانەوەی ئەو کۆمەڵانە زیاتر نییە کە لەپێش گۆم و بەنداوەکاندا بوونەتە کۆسپ و بەربەست. ئەم کۆسپە موحافەزەکارانەیەی کە خۆی لە خۆیدا هەڵوەشاوەتەوە لە ئاکامی چەند لێدانێکەوە بە تەواوەتی دەڕووخێ و بەمجۆرە لێشاوی

شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، لە هەموو لایەکەوە لق و گۆمی نوێ لە خۆوە دەگرێت و دەبێت بە لافاوێك کە هیچ شتێك بەرگەی ناگرێت. لەمیانەی ئەم هەڵمەتە شۆڕشگێڕییە مەزنە، مرۆڤایەتی لەسەرەکیترین ناوەندەکانی خۆیدا، لە ڕێگای گۆڕانکارییەکی نوێی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسی دەبێت بە شێوە و هێزی نوێی مێژووی شارستانییەت.

بێگومان کاتێك ئەم پێشکەوتنە مێژووییە بەمجۆرە پێناسە دەکەین، بێگومان لە نزیکەوە بینینی تایبەتمەندێتی و ڕۆڵی حەزرەتی مەحەممەد کە کەسایەتی هەرە سەرەکی ئەم پێشکەوتنەیە، جێگای گرنگی و بایەخێکی مەزنە. هەروەکو ئاماژەی پێکرا ئەو هەلومەرجانەی کە تێیدا لە دایك بووە و مەزنی کردووە، هەلومەرجەکانی سێگۆشەی مەککە و مەدینە و تائیفی عەرەبستانە کە ناوچەی یەکتر بڕینی هەر سێ هێزی سەرەکی ئەو سەردەمە ئیمپراتۆرییەتەکانی بێزەنتی و ساسانی و حەبەشییە. ئەم شارانەی کە لە نێوان هەر سێ ئیمپراتۆرییەتدا پێشکەوتنی مەزنیان بە خۆیانەوە بینی، بە ئامانج و پشتبەستن بە بازرگانی ئاواکرابوون. بە گوێرەی سیستەمی تیرە بەدەوییەکانی بیابان پێشکەوتنێکی بریقەدار و دەوڵەمەندە، بە واتای بەشار بوون دێت. بە شار بوون، لە زمانی عەرەبیدا بە واتای (مەدەنییەت) شارستانی بوون دێت. هەروەکو دەزانرێ ناوی شارێکیش مەدینەیە. بۆ یەکەمین جار تیرە عەرەبە سامیەکان کە لە دەورووبەری ئەو شارانەی بە ئامانجی بازرگانی کردن ئاوایانکردبوو بە دەرفەت و توانستی شارستانی بوون دەگات.

داب و نەریتی عیبرانیەکان کە بە حەزرەتی ئیبراهیم دەستپێکرد، لەگەڵ پشتبەستن بە توانستەکانی شارستانییەتی میسر و سۆمەر، ئەوانیشی تێپەڕ کرد و بەوەرچەرخانیدا دەرباز کرد و تیرە فراوانەکانی بیابانی بەرەو قۆناخی شارستانی بوون راکێشاو و لە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی رۆژهەڵاتی ناویندا چاخێکی مێژوویی دەستپێکرد. ئەمە ئاڵای ئایدیۆلۆژی دووەمین شەپۆلی مەزنی شارستانییەتە. لە بواری رۆحیدا سەرلەنوێ شێوەگرتنی جولانەوەی مەزنی کۆمەڵگا و هزرە پێشکەوتووەکەیەتی. لەلایەکەوە ئەو بتە تەوتەمیانە دەشکێنێ کە نوێنەرایەتی پاشڤەرۆیەتی تیرە سەرەتاییەکان دەکات، لەلاکەی دیکەشەوە لە دژی ئەو سیستەمانەی میسر و سۆمەر سەرهەڵدەدات کە خوداوەندی لە رووخساری مرۆڤ، فرە خودایی، گەورەکەیان وەکو نەمرود و فیرعەون خۆی بە شێوەی پادشای ـ خوداوەند نیشان دەدات. کردنی **ئەل** بە **ئەڵلا** چەکی سەرەکی ئایدیۆلۆژی ئەم پێشکەوتنە مێژووییەی مرۆڤایەتییە. گوتەی "خودا یەکە، پێغەمبەر نێردراوەکەیەتی" گەورەترین هێزی پروپاگەندەیە کە جەماوەری موئمینەکان زیاد دەکات.

لە سەردەمی دەرکەوتنی حەزرەتی مەحەممەد، لە کاتێکدا بەرامبەر بە پێشکەوتنی هەلومەرجە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان پێکهاتە سیاسیەکان لە پەلوپۆ کەوتن، ئایدیۆلۆژیا فەرمییەکان پاشڤەڕۆ بوونە و تایبەتمەندێتی پەلاماربەرانەیان بە دەست هێناوە. لە کاتێکدا لە بواری دەزگا ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە کۆیلایەتی بە خێرایی بەلاوە دەنرا، لە شێوەکانی دەوڵەتی باڵادەستدا جەخت کردنەوەیەکی مەزن لەسەر بەردەوامکردنی موحافەزەکاری لە ئارادا بوو. تەنانەت کەوتبوونە رەوشێك کە لە میسر و سۆمەریش پاشکەوتووتر بوون. زۆر لەوە دوور بوون وەڵامی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابووریانە بدەنەوە کە تازە دەرکەوتبوون. پێکهاتەی سیاسی کۆسپی سەرەکییە لەپێش پەیوەندییە نوێکانی کۆمەڵگا و شێوەی بەرهەمهێنان. بە تایبەتیش ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی و ساسانی، زۆر لە زووەوە سەردەمی خۆی تەواو کردووە، لە کارکەوتوون، ئیتر ئامێر و دەزگاکانی پاشماوەی دەوڵەتی کۆیلەداری، ئەو کۆسپانەی پێش هەڵمەتی نوێی شارستانییەتن کە پێویستە بە لاوە بنرێن.

خەیاڵ و ئارەزوو و داخوازیە نوێکانی مرۆڤایەتی بۆ ژیان بەر ئەم کۆسپانە دەکەوێ و دەوەستێ. ئەو پێشکەوتنەی لە ڕێگای مەسیحییەتەوە لە ئیمپراتۆرییەتی بێزەنت بەدیهاتووە، ئیتر پێبەپێ بەرەو موحافەزەکاریەکی مەزن دەگۆڕێت کە ڕێگا لەپێش شەوەزەنگ و فشار دەکاتەوە. ئایینی مەسیحییەتی عیسا کە ئومێدی رزگاری چەوساوەکان بوو، لە ئایینێکی ویژدان و ئەخلاقی دەرکەوت و کرا بە ئامرازێکی لەیستۆکەکانی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی. لەسەردەمی مەزن بوونی حەزرەتی مەحەممەد، ئایینی فەرمی مەسیحییەت وەکو ئامرازێکی فشار و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتداران، شێوەیەکی بە خۆوە گرتبوو کە لەگەڵ گەوهەرەکەی خۆیدا ناکۆك بوو. ئیتر ئومێدی جەماوەر نییە و وەکو ئامرازێکی هاڕین بەکار دەهێنرێت. ئیتر باوەڕی کۆنی چاوەڕوانکردنی فریادڕەس (مەسیح) هەروەکو لە تەوراتی پیرۆزیشدا هاتووە کەوتۆتە نێو رەوشێك بە دوای مەسیحی نوێ، واتە بە دوای پێغەمبەری خۆیدا دەگەڕێ. دیاردەکانی ئەو زیاد بوونە، کە پێغەمبەری نوێ لە کوێ و کەی دەردەکەوێ، هەر رۆژە و نیشانەی نوێ دەردەخات و گفتوگۆی دەرهەق دەکرێت.

بەرزبوونەوەی مانی لە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ـ پارس هەر لەسەرەتاوە لەلایەن ئەو راهیبانەوە دووچاری کوشتن دێت کە زەردەشتییەتیان دووچاری موحافەزەکاری کردووە و بەرامبەر بە هەر نوێخوازییەکەوە ئیمپراتۆرییەتیان بێ هەناسە هێشتۆتەوە. ئیتر زەردەشتایەتی لە ئامرازێکی موحافەزەکاری و قاڵب بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکەی نەماوە. هەروەها لەو پەڕی رۆژهەڵاتیشەوە شارستانییەتی چین و هیند لە ناوەوە دووچاری تەنگەتاوی هاتوون، دەرەبەگایەتی بە ئێشەوە پێشدەکەوێت. هەروەکو دوا قۆناخەکانی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور، مرۆڤایەتی لە تەریقەتە نهێنی و بەربڵاوەکانی سۆفیگەرایی بە دوای رزگاری خۆیدا دەگەڕێت. ئەم لقە سۆفیگەراییانەی نیو ئایینی، نیو فەلسەفی وەکو تاکە ڕێگای ئازادی مرۆڤایەتی لەسەر پێیان ماون. بەڵام چەندەی دەکات نابێت بە لێشاوێکی سەرەکی رزگار بوون. لە گۆم و بەنداوی بچووکەوە ناتوانێ بەرەو رووبارێکی سەرەکی رێ بگرێتە بەر.

شانس و لایەنێکی باشی ئەم شارانە ئەوەیە کە بە گوێرەی هەر سێ ئیمپراتۆرییەتیش وەکو دەورووبەر وایە. هیچ یەکێك لەم ئیمپراتۆرییەتانە بە تەواوی ئەو ناوچەیەی نەخستۆتە ناو سنوورەکانی خۆیەوە. هەروەکو بڵێی بیابان رۆڵی دەریایەکی سروشتی خۆپاراستن دەبینێ. هیچ سیستەمێکی سوپا ناتوانێ خۆی بەرامبەر هێزی تیرە عەرەبەکان رابگرێت کە خاوەن شمشێری ئاسنینن و ئەسپی بازدانن. لێرەدا شمشێر و ئەسپ رۆڵێکی ستراتیژی دەبینن. کاتێك رۆڵی گرنگی حوشتر کە وەکو کەشتییەکی بیابان وایە لەگەڵ ئەسپەکانی غاردان و شمشێرەکانی عەرەب و هێزی سروشتی بیابان بۆ خۆپاراستن ببن بە یەك، سەرەکیترین هەلومەرجەکانی قۆناخی ستراتیژی مێژوو پێدەگات. لەگەڵ ئەوەی هەر سێ ئیمپراتۆرییەت بۆ چەندین جار هێرشیان تاوەکو مەککە هاتووە، بەڵام لە ئەنجامی ئەو زیانە گەورانەی بەریان کەوتووە ناچاری پاشەکشێ بوون. شتێکی ئەوتۆ لە ئارادا نییە کە سوپایەکی نیزامی بتوانێ لە ژێر ئەم هەلومەرج و رەوشەی جوگرافیادا بیکات. لە سورەتێکدا دەرباز دەبێت: باڵندەکانی ئەبابل سوپای حەبەشییەکانیان بەرد باران کردووە، لە راستیدا ئەم چیرۆکە گێرانەوەی ئایینی شەڕی هێزەکانی تیرەیە کە لەمیانەی ئەسپ و شمێرەوە ئەنجامیانداوە. لە کاتێکدا بازرگانی نێوان هەر سێ ئیمپراتۆرییەت ڕێگا لەپێش دەوڵەمەند بوونێکی نائاسایی دەکاتەوە، بە گوێرەی هەلومەرجی بیابان و لەمیانەی ئەسپ و شمشێرەوە شێوازێکی شەڕی گەریلایی نوێ دەردەکەوێت و بە شێوەیەکی نائاسایی هەلومەرجەکانی سەرکەوتن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بەرگەگرتنی گەریلاکانی بیابانی مەزن زۆر ئاستەمە، ئینجا چی ئەمە هی کۆن بێت یاخود ئەوەی لە رۆژگاری ئەمرۆمان دژی رژێمەکانی مەغریب، جەزایر و سۆدان پەیرەو دەکرێت.

شێوازێکی هاوشێوەی ئەم گەریلایانەی بیابان لە مێژوودا لە بیابانەکانی مەغۆلیا و تورکمانستان سەرچاوە دەگرێت و ڕێگا لەپێش بەهێزترین هەڵمەتی بڵاوبوونەوە دەکاتەوە. ئاریانیەکان پشت بە زنجیرە و سیستەمی چیای زاگرۆی ـ تۆرۆس؛ ئەڵمان و سلاڤەکانیش پشت بە کوێستان و دارستانەکانی باکوور دەبەستن بۆ خۆپاراستن و ڕێچکە و شێوازەکانی هێرش بەرامبەر بە ناوەندەکانی شارستانییەت. هەروەکو دەزانرێ لە ساڵانی ۳۰۰۰ پ.ز بەو لاوە لە نیمچە دورگەی عەرەبستان کە دەکەوێتە نێوان شارستانییەتەکانی دۆڵی نیل و رافیدێن هەلومەرجێکی هاوشێوە پێکهاتووە. هەلومەرجەکانی بازرگانی کە لە ناوچەکانی نێوان ناوەندەکانی شاری دۆڵی رافیدێن و نیل و گوندە بەرهەمدارەکانی گوندەکانی نئۆلیتیکی باکوور جێگای خۆی دەگرێت، تیرە سامیەکانی بە وەرچەرخاندا تێپەڕ کردووە؛ کردوویەتی بەهێزێکی پاراستن و هێرش بردن. بەردەوام و بە شێوەیەکی بەرفراوان تاڵانکاری دەکەن، کاتێك هێزەکەیان تێر بکات و بۆیان بلوێ، لە شوێنی جێگیر نیشتەجێ دەبن، ئەگەرنا بەرەو قوڵایی بیابانەکان رادەکەن و خۆیان دەپارێزن.

بە باپیرە بوونی ئیبراهیم ئەم داب و نەریتەی گەیاندۆتە ئاستی هەرە بڵند، کردوویەتی بە خاوەن ناسنامە و کەسایەتی، پێبەپێ کردوویەتی بە هێزێکی تایبەتی شارستانییەت. لەو قۆناخانەی هێشتا نەببوون بە خاوەنی هێزی شمشێر و ئەسپ، توانیویانە ئەم کاریگەرییە لە ڕێگای هێزی حوشترەوە ئەنجام بدەن. لە ساڵانی ۱۰۰۰ پ.ز کاتێك چەکی ئاسنین دەکەوێتە گەڕ، ئەم داب و نەریتە بەکاریگەر دەبێت و یەکەمین پادشایەتی عیبرانی ئاوا دەکرێت. هێرشکردنی میسر و بابلیەکان و دواتریش ئاشووریەکان و پارس و رۆماییەکان بۆ سەر مۆڵگە

نوێکانی شارستانییەت و هەندێ جاریش سەرکوت کردنیان بە شێوەیەکی بێ ڕەحمانە و ریشەکێش کردنیان لەخۆڕا و بێ هۆکار نییە. چونکە ئەوەی بە رادەیەکی هەرە زێدە ئەم ناوەندانەی شارستانییەت تەنگەتاو دەکات، هێرشی ئەم تیرانەی بیابان و توانستی پێکهێنانی ئەلتەرناتیفێکی نوێیانە. هەربۆیە دەبینین داب و نەریتی ئەم تیرانە رۆڵێکی سەرەکیان لە کۆتایی هاتنی سۆمەر و میسر هەبووە، تەنانەت لەمیانەی عیساوە رۆڵێکی سەرەکیان لە هەڵوەشانەوە و کۆتایی هێنان بە ئیمپراتۆرییەتی رۆمای شکۆداردا بینی. سەردەمی حەزرەتی مەحەمەدیش قۆناخی گەیشتنە لوتکەی ئەم داب و نەریتەیە، لەژێر هەلومەرجێکی نوێدا وەکو لافاو تەقیەوە و ئامادەکاری شارستانییەتێك و بەرزبوونەوەی شکۆمەندانەی دەرەبەگایەتی کردەوە کە تاکو رۆژگاری ئەمرۆشمان کاریگەریەکەی بەردەوامە.

٢ ـ لەژێر کاریگەری هەلومەرجی ئەو قۆناخەی بە پوختی ئاماژەمان پێکرد کەسایەتی حەزرەتی مەحەمەد پێشکەوتنێکی پڕ لە ناکۆکی بە خۆیەوە دەبینێ. کولتووری هەر سێ ئیمپراتۆرییەتی بڵاوبوونەتەوە، زۆر لە کولتووری تیرە عەرەبەکان پێشکەوتووترە. کەلێن و جیاوازییەکی یەکجار مەزنیان لە نێواندا هەیە. تەوتەمی تیرەکانی لە شێوەی پەنتائۆن لە کەعبە کۆبوونەتەوە تایبەتمەندێتی هێزبەخشینیان نەماوە. هەرچەندە چەندێکی لە جۆری لات، مەنات، عوززا وەکو گەورەترینیان رێزیان لێدەگیردرێ و نوێنەرایەتی تیرە بە شان و شکۆکان دەکات، وەلێ زۆر لەوە دوورن ئیلهام بەخشی شارستانییەتێکی نوێ بن، بە پێچەوانەوە بەهۆی ئەوانەوە پێبەپێ، هزرە نوێ و تەریقەتە سۆفیگەرییەکان قەدەخە دەکرێن. ئەو هزر و دەزگایانە بەسەر پێکهاتەکانی سەرخاندا زاڵن کە موحافەزەکارێتی تیرەگەرێتی بە بنەما دەگرن. هەر کەس لەمیانەی تیرەکەیەوە پەسنی دەدرێت و باسی دەکرێت. ژنان بە نەزان و بچووك دەبینرێن، کیژۆڵەکان زیندە بە چاڵ دەکرێن و رووبەڕووی مردن بەجێ دەهێڵدرێن.

کاروانە بازرگانییەکانی نێوان مەککە ـ شام گرنگی و رۆڵێکی مەزنی هەیە لەپێگەیشتنی هزری حەزرەتی مەحەمەد. هەروەکو دەزانرێ بە زۆری گوێڕایەڵی راهیبە نەستۆرییەکانی کردووە و گفتوگۆی لەگەڵدا کردوون. باوەڕی پێهێنان و متمانەکردنی خەدیجە و خۆشەویستی و مێردپێکردنی گرنگی و رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە لەوەی سەبارەت بە ژن بگات بە هزر و بۆچوونێکی باش. ئەگەر خەدیجە نەبێت ناشێ مەحەمەد  ببێت بە پێغەمبەر. ئەگەر بە شێوەیەکی شاراوە و دەمامك کراویش بێت، بە گوێرەی مەریەم خاوەنی کاریگەرییەکی زۆر مەزنترە و لە رەوشێکی وەها دایە کە نوێنەرایەتی کولتووری خوداوەندی ژن دەکات. بەهۆی باڵادەستی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پیاوسالارییە، کە لە مێژووی ئیسلامییەتدا بە شێوەیەکی پێویست و شایستە باس لە رۆڵی خەدیجە نەکراوە. ئەمە ئاشکرایە یەکەمین کەسی لە مەککە پشتگیری لە حەزرەتی مەحەمەد کرد خەدیجە بوو. بە تەمەنیش لە مەحەمەد گەورەتر و تا رادەیەك بەهێز و دەوڵەمەندە دەتوانێ ببێ بە خاوەنی کاروانە بازرگانییەکان. بێگومان ئەم رەوشەی خەدیجە لەناوکۆمەڵگای مەککەی پیاو سالاریدا وەکو ناکۆکییەکی جددی و مەزن وایە، چونکە ژن بە گێل و نەزان و بچووك دەبینن و کیژۆڵەکان بە زیندوویی زیندە بە چاڵ دەکەن. بە گوێرەی ئەوەی بە تەنیا ناتوانێ بەرگە و بەرەنگاری ئەم کۆمەڵگا هۆڤە بێتەوە، ئەوا پەیوەندییەکانی لەگەڵ مەحەمەد و مێرد پێکردنی زۆر واتادارە. لە خۆشەویستی بەولاوە بەرامبەر بە کۆمەڵگای فەرمی مەککە وەکو یەکەمین چەکەرەی تۆوی سیاسی و ئایدیۆلۆژی وایە. تاوەکو مردنی نەهێنان و نەخواستنی ژنێکی دیکە لەلایەن مەحەمەد، جگە لە رێز گرتن، گرێدراوی هێزی ماددی و مەعنەوی خەدیجەیە. وەکو یەکەمین کەسی کە پێغەمبەرایەتی مەحەمەد پەسند کردووە، رۆڵی لەم پێکهاتنەدا ئاشکرایە و بەرچاوە.

دواتر ئەوانەی بۆ یەکەمین جار وەکو یەکەمین کەس باوەڕی بە حەزرەتی مەحەمەد دێنن ئامۆزاکەی، حەزرەتی عەلی یە کە هێشتا منداڵە و کۆیلەکەیەتی (زەید). ئەم تابلۆیە بە شێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕێتی ئەم گروپە نیشاندەدات. لە کاتێکدا لە کەسایەتی عەلی دا پەیوەندییەکانی تیرەگەرێتی بە شێوازێکی شۆڕشگێڕێتی پارچە دەکات، لە کەسایەتی زەیدیشدا کۆیلایەتی دەبەخشێ و لەمیانەی شۆڕشەوە کۆتایی پێدێنێت. لە راستیدا لەم سێیانیەدا هەرچەندە بە شێوەیەکی سەرەتاییش بێت سێ شۆڕش ئەنجام دەدرێت. لەمیانەی پەیوەندی لەگەڵ خەدیجە شۆڕشی ژن، لە رێگای پەیوەندی "عەلی" شەوە شۆڕشی تیرە و لە رێگای زەیدەوە شۆڕش بەرامبەر کۆیلایەتی ئەنجام دەدرێت. هەر لەبەر ئەوەی ژیانێکی هاوبەش و کۆمەڵکارییان ئاواکردووە، شێوازێکی شۆڕشگێری  بەسەر ژیانیاندا زاڵە. لەسەر ئەم بنەمایە مەزنبوونی گروپ مانیفێستۆی ئایدۆلۆژی دەکات بە ناچارییەك. بەرلەوەی مەحەمەد ببێت بە پێغەمبەر ماوەیەکی درێژ مانەوە و هاتوچۆی بۆ ئەشکەوتی (حەرا) قۆناخی فوولبونەوەی ئایدیۆلۆژییە. لە تەواوی قەڵەمبازەکانی پێغەمبەرایەتیدا قۆناخی هاوشێوەی ئەمە تێپەربووە. لە تەوراتدا بە درێژایی باس لە ئەم قۆناخەی حەزرەتی موسا دەکرێت کە لە چیاکانی سینا بە سەری بردووە.

لە تەمەنی چلساڵیدا هاتنە خوارەوەی سروش (وەحی) پێغەمبەرایەتی بۆ حەزرەتی مەحەمەد، لە راستیدا بە واتای راگەیاندنی قاڵبوونەوەی شۆڕشگێڕێتی نوێ و دەرباز بوون بۆ قۆناخی تێکۆشانی ئاشکرا دێت. لە لایەنێکەوە بە واتای راگەیاندنی رەوا بوون و زاڵ بوونی دێت لە مەککە. لە قاڵبوونەوەی ئایدیۆلۆژییەوە هەنگاو هاوێشتنە بەرەو بە سیاسی بوون. وەحیەکانی ئەم سەردەمە زیاتر گرێداوی بنەماکانی باوەڕی و ئەخلاقە. واتە تیۆری شۆڕش پێشدەخرێ. پرەنسیپەکانی دەستنیشان دەکرێت. کاتێك مەترسی پێبەپێ مەزن دەبێ و کۆمەڵگای فەرمی مەککە دەخاتە نێو جموجۆڵەوە، کوشتن دەبێتە مەسەلەیەکی ئان و سات.

دوای ئەوەی شاری تایف بە شوێنێکی گونجاو نابینێ کە لە ئەنجامی بازرگانییەوە زۆر دەوڵەمەند بوونە، مەدینە وەکو تاکە بژارێك دەبینێ و مەحەمەد لە تەمەنی ٥٢ ساڵیدا لە ساڵی ٦٢٢ی زایینی کۆچ دەکات. مێژوو ئاماژە بەوە دەکات ئەگەر بێتو حەزرەتی عیسا لە خاچ نەدرابایە، مەسیحییەت لە تەریقەتێکی سۆفیگەرایی ئاسایی بەدواوە تێپەڕی نەدەکرد. سەبارەت بە کۆچی حەزرەتی مەحەمەد بۆ مەدینە دەتوانرێ هەمان شت بگوترێ. ئەگەر بێتو کۆچ نەبوایە بە ناچارییەك، دەمارگیری و پاشڤەرۆیەتیەکی دژوار بەرامبەری نیشان نەدرابایە، لەوانەیە وەکو گروپێکی سۆفیگەرایی بمابایەوە. بەڵام ئەمە راستینەیەکی زانراوە کاتێك هەلومەرج رەخسا و یاسای کارتێکردن ـ کاردانەوە کەوتە گەڕ، تەنانەت بچووکترین و سادەترین گروپیش رێگا لەپێش گەورەترین هەڵمەتی مێژوویی دەکەنەوە. قۆناخی مەدینە قۆناخی بە سەربازی بوون و سیاسی بوونە. ئایەتەکان زیاتر سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهێنانی سیستەمی سیاسی نوێیە. لە مەدینەدا پەیمانێکی نوێی کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی شار پێکدێت. بەڵام قۆناخ وەکو چاخی بەرە بەیانی شارستانییەتی سۆمەر و میسر نییە. لە تەنیشت سەریانەوە بازرگانییەکی پێشکەوتووی ناوەندی ئیمپراتۆرییەتە جیاوازەکان لە ئارادایە. بە دەوڵەت بوونێکی خێرا و مەزن بوون بە سەر دەوڵەتەکانی دیکەدا، ناچارییەکە. ئەوە مەسەلەیەکی مان و نەمانە. چاو تێبڕینی تیرەکانی بیابان بۆ ناوەندەکانی شارستانییەتی دەورووبەر و رەوشی نەدارییان، دەبێتە هۆکاری ئەوەی قەڵەمبازی ئایدیۆلۆژی حەزرەتی مەحەمەد و رێککەوتنی کە لە مەدینە ئاوای کردووە بە شێوەیەکی ئاوارتە سەرنج راکێش بێت؛ ئەمەش رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە جارێکی دیکە مێژوو بڵێ "**بەندەکەم هەنگاو بهاوێژە، رێگات کراوەیە.**"

لەگەڵ گەیشتن بە کۆچی دوایی حەزرەتی مەحەمەد، سیستەمی دەوڵەتیش بونیاد نرا بوو. لە نزیکەوە دەستنیشان کردن و بینینی تایبەتمەندێتیە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو پێکهاتەیەی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەرکەوت و تا رادەیەك کاریگەری لەسەر مێژوو کردووە کە تا ئێستاش درێژەی هەیە، گرنگییەکی مەزن لە خۆوە دەگرێت.

١ ـ لە ئاستی ناسنامەی ئایدیۆلۆژیدا، سێیەمین شێوەی مەزنی میتۆلۆژیای سۆمەرە کە بە وەرچەرخاندا تێپەڕیوە. لە خوێندنەوە و شیکردنەوەی دوا تاتە قورینەکاندا بە شێوەیەکی ئاشکرا روون بۆتەوە کە سەرچاوەکەی بۆ میتۆلۆژیای سۆمەر دەگەڕێتەوە. لەلایەن بابلیەکانەوە بە یەکەمین وەرچەرخاندا تێپەڕی، لەلایەن عیبرانیەکانەوە بە دووەمین، لەلایەن دوا نەوەکانی ئەم داب و نەریتە، واتە لەلایەن عەرەبەکانیشەوە لەمیانەی سێیەمین وەرچەرخانەوە بە لێهاتوو و تۆکمەترین شێوە گەیشتووە. بە پێی پێویست روون کردنەوەمان سەبارەت بە سەرچاوە و وەرچەرخانی یەکەم و دووەم پێشخست و ئەنجام دا. بۆ ئەوەی زۆر بە باشی لە سێیەمین وەرچەرخان تێبگەین، پێویست دەکات بەردەوام ئەم سەرچاوە و وەرچەرخانانە لەبەرچاوان بگیردرێت. لێرەدا ئامانجمان نە بچووك کردنەوەی گرنگی و بایەخی قورئانە، نە ئەوەیە کە هەروەکو چۆن پێ لەبەفر دەکرێ، بەها هزری و ئەخلاقییەکان بن پێ بخەین و ئەو دۆگمایانەی کە رزاندن لەگەڵ خۆیان دێنن، وەکو پێشکەوتنێکی ئایینی ئاسایی نیشان بدەین. بە پێچەوانەوە نیشاندانی هەڵوێستێکی راستی (کۆمەڵناسی) سۆسیۆلۆژیانە بەرامبەر بە

قورئان و ئاشکراکردنی ئەوەی کە دۆگما و قاڵبەکانی ئیسلام لەپێناو کام بەرژەوەندی نەفرین لێکراو کراوە بە دەمامك، ئەرکە زانستیە سەرەکیەکانمانە. کاتێك رۆشنگەری ئیسلامییەت و رۆژهەڵاتی ناوین بە شێوەی پێویست و تەواو لە جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکەیدا سەرکەوتوو بێت، ئەوا ئەنجامگیر دەبێت. نابێ هیچ کاتێك لەبیربکەین کە تاوەکو ئەو شەوەزەنگ و تاریکاییە رۆشن نەکرێتەوە کە تێیدا دەژین، نەدەتوانرێ بە شێوەیەکی راست ئەو هێزە شارستانیانەی لە ئارادان پێناسە بکرێن، نە دەتوانرێ پێداوێستییەکانی رۆڵی سەرکەوتووانەی شارستانی بوون جێبەجێ بکرێت.

دەستپێکردنی گفتوگۆیەکی ئایدیۆلۆژی سەبارەت بە ئیسلامییەت لە رێی پرسیارێکی وەکو "باوەڕیت بە هەبوون و تاکانەیی خودا هەیە؟" ئەمە هەڵپەرستانەترین و "چەواشەکارترین" نزیکبوونەوەیە و بە واتای بەکارهێنانی رێچکەی تەواوی چەنەبازەکانی چاخەکانی دێرین و ناوین دێت. بەداخەوە بە سەدان ساڵە ئیلاهییات و فەلسەفە لەمیانەی ئەم شێواز و رێچکە چەنەبازیانە راکێشی ناو مشتومڕێکی زۆر بێ سوود و بێ واتا کراون. تا ئاستێکی مەزن هێزێکی مەزنی زانیاری لەم رێگایەدا بە فیرۆچووە و چەندین گیان سەندراوە، مرۆڤ بە ئەشکەنجەدا دەرباز بووە، ئاخێنراوەتە زیندان، لە ئەنجامیشدا هێندەی دەنکە هەنجیرێك سوودی نەبووە و بێ ئاکام بووە. لە راستیدا سوقرات لە یەکەمین گفتوگۆکانی کە لەگەڵ ئەم چەنەبازانە ئەنجامی دا، هەستی بەمەترسی ئەم شێوە گفتوگۆیانە کردبوو، هەربۆیە تەواوی ژیانی خۆی خستە نێو مەترسی و خواستی پێشی لێبگرێت. بەردەوام گوتویەتی؛ گەوهەرەکەی بزانە! گفتوگۆی بێ سوود و بێمانا بایەخی نییە، گرنگ، زانینی گەوهەری مەسەلەکانە، لە جیاتی گفتوگۆی لە جۆری دارتاش هەیە، یاخود نە؟ باشە یان خراپە، بە گوێرەی ئەو گرنگی لێرەدایە کە وەڵامێکی راست بدرێتەوە کە چۆن باشترین دارتاشی دەکرێت؟ لە کاتێکدا یەکەمیان شێوازی هەڵپەرستانەی چەنەبازەکانە، دووەمیان هی فەیلەسوفە راستەقینەکانە، شێواز و رێچکەی زانا و فەیلەسوفەکانە.

کەواتە مەبەست چییە لە هەبوون و یەکبوونی خودا کە قەڵەمبازی سەرەکی ئیسلامییەتە؟ وەکو بەرهەمی کام پێشکەوتنی مێژوویی و کۆمەڵایەتی رووبەڕوومان بۆتەوە؟ ئامانجە کرداریەکەی چییە؟ ئەمانە سەرەکیترین و ریشەیی ترین پرسیارن کە پێویستیان بە رۆشن کردنەوە هەیە.

بەر لەوەی جارێکی دیکە باس لە چۆنیەتی پێشکەوتنی زاراوەی خودا "الله" بکەین، دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە پێناسەکانی لە جۆری یەکەمین هۆکاری پێشکەوتن، دامەزرێنەر و خاوەنی گەردوون، زێدە واتادار نابینم، کە بەردەوام زانستی خوداناسی و فەلسەفە باسی دەکەن. ئەمانە پێناسەی نزیك بە سۆفیگەراییىن. تەنانەت ئەمەش بێ مانا دەبینم، کە لە کوێی ئەم باوەڕی و گفتوگۆیانە جێگای خۆمان دەگرین، ئایا لەگەڵ ئەوەی کە دەڵێ خودا هەیە و تاکە یاخود پێچەوانەکەی، یاخود لایەنی هزری خوڵقێنەر و دامەزرێنەر و خاوەنە، یان پێچەوانەکەی. لەبەر ئەوە لەسەرەتادا ئاماژە بەم لایەنانە دەکەم، هەروەکو لە مێژووی رابردوودا رووی داوە، ئەوا پاشفەڕۆیەتی رۆژگاری ئەمڕۆشمان بە گوێرەی بەرژەوەندییە سیاسییە کرداریەکانیەوە، ئایین دژ بە رۆشنگەری بەکاردێنێ و دەخوازێ لەمیانەی فێڵ بازی و ئەم شێوازە چەنەبازیانە، ئەنجام بەدەست بێنێ. لە تورکیا و زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەبینرێ کە پاشفەڕۆیەتی لەمیانەی بەکارهێنانی ئەم رێچکەیە بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەدیدێنن و دەپارێزن، بەمجۆرە چەوسانەوە و بەکارهێنانێکی (استسمار)ێکی مەترسیدار بەڕێوە دەچێت. بەر لە هەموو شتێك ئاماژە بەوە دەکەم لەوانەیە لە داهاتوودا ئەم هەڵسەنگاندنانەم (**أستسمار**) بکەن و بخوازن بە خراپی بەکاری بێنن. زاراوەی "الله" خودا کە لەگەڵ کۆمەڵگادا پێشکەوتووە لە کۆمەڵگای سەردەمی زانیاریشدا درێژە بە هەبوونی خۆی دەدات. پێویستە درێژەشی پێبدات. بەڵام ئیتر ئەو، ناوێکی ئەو تاك یاساییەی کۆمەڵگا و پێشکەوتنە. چەندە بە چاکی ئەم یاسایە بناسین، بەو ئەندازەیە ناوەکەی واتە "الله" خودا بە راستی دەناسین و دەرکی پێدەکەین. تەواوی پێناسە و گفتوگۆکانی دەرەوەی ئەمە زۆرتر چەنەبازییە. لە بناخەی خۆیدا بە واتای شاردنەوەی نەزانی و پاشفەڕۆیەتی و پاراستنی سیستەمی چەوساندنەوە و جیهانی بەرژەوەندی زۆردارانە و ترس دێت.

لەژێر رۆشنایی ئەم هەڵوەستەیەدا هەوڵ دەدەین زاراوەی خودا "الله" لەمیانەی رێچکەکانی کۆمەڵناسییەوە شیبکەینەوە، نەك لە رێگای رەوتەکانی فەلسەفە و ئیلاهییات. وەکو ناسنامەیەکی ئایینی کە لەمیانەی کۆمەڵگاوە هەبوونی هەیە و دەرکەوتووە، هەوڵ دەدەین ئەوە پێناسە بکەین کە وەکو وەڵامی کامە پێویستی کۆمەڵگا دەرکەوتووە و پێشکەوتووە و وەرچەرخانی بە خۆیەوە بینیوە.

تەواوی دیاردە و نیشانەکان ئاماژە بەوە دەکەن حەزرەتی مەحەمەد بە درێژایی تەمەنی خۆی سەبارەت بە زاراوەی خودا "الله" قاڵبۆتەوە. ئەو کێشەیەی بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن پێیەوە خەریك بووە، روون کردنەوەی هەبوونی خودا و ناسنامەی یەکبوونە. لەمیانەی هەوڵە چڕوپڕەکەی و گەڕانی بە دوای وەڵامدا روون دەبێتەوە کە ئەمە کێشەیەکی دروست کراو نییە و وەکو زاراوەیەك رۆڵی کلیل دەبینێ و هەوڵدەدرێت سەرلەنوێ ناوەڕۆکەکەی پێناسە بکرێتەوە. بەخشینی نەوەدونۆ تایبەتمەندێتی (سیفەت)، ئەوە نیشاندەدات کە هەوڵدراوە لە بواری ناوەڕۆك و چۆنایەتیەوە قەڵەمبازێك ئەنجامبدرێت. بەردەوام زاراوەی خودا "ئەڵڵا" لەژێر سایەی رووخساری نوێ وزەی پێدەدرێت. بۆ ئەوەی باشتر لەو کار و خەباتە تێبگەین، ئەوا بەراوردکردنی لەگەڵ ئەو بەهایانەی کە زاراوەکانی سۆسیالیزم و لیبرالیزم لە خۆیانەوە دەگرن، گەلێك وانە و ئەزموونی گرنگی لێ هەڵدەهێنجرێت. کاتێك لە ئەنجامی وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگادا ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پەرەی پێدەدرێت، ئەوا ئەو زاراوانەی رۆڵی کلیل دەبینن لەمیانەی بەهای بەمجۆرە دەوڵەمەند و بەهێز دەکرێت.

هەروەکو دەزانرێ لە ساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز بە دواوە تیرەکانی نیمچە دورگەی عەرەبستان هەوڵیانداوە مەزنترین هێزی خودایی "EL ئەل" (ئەل ـ رۆح) وەکو ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی پەسند بکەن. زاراوە، لە ئەنجامی گۆڕانکارییەکانی پێکهاتەکانی ناواخنی تیرەکان، هەروەها لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیانە هاتۆتە ئاراوە و پێشکەوتووە کە لەگەڵ کۆمەڵەکانی دەرەوە، بە تایبەتیش لەگەڵ شارستانییەتی هەڵکشاوی سۆمەر و میسر، ئەنجامی داوە. کاتێك تەوتەمە، کە هەبوونێکی نیو خودایی قۆناخە پاشکەوتووەکانی تیرەیە، کەوتە ناو رەوشێکەوە کە تێر نەکات و نەتوانێ وەڵامی گۆڕانکارییە نوێکان بداتەوە، ئەوا خوداوەند "ئەل EL" لە هزردا جێگیر دەبێت، کە جیاوازترە و لە ئاسمان وەستاوە. بێگومان سیستەمی ئاسمانی راهیبەکانی میسر و سۆمەر و زاراوەکانی خوداوەندی مەزن و نەگۆڕی کە لەسەر بنەمای ئەم سیستەمە پێشیان خست، رۆڵێکی دیاریکراوی لەمەدا بینیوە. پێکهاتەی داتاشراو و یەك ئاستی تیرەکان، چۆنیەکی جوگرافیا و سیستەمی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی لەگەڵ ناوەندەکانی شارستانییەت، ئەوە دەکەن بە ناچارییەك کە "ئەل" وەکو زاراوەی تاك و یەکبوون پێشکەوێت. بە شێوەیەکی بەرفراوان هەوڵماندا ئەوە روون بکەینەوە کە تایبەتمەندێتی داب و نەریتی ئیبراهیم ئەمە بوو.

ئەو واتایەی موسا بۆ ئەم زاراوەیەی زیاد کرد هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوەی بردووە. هەروەکو بڵێی ئەلی کردووە بە موڵکێکی میللی، خودایەکی میللی. زاراوەی "ئیسرائیل" لای تیرە عیبرانیەکان بە واتای زۆرانبازی لەگەڵ ئەلی خوداوەند دێت. بە تەنیا ووشەی ئیسرائیل سەلمێنەری ئەوەیە کە خواستویانە نزیکایەتییەکی تایبەت ئاوا بکەن. دواتر لەمیانەی راهیب ساول کە داود دەکات بە پادشا، بەمجۆرە لە رێگای داود و کورەکەی سولەیمان دەبن بە خاوەنی هێزێکی سیاسی ناوەندی و ئەو زاراوە فەرمی دەبێت. ئیتر ناوی ئەل بە زمانی عیبرانی بۆ خوداوەندی فەرمی "ئەلۆهیم" دەگۆڕدرێت. شتێکی زۆر ئاشکرایە کە ئەلۆهیم دەبێتە ناوی نوێ و گوزارشتی هەبوونی کۆمەڵگای ئیسرائیل کە بەواتای قەومی عیبرانی سیاسی وخاوەن میرنشین دێت. ئەمەش گوزارشتی بەرجەستەی هزری کۆمەڵگای وەرچەرخاو و زاراوەی ناسنامە ئایدۆلۆژیەکەیەتی. رووبەڕووی نمونەیەکی وەها خوڵقێنەری سەرنج راکێش و مێژوویین کە هێز لە زاراوەکان وەردەگرێت و لەمیانەی بەهێز بوونیش، بەزاراوەی نوێتر دەگات. ئەگەر ئەمە بێنینە بەرچاوان کە خودای ئیسرائیل تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان رێگای لەپێش کام شەڕ، داهێنان، نوێبوونەوە و هزر، کردۆتەوە، ئەوا باشتر دەرك بەوە دەکرێت کە تابلۆیەکی چەندە سەیرە.

داب و نەریتی مەسیحییەت کە لەگەڵ دەرکەوتنی عیساوە پێشکەوت لە گەوهەری خۆیدا وەکو گوزارشتی دابڕانی توێژە هەژارەکانی داب و نەریتی فەرمی عیبرانیەکان سەرهەڵدەدات. لەئاکامی جیابوونەوەی کۆمەڵایەتی و لەخۆوەگرتنی شرۆڤەیەك بەناوی چەوساوەکان، ئەم نەریتە دەبێتە ناسنامەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژی"ئینجیل"، کە دەبێتە ئومێدی چەرخی نوێ و ئیرادەی رزگاری، وەکو شێوازی ئەخلاق و باوەڕی شێوە دەگرێت.

کاتێك عیسا لە زمانی ئاشوورییەوە بۆ زمانی قۆناخ هەنگاوی هاوێشت و بە ئارامی قسەی کرد ئەلۆهیمیش ناوی گۆڕا و بوو بە رەب. ئەلۆهیم بووە بە رەب. واتای وشەش "ئەفەندی" یە دێت. ئاشکرایە کە نوێنەرایەتی چینی ژوور دەکات. کاتێك ئەو مرۆڤانەی کەوتونەتە رەوشی خزمەتکاری بە"بەندە" ناو بران، ئاشکرایە لێرەدا مەبەست چینی چەوساوە و ستەم لێکراوە.

زۆر چاك دەزانرێ کە عیسا تایبەتمەندێتی بەخشندەیی، رزگاری، لێبوردن، چاکە، برایەتی، ئاشتی دادوەری و خۆشەویستی کردۆتە موڵکی زاراوەی خودای لایەنگری چەوساوەکان. رەب کە ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی نوێی کۆمەڵەی چەوساوەکانە، لەمیانەی ئەم زاراوانە بەهێز دەکرێت و دەبێتە سەرچاوەی هێزی هەڵمەتی نوێی مێژوویی و کۆگای وزە. وەکو منداڵ و نەوەکانی رەب سەرەتا عیسای کوڕی، مەسیحییەکان کۆمەڵەیەکی نوێی پیرۆزکراون. رەبەکەیان (خوداکەیان) لە نێو سەختترین هەلومەرجدا دەیانپارێزێت و هاوکاری و یارمەتی خۆی کەم ناکاتەوە. لەوە بە دواوە ئاراستەی هەموو دوعاکان بەرەو ئەو (رەب)ە دەبێت. ئەویش تاوەکو بەدیهاتنی ئومێدەکانیان لەگەڵیان دەبێت. بۆ جارێکی دیکە رووبەڕووی نموونەیەکی مێژوویی بەمجۆرە دەبێتەوە کە لەمیانەی پێشخستنی زاراوە نادیارەکانی کۆمەڵگا، بەهێز بوون و پێشکەوتن و وەرچەرخان بەدیبێت. ئەمەش یەکێك لەو نموونانەیە کە دەیسەلمێنێ هێزی ئایدیۆلۆژی لەپێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دابڕاو نابێت، ئەگەر یەکێکیان نەبێت مەحاڵە ئەوی دیکەشیان پێشکەوێت، هەندێ جاریش ئایدیۆلۆژیا رۆڵی پێشەنگی و دیاریکراو دەبینێ. دواتریش لە دەسکەوتەکانی پاولەوە تاوەکو نوێخوازی پرۆتستانتەکانی بەناوی مەسیحییەت کراوە، رۆڵیان لە پێکهاتنی چاخی دەرەبەگایەتی تاوەکو کاریگەری و کاردانەوەیان لەسەر دەرکەوتنی سەرمایەداری و پێشکەوتنیان، هەنگاو بە هەنگاو دەتوانرێ تەماشای پێشکەوتن و گۆڕانکاری و وەرچەرخانەکانی مێژوو بکرێت.

بە بایەخەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەم: ئەگەر بە شێوەیەکی راست گرێدان بەو ئومێد، باوەڕی و هزرانەوە بەردەوام بکات کە لەم زاراوانە نراوە، ئەگەر بە گوێرەی پێداویستییەکانی ژیان بەڕێوە بچێت و پێشبینیەکانی پراکتیزە بکرێت، ئەگەر لەگەڵ قۆناخ و رۆژەڤدا ناکۆك نەبێت، بە پێچەوانەوە لەپێناو پێشکەوتنیدا ئاراستە بکرێت، ئەوا بەرەو پێشکەوتنی مەزن راستە رێ دەگرێت؛ بەڵام ئەگەر لە نێو رەوشێکی پێچەوانەدا بێت، خزمەت بە پاشڤەرۆیەتی و بەستەڵەکی و رووخان دەکات. بە هۆی ئەم پێشکەوتنانە شیکردنەوەی زمانی ئەم زاراوە مەزنانە بە گوێرەی ناوەڕۆکی خۆیان، بەردەوام جێگای بایەخ و گرنگی پێدانە. گرنگی و رۆڵی لە بن نەهاتووی ئایدیۆلۆگە مەزنەکان و خاوەن باوەڕییەکان سەرچاوەکەی بۆ ئەم راستینەیە دەگەڕێتەوە.

ئەو واتاو ناو و تایبەتمەندێتیانەی، حەزرەتی مەحەممەد بە رەبی (خودا)ی خۆی بەخشیوە گرنگیەکی مەزنتر لە خۆیەوە دەگرێت (رەب، زاراوەیەکی ئاشووری ـ سوریانییە، ئەللا زاراوەیەکی عیبرانییە و هەمان واتا دەبەخشێت). لە راستیدا زۆربەی زۆری زاراوەکانی داب و نەریتی عیبرانی و سوریانیەکانی پەسند کردووە، نابێ هیچ کاتێك لە بیر بکەین کە هەبوونی سۆمەر، میسر و تا رادەیەکیش ئاریانیەکان سەرچاوەی پێکهاتنی ئەم زاراوانەن. بەڵام لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە لە سەدەی پێنجەمی زایین بەدواوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گۆڕانکاریە رۆحی و هزریەی کە پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دەرەبەگایەتی رێگایان لەپێش کردۆتەوە، بە باشترین شێوە خۆ ئامادە کردن و قاڵبوونەوەیەتی. حەزرەتی مەحەممەد وەکو پێشکەوتووترین رۆح و هزری ئەو سەردەمەی تازە هەڵدەکشێ، گوزارشت لە قاڵبوونەوەیەکی ئاوارتە دەکات. لەرزین و خوێدان و ئارەق کردنی لە کاتی هەر ئایەتێك کە دەیدرکێنێ، لە راستیدا ئەوە نیشان دەدات کە لەمیانەی هەوڵ و کۆششێکی چەندە مەزن قاڵبۆتەوە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا حەزرەتی مەحەممەد بە واتای قاڵبوونەوەیەکی سەرتاسەری زاراوەکان دێت کە وەکو ناسنامەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژی شێوەی گرت و وەکو قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی بەرجەستە، بە واتای هەڵوێستەیەکی ئەخلاقی یەکپارچەیی دێت. گەورەترین شۆڕش، لە بەجێکردنی زاراوە نوێکانی لە پێکهاتەی هزری و ئیرادەی خۆیدا ئەنجام داوە. روون کردنەوەی ئایەت و سونەت بە گوێرەی ریزبەندی و گرنگی پلە یەك و دوو، دەبێ وەکو خوڵقاندنی مرۆڤ و کۆمەڵگای نوێ هەڵبسەنگێنرێت.

تەواوی پێغەمبەرەکان سەبارەت بە زاراوەی سەرەکی ئەڵڵا دەوڵەمەندیان کردووە و بەرامبەر ئەمەش بەهێز بوون و چالاکی خۆیان بەڕێوە بردووە. بازرگانی کە سەرەکیترین تایبەتمەندێتی کۆمەڵگا بووە، لێرەدا دەبێ بە لۆژیکێکی خودایی و فۆرمیلەی (چەندە بە خوداکەت بدەیت، واتە چەندە دوعا و عیبادەت و قوربانی پێشکەش بکەیت، ئەوا بە تەواوی بەرامبەرەکەی وەردەگریت) لە نێو یاسا و ئایینیشدا داڕێژراوە. نابێ هیچ کاتێك لەبیر بکرێت: کە ئایینە تاکخودایەکان بە گشتی و بە تایبەتی لەنزیکەوە گرێدراوی شێوەکانی خودایە کە پشت بە باپیرێتی حەزرەتی ئیبراهیم دەبەستێت و کۆمەڵگای بازرگانییە. بە گوێرەی کۆمەڵگای کشتوکاڵی کۆمەڵگای بازرگانی قۆناخە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵگا دەکات بە ناچارییەك و رێگا لەپێش کۆمەڵگای شار و دەوڵەت دەکاتەوە.

کاتێك پەیوەندی نێوان دەرکەوتنی دەوڵەت و بەرزبوونەوەی خوداکان بە شێوەیەکی راست دەستنیشان بکەین، ئەو کاتە باشتر دەرك بەوە دەکەین، بۆچی هەڵکەوتی قۆناخێکی پێشکەوتووی هزری هاتووە. لەمیانەی ئەم داب و نەریتەوە، بە تایبەتی گروپ و کۆمەڵە عیبرانیەکان سەراوبن بووە. تا چ رادەیەك خودای خۆیان بەهێز کردبێت، هێندە هێز بەدەست دێنن، بەهێز دەبن. فۆرمیلەیەکی تۆکمەیان دۆزیوەتەوە و رێکیان خستووە. خوداکەت چەندە بەهێز بێت، تۆش هێندە بەهێزی. خوداکە لەناو ببە، هەروەکو ئەوەیە ئەویشت لەناو بردووە. خوداکەی چەواشە بکە و بیشێوێنی، واتە ئەویشت شێواندووە و چەواشەت کردووە. کاتێك ئەنکی خودای فێڵباز و زانای کۆمەڵگای چێنایەتی سۆمەر، تەواوی بەها گەوهەرییەکانی خواوەندی ژنی سۆمەریەکان "ئینانا" و تەواوی ئەو بەهایانە دەبات، کەلە کۆمەڵگای نئۆلیتیکدا خوڵقاندوویەتی، لە راستیدا هەموو شتێکی رەگەزی ژن لەناو کۆمەڵگا دەبات و دەستی بەسەردا دەگرێ. هەربۆیە شتێکی رێکەوت و لە خۆرایی نییە کە یەکێك لە داستانە گرنگەکانی میتۆلۆژیا کە لە بیر ناکرێت، ئەو داستانەیە کە گوزارشت لە کاروانی ئینانا دەکات کە لە ئورگەوە بەرەو ئەریدۆ ئەنجامی دەدات و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە دەگەڕێتەوە و تەواوی سەد و چوار یاسایەکانی "ما" لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە. ئەمەش گێڕانەوەی ئەفسانەیی و ئایینی و ئەدەبی ئەو پەیوەندی و ناکۆکیانەی نێوان خواوەندە ژن و پیاوەکانە کە رەنگدانەوەی رەوشی ناو کۆمەڵگایە و رێگا لەپێش چ جۆرە دانوستاندن و پێکدادانێك دەکاتەوە. بەدەستی مرۆڤ نییە بەرامبەر ئەم کارە جوان و رێك و پێکەی وێژەزان و نووسەرانی سۆمەر مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ. لە راستیدا ئەمە گەوهەری ئەدەبیاتە.

حەزرەتی مەحەممەدیش لە رێی ئیسلامییەتەوە ئەو خاسییەت و تایبەتمەندییە سیاسی و سەربازییانەی شۆڕشی بە زاراوەی خودا "ئەڵڵا" بەخشیوە.

موسا زیاتر تایبەتمەندێتی دەرهەق بە پەروەردەی کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبەرایەتیەوە زیاد کردووە، گەرچی عیسا بە تایبەتمەندی ئەخلاقی لە جۆری تکا، خۆشەویستی و دادپەروەری لێ زیاد کرد. خاسییەتەکانی قەهار، حاکم و مالیك ئەو تایبەتمەندێتییە سیاسی و سەربازیانەن کە لەگەڵ ئیسلامییەتدا زیاد کراون. هەروەها ئەزەلی، ئەبەدی، ناخوڵقێنرێ، زیاتر نزیکبوون لە شا دەمار، ئەو زاراوە تیۆلۆژیانەن کە رەنگدانەوەی هزری فەلسەفی گریك بە تایبەتیش کاریگەری فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستۆیە. کاریگەرییەکی مەزنی فەلسەفە لەسەر لە دایکبوونی ئیسلامییەت هەیە. بە گوێرەی مەسیحییەت هەر لەسەردەمی دەرکەوتنی ئیسلامییەتەوە رەنگدانەوەی کاریگەری فەلسەفی بەسەریدا دەتوانرێ لەمیانەی پەیوەندی حەزرەتی مەحەممەد لەگەڵ راهیبە نەستوریەکان روون بکرێتەوە کە هەر لە زووەوە ئەمانەیان لە کڵێسەکانی یۆنان وەرگرتبوو. وەکو زەمینەی ماددی ـ بابەتیش، لەمیانەی ئاستی پەیوەندی ئاڵۆزی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگا و بڵاوبوونەوەی هزری فەلسەفی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کاریگەری لەسەر ئەوە کردووە جگە لەو ئایەتانەی کە بە باوەڕی و ئەخلاقەوە

پەیوەست دارن، قورئان ئایەتی بەمجۆرەشی تێدا بێت کە هزری فەلسەفی لە خۆوە دەگرن. لەگەڵ ئەوەی کە تەورات و ئینجیل زیاتر گەوهەرێکی ئەخلاقی و باوەڕی لە خۆ دەگرن. بەڵام پێکهاتەی هزری قورئان کە فەلسەفە لە خۆوە دەگرێ، ئاستێکی گرنگ و پڕ بایەخی هەیە.

حەزرەتی مەحەممەد ڕاگەیاندنی خۆی بە دواترین پێغەمبەری خودا بابەتێکی پڕ بایەخ و گرنگە کە پێویستی بە تاوتوێ کردن هەیە. لەلایەنی ئایینیەوە هەڵوێستێکی فەرمی ریفۆرمخوازی واتادارە. بەدەستی خۆی کۆتایی بە سەردەمی پێغەمبەرایەتی دێنێ. ئەم ڕەوشەش زۆر لەو هەڵوێستەی مارکس دەچێت کە لەمیانەی سۆسیالیزمەوە کۆتایی بە قۆناخی شارستانیەتی دەوڵەتان هێنا. هەروەکو چۆن بە بێ هەبوونی دەوڵەت کارگێری پێگەیشتووە و پێویستی بە ئاستێکی کۆمەڵگای ئاقڵمەندانە هەیە کە لە چین و توێژە بێ واتاکان ڕزگاری ببێت، ئەوا کۆمەڵگای بێ پێغەمبەرایەتی بە واتای ئەوە دێت کە گەیشتوونەتە ئاستێکی ئازادی و پێگەیشتن. ئەو کۆمەڵگایانەی لەمیانەی ئیرادەی ئازادانەی خۆیان بەهێزی کارگێری بەڕێوەبردن گەیشتوون، پێشبینی ئەوە دەکات کە ئیتر مرۆڤایەتی پێویستی بە پێغەمبەر نییە. لەم بوارەدا ئیسلامییەت بۆ خۆی کۆتایی بە سەردەمی ئایینەکان دێنێت. ڕاستتر بڵێین دواترین شێوەی پێشکەوتنی ئایینییە لە دەرباز بوون بۆ قۆناخی چاخی فەلسەفە.

گرێدانێکی زێدەڕۆیی بە شتێك، بەردەوام گومان لە ناواخنی خۆیدا دەشارێتەوە. بێ پێوانەیی نیشانەی ناڕاستییە. کاتێك ئیسلامییەت باوەڕی بە خودا تاڕادەیەکی مەزن بە هزری فەلسەفییەوە پشت ڕاست دەکات، ئەوا هەر لە خۆیەوە کەوتۆتە نێو گومان و دوودڵی. هەربۆیە حەزرەتی مەحەممەد هەوڵ و کۆششێکی یەکجار مەزنی دەرهەق بە بابەتی هەبوون و یەکبوونی خودا داوە، کە لە هیچ پێغەمبەرێکی دیکەدا نەبینراوە. لە ژماردنی تایبەتمەندێتیەکانی تاوەکو شێوازی ژیان و کارکردنی، لە تایبەتمەندێتی ئەبەدیەت و یەکجارییەوە تاوەکو دەگاتە خوڵقێنەری هەمووشتێك ، بە هەموو شێوەیەك هەڵوەستە سەبارەت بە خودا دەکات و هەوڵ دەدات پێناسەی بکات. لێرەدا ئەمە بەئەقڵی مرۆڤ دا دێت، بپرسێ: خودایەکی هێندە بلیمەت، خوڵقێنەرو دەسەڵاتدار، بۆچی بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی بە بەندەکانی خۆی ناناسێنێ و ڕوون ناکاتەوە و پەسند ناکات، هەوڵدەدات لە ڕێگای دوا پێغەمبەری خۆیەوە بە هەزارویەك بەڵاوە خۆی بسەپێنێ و پەسند بکات؟ لە ڕاستیدا ئەو وەڵامەی کە ئەم پرسیارە بە دوایدا دەگەڕێت، ئەوەی هەوڵدەدرێت ڕوون بکرێتەوە، ئەوەیە کە کۆمەڵگای نوێی چینایەتی و چاخی شارستانییەت زەحمەتی و تەنگەتاوییان لەو پێکهاتە ئاڵۆزەی شێوەی نوێی کۆمەڵگا و شارستانییەت سەرچاوەی خۆ دەگرێت. بە تایبەتیش پێکهاتەی یاسایی و سیاسی نوێ یەکێك لەو کێشە سەرەکی و ڕیشەییانەیە کە چاوەڕوانی چارەسەری دەکات. بەرامبەر بەو دەزگایەی تا دواڕادە زەحمەت و ئاستەمە کولتووری هۆز و تیرەکانی بیابان وەڵامی بدەنەوە، بۆیە شتێکی ڕوون و ئاشکرا و ئاساییە کە حەزرەتی مەحەممەد تەنگەتاو بێت و ئارەق بکات. ئەوەی بونیاد نراوە تەنیا دەوڵەت و کومەڵگایەکی نوێ نییە، بەڵکو چەرخێکە. زاراوەی خودا "ئەڵڵا" لە بەرزترین ئاستدا گوزارشت لە سەمبوڵی ئەم چاخە و ناسنامە ئایدیۆلۆژیەکەی دەکات. حەزرەتی مەحەممەد زۆر باش دەزانێ چەندە تایبەتمەندێتی واتادار بە زاراوەی ئەڵڵا ببەخشێ و لەمیانەی ئەم زاراوە هێزی فەرمان، یاسا، ڕێ و ڕەسم پێك بێنێت، ئەوا بەو ڕادەیە دەتوانێ بە سانایی کۆمەڵگای نوێ و دەوڵەت و چاخ ئاوا بکات و بەڕێوەی ببات.

ڕەوشێکی هاوشێوەی ئەو قۆناخە جێگای باسە کە ڕاهیبە سۆمەریەکان کۆمەڵگای شار و دەوڵەتیان ئافراند. بەرهەمی ئەو کۆمەڵگایەی سەرلەنوێ خۆی ڕێکخستەوە، لەبەر ئەوەی ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی بەهێز و باوەڕپێکراو، هەم هۆکار و هەم ئەنجامەکەیەتی، بۆیە ناچاری ئەوەیان دەکات میتۆلۆژیا و ئایین لە پەرستگاکاندا بەرهەم بێنن. باوەڕیان بەوە هەیە چەندە لەوەدا سەرکەوتوو بن، ئەوا کۆمەڵگای نوێش دەکەوێتە ژێر گەرەنتییەوە. هەربۆیە بەرهەم هێنانی ئایدیۆلۆژیا و بڵاوکردنەوەی وەکو گۆشت و نینۆك بە بەروبوومەوە گرێدراون و ناشێ پشت گوێ بخرێت. لە تەواوی کۆمەڵگاکاندا، وەکو ڕاستینەیەکی مێژوویی ڕابردوو و ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان وەکو ڕاستینەیەکی سەرەکی کۆمەڵگا، پەیوەندییەکی نەپچڕاو لەنێوان پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی و بەرهەمهێناندا هەیە.

هێندە داکۆکی کردنی حەزرەتی مەحەممەد لەسەر زاراوەی خودا، ئەوە نیشاندەدات دەرکی بەوە کردووە کە لە مێژووی ڕابردوودا لە ڕێگای ئەم زاراوەوە چی کراوە و خوڵقێنراوە، هەم هەستی بەوە کردووە کە چاخ و کۆمەڵگای ئایندە تا چ ڕادەیەك هێزی لێ وەردەگرن. لە ڕاستیدا بە گوێرەی سۆسیۆلۆژیا (زانستی کۆمەڵناسی) بیر دەکاتەوە. بە گرنگی و پڕ بایەخەوە ئاماژە بەوە دەکەم: لەبەر ئەوەی فەلسەفە کەوتۆتە ناو مەسەلەکەوە، بە قووڵایی هەستی بەوە کردووە ئایین تێری کۆمەڵگای نوێ ناکات و ئاقڵمەندی و تێگەیشتن دەردەکەوێتە پێش، بەمجۆرە لە نێو ناکۆکیدا دەمێنێتەوە. چونکە لەو شوێنەی فەلسەفەی لێبێت، ئایین نابێت، ئەو شوێنەی ئایینی لێبێت بە سانایی جێگای فەلسەفە نابێتەوە. لایەنێکیان قورسایی خۆی دەسەپێنێ. هەروەکو دەزانرێ لە ئەزموونی گریك و ڕۆمادا فەلسەفە دەرکەوتە پێش. لە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی، مانیش دەیخواست فەلسەفە دەرخاتە پێش. بەڵام لە دەرئەنجامدا ڕاهیبە ئایینیە موحافەزەکارەکان بە کاریگەر بوون. ئیسلامییەت هەر لەسەرەتاوە بەم مەترسییەدا تێپەڕ دەبێت. بە ناویەکدا چوونی ئایین و فەلسەفە، هۆکاری سەرەکی کەسایەتی بە گومانی حەزرەتی مەحەممەدە. کۆشش و هەوڵەکانی لەپێناو سەلماندنی هەبوون و یەکبوونی خودا لە ئاستێکدایە لە پەڕاوی هیچ کتێبی دیکەی پیرۆزدا نەبینراوە، ئەمەش سەرچاوەکەی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە بەردەوام بیری لەو پرسیارانە کردۆتەوە، ئاخۆ ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیەی دێتە ئاراوە لە ڕێی یاسای نزیك بە ئەقڵ، یاخود لەمیانەی پێکهاتە هزرییە کۆمەڵایەتیە پاشڤەڕۆکانی چاخی کۆن بەڕێوەدەچێت، کە یاسا و فەرمانڕەوایەتی ئایینی تێدا کاریگەرە و سانایی ترە. لە ئەزموونی تایبەتی خۆیدا دەرکەوتووە کە هێندە باس کردن و گرێدان بە زاراوەی خودا، لەپێناو خۆ تێرکردنێکی سادەی هزری نییە.

ئەگەر نموونەیەکی هاوچەرخ بێنینەوە ئەو کاتە ڕەوشەکە بە چاکی دەرکی پێدەکرێت. سۆسیالیزمێکی چۆن؟ سەرەڕای ئەوەی چەند سەدەیەکە گفتوگۆی دەرهەق دەکرێت، بەڵام تا ئێستا باشترینی نەدۆزراوەتەوە و پراکتیزە نەکراوە. ئەم ڕەوشە بۆ گفتوگۆکانی دەرهەق بە لیبرالیزمیش بەمجۆرەیە.

بە بایەخەوە ئاماژە بەوە دەکەم کاتێ حەزرەتی مەحەممەد پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی ئاوا کرد، تاوەکو دوایی باوەڕی هەیە کە ئەوەی ئەنجامی بدات لەلایەنی ئەقڵەوە پشت ڕاست و ئەرێ دەکرێت. هەرگیز سۆفیگەراییەکی ساختە جێگای باس نییە. بە ئەندازەی ئەوەی تەواوی ئەو بەهایانەی کە ئیسلامییەت دەیپارێزێت لە خۆیدا بەرجەستە کردووە، هەروەها دەرکی بەوەش کردووە کە لە چاخێکدایە ناتوانێ خۆی لە ڕوونکردنەوەی فەلسەفی و ئاقڵمەندانە بدزێتەوە، لەسەر ئەم بنەمایەش سیستەمی ئیسلامییەت ئاوا دەکات. سەنتێزێکی ئاستەمی بەناویەکدا چوونی هزری ئایینی و فەلسەفییە. بەڵام ئەمە یەکێك لە تایبەتمەندێتیە سەرەکیەکانی حەزرەتی مەحەممەدە. لەگەڵ ئەوەشدا زانیاری سۆسیۆلۆژی هەبووە، واتە لە لایەنێکەوە هەستی بە قووڵایی زانست کردووە، هەروەها ئەم تایبەتمەندیەشی شایانی سەرنج ڕاکێشانە، کە کاتێك سیستەمی خۆی ئاوا کردووە، بە گوێرەی قۆناخ بە شێوەیەکی زانستیانە جوڵاوەتەوە. کەسایەتییەك تا ئەم ڕادەیە ئایینی و فەلسەفی و زانستی بێت، ئەوا لە کەسایەتی خۆیدا ڕاگەیاندنی کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی ڕەوشێکە دەرکی پێدەکرێت. باوەڕکردنی بەوەی کە لە دوای خۆی مرۆڤ دەگات بە ئاستی هزری فەلسەفی و زانستی، پێویستی بە کەسایەتییەکی لە پلە و پایەی ئەودا نییە. بەڵام ئێش و ئازارێك و ناکۆکییەکی چەندە مەزنە کە لە زووترین و کورت ترین کاتدا بەڵایەکی مەزنی پاشڤەڕۆیەتی ئایینی بەسەر سیستەمەکەیدا بووە بار و تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان وەکو لەسقە (سیکۆتین) بە پێکهاتەی هزری و ڕۆحی ئۆمەتەکەیەوە نووساوە. مارکس لەسەردەمی خۆیدا لە فەرەنسا دەبێتە شایەدی گفتوگۆیەکی دەرهەق بە مارکسیزم لە ئەنجامدا دەڵێ: "Jen'ais pos Marxist" واتە ـ من مارکسیست نیم ـ. لەو باوەڕەدام ئەگەر حەزرەتی مەحەممەد هەڵسێتەوە سەر پێیان و ئەو ناکۆکییە مەزنەی ئۆمەتەکەی لەگەڵ چاخدا ببینێ بە شێوەیەکی زۆر ڕاشکاوانە تر دەڵێ: "**من موسوڵمان نیم!**".

دەشێ هەڵسەنگاندنی فراوان و تێروتەسەلتر دەرهەق بە بابەتی شیکردنەوەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئیسلام پێشبخرێت، گرنگ ئەوەیە پێناسەکردن بە شێوەیەکی واقیعیانە بکرێت. ئەمە تەنیا بۆ تێگەیشتنێکی ڕاست دەرهەق بە مێژوو پێویست نییە، بەڵکو لەمە زیاتر لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا بۆ ڕۆشنگەری ڕۆژهەڵاتی ناوین ئەرکێکی دەست لێ بەرنەدراوە. ئەوەی ئەمڕۆ بە ناوی حەزرەتی مەحەممەدەوە ئەنجام دەدرێت بە واتای سووکایەتی پێکردنی دێت. مەحەممەد کە لە بەرزترین ئاستدا پێشکەوتنی ئایینی و فەلسەفی و زانستی قۆناخی لە

کەسایەتی خۆیدا قاڵکردبۆوە و بۆ پێکهاتەی بەرهەمدارترین کۆمەڵگا و دەوڵەتی گواستەوە، ئەوا کەسایەتی و کۆمەڵگای ئیسلام کە توانای ئەوەی نییە تەنانەت خۆشی بە شێوەیەکی راست پێناسە بکات، چۆن دەتوانین بە مەحەمەدی ناویان ببەین؟ شتێکی زۆر روون و ئاشکرایە کە هەروەکو چۆن حەزرەتی ئیبراهیم و موسا و عیسا و مەحەمەد جوڵانەوەی شکاندنی بتیان ئەنجامدا، ئەوا لە رۆژگاری ئەمڕۆشدا دەبێ جولانەوەیەکی بەمجۆرە دەرهەق بە تەواوی پێکهاتە رۆحی و هزرییەکان و تا دەگاتە تەواوی دەزگاکانی ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگا ئەنجامبدرێت.

ب ـ ئیسلامییەت لەمیانەی ناسنامە ئایدیۆلۆژییە قاڵبۆوەکەیەوە هەر لە دەستپێکەوە وەکو شۆڕشێکی سیاسی ـ سەربازی بەناو یەکدا چوو، گەشە دەسەنێ. لە رێگای پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەکەیەوە وەکو شێرێکی برسی کە زنجیرەکەی خۆی پچڕاندبێ، هێرش دەکاتە سەر هەموو لایەك. هەروەکو جولانەوەی تۆڵەسەندنەوە لە شارستانییەتەکانی دەورووبەر، کەوتۆتە نێو قەڵەمبازێك. هێرشی ئیسلامییەت بۆ دەورووبەر، هاوشێوەی هێرشی گۆت و هۆنە بەربەرییەکانی ئەوروپایە بۆ سەر ناوەندەکانی شارستانییەتی رۆما. لە کاتێکدا ئیمپراتۆرییەتەکانی بێزەنتی و ساسانی و حەبەشی سەرەڕای پێکهاتە ئیفلیج بووەکەیان بەرهەمدارترین ناوچە ئابوورییەکانیان لە ژێر دەستدابوو، هۆز و تیرە عەرەبیەکانی بیابان کە ژمارەیان لە زیادبووندا بوو لە نێو ژیانێکی سەخت دا بوون، ئەم ناکۆکییەش رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ. ناوەندەکانی شارستانییەت هەروەکو خەیاڵی بەهەشت سەرنجیان رادەکێشێ. لەمیانەی ئەو بازرگانی و هێرشانەی لە یەکەمین سەردەمی میسر و ئاشوورییەکان تا ئەو سەردەمە یەك بە دوای یەك ئەنجامیاندابوو زۆر باش بەرەکەتی شارستانییەتیان ناسیبوو. لە کاتێکدا بیابان ئەشکەنجەی دۆزەخیان دێنێتە بەرچاوان، ئەوا ژیانی شارستانییەت بۆتە سەرچاوەی ئیلهامی زاراوەی بەهەشت. هەڵکشانی ئیسلامییەت بەر لە هەموو شتێك بەدیهێنانی خەیاڵی رزگار بوونیان لە دۆزەخ و گەیشتن بە بەهەشت، دەکات بە راستینەیەکی باوەڕ پێکراو. خولقاندنی رۆح و خەیاڵێکی نوێ، باوەڕییەکی بێ وێنە و لەم پێناوەشدا ئازایەتییەکی بێ سنوور و فیداکاری و چالاکی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. خەیاڵێکی بەمجۆرەیە ئەگەر شەهید ببن ئەوا یەکسەر دەچنە بەهەشتی دونیای ئاخیرەتی کە باوەڕیان پێهێناوە، ئەگەر بریندار یاخود کەم ئەندامیش ببن ئەوا دەبنە خاوەنی بەهەشتی سەر رووی زەوی. وەستایەتی و کارامەیی حەزرەتی مەحەمەد لێرەدا شاراوەیە. دوای ئەوەی ئاستێکی بەمجۆرەی باوەڕی خولقاند، ئەوی دیکە لەمیانەی رێکخستنێکی سادە و پیلاننامەیەکی مەیدانی و کرداری بەدیدێت.

وەکو ئامراز لەو سەردەمەدا زۆری شمشێر و ئەسپ و رەوشی لەبار و گونجاوی جوگرافیای بیابان بۆ هێرشی شێوازی گەریلایی و خۆ پاراستن تاوەکو دوایی رێگا لەپێش فەتحەکانی ئیسلام ئاوالا دەکەن. لەبەر ئەوەی یاساکانی فەتح بۆ دونیا و ئاخیرەت پیرۆزترین شتە و بۆ ئەو کەسانەی بێ موڵکن و نەدارن بەرفراوانترین تواناکارییان پێشکەش دەکات، دەبێتە هۆی ئەوەی بە سوپا بوون هەرەس ئاسا پێشبکەوێت و وەکو بورکان بتەقێتەوە و بە شێوەی چارەنووسێکی نووسراوی نێو چاوانی مێژوو پێشبکەوێت. شتێکی بەرچاوە کە رووبەڕووی جولانەوەیەکی شۆڕشگێڕی هەرە گورج و گۆڵی مێژوو بوونەتەوە. پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی و سەربازی بۆ ئەوە ئامادەیە تەواوی جیهان فەتح بکات. ئیمپراتۆرییەتەکانی بەرامبەریان پێکهاتەی دەوڵەتەکانیان لەسەر بنەمای پەیوەندی کۆیلە و بەندە ئاوا کراون، لە قۆناخی هەرە بەستەڵەکی خۆیاندا دەژین. لە بواری سیاسیشدا رۆڵێکی پێشکەوتووخوازانە نابینن. لە دوای قۆناخێکی درێژخایەنی پێشکەوتندا، ئیتر لە زووەوە لەپێش ئەو گەلانە بوونەتە کۆسپ کە لە پێکهاتەی ئەتنیکیەوە بەرەو بوون بە قەوم هەنگاو بهاوێژن. هەلومەرجە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆیلایەتی دەرباز کردووە، ئومێد و داخوازی ئەوە دەکات لەمیانەی شێوە گرتنێکی رۆحی و هزری نوێ، ئەو پێکهاتە گەندەڵ بووانە بەلاوە بنێن و لێیان رزگار ببن کە وەکو کۆت و بەندن. ئیتر وەکو جاران کۆنترۆڵ کردنی گەلان سانایی نییە. بوویەری مەسیحی چاوەڕوانکراو وەڵامدانەوەی لەمیانەی دەرکەوتنی عیسا، جارێکی دیکە دووبارە دەبێتەوە. نەك تەنیا بۆ تیرە و هۆزەکانی بیابان، بەڵام خولقاندنی ئیلهامی رزگاری تەواوی گەلانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەکان هێندە ئاستەم نییە. کەمێك دادپەروەری و رێزگرتن لە کولتوورەکانیان ـ جگە لەلایەنە پاشڤەڕۆتیەکەیان ـ ئەوا بەسە بۆ ئەوەی گەلان ئیسلامییەت پەسند بکەن. کەسایەتی دادوەرانەی عومەر بە هۆی ئەم پێویستیە مێژوووییەیە. باڵابوونی ئایدیۆلۆژی، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە دەست لە ناسنامە ئایدیۆلۆژییە پاشڤەڕۆکان بەربدرێت، لەوانەیە لە سەفەرەکانی فەتح کردندا (ڤەبوون) سەرەکیترین رۆڵی ببینێ.

لەگەڵ ئەوەی هەڵسەنگاندنی ئایینی ئیسلام وەکو ئایینی شمشێر لایەنی راستی هەیە، ئەوا بە بێ ئەوەی باڵابوونی ئایدیۆلۆژی رەچاو بکرێ، تەنیا شمشێر بەکەڵکی هیچ نایەت. زۆر پێشتر شمشێر و ئەسپ هەبوون. بەڵام تەنانەت هەنگاوێکیش بەرەو پێشەوەی نەدەبردن. هەروەکو چۆن سەدەکانی دەستپێك مەسیحییەت وەکو جولانەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ئاشتی و باوەڕی پێشکەوتبێت، ئەوا ئیسلامییەتیش وەکو جوڵانەوەیەکی سیاسی و چەکداری و شەڕ پێشکەوتووە. لایەنی ئایدیۆلۆژی و سەربازی و سیاسی بە ناو یەکتردا قاڵبوونەتەوە و وەکو دیاردەیەکی شۆڕشگێڕی ڤەبوون ئەنجامدەدات و دەبێتە دەسەڵات. هەرچی مەسیحییەتە لەگەڵ ئەوەی لە بواری کۆمەڵایەتیدا پێشکەوتووە، بەردەوام سەرکوت دەکرێت و دووچار و مەحکومی ژێر دەستی دەبێت.

پەلامارە سەربازییەکانی ئیسلامییەت بەرامبەر بە سوپای نیزامی بە شێوە و گەوهەری شەڕی گەریلاییە. لە کاتی ژێر کەوتنیشدا پاشەکشێ و سەرلەنوێ خۆ رێکخستن کارێکی هێندە ئاستەم نییە. لە هەموو لایەکەوە و بەخێرایی هێرشکردنە سەر سوپای نیزامی و لە پەلوپۆخستنی، شتێکی سانایە. ناکەونە نێو شێوەی شەڕی ـ یەك پێکدادان ـ ستراتیژییەتێکی درێژ خایەن پەیڕەو دەکەن. بەرامبەر بەمەش سوپای نیزامی خەرجییەکەی زۆرە، گران و سستە لە جوڵانەوەدا، بە گوێرەی سیستەمی شەڕی ـ یەك پێکدادان ـ رێکخراوە، بۆ پارچەبوون لە بار نییە، کاتێك دووچاری ئاڵۆزییەك هاتن بە سانایی نایەنەوە سەرخۆ، ئەم تایبەتمەندیانەش وایکردووە تای تەرازوو بە لایەنی هونەری سەربازی ئیسلامیدا بشکێتەوە ـ هەروەها باڵایی سایکۆلۆژی بە تەواوی بەدەست سوپای ئیسلامییەتەوەیە. قۆناخێکی مێژوویی لە ئارادایە کە هێزی تازە لە دایك بوو لەگەڵ ئەو هێزانەی کۆنەپارێزن، هەلومەرجیان پێگەیشتووە و سەرکەوتنی مەزن بە ناوی هێزە نوێکانەوە تۆمار کراوە.

دوای سەرکەوتنە سەربازی و مەیدانیەکان، سیستەمی سیاسی ئیسلامییەت یەك لەدوای یەك ئاوا دەکرێن. سیستەمی والی هەرێمی کە لە پارسەکان مابۆوە، سەرلەنوێ لە ژێر سایەی ناسنامەی نوێی ئایدیۆلۆژی، گیانی بەبەردا کرایەوە. لەوە زیاتر کە ئیسلامییەت ناوچەی نوێی شارستانییەت بکاتەوە، عەرەبەکانی بیابانی کە تەڤلی شارستانییەت نەببوون و گەلانی کە لە نێو هەمان رەوشدا بوون، وەکو تازە خوێنی شارستانییەتی کۆن بەکاریهێنان و لە بن سایەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی خۆی نوێی کردەوە. سەرەکیترین تایبەتمەندێتی ئەم نوێبوونەوەیە، گۆڕینی پێکهاتەی دەزگا و هزری ئەم دەوڵەتەی پشت بە سیستەمی کۆیلایەتی دەبەستێت، بۆ سیستەمی پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتی. ئەوە بە گوێرەی قۆناخی خۆی هەنگاوێکی زۆر پێشکەوتووانەیە. شێوازی پەیوەندی و هزری کۆیلەداری کە ریشەکەی بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە بەستنەوەی بە بوونێکی نادیار و بەندایەتی کردنی تاکخودایی، رێگا لەپێش ئاسوودەیی مەعنەوی و بەهایەکی ئەخلاقی گونجاوتر لەگەڵ شەرەفمەندی مرۆڤ دەکاتەوە. کاتێك لەگەڵ کۆیلایەتی کردنی پادشا ـ خوداوەندەکان بەراورد بکرێت، ئەوا بوون بە بەندەی خۆشەویستی خودا، شەرەفێکی مەزن و متمانە و باڵابوونێکی مەعنەوی بەدی دێنێ. ئەوەی لە ژێر ئەم باڵابوونە سایکۆلۆژیەدا شاراوەیە، پارچەبوونی پێکهاتە هزری و رۆحییەکانی کۆیلەدارییە کە مرۆڤ بچووك دەکات، لە جیاتی ئەو دانانی ناسنامەی نوێیە کە شەرەف و رێز و دادپەروەی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

لە کاتێکدا مەسیحییەت لە رێگای تێکۆشانی جەماوەری و دوور لە ئاواکردنی پێکهاتە سیاسی و سەربازییەکان، هەوڵدەدات گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی گرێدرا و بە خۆی ئاوا بکات و ڤەبوون لە پێکهاتەی سیاسیدا ئەنجام بدات، ئەوا ئیسلامییەت لەمیانەی سەفەر و پەلامارە سەربازییەکان ڤەبوون لە پێکهاتە سیاسیەکان ئەنجام دەدات و بە گوێرەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی خۆی سەرلەنوێ شێوەی پێدەدات. لە کاتێکدا یەکێکیان لە رێگای شۆڕشی سیاسی و سەربازییەوە بەرەو شۆڕشی کۆمەڵایەتی دەچێ، ئەوەی دیکە لە شۆڕشی کۆمەڵایەتیەوە بەرەو شۆڕشی سیاسی دەچێ.

ئەمەش لەو پەیوەندییە دەچێت کە لە سەدەی بیستەمدا لە نێوان هەڵوێستی هەڕەمەکی بەلشەفیکەکان و شێوازەکانی سۆسیال ـ دیموکرات دەچێت. ئەمەش لەوە دەچێت کە "ئایا بۆ بە ئامانج گەیشتن، شۆڕش گونجاوترە یاخود پێشکەوتنی پلە بە پلە (**تدريجى**) یە؟

بێگومان ئیسلامییەت بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێشانە ئەرکە سیاسی و سەربازییەکانی شۆڕشی دەرەبەگایەتی دەستپێکردووە. رۆڵی ئیسلامییەت لە ڤەبوونی (فەتح) مەسیحییەت لە ئەوروپا دیاریکراوە. دەبێ بە بایەخەوە ئاماژە بەوە بکەین مەسیحیەتیش پارچەیەکی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوینە. ئەگەر باس لە رۆڵ و کاریگەرێتی بکەین، ئەوا ئەوەی تاوەکو ئێستاش لە بواری شارستانییەتدا ئەوروپا بەخێو دەکات رۆژهەڵاتی ناوینە. ئەم چالاکیەی بەخێوکردن و تێرکردن، نزیکەی ساڵانی ١٠٠٠٠ پ.ز دەستپێکرد و تاوەکو مەسیحییەت بەرامبەر بە رێنسانس کەوتە پلەی دووەمەوە، بەردەوام بوو. ئەگەر تەنیا مێژووی شارستانییەت بگرینە دەست چوار هەزار ساڵە، ئەگەر چاخی نئۆلیتیکی بخەینە سەر ٨ هەزار ساڵە، پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوینەوە سەرچاوە دەگرن و ئەوروپا تێر خۆراك دەکات. بەرامبەر بەمە ئەم ٥٠٠ ساڵەی دوایی ئەوروپا کەوتۆتە نێو هەڵمەتێکی هێرش و باڵا بوون. لە کاتێکدا هەندێ بەهای سنوورداری شارستانییەتی پێشکەش کردووە، ئەوا هیچ کاتێك شێوازەکانی وشك کردنەوەی، کەم نەکردۆتەوە. کاتێك بووە جێگای باس، هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی بەرفراوانتر بەراوردی نێوان شارستانییەتی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا ئەنجام بدەین.

تیۆری سیاسی بابەتێکی گرنگ و سەیری هزری ئیسلامییەتە. کاتێك بەدەزگابوونی سیاسی بووە جێگای باس، زاراوەی خودا کە جێگای خۆی لەناو ناسنامەی ئایدیۆلۆژیدا گرتووە، تەواوی سێبەری خۆی نیشاندەدات و بەسەریدا رەنگ دەداتەوە. ناوزەدکردنی خەلیفە و خاوەن دەسەڵاتەکان بە سێبەری خودا (**ظل الله**)، ئاماژە بە زاراوەیەکی دیکەی کلیل دەکات. سیفەتەکانی لە جۆری قەهار، حاکم، جەبار، ستار، عادل، موقتەدیر کە زاراوەی خودای پێ پڕ کراوەتەوە، دواتر وەکو سیفەت و تایبەتمەندێتی خاوەن دەسەڵاتەکان (دەسەڵاتداران) رووبەڕوومان دەبێتەوە. نابێ بڵێین ئەمە گەمەیەکی ئایدیۆلۆژییە و بچووکی بکەینەوە. سۆسیالیزم کە وەکو ئایدیۆلۆژیایەکی زانستی پێشکەشکراوە، گەلێك زاراوەی دیکە لەخۆوە دەگرێت، پاشتر وەکو سیستەمی سیاسی بەرچاو کەوتووە. سیستەمێکی پەیوەندی بەمجۆرە لە تەواوی بەدەزگابوونەکانی سیاسەت و ئایدیۆلۆژیدا دەبینرێ. ئەمە تەنیا رەوشێکی تایبەت بە ئیسلامییەت نییە. پێشتر هەوڵماندا بە شێوەیەکی بەرفراوان یەکەمین نموونە نیشان بدەین کە چۆن راهیبە سۆمەریەکان ئەمەیان ئەنجامداوە.

بەڵام هەرچی بەخشینی سیفەت و تایبەتمەندێتیە سیاسیەکانە لە ئاستێکی بەرزدا بە زاراوەی خودا، ئەوا وەکو بناخەی ئایدیۆلۆژی ئەو حاکمیەتە رەها و دژوارەیە کە دواتر دێتە ئاراوە. هەربۆیە بە گوێرەی ئایینی مەسیحییەت رێگا کردنەوەی لەپێش چەمکێکی توندی دەسەڵات، دەبێتە ناچاریەك. تاکە جیاوازی لەگەڵ سیستەمی کۆیلایەتی ئەوەیە لە جیاتی هاوکێشەی پادشای ـ خوداوەند فۆرمیلی پادشای سێبەری ـ خودا دادەنرێت. لە یەکێکیاندا پادشا دەتوانێ ببێتە خوداوەند. بەڵام هەرچی لە سیستەمی ئیسلامییەتدایە دەبێتە سێبەرەکەی. لە راستیدا بە شێوەیەکی شاراوە و دەمامك کراو تەواوی سیفەتەکانی خودا بە تایبەتیش دەبێتە خاوەنی ئەو سیفەت و تایبەتمەندێتییانەی کە سیاسەت پەیوەستدار دەکات و زۆر لە دەسەڵات (**صلاحيات**)ی خودا نزیك دەبێتەوە.

ئەم مەترسیەی تیۆری سیاسەتی ئیسلامییەت، سەرچاوەی خۆی لە پێکهاتە ئایدیۆلۆژیەکەیەوە دەگرێت. هەروەها بە تەواوی جیا نەکردنەوەی ئایین و فەلسەفەش، کەم و کوڕیەکە دەرئەنجامی هەڵە و مەترسیدار دێنێتە ئاراوە. کاتێك دەسەڵاتەکان دووچاری گەندەڵی و لە رێ لادان دەبن، دوودڵی لەوە ناکەن ستەم و زۆرداریەك پەیڕەو بکەن کە هی سیستەمی کۆیلەداریش تێپەڕ بکات. لەبەر ئەوەی خوداوەندەکانی چاخی کۆیلەداری پێشنەکەوتبوون، پادشا خوداوەندەکانیش زێدە پێشنەکەوتبوون. هەرچی خودا (ئەڵڵا)ی ئیسلامییەتە تا دواڕادە پێشخراوە، خودایەکەی بەهێزە و گەلێك سیفەتی سیاسی هەمە جۆری هەیە. خاوەن دەسەڵاتەکان (دەسەلاتداران) کاتێك دەبنە هاوبەشی ئەم سیفەت و تایبەتمەندێتیانە، مەرگەسات روودەدات. ئەو لایەنەی چەندین تایبەتمەندێتی باشی ئیسلامییەتی لەناو بردووە ئەمەیانە. لە قۆناخی پێشکەوتووخوازی دەستپێك و تاوەکو سەدەی دەیەمی زایینی کە پێکهاتە سیاسیەکانی چالاك و بە کاریگەر بوون، مەترسی سەریهەڵنەدابوو. بەڵام کاتێك رێگای ئیجتیهاد و گفتوگۆ لە رێگای فەتوایەکی شێخی موسلمانان لەمیانەی لاساییکردنەوەی داب و نەریت و بە شێوەیەکی وشك و برینگ رێگای لەپێش گیرا و سیستەمی ئیسلامییەت کەوتە نێو قۆناخی پاشڤەڕۆیی و موحافەزەکاری، ئەوا سیستەمی سیاسی دووچاری چەقبەستنێکی تەواو هات. نەیتوانی ببێتە وەڵامی هیچ وشیاربوونەوەیەکی دەرەوە و ناوەوە. لە کاتێکدا شارستانییەت لە ئەوروپا لەمیانەی رێنسانسەوە لە سەدەی پانزدەهەم بەدواوە شێوە و ناوەڕۆکی خۆی گۆڕی و لەسەر بنەمای سەرمایەداری هەڵکشا، دەزگا سیاسیە سەرەڕۆکانی ئیسلامییەت مۆری خۆی لە پاشڤەڕۆترین قۆناخی رۆژهەڵاتی ناوین دەدا. ئەو کۆمەڵگا و مێژووەی بە درێژایی ١٥٠٠٠ ساڵ لەسەر رێبازێکی هەڵکشاندن پێشدەکەوت، لەمە بەدواوە دەکەوێتە ناو قۆناخێکی تاریکی وەها کە شایستەی نییە و هەقی ئەویش نییە. تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان رێگای رزگار بوون لەو شەوەزەنگەی نەدۆزیوەتەوە.

ج ـ قۆناخی زێرینی بازرگانی رۆڵێکی دیاریکراو لە شێوەگرتنی گەوهەری ئابووری و کۆمەڵایەتی قەڵەمبازی ئیسلامییەت دەبینێ. ئەمە بابەتێکی گرنگە. قەڵەمبازی ئایینی کە سەرچاوەکەیان لە داب و نەریتی عیبرانییەکانەوە وەردەگرن، گۆڕانکاری هزریشی لەناودا بێت، زەمینەی ماددی بازرگانی پێك دێنێ، لێگەڕینەکانی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ، گرێدراو بەم راستینەیە پێشکەوتووە. بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی زانستیانە سەبارەت بە مێژووی ئایینەکان پێشبخرێت، پێویست دەکات بەردەوام ئەم راستینەیە لەبەرچاوان بگیردرێت. هەروەکو چۆن لادێیی و جووتیاری ئازاد، گرێدراو بە شۆڕشی کشتوکاڵی ئەو پێشکەوتنە رۆحی و هزریەی لەسەر ئەم بنەمایە هاتۆتە ئاراوە، مۆری خۆی لە تەواوی چاخی نئۆلیتیك داوە، ئەوا شۆڕشی کار و پیشەکاری بناخەی کۆمەڵگای کۆیلەداری و پێکهاتە هزریەکەیەتی. لەگەڵ ئەوەی بازرگانی لەم دوو قۆناخە مێژووییە گرنگەدا دەرکەوتووە، وەلێ نەگەیشتۆتە ئاستی هێزی چینێکی سەربەخۆ، بەڵکو گرێدراو بە کۆشك، پەرستگا و گوند هەوڵدەدات. پێشکەوتنی زێدە ـ بەرهەم و ئاڵوگۆڕی، دەبێتە هۆکاری ئەوەی بازرگانی ببێتە خاوەن رۆڵ و هێزی سەرەکی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕ. لە کاتێکدا ژیانی سادەی گوند و شارەکان رێگای لەپێش میتۆلۆژیای مەییو و پێکهاتەی خوداوەندی تەمبەڵ دەکردەوە، ئەوا بەردەوام جێگۆڕکێ و گۆڕانکاری و جموجۆڵی بازرگانی، رۆڵ لە گۆڕانکاری زاراوەکانی بواری هزری و گۆڕانکاری ناوەڕۆك و جیابوونەوەیدا دەبینێ. لەسەر ئەم بنەمایەش مەیلی نوێی ئایینی لە نێو پێکهاتەی دەزگاکانی سەرخاندا سەرهەڵدەدات و رێگا لەپێش نیگار و سیمای ئەو خوداوەندانە دەکاتەوە کە خاوەنی تایبەتمەندی پێشکەوتووترن و بە جموجۆڵتریشن. تەسەور و سیمای داڕنراوی، سەرچاوەی خۆی لە گەوهەری گەڕۆکی و جێگۆڕکێی بازرگانی دەگرێت. توانستی لێکجودا کردنەوە، قۆناخێکی زۆر گرنگە لە پێشکەوتنی هزر و لۆژیکدا. هەروەها کاریگەری و رۆڵێکی سەرەکی هەیە لە دەوڵەمەند بوونی هزر و زماندا. گرێدراو بەو گۆڕانکارییەی لەو میتۆلۆژیا مەییو و بێ کاریگەرانەی پشت بە پێکهاتەی سستی خوداوەندەکان دەبەستێ، قۆناخی ئەو ئایینانە دەستپێدەکات کە پشت بە خوداوەندە بە جموجۆڵ و خاوەن لۆژیك و بە توانستەکان دەبەستێ. بازرگانی لە جیاتی خوداوەندێك کە بە گوێرەی ئارەزوو و هەوەسەکانی بجووڵێتەوە، پێویستی بە خودایەکی چوست و چالاك هەیە کە گرێدراوی یاساکانە و ئاقڵمەندە و لە هەموو شوێنێك هەیە و بۆ خۆپاراستن دەبێتە پشت و پەنا و هێز.

کاتێك حەزرەتی مەحەممەد زاراوەی خودا (ئەڵڵا) شیدەکاتەوە، ئەوا پەیوەست کردنی بە دیاردەی بازرگانی، کە رەگی خۆی لەناو ژیانی کۆمەڵگا داکوتاوە، گرنگە و رۆڵی کلیل دەبینێ. خودی حەزرەتی مەحەممەد بەرهەمی ئەو ژیانە هاوبەشەیە کە لە رێگاکانی بازرگانی و کاروانەکانیدا لەگەڵ ژنێکی بازرگان بەسەری بردووە. لەو قۆناخەدا پاراستن (ئاسایش) کێشەیەکی سەرەکی بازرگانی بوو. وەستاندنی پەلامار و تاڵانکارییەکانی تیرە و بیابانیەکان بە درێژایی هەزاران ساڵ، کێشەیەکی بەردەوام بووە. ئیبراهیم بەخۆشی سەرۆکی تیرەیەکی بازرگانە. لەو قۆناخەی شیمانەی دەرکەوتنی دەکرێ واتە ١٧٠٠ پ.ز، پاراستن و ئاسایشی رێگا پێویستی بە هێز هەیە. هەبوونی کۆمەڵایەتی نیمچە دوورگەی عەرەب لە باکوور ئەنادۆل و میزۆپۆتامیا، لە رۆژئاوا میسر و حەبەشە، لە رۆژهەڵاتیش لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانییەتی ئێران، لە نێو پەیوەندییەکی زۆر چڕدا پێشدەکەون. تەنانەت گەلێك زووتر لە نزیکەوە بە پێشکەوتنی

کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکانی ئەم ناوچانەوە گرێدراو بوون. رۆڵیان هاتوچۆ کردن و بازرگانی کردنی نێوان ئەم ناوەندانەیە. بۆ جاری یەکەمە توێژی ئەرستۆکراتی تیرەکانی بیابان بازرگانی و ئاڵوگۆڕی تەواوی بەها ماددی و مەعنەویەکان ئاراستە دەکەن کە ناوەندەکانی شارستانییەت خولقاندوویانە. حوشتر وەکو کەشتی بیابان سەرەکیترین ئامرازی هاتوچۆیە. ناوبردنی حوشتر بە سەدان ناوی جیاواز، لەبەر ئەوەیە کە ئامرازێکی سەرەکی ژیانە و دەستی لێبەرنادرێت.

تەنیا کەل و پەل نابنە بابەتی بازرگانی، بەڵکو میتۆلۆژیا، ئایین و فکری هەمە جۆریش دەبنە بابەتی بازرگانی. گەلێك بەڵگە هەن دەیسەلمێنن پەیکەری خوداوەندەکانیش وەکو کەل و پەل لە بازاڕەکان دەفرۆشران. شارستانییەتی گریك لە سایەی هەلومەرجی دەریادا زیاتر پێشیخستووە. دەریا لە جێگای بیابان، کەشتی چارۆگەدار جێگای حوشتری گرتۆتەوە. لەم ماوەیەدا لەمیانەی رێگاکانی بیابان و دەریادا جگە لە ئاڵوگۆڕکردنی کەل و پەل، بە شێوەیەکی بەرفراوانیش بازرگانی ئایین و خوداوەندەکان دەکرێت. بوونی پەیکەرتاشی بە هونەرێکی بەهادار و بایەخدار بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێویستی بە بەرهەمە خوداییەکان هەبووە و بەهۆی نرخە زیادەکەیانەوە بووە. بە ئەندازەی ئەوەی گۆڕان لە ئاییندا روویدا، ئەوا دەرکەوتنی هزری فەلسەفیش لەو رێگایانەی بازرگانیدا پێشکەوتووە. پێشتر هەڵکشانی بابل و ئاشوور و ئاوا کردنی ئیمپراتۆرییەتەکانیان، لە سایەی هەبوون و بەرەو پێشەوە چوونی گرنگی بازرگانی بووە. یەکەمین تروسکەی شارستانییەتەکانی هیند، چین، ئاسیای ناوین، ئێران، بازرگانەکانی سۆمەر و بابل و ئاشوور بوون. ئەو چەتەگەریانەی لەسەر رێگاکانی هاتوچۆ هەبوو مۆڵگەی بەهێزی دەوڵەتیان کردۆتە پێویستییەك. لە دەوری ئەم مۆڵگانە کۆلۆنیە (کاروانسەرا) بازرگانییەکان ئاوا کران، دواتر بوون بە ناوەندە نوێیەکانی شارستانییەت و چەندین دەوڵەتی تێدا ئاوا کرا.

هەروەکو دەزانرێ مەککەش یەکێك لە ئەڵقە گرنگەکانی ئەم قۆناخە مێژوویە بوو. هەروەکو چۆن میسر و سۆمەر بەرهەمی نیل و دیجلە و فوراتن، ئەوا مەککە و دەوروبەرەکەی بەرهەمی بازرگانیە. ئاشکرایە ئەگەر بازرگانی نەبوایە تەنانەت چادرێکیش لە شوێنی مەککە هەڵنەدەدرا. تەنانەت لە فەرموودەکانی حەزرەتی مەحەمەد و ئایەتەکانی قورئانیشدا روونکراوەتەوە کەعبە بازاڕێکی بتەکان بووە.

تەنانەت ئەم هەڵسەنگاندنە کورتەش پەیوەندی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامییەت و بەدەزگابوونی سیاسی و سەربازی و گۆڕەپان و بوارە سەرەکیەکەی ئابووریان، پەیوەندی بە دیاردەی بازرگانییەوە بە شێوەیەکی قووڵ نیشان دەدات. دەرکەوتن و هەڵکشانی ئیسلامییەت، هێز و نوێنەری ئاقڵمەندی و دیسپلین و شان و شکۆی بازرگانە. ئەمەش چالاکییەکە بۆ یەکەمین جار بنەماڵەیەکی بازرگان لەمیانەی ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی سەربەخۆ و هێزێکی مەزنی پەلاماردان، دەوڵەت و شارستانییەتێکی نوێ دەخولقێنێ. دوای ئەزموونی تیرە عیبرانیەکان لە پادشایەتی قودس، ئەمە بە واتای تەڤینەوەی ئەو توانستە بازرگانیەیە کە بە درێژایی هەزاران ساڵ لە نیمچە دوورگەی عەرەبی کەڵەکە ببوو. ئەمە لەسەر بنەمای بازرگانی گەورەترین هەڵمەتی ئایینی، سەربازی، سیاسی و ئابووری تیرە و هۆزەکانی عەرەبە؛ ئەمەش بە واتای بوون بە هێزێکی سەرەکی دەوڵەت و شارستانییەتە. چاخی ئابووری بازرگانی و باڵادەستی بازرگانانە. لە چەندین ئایەتی قورئان و سوننەتەکانی حەزرەتی مەحەمەد ئاشکرا دەبێت چۆن پەسنی بازرگانی کردنیان داوە و شکۆمەندیان راگرتووە، وەکو بەهایەکی خودایی پیرۆز راگیراوە. هەروەکو دەزانرێ لە چاخی نئۆلیتیك و سیستەمی کۆیلەداری میسر و سۆمەر کە لەسەر بنەمای کشتوکاڵ بوون، خۆراکی دانەوێڵە و میوەکانی دار و ئاژەڵەکانی ماڵیکردن پیرۆز بوو. ووشە و زاراوەی پیرۆزی کاوتا لەزمانی سۆمەریەوە هاتووە. دوای چینی جووتیار، چینی بازرگان دووەمین هێزی مەزنی کۆمەڵایەتیە کە شارستانییەت پشتی پێدەبەستێ. کۆیلەکان لە نێوان ئەو دوو چینە بەرفراوان و چڕەدا دابەش بوون. پیشەکارانی دەستکاری، گرێداروی بازرگانین و بەدوای بازرگانەکانەوە دێن. لە رۆژهەڵاتی ناویندا ئەم چینە بە بازرگانە ـ دەلالەکانیش ناودەبرێت. ئەوانە پێشەنگایەتیان کردووە تاوەکو زێدە بەها وەکو دەزگایەك پێشبکەوێت. بازرگانی رۆڵکی سەرەکی هەیە لە پێشکەوتنی بیرکاری و سیستەمەکانی پارە و ژمێریاری. هزری جودا و داڕنراو و فرە واتایی وشەیەك و گۆڕانکاری ژیانی ئابووری، وەکو رەنگدانەوەیەکی بازرگانی پێشکەوتووە.

لە چاخی کۆیلەداریدا تەنانەت لە ئابووری کشتوکاڵی چاخی نئۆلیتیکیش، بازرگانی پێشکەوتنێکی زۆر سنورداری بەخۆیەوە بینیوە و بازرگان لە رەوشی چینێکی وابەستە دایە و سەربەخۆیی خۆی بەدەست نەهێناوە، لە چاخی دەرەبەگایەتیدا رەوشێکی پێچەوانە دێتە ئاراوە. شارەکان وەکو ناوەندی بازرگانی سەربەخۆ، ناوچە لادێیی و کشتوکاڵییەکان بەخۆیانەوە گرێدەدەن. دەوڵەتی مەدینە ـ مەککەی ئیسلامییەت یەکێکە لە نموونە لەپێشینەکانی ئەم وەرچەرخانە مێژووییە.

گۆڕانکاریەکی گرنگی زەمینەی کۆمەڵایەتی شارستانییەت لە ئارادایە. لە سایە و دەورووبەری بازرگانی، سەرلەنوێ ئابووری رێکدەخرێتەوە. گرنگی و بایەخێکی زیاتر بە بەرهەمە بازرگانییەکان دەدرێت. وەکو یەکینەی ئاڵوگۆڕی ئابووری پارە (دراو) دەکەوێتە گەڕ. ئیسلامییەت هەروەکو هێزی بازرگانی دونیای هاوچەرخ سەرهەڵدەدات. هەروەکو جیهانگیری رۆژگاری ئەمرۆمان، هەروەکو چۆن هێزی جیهانی وڵاتە یەکگرتوەکان بۆ ئەوەی تەواوی کۆسپەکان لەپێش بازاڕی ئازاد هەڵگرێ، رۆڵ دەبینێ، ئەوا دەوڵەتی ئیسلامییەت وەکو هێزی جیهانی ئەو سەردەمە بۆ ئەوەی بازرگانی لە نێو ئارامی و ئاسایشدا بە شێوەیەکی ئازادانە پێشبکەوێت، رۆڵێکی هاوشێوە دەبینێ. لە ئەنجامی جێگیرکردنی دەوڵەتێکی باوەڕپێکراو لە نێوان ناوەندە گەورەکانی بەرهەم هێنان، بووە خاوەنی شوێنگەیەکی بەمجۆرە کە لە زەریای ئەتلەسیەوە تاوەکو زەریای مەزن، لە زەریای هیندییەوە تاوەکو کوێستانەکانی سیبریا، لە پێشکەوتنی شارستانییەتدا ببێتە خاوەن رۆڵێکی دەست لێنەدراو.

د ـ هیومانیزمی (مرۆڤ پەروەری) ئیسلامییەت و کاریگەریەکەی بەسەر تاکە کەس، بابەتێکی گرنگە و پێویستی بە هەڵسەنگاندن هەیە. ئەوە شتێکی مسۆگەرە کە ئایینی مەسیحی دەمارگیری قەوم و چینایەتی تێپەڕاندووە، یەکێکە لە هەنگاوە گرنگەکانی خولقاندنی ئایینی مرۆڤایەتی (هیومانیزم). بۆ یەکەمین جارە مرۆڤایەتی وەکو زاراوە جێگای خۆی دەگرێت و واتای پێدەدرێت. جیاوازی تیرە، نەژاد و توێژی کۆمەڵایەتی لەپێش برایەتی نابێتە کۆسپ و تەنانەت کاتێك لەگەڵ قەومی یەهودی و موسەوییەت بەراورد بکرێت، ئەوا زۆر بە سانایی دەبینرێت مەسیحییەت وەکو جولانەوەیەکی نێونەتەوەیی (ئەنتەرناسیونالی) دەستی پێکردووە. لەمیانەی ئەو لایەنەوە وەکو ئایینێکی هەرە پێشکەوتوو تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆشمان درێژە بە رۆڵی پێشەنگایەتی خۆی دەدات. بە پێچەوانەوە موسەوییەت (یەهودییەت) لە سەرووی ئەو ئایینانەوە دێت کە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بە شێوەیەکی دەمارگیری، تایبەتمەندێتی قەومی دەپارێزێ. گەلێك پێشکەوتنی ئایینی دیکە لە نێو سنوورەکانی قەوم و ناوچەدا ماوەتەوە. لەم لایەنەوە ئیسلامییەت لە ناوەڕاست دەوەستێ. هەرچەندە بە تایبەتی حەزرەتی مەحەمەد گوتویەتی "باڵا بوونی عەرەب بەسەر عەجەمدا تەنیا لە رێگای عیبادەتەوە دەبێت"، بەڵام ئەگەر بڵێین زێدە گەوهەری قەومی تێپەڕ نەکردووە ئەوا واقیعی ترە.

کارەکتەری چینایەتی چینی سەرووی یەهودییەکان بەردەوام (شۆڤینیزمی) دەمارگیری قەومی کردووە بە پێویستییەك. درێژەدانی بەڕەوشی ئیمتیازاتی خۆی، گرێدراوی پاراستنی ئەم تایبەتمەندێتیەیە. یەهودییەت بۆ درێژەدان بەڕەوشی تاکە چینی باڵا و تاکە قەومی بەڕێوەبەر، دەمارگیری قەومی (یەهودییەت) دەکات بە ناچارییەك. هەڵبەتە کاتێك یاهۆڤای خوداوەند دەڵێ "تۆ قەومی تایبەتی منی، لە خۆمم مارە کردوویت" ئەم ئیرەییەش ناوەڕۆکی شۆڤینیزم ئاشکرا دەکات. بە درێژایی مێژوو هەم رۆڵی مەزنی یەهودییەکان، هەم ئەو ئێش و ئازار و تراژیدیانەی دووچاری هاتوون، لە نزیکەوە پەیوەندی بەو دەمارگیرییە ئایدیۆلۆژییەوە هەیە. لە کاتێکدا چەمکی تایبەت بوون ناچاری هزری مەزن و ئەنجامدانی کاری گرنگ دەکات، هاوکات ئەو نایەکسانی و ئیرەییەی لە دەورووبەر بڵاویان کردۆتەوە ناچاری کین و دوژمنایەتیان دەکەن. فاشیزمی هیتلەر دوا ئەڵقەی گۆڕانکاری بەمجۆرەیە. تراژیدیای فەلەستین ـ ئیسرائیل سەرچاوە و ریشەیی خۆی لە پاشماوە مێژووییەکان وەردەگرێت.

نیشاندانی چەمکێکی جیاوازتر لەلایەن مەسیحییەتەوە رۆڵ و کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر ئاشتی و برایەتی نێوان مرۆڤایەتی کردووە. هەڵوێستی ئاشتی و یەکسانی سەبارەت بە تەواوی ریشە نەژادییەکان و قەوم و هزرە جیاوازەکان، یەکەمین پەیڕەو کردنی سۆسیالیزمی سەرەتایی هەنگاوێکی مەزنی مرۆڤ پەروەری مرۆڤایەتیە. پەیڕەو نەکردنی جیاوازی

رەگەزی، بەهاکەی مەزنتر دەکات. لە جێگای خۆیدایە کە بە یەکەم و گەورەترین جولانەوەی ئەنتەرناسیۆنالی سۆسیالیزمی سەرەتایی ناوی ببەین. بەڵام ئەو خراپەکاری و لە ڕێ لادانەی دواتر هاتە ئاراوە، نوێنەرایەتی ئەم پێشکەوتنە گەوهەریانەی قۆناخە سەرەتاییەکان ناکات. ئەوە مسۆگەرە کە مەسیحییەتیش لەسەر بنەمای گەڕانەوە بۆ گەوهەریخۆی، پێویستی بە نوێبوونەوە هەیە.

لەم بوارەدا ئیسلامییەت هێڵی ناوینی گرتۆتە بەر. ئەمە تا ڕادەیەك لە کارەکتەری چینایەتیەوە سەرچاوە دەگرێت. ئیسلامییەت زیاتر ئایینی چینی ناوینە. لەبەر ئەوەی چینی بازرگان هێزی سەرەکی پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ناسنامەی ئایدیۆلۆژییەتی، بۆیە نە هێندەی یەهودییەت قەوم پەرستە، نە هێندەی مەسیحییەتیش ئەنتەرناسیۆنالیستە. کاتێك ناچار بووە تیرە و هۆزەکانی بیابان بکات بە یەك، ئەوا مسۆگەرە کە رۆڵێکی مەزنی لە پێشکەوتنی قەومی عەرەب بینیوە.

ئیسلامییەت بە ئەنقەست دەمارگیری قەومی پەیڕەو نەکردووە. ئەڵلا خودای تەواوی مرۆڤایەتیە. بە گوێرەی یاهۆڤای خوداوەند، ئەڵلا بە شێوەیەکی یەکسان نزیکی تەواوی قەوم و گروپە ئەتنیکیەکان دەبێتەوە. جیاوازی نەژادیش پەیڕەو ناکات.بەڵام مسۆگەرە سۆسیالیست نییە. بەڵام لە قورئان و فەرموودەکاندا دیارە کە لە سەرەتادا جیاوازییەکی نەرمی چینایەتی و رەگەزی کردووە. بە بەراوردکردن لەگەڵ براهمانی خودای هیندەکانیش کە جیاوازی چینایەتیەکەی بڕای بڕە، ئەڵلای ئیسلامییەت یەکجار نەرمە و پێکهاتەیەکی بەمجۆرەی هەیە کە ڕێگا و مۆڵەت بە جێگۆڕکێی چینایەتی دەدا. مرۆڤایەتی بە زاراوەی هیومانیزم (مرۆڤ پەروەری) گەیشتووە. ئایینە تاکخوداییەکانی دیکە بە رەوا (مشروع) دەبینێ. بەرامبەر بە باجدان هەر کەسێکی بخوازێت دەتوانێ جێگای خۆی لەناو سیستەمدا بگرێت. ئەوانەی هێرش بکەنە سەر ئیسلامییەت بە کافر رادەگەیەنرێن و تاکو دوایی شەڕ لە دژی ئەمانە وەکو گەورەترین عیبادەت دەبینرێ، وەکو ئەرکی **جیهاد** دادەنرێتە پێش تەواوی ئومەت. خودی زاراوەی ئومەت بە واتای ئەنتەرناسیۆنالیزمی ئیسلامییەت دێت. شوێنگەی ڕێکی جێگا و شوێنی چینی لیبرالی رۆژگاری ئەمرۆمانە. بەمجۆرە بە گوێرەی نەخشەی مێژوویی لە کاتێکدا یەهودییەت ئایینی چینی سەرووە، مەسیحییەتیش ئایینی چینی هەرە ژێرە، ئەوا ئیسلامییەتیش ئایینی چینی ناوینە. بێگومان بەردەوام بوونی هەرسێکیان تا رۆژگاری ئەمرۆمان گرێدراوی ئەم پایە کۆمەڵایەتی و تایبەتمەندێتییە مرۆڤ پەروەرانەیانە.

بەو رادەیەی ئیسلامییەت یەکبوونی تیرە و هۆزەکانی پێکهێناوە رۆڵێکی ئەرێیی هەیە لە بەنەتەوە بوونی چاخەکانی ناویندا. هەروەکو چۆن سەرمایەداری ڕێگای لەپێش نەتەوە و میللەت کردۆتەوە، ئەوا ئیسلامییەتیش رۆڵێکی گرنگی لە پێکهاتنی قەوم و نەتەوە بوون هەیە. بە تایبەتیش ئەو رەچەڵەکانەی دەسەڵاتدار بوون ئەوا لە پێشکەوتنی قەومەکانی خۆیاندا بە شێوەیەکی سەرکەوتووانەتر ئەم رۆڵەیان گێڕاوە. عەرەب و فارس و تورکەکان کە لەو قەومانەن بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن دەسەڵاتی ئیسلامییەتیان بەدەستەوە بوو، ئەگەر بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژیش نەبێ، بە شێوەیەکی بابەتیانە رۆڵێکی دیاریکراویان هەیە کە عەرەبەکان، فارسەکان و تورکەکان تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆشمان لەو نەتەوە موسوڵمانانە بن کە لە ریزی پێشەوەدا جێگای خۆیان دەگرن. ئاشکرایە ئەگەر ئیسلامییەت نەبوایە چارەنووسیان زۆر جیاوازتر دەبوو. هەڵسەنگاندنی پەیوەندی ئیسلامیەت لەگەل چینایەتی و نەتەوایەتی بە شێوەیەکی قووڵ سوودمەند دەبێت. وەلێ هەڵسەنگاندنێکی ئەوتۆ دەرهەق بەم مەسەلەیە نەکراوە؛ تەنیا لە میانی بەلاوەنانی شۆڤینیزمی میللی و ئایینی، لەم بوارەدا، بۆ ئاشتی و برایەتی هەنگاوەنان بەرەو ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی ئیسلامی کراوە، رۆڵێکی بونیادنەرانە دەبینێ لە بەلاوەنان و چارەسەرکردنی گەلێك کێشەدا. ئیسلامییەتیش وەکو مەسیحییەت دەبێ ببێتە خاوەن گەوهەرێکی ئاشتیەکی دادپەروەرانە و واتادار. کێشەی چەمکی مرۆڤپەروەرانە و ئاراستە گرتن بەرەو ئەنتەرناسیۆنالیزم چارەسەر بکات، ئەمانەش گرنگترین ئەرکن کە پێویستە جێبەجێ بکرێن.

لە بواری تاکە کەسدا ئیسلامییەت مرۆڤ بە "**أشرف المخلوقات**" ناودەبات، ئەمەش بە واتای شەرەفمەندترین بوونەوەر دێت. ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت ئەمە چەمکێکی مرۆڤایەتی قووڵە. دەتوانرێ بگوترێ کە بەرامبەر بە کۆیلایەتی ئەم زاراوەیەی مەزن کردووە. ئەو مرۆڤەی سیستەمی کۆیلەداری، سووکایەتی پێکرد و بچووکی کردەوە، ئیسلام دەخوازێ لە ڕێی شەرەفمەندییەوە بەرزی بکاتەوە. ئەوە مسۆگەرە سەبارەت بە تاك، خاوەنی چەمکێکی پێشکەوتووخوازە. بەخشینی شەرەفێکی بەمجۆرە بە مرۆڤێك کە لە شوێنێکی وەکو رۆژهەڵاتی ناوین بە نێو چەندین پەرژینی هەمە رەنگی کۆیلایەتیدا دەرباز بووە، دەبێ وەکو گرنگترین پێشکەوتنی ئەو چاخە ببینرێ. بەڵکو لە ئاستی ئازادی کۆمەڵگا زیاتر نزیکی ئازادییەکی پێشکەوتووخوازانەتری تاك بۆتەوە. پارچە کردنی پێکهاتەی رۆحی و هزری کۆیلەداری، راگەیاندنی ئەوەی کە لە بەندایەتی خودایەکی تاقانە و نادیار بەولاوە مرۆڤ نابێتە بەندەی هیچ کەس و شتێکی دیکە، تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان دەرك بە بەهاکەی نەکراوە و پێویستە وەکو شۆڕشی ئازادی تاك بنرخێنرێ. یەکێك لە دەسکەوتە گرنگەکانی ئیسلامییەت ئەوەیە ئەو مرۆڤەی لە میانی پەیوەندییە وشکەکانی کۆیلایەتی پاشماوەی سەردەمی میسر و سۆمەر و شێوەگرتنی رۆحی و هزرییەکەی کە لە رۆژهەلاتی ناویندا ماوەتەوە، زۆر لە گەوهەری خۆی جیاوازتر دووچاری نامۆ بوون هاتووە، ئەگەر بە رادەیەکی سنوورداریش بێت لە گەوهەری خۆی نزیك کردۆتەوە. لێرەدا دۆزینەوەی یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی کاریگەر بوونیان واقیعی ترە.

مرۆڤایەتی ئەو سەردەمە لەم بوارەدا بە قووڵی دەرکی بە ئیسلامییەت کردووە و گرێدانێکی بێ دوودڵی نیشانداوە، جارێکی دیکە تواناکاری دەرککردنی هەنگاوە مێژووییەکانی نیشانداوە. گەورەترین ئەنجامی شۆڕشی ئیسلامییەت سەبارەت بە تاك بەمجۆرەیە. بە تەواوەتی کۆتایی بە کۆیلایەتی نەهێناوە. زەمینەیەکی تەواو و لەباریشی بۆ ئەو ئازادیەی تاکە کەس نەرەخساندوە کە سەرمایەداری بەدیهێناوە. بەڵام دیسان ئیسلامییەت رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە لە کۆتایی هاتنی یەکجارەکی کۆیلایەتی و ئەو دەسکەوتەی سەرمایەداری سەبارەت بە ئازادی تاکە کەس بەدیهێناوە. بە بێ ئەوەی بیر لە ئیسلامییەت بکرێتەوە، باسکردن لە بەلاوەنانی کۆیلایەتی، شتێکی واقیعی نییە. ئیسلامییەت لە مەسیحییەت زیاتر لەمیانەی هەنگاوی رادیکالانە، کۆیلەداری بەلاوە ناوە و هەروەکو چۆن ئەم چالاکیە رادیکالانەی بۆ تەواوی گۆڕەپانەکانی شارستانییەت گواستەوە، هاوکات چەندین تیرە و گروپی ئەتنیکی لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە دەرباز کرد، بە بێ ئەوەی بە کۆیلایەتیدا دەرباز ببن و بەمرەنگە توانیویەتی بەرەو رەوشێکی پێشکەوتووتریان ببات. لەم بوارەدا ئەگەر بگوترێ ئیسلامییەت ئەو سیستەمە شارستانیە کە بە رادەیەکی هەرە زێدە جیهانی بۆ ئەنتەرناسیۆنالیزمی سەرمایەداری ئامادە کردووە، ئەوا ئەمە هەڵسەنگاندنێکی واقیعی ترە.

## ج ـ بەدەزگابوون و پەلهاوێشتنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی

کاتێك لەمیانەی قەڵەمبازەکانی مەسیحییەت و ئیسلامییەت، کە لەسەر بنەمای داب و نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم ئەنجامدرا، سەلمێنرا کە دەتوانرێ دەزگا سیاسیەکان و ئەو پێکهاتە رۆحی و هزرییە بەلاوە بنرێت کە کۆیلەداری خولقاندبووی، ئەوا دەربازبوون بۆ قۆناخی بەدەزگابوون و بڵاوبوونەوەی دەرەبەگایەتی بۆتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو. کاتێك مەسیحییەت لە ڕێگای پێشکەوتنی سروشتی خۆی لە نێو خەڵکدا، ئیسلامییەتیش بە شێوەیەکی هەرەمەکی لە ڕێگای شۆڕشگێڕییەوە، سیستەمی کۆیلەداری رۆژئاوا و رۆژهەڵاتیان کون کون کرد و لە پەلوپۆیان خست و کۆتاییان پێهێنا، ئیدی شێوە نوێکانی شارستانییەت لە بەدەزگابوون و بڵاوبوونەوە دووچاری تەنگ و چەڵەمە و ئاستەنگی نەهاتن.

قۆناخە ئایدیۆلۆژییەکان ئەو کەسایەتیانە بونیاد دەنێ کە لە دەورووبەری پێکهاتە کۆمەڵایەتیە نوێکەدا گەشە دەکەن. بە واتایەکی دیکە ئەمە کۆششی دارشتنی پرۆگرام و بونیادنانی کادیری سیستەمی نوێیە. گەرچی پڕوپاگەندەی جەماوەری و چالاکییە، خەباتی لە پەلوپۆ خستن و بێ واتا کردنی سیستەمی کۆنە. بە شێوەیەکی گشتی ئەم قۆناخە بە قۆناخی شۆڕش ناودەبرێت. قۆناخی ئایدیۆلۆژی و ساڵانی شۆڕش لە مەسیحییەتدا درێژ خایەن بووە. وتەکانی عیسا و حەوارییەکانی سەرەتا؛ کەسایەتی بنچینەیی و کادیر و پرۆگرام پێکدێنێت. ئەو قۆناخەی تاوەکو راگەیاندنی وەکو ئایینێکی فەرمی بەردەوام دەکات، لەسەر بنەمای پڕوپاگەندەی جەماوەری و چالاکیە و نزیکەی سێ سەد ساڵ بەردەوام بووە. سەربارى ئەشکەنجە تۆقێنەرەکان، لە ئەنجامی باوەڕییەکی مەزن و ئاشتی و برایەتیەوە باوەڕی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە کۆنەکانی هەڵوەشاندۆتەوە، لە میانی بونیادنانی باوەڕی و پەیوەندی نوێوە گەیشتونەتە یەکەمین سەرکەوتنی خۆیان. ئیسلامییەت لە کەسێتی مەحەممەد کەسایەتی پێشەنگی دۆزیوەتەوە، لە رێگای یەکەم روونکردنەوە و وتەکانی سەرەتادا گروپێکی بچووکی مەککەی خاوەن باوەڕی پرۆگرام و کادیری خۆی پێکهێناوە، هەر زوو کەوتۆتە نێو قۆناخی شۆڕش کە لایەنی چالاکی لەپێشە. بە شێوەیەکی بنچینەیی سەردەمی حەزرەتی مەحەممەد و هەر چوار خەلیفەی (راشیدی) کە نزیکەی چل ساڵی خایاندووە بە سەرکەوتن گەیشتووە.

لەهەر شۆڕشێکی گرنگدا قۆناخی هاوشێوەی ئەوە لە ئارادایە. لە کاتێکدا شۆڕشەکان لە ماوەیەکی کورتدا ئامانجەکانی قۆناخی یەکەم دەپێکن، ئەوا لە پێشکەوتنی سروشتی (تدریجی) ئەم قۆناخە درێژ خایەنترە. جیاوازی نێوانیان زیاتر سەرچاوەی خۆی لە شێوازی تێکۆشان و کار وەردەگرێت. سەردەمەکانی دواتر قۆناخێکی جیاوازترە؛ بە گشتی ناوزەد کردنی ئەم قۆناخانە بە قۆناخی دەزگابوون و بڵاوبوونەوانە، گونجاو و لە جێگای خۆیدایە. پرەنسیپەکانی شۆڕش و شێوازی پەیوەندییەکانی مۆدێلی دەستپێك و بەدەزگابوون، پێویستی بڵاوبوونەوانە و پەلهاوێشتنی قووڵ و فراوان دەکاتە پێویستیەك. لە قۆناخی هەرە دواییدا کە سیستەم دەگاتە لوتکە، ئەوا لەمیانەی قۆناخی کەوتندا هەڵدەوەشێتەوە و جێگای خۆی بۆ پێکهاتەی نوێ بەجێ دێڵێ.

١ ـ قۆناخی بەدەزگابوونی مەسیحییەت، لە ماوەی نێوان ٥٠٠ تا ١٠٠٠ ی زایینی بەردەوام لە نێو گەشەکردن و بڵاوبوونەوەدایە. لەگەڵ ئەوەی دەبێتە ئایینێکی فەرمی، لەناو ئیمپراتۆرییەتی رۆما بە شێوەیەکی ئاشکرا بەرەو بەدەزگابوون دەچێت. ئەم بەدەزگابوونانەی لەسەر بنەمای کڵێسە پێشکەوتوون، بە بەراورد کردن لەگەڵ سیستەمی ماناستەر، پێشکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێناوە. هەروەکو چۆن لە دەورووبەری پەرستگای سۆمەریەکان شار دەئافرێنرێن و دەوڵەت ئاوا کرا، ئەوا لە سەردەمی دەرەبەگایەتیشدا رەوشێکی لێکچووی ئەوە لە ئارادایە. لە دەوروبەری کڵێسە و لەمیانەی پێشکەوتووترین بیناسازیدا سەرلەنوێ شارەکانی چاخەکانی ناوین ئاوا دەکرێنەوە و دەبنە تۆوی ئەو دەوڵەتانەی دواتر پێشدەخرێن. لە راستیدا ئەوەی ئەوروپای بۆ شارستانییەت ئامادە کردوە دەزگای فەرمی کڵێسەیە. کڵێسە گەیشتبێتە کوێ، زانکۆیەك لە دەورووبەری خۆی دەکاتەوە، لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان شاری نوێ سەرهەڵدەدەن، یان بەڕێوەبەرێتی میرنشینەکان یاخود شارەوانی ئاوا دەکرێن و ئەمەش دەبێتە هەنگاوێك بەرەو دەوڵەتی هاوچەرخ. لە هەموویان گرنگتر، لەمیانەی پەروەردە کردنی پێکهاتنی رۆحی و هزری گەل بە گوێرەی راستینەی ئیرادەی خودا، بناخەی دەوڵەتی چەرخەکانی ناوین دادەنێ و بەهێزیان دەکات. هەروەکو چۆن ئیمپراتۆرییەتی رۆما هەڵوەشایەوە کە باوەڕی و بەها ئەخلاقییەکانی لەدەستدابوو، ئەوا لەمیانەی باوەڕی و پێکهاتەی ئەخلاقی نوێ بناخەکانی رۆمای پیرۆز و ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانی و فرانگ دانراوە. ئەگەر کڵێسە نەگەیشتبوایە تەواوی بەربەرییەکانی ئەوروپا و پەروەردەی نەکردنایە، ئەوا نەدەشیا باس لەو شارستانییەتەی ئەوروپا بکرێت کە پاشان پێشکەوت. چونکە ئایدیۆلۆژیایەك لە ئارادا نەبوو بەربەرەکان بەرەو شارستانییەت ببات. شارستانییەتیش بە بێ ئایدیۆلۆژیا نابێ. مەسیحییەت کە سیستەمی بەهای ئەخلاقی و باوەڕی رۆژهەڵاتی ناوینە، کاتێك بەرەو ساڵانی ١٠٠٠ ی زایینی بە تەواوی ئەوروپای فەتح کرد، دەرگای بۆ شارستانییەت ئاواڵا کرد.

نیشاندانی مەسیحییەت بە پاشڤەرۆیەتی و هۆکاری رووخان، ئەم رۆڵە مێژووییەی لەبەرچاوان ناخات. شارستانییەتی ئەوروپا بەرهەمێکی مەسیحییەتە. رۆحی بەربەریانەی پاشماوەی چاخی هۆڤێتی ئەوروپا و بەها ئەخلاقی و باوەڕییەکانی هەزاران ساڵە دەپاڵێوێ و شێوەی مرۆڤی شارستانی خوڵقاندووە. لە دەورووبەری ئەم مرۆڤەدا کۆمەڵگای نوێی شار و گوندێتی پێکهاتووە، لەسەر بنەمای ئەم شار و گوندانەش دەوڵەتی پیرۆزی چاخەکانی ناوین ئاوا کراوە. ئەم سەردەمە ئەو قۆناخانەن کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، بەهاکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین گواستراونەتەوە. هەروەکو چۆن لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆ هەموو لایەنێکی جیهان دەگوازرێتەوە، ئەوا بە درێژایی هەزاران ساڵیش هەروەکو چۆن بۆ تەواوی جیهان گواستراوەتەوە، ئەوا توانستە مەزنەکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئەوروپاش گواستراوەتەوە.

لە دوای ساڵانی ١٠٠٠ ی زایینی کڵێسە بە تەواوی بەسەر سیاسەتدا زاڵ دەبێت. ئیتر کڵێسە بەخۆی دەوڵەتە. هەروەها ئەو هۆز و تیرە ئەتنیکیانەی لەناویاندا دەجووڵێتەوە، بەرەو یەکینە فراوانەکانی قەومیان دەبات، رێگایان لەپێش دەکاتەوە کە ببن بە نەتەوەیەکی پێشکەوتوو. ئەو قاڵبوونەوە و چڕبوونەوەی لە دەورەی کڵێسە بەدیدێت، رۆڵێکی گرنگی هەیە لە قاڵبوونەوەی نەتەوەگەرایەتی و گەیشتن بە زاراوەی وڵات. لەم چوارچێوەیەدا ئەوروپای چاخەکانی ناوین سەبارەت بە پێکهاتنی نەتەوایەتی قەرزاری کڵێسەیە. بە تایبەتیش لەمیانەی دەسکەوتەکانی لە پێشخستنی زمان و کولتوورێکی هاوبەش، لە ئاستێکی زۆر دیاریکراودا ئەم رۆڵەی گێڕاوە. لە رێی فێرکردنی خوێندەواری و تەواوی ئەو کولتوورە کەڵەکەبووەی مرۆڤایەتی، ئەوروپای کردووە بە خوێندەوار و خاوەن کولتوور. هەرچەندە مۆری ئایینی پێوە بێت، یەکەمین تیۆلۆژی و هزری فەلسەفی بڵاو کردۆتەوە، پێکهاتەی ئەقڵ و هزری گونجاوی بۆ قەڵەمباز ئاوا کردووە؛ پێشەنگایەتی شێوەبەندی نوێی کردووە، بنەماکانی چاخەکانی رێنسانس و زانستی داناوە کە دواتر دێنە ئاراوە. هێزێکی فراوان بوونی هێشوویی و بە قووڵایی نیشانداوە و تاوەکو چیاکانی ئۆرال و تەواوی کیشوەردا بڵاوبۆتەوە،

بەدەزگابوون و بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە رۆژهەڵاتدا هەمان سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە. سەرەتا ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ـ پارس و دواتریش ئیسلامییەت لە پێشیدا دەبنە کۆسپ. یۆنانیەکان کە مەسیحییەتیان بەرەو رۆژئاوا بردووە، ئاشووری ـ سوریانیەکانیش هەمان رۆڵی یۆنانیەکانیان لە رۆژهەڵاتدا بینیوە. بە تایبەتیش کڵێسەی ئایینزایی نەستوری خاوەن رۆڵە لە جێگیربوونی کڵێسە لە رۆژهەڵاتدا. پشت بە شاکارە فەلسەفیە کلاسیکییەکانی یۆنان دەبەستن و رۆڵێکی بەرچاویان هەیە لە گەشەکردنی تیۆلۆژیای مەسیحییەت و داوییش گواستنەوەی بۆ ئیسلامییەت و بەمجۆرەش شوێنگەی کەڵەکە بوونی توانستەکان و ئەزموون بەخشین دەبینن. لە بە موڵککردنی چاخەکانی دێرین بۆ چاخەکانی ناوین، هەوڵ و کۆششی چڕ و بەردەوامی ئەم راهیبە نەستوریانە، بەهایەکی ئێجگار مەزنی هەیە. ئەمانە گرنگترین رۆشنبیرانی چاخەکانی ناوینن کە لەسەرپێیان ماونەتەوە. بەڵگە نەویستە رۆڵێکی مەزنی توانستە کولتوورییەکانی ئاشوور ـ بابل لەمەدا هەیە کە لە سۆمەریەکانەوە ماوەتەوە.

مرۆڤ ناتوانێ ئەم پرسیارە نەکات: هەروەکو چۆن لە ئەوروپا روویدا، ئەگەر لە ئاسیاشدا لەمیانەی کڵێسەیەکی رۆشنبیرانەتر، مەسیحییەت دەزگای خۆی ئاوا بکردایە و زاڵ ببوایە، ئایا مێژوو چۆن رێڕەوی دەگرت؟ مرۆڤ باوەڕ بەوە دەکات لەدەستدانی شانسی رۆشنگەری و سەرلەنوێ بە شارستانی بوونی مانی و ئەو جولانەوەیەی راهیبە سوریانیەکان رێبەرایەتیان کرد، میزۆپۆتامیا گەلێك شتی لەدەستدا. ئەمە بە بیری مرۆڤدا دێت کە سوڵتانە ئەمەوی و عەباسیەکان لەمیانەی هێزی ئیسلامییەتی کە لە بەر دەستیانەوە بوو، شارستانییەتێکی شایستەیان بەم خاکە نەخوڵقاندووە کە دایکی شارستانییەتی مەزنە و لە هەموو بوارێکدا بە لاوازی ماونەتەوە، هەر زوو کەوتوونەتە ناو رابواردن و کەیف و سەفا و گەلێك شتیان لەدەستداوە. ئەگەر لەگەڵ پێکدادانە ئایینیەکانی ئەوروپا بەراورد بکرێت، ئەوا دەبینرێ پێکدادانی ئیسلامی ـ مەسیحی، کە رێگای لەپێش تراژیدیا کردەوە، رۆڵێکی یەکجار تێکدەرانەی بینیوە. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا کاتێك گفتوگۆکانی سەبارەت بە ئایین و علمانییەت دەکرێت، ئەوا هەڵوێستێکی رەخنەگرانە بەرامبەر بە مێژوو و ئەزموون دەرخستن، ئەرکێکە بایەخەکەی کەم نەبۆتەوە و پێویستی بە جێبەجێکردن هەیە.

٢ ـ بەدەزگابوون و پەلهاوێشتنی ئیسلامییەت دوای قۆناخی شۆڕش، دوای ئەوەی بنەماڵەی ئەمەوییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، پێشکەوت. بەرزبوونەوە و باڵادەستبوونی بنەماڵەی ئەمەوی لەمیانەی شۆڕشێکی چەواشە، سەر راست کراوە. بەرامبەر بەوەی حەزرەتی مەحەممەد پشتی خۆی بە هۆزی هاشمی خێڵی قوڕەیش بەستووە، عوسمان و مەعاویە پشت بە هۆزی ئەمەوی دەبەستن. بەڕێوەبەرایەتی مەککە زیاتر بەدەست ئەم هۆزەیە (ئەمەوی). بە واتایەکی تەسك و سنووردار، حەزرەتی مەحەممەد دەسەڵات لەدەست ئەم هۆزە دەردەخات و لەمیانەی شۆڕشێکی نوێدا دەیکات بە بونیادنانی دەوڵەت. ئەم مەیل و هەڵوێستە شۆڕشگێڕییە، هەروەکو چۆن خاوەنی ئاسۆیەکی مەزنی پێشکەوتنە، بۆیە تیرەگەرێتی تێپەڕ دەکا و بەرەو بەدەزگابوونی سیاسی و سەربازی نوێ هەنگاو دەهاوێژێت؛ تەواوی ئەمانەش لەسەر بنەمای ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی نوێ و ئایەت و فەرموودەکانەوە پێشدەخات.

دوای ئەوەی شۆڕش بە تەواوی گەیشتە سەرکەوتن هۆزی ئەمەوی بووە موسوڵمان. هەنگاو هاوێشتنیان بۆ موسوڵمانییەت بە نابەدڵی و لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بووە. لە ناوەوە رقیان لە موسولمانەکان دەبۆوە، هەروەها لەگەڵ کۆچی دوایی حەزرەتی مەحەممەد ئامادەکارییەکانی خۆیان خێرا کرد. والییەتی مەعاویە لە شام وەکو ناوەندی شۆڕشی چەواشە کاری کردووە. مەعاویە سەبارەت بە هونەری دەسەڵات خاوەن ئەزموونتر بوو؛ لە شام فێری هەموو فێڵ و تەڵەکەبازیەکی بێزەنتیەکانی سەبارەت بە دەسەلات بوو. نەوەکانی "**بەرمەکیەکان**"ی لای خۆی گلدا بۆوە، کە نوێنەرێکی بەهێزی نەریتەکانی دەسەڵاتی ئێران بوون. لە کەسایەتی حەزرەتی عەلی دا نوێنەرایەتی ئەهلی بەیت (أهل ألبيت) دەکرا. دڵسۆز بوو، خاوەن هەق و لایەنگری ئەوەبوو کە شۆڕش بە گوێرەی گەوهەرەکەی خۆی بەردەوام بکات. بەڵام لە بواری دەسەڵاتدا زۆر بێ ئەزموون و وەکو پێویستیەکی دڵسۆزیش زۆر سادە (ساف) بوو. لەگەڵ ئەوەی خاوەن پرەنسیپ بوو، بەڵام سەبارەت بەدەزگابوونی دەوڵەت، کارامە نەبوو. لە کاتێکدا وەکو ملیتانێکی شۆڕشی ئیسلامی زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڵام سەبارەت بە دەزگابوونی ئەم هێزە و بە دەوڵەت بوون، بە گوێرەی مەعاویە لاواز بوو. هەروەها باوەڕی بەوە دەکرد ئەوانیش وەکو خۆی بە دڵسۆزییەوە گرێدراوی ئایینی پیرۆزن. دواتر دەردەکەوێ کە ئەم لێکدانەوەیەی هەڵە بووە.

بەڵکو یەکێك لەو شۆڕشە چەواشە هەرە گەورانەی مێژوو ئەوەیە کە لەژێر ناوی بنەماڵەی ئەمەوییەکانەوە ئەنجامدراوە. سەرۆك و ریش سپیەکانی ئەم بنەماڵەیە هیچ کاتێك بەرامبەر ئیسلامییەت دروست و دڵسۆز نەبوونە، لە ناوەوە رقیان لێ بووە، لە کاتی سەرکەوتنەکانیشدا بە رادەیەکی هەرە زێدە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دابین کردووە، لە رێی خەلیفە عوسمانەوە هەنگاوێکیان بەرەو پێشەوە هاوێشت، لەگەڵ کوشتنی عەلی و شەهید کردنی حوسێن لە کەربەلا بە شێوەکی هۆڤیانە، بە تەواوەتی دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت. ١٤٠٠ ساڵە ئومەتی ئیسلام لەژێر ئێش و ئازاری ئەو شۆڕشە چەواشەکاری و پیلانگێڕیە دەناڵێنی کە لە نزیکەی ساڵانی ٦٤٠ ی زایینی تاوەکو ٦٨١ ی زایینی بەردەوام بوو. ئەوەی ئەنجامدراوە لەمیانەی سوود وەرگرتن لە کاریگەرییە بەهێزەکانی شۆڕشی ئیسلام، سەرلەنوێ زیندوو کردنەوەی تیرەگەرێتی و بنەماڵەگەرێتیە. ئەم هەنگاوە بە درێژایی مێژووی ئیسلامییەت زۆر لەوەی کە مەزەندە دەکرێ زیاتر پاشڤەرۆیەتی لەخۆوە گرتووە، هێزێکی مەزنی بە کارەکتەری چەوسانەوە و سەرکوتکارانەی کۆمەڵگای کۆن بەخشیوە. ئەوەی ماوەتەوە ئیسلامییەتێکی رووکەشییە، تەنانەت خیانەتکردنە لە گەوهەری ئیسلامییەت.

لەمیانەی ١٢ **ئیمام** و جولانەوە **شیعی و باتنیەکان**ی دواتر پێشکەوتن و بەدوای ئەم گەوهەرەدا گەڕاون و خواستویانە بیپارێزن. بەڵام ئاستەمە بڵێین ئەم جولانەوانە کە لەمیانەی هەوڵ و کۆششی مەزنەوە بەڕێوەبران سەرکەوتن. هەر بۆیە مێژووی ئیسلامییەت بە مێژووی چەواشە لە قەڵەمدەدرێت، ئەوکاتە واتادار دەبێت کە، ئاماژە بە راستینە گرنگەکان بکات و موسوڵمانە شۆرشگێڕەکان و دژە شۆڕشەکان لێك جیابکاتەوە و راستیەکان ئاشکرا و دەستنیشان بکات. مێژوویەکی ئیسلامییەت کە لە یەك ئاست و بە شێوەیەکی یەك لایەنە بێت، کاتێك مێژووی خیانەت و دژە شۆڕشی شاردەوە، ئەوا بە واتای کوێرایی تەواوی ئەو کۆمەڵگایانە دێت کە خۆیان بە موسوڵمان دادەنێن.

تاوەکو دیاردەی شۆڕشی چەواشە (دژە شۆڕش) و هەموو دەرئەنجامەکانی بە شێوەیەکی راست شینەکرێتەوە و چارەسەر نەکرێت، ئەوا ناشێ لە راستی مێژووی ئیسلامییەت تێبگەین و گفتوگۆی واتادار و بەجێ سەبارەت بە ئیسلامییەت ئەنجام بدەین. یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو نەزۆکیەی سەدان ساڵە لە کۆمەڵگاکانی ئیسلام و رۆشنبیرەکانی بەردەوام دەکات، ئەمەیە. رووداوی کەربەلا تەنیا سات و ئانی کارەسات و لێ قەومان نییە، مێژوویەکی نەفرین لێکراوی بەردەوامە؛ بەردەوامکردنی گەورەترین کارەساتە لەژێر ناوی ئیسلامییەتەوە. ئەو رووداوانەی ئێستا لە جەزائیر و ئێران و چەندین وڵاتی دیکەی ئیسلامی لە ئارادایە لە نزیکەوە پەیوەستی ئەم راستینە نەفرەت لێکراوەیە، هەروەها ئەوە دەسەلمێنێ کە لە میانی کاریگەرییەکی ساتەوەختیدا شۆڕشی چەواشە بەلاوە نانرێت. لەوەش گرنگتر، ئەوە نیشاندەدات، پێویستی شرۆڤەیەکی نوێ و هاوچەرخانەی سەبارەت بە سەرلەنوێ ئاوا کردنەوەی ئەو شۆڕشەی کۆتایی پێنەهاتبوو و خیانەتی لێکراوە، وەکو کێشەیەکی زیندوو لە ئارادایە و بەردەوام دەکات.

هەروەکو دەزانرێ گەلێك شۆڕش بە هەمان قۆناخی بەمجۆرە تێپەڕ بوون. کاریگەرییەکانی شۆڕشە هاوچەرخەکانی فەرەنسا و روسیا و دژە شۆڕشەکانیان، تاکو ئێستاش بەردەوامە. بەڵام کاتێك گەورەبوون و تایبەتمەندێتی گەردوونی و مێژوویی شۆڕشی ئیسلام بێنینە بەرچاوان، بۆمان روون دەبێتەوە پێویستە ئەم گفتوگۆیە ببێتە وەڵام بۆ کێشە تایبەتییەکانی رۆژگاری ئەمرۆمان و خاوەنی گرنگی و بایەخێکی مەزنە. ئەمەش ئەنجامدانی شیکردنەوە و چارەسەری بۆ ئەو ئێش و ئازار و قەیران و بە پاشکەوتوویی مانەوە و پێکهاتە پڕ لە گرفتەکەی کۆمەڵگای ئیسلامییەت دەکات بە ناچارییەك کە لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم مێژووەیە و کردارێك دەسەپێنێ کە کەوتبێتە سەر راستەڕێ.

سەرباری ئەو رەخنانەی پێشخرا، لە قۆناخی ئەمەوییەکاندا بەدەزگابوون و بڵاوبوونەوەی ئیسلامییەت خێراییەکی گەورەی بەخۆوە بینی. ئاقڵمەندێتی مەعاویە و ئەوانەی دوای ئەو دەسەڵاتیان گرتە دەست، رۆڵیان لەم پێشکەوتنانەدا هەیە. لە زەریای ئەتڵەسیەوە تاوەکو هیندستان پەلهاوێژی و بڵاوبوونەوانە ئەنجامدراوە. لە باکوور گەیشتۆتە بنارەکانی قەفقاسیا، لە باشووریش تاوەکو ناوەوەی ئەفریقیا رۆیشتووە. بە دەوڵەت بوون، بە واتایەکی دیکە بەدەزگابوونی سیاسی، سوود لە داب و نەریتی ساسانی و بێزەنتیەکان وەردەگرێت. ئۆرگانی نوێی دەوڵەت ئاوا دەکرێن، بنەماڵەی بیروکراتی لە جۆری بەرمەکییەکان دەکرێن بە بەرپرسیار. ئەو کەسانەی چینی ژووری کۆمەڵگایەك بە ئەندازەی ئەوەی کۆمەڵگاکانی خۆیان بە دەوڵەتی ناوەندییەوە گرێبدەن تۆکمە و بەهێز دەکرێن.

بە شێوەیەك مۆدێلی ئیمپراتۆرییەتی پارس بە بنەما دەگیردرێت. لەم بوارەدا هەر لە زووەوە لەگەڵ دەزگا سیاسیەکانی قۆناخی کۆیلەداری دەکەوێتە نێو رێککەوتنێك. لێرەدا نموونەیەکی بەهێزی کرداری ئەم رێککەوتنانە لە ئارادایە کە هەر شۆڕشێکی چەواشە لەگەڵ دەزگا باڵادەستەکانی کۆمەڵگای کۆندا پێشی دەخات. باڵادەستی بنەماڵەی ئەمەوی کە سەد ساڵ بەردەوام بووە، بەس بووە بۆ ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێزی بەناو ئیسلامییەت. بەڵام لە جوڵانەوەکانی ڤەبوون و داگیرکاری و تاڵانکاریدا هێندە زۆردارانە هەڵسوکەوتی کردووە کاریگەرییەکی پێچەوانەی کردووە و کاردانەوەی بەرامبەر نیشاندراوە. رەوتە رکابەرەکان بەردەوام هەبوون و کەم نەبوونەتەوە. تاوەکو بزووتنەوەی دوانزدە ئیمامەکە، خەواریجەکان و چەندین تەریقەتی باتنی لەم قۆناخەدا سەریانهەڵدا.

یەکەمین بەرخودانی سەرکەوتووانە لە ناوچەی خوراسانی ئێران پێشکەوت کە نوێنەرایەتی نەریتێکی مێژوویی درێژ خایەن دەکات. پارتەکانیش لەم ناوچەیەدا بەرامبەر بە داگیرکاری هێلینیەکان سەریان هەڵداوە و بە ئاوا کردنی خانەدان نشینی ئەرسەکیەکان ئەنجامگیر بوو، کە ٥٠٠ ساڵی خایاندووە. پارتەکان کۆمەڵەیەکی هەرێمین کە هەندێ جیاوازیان لەگەڵ فارس و مادە ئاریەکان هەیە. خاوەن نەریتی یاخیبوونن و ناوەندەکەیان خوراسانە. جگە لە بەکرێگیراوەکانیان، ئەمەویەکان رێگایان لەپێش کاردانەوە و بەرپەرچدانەوەی ئەهلی بەیت (بنەماڵەی پێغەمبەر) و تەواوی گەلانی دیکە کردۆتەوە. لە زووەوە گەلێك تیرەی عەرەبی کە نەتەوەی باڵادەست بوون بە تایبەتیش توێژە هەژارەکانی، لەمێژ بوو بە شێوەی

خەواریجەکان لە نێو سەرهەڵدان دا بوو. لایەنگرانی عەلی نەك تەنیا لە نێو عەرەبەکان، بەڵکو لە نێو تەواوی ئەو گەلانەی بە زۆرەملێ و زەبر کران بە ئیسلام لەژێر ناوی شیعە و عەلەوییەکان وەکو مەیل و هەلوێستێکی یاخیبوون جێگیر بوون.

ئێران لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە خاوەنی داب و نەریتێکی بەمجۆرەیە کە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەرپەرچی ئەو پەلامارانەی داوەتەوە کە لە رۆژئاوایەوە هاتوون. پارچەبوون و تێکشکانی ئیمپراتۆرییەتی رزیوی ساسانیەکان بەرامبەر بە چەند لێدانێك، رێگای لەپێش جموجوڵێکی نوێی ئەم نەریتەی کردەوە. هەروەکو سەرهەڵدانی پارتی دوای قۆناخی پارسەکان، دیسان لە بن رێبەرایەتی **ئەبوموسلیم** لە ناوەندی خوراسان پارت جولانەوەیەکی بەرخودان پێشکەوت. ئەو بەرخودانەی لەمیانەی تەڤلیبوونی چەندین گەلانی وەکو فارسەکان، کوردەکان و ئازەریەکان بە شێوەی هەرەس ئاسا مەزن بوو، لە ساڵی ٧٥٠ ی زایینی لە ئەنجامی رووخاندنی ئەمەویەکان بە سەرکەوتن گەیشت. دەشیا ئەمە بۆ ئیسلامییەت ببێتە دەرفەتێکی نوێبوونەوە. یادگارییەکانی شۆرش هێشتا زیندوو بوو. بەڵام بنەماڵەی عەباسییەکان کە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمەوییەکان نەبوو، ئەم دەرفەتەیان بە شێوەیەکی راست بەکار نەهێنا و مافی خۆیان پێنەدا. بە شێوەیەکی زۆر چەپەڵانە ئەبوموسلیمی رێبەری یاخیبوونەکەیان کوشت. کوشتنی ئەبوموسلیم هێندەی کوشتنی ئیمام عەلی رۆڵێکی خراپی بینیوە. هەر لە زووەوە گۆڕین و وەرچەرخانی دەرەبەگایەتی بۆ کارەکتەرێکی پاشڤەڕۆیی، لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم دوو تاوان و تیرۆرەیە. ئیمام عەلی و ئەبوموسلیم نوێنەرایەتی ئەو ملیتانە ئیسلامیانە دەکەن کە دادپەروەرن، لایەنگری هەژارانن، گرێدراوی پرەنسیپەکانن و دەمارگیری قەومیان لەلا نییە. ئاوا نەکردنی دەزگاکان و بە رادەیەکی زیاتر جولانەوەی نهێنیانەیان لە چوارچێوەی سنوورە تەسکەکانی تەریقەت، گەلێك ئەنجامی نادروست و نابەجێی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

گەلێك نموونە هەن دەیسەلمێنن کە بە ئایینزا بوونی مەیلە شۆڕشگێڕییەکان هێندەی بە دەسەڵاتبوونی شۆڕشی چەواشە، رێگای لەپێش پاشڤەڕۆییەتی کردۆتەوە. مەزهەبگەرایی، وەکو ناچارییەك لە رێ لادان لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هەڵبەتە کاتێك مەیلە شۆڕشگێڕییەکان سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، ئەوا هۆکارەکانی رێگا لەپێش مەزهەبگەرایی دەکاتەوە. مەزهەبگەرایی، کەڵەکە بوونی ژێرکەوتنەکانی شۆڕشە ژێرکەوتووەکانە؛ کفت بوونی کەم و کوڕی و هەڵەکانی شۆڕشە. هەرچەندە بانگەشەی گرێدان بە رێباز و یادی شۆڕشگێڕی بکەن، ئەوا لە ئیستسمار کردن و بەکاربردنی ئەم مەسەلەیە رزگاریان نابێت. سەرچاوەیەکی سەرەکی کە لە مێژوودا دەسەڵاتی شۆڕشی چەواشەیان لەسەر پێ راگرتووە، ئەم مەزهەبگەراییە پاشڤەرۆییەی رکابەرە شۆڕشگێڕەکانە. لە هەلومەجی هاوچەرخیشدا رەوشی مەزهەبگەرایی شۆڕشە نەتەوەییە دیموکراتیەکان بەرامبەر بە دەسەڵاتی دژە شۆڕش ئەوە نیشاندەدات کە ئەم راستینەیە وەکو دیاردەیەکی بەربڵاو لە هەموو سەردەمەکاندا هەبووە. ئەوەی بەسەر چەندین مەیلی شۆڕشگێڕێتی تورکیاشدا هاتووە نموونەیەکی دیکەی بەرچاوی بەرفراوانی ئەم دیاردەیەیە.

سەردەمی عەباسییەکان نوێنەرایەتی قۆناخی پێگەیشتن دەکات. بەهێز کردنی شرۆڤەی ئایینی ئیسلامییەت لەمیانەی فەلسەفەوە لەم قۆناخدا پێشکەوتنێکی مەزن بەخۆیەوە دەبینێ. زۆر پێش ئەوروپا، کلاسیکیە یۆنانییەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە هی ئەفلاتون و ئەرستۆیان بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕاوە. زیندووبوونەوە لە زانست و فەلسەفە دەستپێدەکات، قۆناخی رۆشنگەری بەڕێوە دەچێت. لە هەموو بوارێکدا باڵابوون بەدەست رۆژهەڵاتەوەیە. ماوەی نێوان ٨٠٠ تا ١٢٠٠ ی زایینی وەکو قۆناخی زێڕینی ئیسلامییەتە. مۆدێلی دەوڵەتی ناوەندی، هەروەکو بڵێی لە نێو هەر میرنشینێکدا هەوێن دەکرێ، کەمێك ماوە چەندین دەوڵەتی نوێ سەرهەڵبدات. مسۆگەرە ئەوکاتە لە سەرتاسەری جیهان ناوەندی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی بوو. ئیسلامییەت کاریگەری خۆی بۆ ناوەوەی ئیسپانیا (ئەندەلوس) تاکو چین، لە سیبریا تاکو قووڵاییەکانی ئەفریقیا گواستۆتەوە. تۆڕێکی مەزنی ئاسایش و دەزگاکانی ژێرخان و رێگا و کاروانسەراکان بۆ بازرگانی ئاوا کرابوون. بازرگانی تەواو لە نێو تەقینەوەیەکدا دەژی. لە هەموو گۆڕەپان و بوارێکدا پایەداری و باڵابوون بەرامبەر بە مەسیحییەت دەبینرێ. بە هەزار و یەك بەڵا، لەمپەر لەپێش فەتح کردنی ئەوروپا لەلایەن ئیسلامییەتەوە دروست کراوە. بەڵام لەمیانەی فەلسەفە و زانست و چەمکی بەڕێوەبەرایەتیدا هیچی لە هێزی کارتێکردنی خۆی لەدەست نەداوە. بۆ ئەوروپا، رۆژهەڵات وڵاتی خەیاڵەکانە؛ بەهاکانی شارستانییەتی رۆژهەڵات جیهانی خەیاڵیان بریقەدار دەکات. چەندین پەرتووك بۆ زمانی دیکە وەردەگێڕدرێ، دەکرێت بە موڵکی زمانی لاتینی و گەلێك زمانی دیکەش.

لە رۆژهەڵات تاوەکو هیندستان رۆیشتووە. لەمیانەی ئیسلامییەتەوە شارستانییەتی هیندستان دەربازی نێو قۆناخێکی نوێ بووە. بە ئیسلام بوون بە شێوەیەکی بەربڵاو بەڕێوە دەچێت، ئەم مەیلە تاوەکو چین درێژ دەبێتەوە. هۆز و تیرە تورکەکانی ئاسیای ناوین بە خێرایی دەبن بە موسوڵمان. تیرە تورك و مەغۆلییەکان، کە مێژوو دەهەژێنن، لەسەر بنەمای ئەو زەمینەی ئیسلامییەت ئاوایکردووە و دەزگاکانی پێشخستووە ئیتر دەکەونە نێو جموجوڵ. لەم قۆناخەدا لە ئایدیۆلۆژیاوە تاوەکو سیاسی بوون و سەربازی بوون، لە ئابووریەوە تاوەکو زانست، لە هەموو بوارێکدا ئیسلامییەت گەورەترین هێزی شارستانی جیهانە. رۆژهەڵاتی ناوین کە لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە پێشەنگایەتی شارستانییەت دەکات، هەم لەلایەنی فراوانی جوگرافیا و قووڵایی بەدەزگابوون و پێکهاتەی هزری، ئیتر لە دواترین قۆناخی پایەی پێشەنگی و بەهێزیدایە. وەکو رۆڵی هێزی خوڵقێنەری سەردەمی پێشەنگایەتی کەنزیکەی ١٠٠٠٠ پ.ز دەستپێکرد، ئیتر هەروەکو بڵێی لە کۆشکەکانی بەغداد و لەمیانەی ژیانێکی خەونەکانی چیرۆکی هەزار و یەك شەوە **(الف لیله و لیله)** بەرەو کۆتایی دەچێت. رێبازی شارستانییەت کە مێژووی ئافراند، لە لانکەدا مەزنی کرد، هەموو هەرزەکاری و بێ عارییەکانی بەلاوەنا و پێیگەیاند، دوای سەماکانی (سەماکەرە ژن و پیاوەکان ـ رقاصات و رقاصین ـ سەماکەرە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەم قۆناخەن) ئەم خەونانە بەرەو ژێر دادەکەوێت و دوای ماوەیەك کۆتایی پێدێت.

٣ ـ شێوەگرتنی مەسیحییەت و ئیسلامییەتی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، نوێنەرایەتی بە گەردوونی بوون دەکات. هەرچەندە شارستانییەتی دەرەبەگایەتی لە چین پێشکەوتنی نیشان دابێت، ئەوا تەواوی ناوچەوی هیندی ـ چینی و ژاپۆنیشی لەناودا، لە قۆناخێکی پاشکەوتووی خۆجێیی بەولاوە، واتایەکی تایبەت بەخۆی نییە. لە کاتێکدا گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکانی کیشوەری ئەمریکا لە نێو قوڵایی قۆناخی نئۆلیتیکدا ژیاوە، تازە بە تازە بە سیستەمی کۆیلەداری ئاشنا دەبێت. ئەفریقیا و ئوسترالیا لە چاخی تیرە بەربەریەکاندا دەژین. ئیسلامییەت و مەسیحییەتی کە ریشەی خۆیان لە کولتووری رۆژهەڵاتی ناوینەوە دەگرن لە ئاستێکی گەردوونیدا نوێنەرایەتی مرۆڤایەتی دەکات.

یەهوودییەت و هەموو جۆرەکانی تەریقەتی سۆفیگەرایی کە لەم ناوەدا ماونەتەوە لە گروپی بێ کاریگەر بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکەیان نییە.

بۆ یەکەمین جار مرۆڤایەتی لە رێگای ئیسلامییەت و مەسیحییەوە لەمیانەی چەمکێکەوە بەڕێوە دەچێت کە خۆیان لە جێگای خوداوەند دانانێن، بەڵکو وەکو سێبەر و نێردراوی دەنگی خوداوەند لە قەڵەم دەدرێن. ئەم تایبەتمەندێتیەیە، کە دەرەبەگایەتی لە سیستەمی کۆیلەداری و سیستەمە پاشڤەڕۆکانی پێش کۆیلەداری و سیستەمەکانی دەرەبەگایەتیش باڵاترن جیا دەکاتەوە. سیستەمی پادشایەتی ـ خوداوەندی شارستانییەتی کۆیلەداری، بە کۆیلایەتی رەهای مرۆڤ ئەنجامگیر بوو. بۆ یەکەمین جار مێژووی مرۆڤایەتی مەحکومی کۆت و بەندێکی ئاوا قووڵ دەبێت. رەوشێکی زۆر جیاوازتر لە ژیانی مرۆڤی سەردەمەکانی نئۆلیتیك و تەنانەت پالئۆلۆتیك هاتۆتە ئاراوە. گەلێك تایبەتمەندێتی سەرسوڕهێنەرانەی نیشانداوە. هەروەکو بڵێی شتێکی زۆر سروشتی و ئاساییە خزمەتکار و ژن و دار و دەستەی پادشا بە زیندوویی لەگەڵ تەرمی پادشا لە گۆڕ دەنرێن، لە خاچدان، سینگ تێکوتان، هەنجن هەنجن کردن لە لایەن شێرە برسیەکان هەندێ نموونەی سەرسوڕهێنەری ئەو سەردەمەن. هەروەها بونیادی ئەهرامەکان، گۆڕی پادشاکان، جۆگەڵەی ئاوەکان و بیناسازی شارەکان نموونەی دیکەی سەرنج راکێش و سەرسوڕهێنەرن. دەکرێ هۆڤێتی شەڕ و هەموو جۆر و رەوش و شێوازی کاری کۆیلەکانیش بخرێتە سەر ئەمە. بۆ پێناسیەکی راست دەرهەق بە شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، ئەوا ناچارییە

له نزیکەوە چۆنیەتی ئەو کاریگەرییە ببینرێت کە ئەم راستینە بابەتیە دەیکاتە سەر پێکهاتەی هزری و رۆحی مرۆڤایەتی. ئەنجامدانی بەراوردکاری بە گوێرەی سیستەمی کۆیلەداری، نەك سەرمایەداری و سۆسیالیزم، راستترین کردارە. بینینی لە دایکبوونی میتۆلۆژیای یۆنانی و ئایینە تاکخوداییەکان گرێدراو بەو سیستەمە، بۆ چەمکێکی راستی مێژوو مەرجە.

خوداوەندەکانی میتۆلۆژیا بۆ ئەوە لە لایەن راهیبەکانی سیستەم خولقێنران تاوەکو شێوەی پەیوەندی سیستەمی کۆیلەداری کۆمەلگای چینایەتی بکەن بە هەتا هەتایی و بەهێزی بکەن و دوای ئەوەی سیمای ئەزەلی پێدرا بە شان و شکۆتر کرا. چەمکی سیستەمی نەگۆری و ئەبەدی و ئەزەلی کە وەکو تایبەتمەندێتی سەرەکی سیستەمی خوداوەندەکان دانراوە، رەنگدانەوەی سیستەمە سامناکەکەی کۆیلایەتی سەر زەوییە. ئەمە هێندە لای سۆمەریەکان ئاشکرایە کە، مرۆڤایەتی چەندەی سوپاسی نووسەرەکانی سۆمەر بکات هەر کەمە. زۆر ئاستەمە گروپێکی دیکەی نووسەران ببینین کە وەکو ئەوان بە شێوەیەکی سەرنج راکێش ئەوە روون بکاتەوە کە چۆن خوداوەندەکانمان بەدەستی خۆمانەوە خولقاند و کردمان بە تاجی سەرمان. لە سەردەمی مێژووی نوسراو بەولاوە رۆژ بە رۆژ مرۆڤایەتی باشتر لەوە تێ دەگات ئەم تاجە چییە. بە تایبەتیش کاتێك بەردەوام ئەمە بێنینە بەرچاوان کە خودی دەوڵەتیش تاجێکی خوداییە کە لەم قۆناخەوە بۆمان ماوەتەوە، ئەوا باشتر سیستەمی سەرەکی و هێزی ماددی و ئەو هزرە تێدەگەین  کە بە ناوی کۆیلایەتییەوە خولقێنراوە، باشتر ئەوە دەبینین کە پەیوەندی نێوانیان خزمەتی بەچی کردووە. لەبەر ئەوەی پێغەمبەرەکانی (خولقێنەرەکان)ی ئایینی تاکخودایی سەرەتا لەمیانەی ئاستی دەزگای هزری و دواتریش دەزگای سیاسی و کۆمەڵایەتی سیستەمیان هەژاند و ئەو باوەڕی و ژیرییەیان پێشخست کە زۆر بەهادارن و دەتوانێ بیانگۆڕێت. بۆیە بەلاوەنانی ئەو بار و گرانییەی کە بە درێژایی هەزاران ساڵ وەکو مۆتەکەیەك لە هزر و رۆحی مرۆڤدا چەقیبوو، پێویستی بە باوەڕی و ژیری و ئازایەتی و هێزی بەرخودان هەیە.

تاوەکو ئێستا زانستی مێژوو (مێژووناسی) زۆر لەوە دوورە بە شێوەیەکی راست هێزی ئایین و بە گشتیش هێزی ئایدیۆلۆژیا پێناسە بکات. ووتەیەکی یەکجار وشکی جێگیر کردووە هەروەکو بڵێی هەندێ بوویەر لە دەرەوەی ژیانی ئەم مرۆڤایەتیە روویانداوە. هەربۆیە هێندەی ئایینیش بەهەند وەرناگیردرێت. ئەگەر تاوەکو ئێستاکەش خەڵك تا رادەی مردن (خۆ قوربانی کردن) گرێدراوی ئایدیۆلۆژیاکانی پێغەمبەران بن، ئەمە لەبەر ئەوەیە لەژێر رووخساری جیاوازتردا رژێمەکانی نەمرود و فیرعەونەکان لە ئارادان و بەردەوامن. ئاشکرایە ئاڵۆزییەك سەبارەت بە تەواوی ئەم مەسەلانە بەردەوامە. پێویستە باش بزانرێ تاوەکو رێنسانسی کولتووری رۆژهەلاتی ناوین ئەنجام نەدرێت ئەمە بەلاوە نانرێت. کاتێك جێگای هات، هەوڵدەدەین ئەوە روون بکەینەوە رێنسانسی ئەورووپا رووکەشییە و واتایەکی سنوورداری هەیە.. بەهۆی ئەو زەمینەیەی سەرچاوەی لێ گرتووە ئەمە رەوشێکی دەست لێبەرنەدراوە. لەبەر ئەوەی زەمینەی کولتووری رۆژهەلاتی ناوین گەردوونییە، بۆیە رێنسانسەکەشی بەرفراوانتر و گەردوونی دەبێت.

ئایدیۆلۆژیاکانی ئایینی تاکخودایی لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئایدیۆلۆژیای سیاسەتن. تەنانەت ئەمانە لە هزرە پێشکەوتووە سیاسییەکانی رۆژگاری ئەمرۆشمان زیاتر، واتای قووڵتری سیاسی لەخۆوە دەگرن. گوتەی (زاراوەی) ئایینی لە جۆری خودا، پێغەمبەر و فریشتە زمانی سیاسی قۆناخە. ئەو قۆناخەی کە ئاماژەمان پێکرد، لەبەر ئەوەی سیاسەت لەمیانەی ئەم رێنوسانەوە کراوە، ئەم زاراوانە بەکارهێنراوە. گرنگتر ئەوەیە لەبەر ئەوەی رەوشی هزری مرۆڤایەتی لەمیانەی ئەم قاڵبانە، واتە فێری شێوازی بیرکردنەوەی ئایینی کراوە، ئەم زاراوانە بەکار دێنێ. ئەوەی ئەنجامدراوە، تێکۆشان و ململانێی سیاسی بێ ئامانە. هەڵسەنگاندنی لە جۆری ئەوەی زمانی زانستی رۆژگاری ئەمرۆمانی نییە و بچووك بکرێتەوە، یاخود هەروەکو بڵێی زۆر لە راستینەی سیاسیمان دوورن، هەڵەی مەزن و خۆ خەڵەتاندنە.

پێویستییەکی زۆر بەوە هەیە داب و نەریتی پێغەمبەرەکان بۆ زمانی سیاسی رۆژگاری ئەمرۆمان بگۆڕدرێت. کاتێك لەسەر ئەم بنەمایە رۆشنگەری ئەنجامبدرێت، ئەوا تێکۆشانی علمانییەت واتادار دەبێت و ئەنجامی سەرکەوتووانە لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

دەبێ ئەوە وەکو راستینەیەکی واقیعی هەڵسەنگێنرێ شۆڕشی دەرەبەگایەتی و بەدەزگابوونەکانی سیاسەت ئازادییەکی سنوورداریان بەدی هێناوە. بەڵام دەبێ ئەمە لەمیانەی بەراورد کردن لەگەڵ سیستەمی کۆیلەدارییەوە ئەنجامبدرێت. ئەگەر تاوەکو ئێستاکەش حەزرەتی ئیبراهیم وەکو کەسایەتیەکی پیرۆز یادی دەکرێتەوە، راستینەی سەرەکی ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بە سەمبۆڵی ئەو کەسایەتی و مەیل و چالاکیانە دادەنرێت، کە بۆ جاری یەکەم سیستەمی پادشای خوداوەندی رژێمەکانی نەمرودیان درز کرد. مرۆڤایەتی زۆر باش دەزانێ چی بەهادار دەبینێ. بەڵام جێگای گومانە ئەو رۆشنبیرەی لە نێو رووداوە رۆژانەییەکاندا خۆی خنکاندووە، لەمە تێگەیشتبێت. هەروەها دیسان ئەگەر موسا وەکو ناوێکی مەزن یادی دەکرێتەوە لەبەر ئەوەیە کە بەرامبەر رژێمی فیرعەونی خوداوەند سەریهەڵدا و وەکو ناوی یەکێك لە قەڵەمبازە مەزنەکان یادی دەکرێتەوە. گەورەترین بەها کە عیسا سەمبۆڵیەتی؛ بە تاقی تەنیا بەرخودانییەتی بەرامبەر بە سیستەمی هەرە زۆرداری رۆما و دەزگای کاهینی بەکرێگیراو؛ سیستەمی رۆمای کە لەسەر بنەمای ژێرپێ کردنی هزر و رۆح و کەسایەتی پێشکەوتووی مرۆڤ بە شێوەیەکی هەرە هۆڤانە و زۆردارانە ئاوا کراوە، دەزگای کاهینەکان کە ناوی پێغەمبەرە مەزنەکانیان لەپێناو قرێژترین بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەکار هێناوە، هەر لەبەر ئەوە عیسا بە تەواوەتی خۆی فیدا کردووە؛ لە جیاتی تەواوی بەهاکانی ژیانی ماددی، ئەوەی هەڵبژاردووە ببێتە شەرەف و ویژدانی مەزنی مرۆڤایەتی؛ بە تەنیا بە بێ ئەوەی بیر لە ستراتیژییەت و تاکتیك بکاتەوە، گوێی بۆ دەنگی ویژدان (ووتەی خودا) رادێراوە؛ ئەگەر لەژێر سەختترین ئەشکەنجەشدا بێت بەرامبەر بە باڵادەستی رەهای سیستەمی کۆیلایەتی تاکو مردن بەرخودانی کردووە، ئەم راستینەیە عیسای کردووە بە سەمبۆل. هەر لەبەر ئەمە یەك لە سێی مرۆڤایەتی بەردەوام لە میانی هەست و سۆزێکی پیرۆزەوە یادی دەکاتەوە. گەورەترین سیاسەت؛ لە رێگای باوەڕی، لایەنی ئەخلاقی و گەردوونی بوونی، بەمجۆرە دەبێت. بەڵام سەبارەت بە حەزرەتی مەحەمەد، بە پێچەوانەی شیمانەکان، زیاتر جێ بە ژیری دەدات، چەمکە دێرینەکانی سەبارەت بە خوداوەند ژێرخاك دەکات، ئەو کەسایەتیە پیرۆزەیە کە خودای تاقانە و نادیار لە نەقۆڵاترین یۆتۆپیا مەزنتر دەکات و دەیکات بە یۆتۆپیای ئەڵڵا ـ قورئان ی دادوەر و خولقێنەر و لەم هەنگاوە سیاسیە مەزنەدا سەرکەوتن بەدەست دێنێ. کاتێك کۆیلایەتی ژێرخاك دەکات زۆر باش دەزانێ چی کردووە. لە ئاستێکی نائاساییدا دەرك بە خۆشەویستی مرۆڤ دەکات. سنووردار بوونی ئەو ئازادییەی کە لە هەلومەرجی ئەو قۆناخەدا بەدی هاتن، مەزنایەتی ئەم هەنگاوانە بچووك ناکاتەوە.

بە گرنگییەوە ئاماژە بەوە دەکەین؛ ئەگەر لەمیانەی دیدگای چاخی نوێوە ـ بەهۆی دوا قۆناخەکانی ـ تەماشای چاخی ناوین بکەین کە بە رێبەرایەتی ئیسلامییەت و مەسیحییەت پێشخرا، لەوانەیە بە سەردەمی تاریکایی ببینرێ. بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت بە گوێرەی جیهانی کۆیلەداری کە بە هەزاران ساڵ بەردەوام بوو، چاخێکی مەزنی رۆشنگەری بووە. دەشێ بۆ ئەوە رەخنە بکرێت کە کولتووری گریك ـ رۆمای داخست و کۆسپی لەپێش ناوەتەوە. بەڵام کاتێك لەگەڵ ئەو کۆیلایەتیە بەراورد بکرێت کە لەلایەن دواترین نوێنەری سیستەمی کۆیلەداری رۆما بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپێنراوە، ئەوا رۆڵ و دەسکەوتی میراسەکانی عیسا و مەحەمەد بۆ چاخەکانی ناوین بچوك ناکرێتەوە. خودی چاخەکانی ناوین بە گوێرەی ئەو جیهانە لەپێشە. لەوانەیە شاری شکۆداریان ئاوا نەکردبێت، شاکاری هونەرییان دانەهێناوە. بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت لێکردنەوەی کۆیلایەتی لە رۆح و هزری مرۆڤایەتی و فرێدانی ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت بەدیهێنانی هەنگاوێکی لەپێشتری ئازادی مرۆڤ، دەسکەوتێکی زۆر بەهادارە. ئەگەر چەرخەکانی ناوین وەکو قۆناخێکی ئامادەکاری چاخی نوێ هەڵسەنگێنین، ئەو کاتە دەبینرێ دواتر رۆڵێکی مەزنیان لە دامەزراندنی شاری مەزن و دروست کردنی شاکارە هونەرییەکان هەیە. کاتێك هەوڵ بدەین لەمیانەی پەیوەندییەکی دیالەکتیکیانە دەرك بە پێشکەوتنی مێژوویی بکەین، ئەو کاتە زۆر باشتر گرنگی و بایەخی مەزنی رۆڵی چاخەکانی ناوین ئاشکرا دەبێت.

## د ـ لوتکە و رووخانی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی

قۆناخی سالآنی ١٠٠٠ تا ١٣٥٠ ی زایینی هەم بۆ ئیسلامییەت هەم بۆ مەسیحییەت گوزارشت لە گەیشتنە لوتکە دەکات. بە شێوەیەکی بەخۆ باوەڕ لە بەشی هەرە زۆری جیهانی شارستانییەت دەسەڵاتی گرتە دەست، بە شێوەیەك دەڕیا هەروەکو بڵێی بە قۆناخێکی زێڕین گەیشتووە. ئیمپراتۆرییەتی ئاسمانی ئایینە تاکخوداییەکان بە ئامانجی پیرۆزی خۆی گەیشتووە، وادیارە ئەم سەرکەوتنە مەزنە جگە لە پیرۆزبایییەکانی یاد کردنەوە، کارێکی دیکەی نەماوە. جیهانێك نەماوە فەتح بکرێت. لەبەر ئەوەی لە یەکتر دەچن، کەوتنە ناو شەڕی یەکتر فڕکردن و ریشەکێش کردنی یەکدی واتایەکی نییە. بۆ باڵابوون، گفتوگۆکانی سەبارەت بە فەلسەفە ئەوەی دیکە تەواو دەکات. ئەم قۆناخە سەبارەت بە هێزێکی باڵای شارستانییەت، هەڵسەنگاندنی وەکو قۆناخی گەیشتن بە ئامانج و گەیشتنە لوتکە، راست و بەجێ یە. هەر رێکخراوێکی پرۆگرامەکەی بەدیهاتبێت، بە هەست و هزرێکی هاوشێوە دەرباز دەبێت. هەنگاوێك لەمە بەولاوە هەڵکشان نییە، بەڵکو کەوتنە. لە کۆگای ئایدیۆلۆژی سیستەمدا کەرەستەی هەنگاوێکی نوێی هەڵکشان لە ئارادا نییە. تەواوی هەنگاوە پێویستەکانی هەڵکشان هاوێشتراوە. ئەگەر بە یاری راکردنی ماراتۆن بەراوردی بکەین، دوای چل کیلۆمەتر ئیتر واتای لە پەلوپۆ کەوتنە. دوای ئەوەش وەستان و کەوتن دێت. هەرچەندە چوارچوار بە قۆناخە سروشتییەکان نەچێ، وەلێ مێژوو ئەو وانە و ئەزموونانەی نیشانداوە کە قۆناخەکانی کۆمەڵگاش گرێدراوی یاساکانی هەمان لۆژیکن.

هەروەکو بڵێی گەیشتنی ئەم قۆناخە بە لوتکە پشت راست دەکات، لەهەر دوو شارستانییەتیشدا گفتوگۆیەکی چڕ دەرهەق بە فەلسەفە دەکرێت. لۆژیك و پێکهاتەی هزری ئەرستۆ مۆرکی خۆی لە گفتوگۆ فەلسەفییەکان دەدات. لە قۆناخی دەرکەوتندا هەر دووکیشیان قورساییان خستۆتە سەر هزری ئەفلاتون. راستتر بڵێین لەژێر کاریگەری ئەم میراسەدان. کاریگەری "جیهانی (ئیدیا) نموونەیی"ی ئەفلاتون بەرزی کردووە، کاریگەرییەکەی لەسەر ئیسلامییەت و مەسیحییەت زۆر لەوە زیاترە کە مەزەندە دەکرێت. زاراوەی خودای تاقانە و داڕنراو (مجرد) بەرهەمێکی جیهانی ئیدیای ئەفلاتونە. هیچ فەیلەسوف و پێغەمبەرێك بە ئەندازەی ئەفلاتوون نەگەیشتۆتە ئاستی مەزنی "دەرك پێکردن"، ژیری و فکر. کاتێك بەردەوام لەلایەن خەڵکەوە بە پێغەمبەرێکی وەکو ئەسکەندەر، ناو دەبرێت لە جێگای خۆیەتی. بەخشینی گەلێك تایبەتمەندێتی دەوڵەمەند بە زاراوەی خودا ئەنجامێکی فەلسەفەی ئەفلاتونە. تەواوی زاراوەکانی سەبارەت بە باشی، جوانی، راستی وەکو پیرۆزییەك بوونەتە بابەتی هەڵسەنگاندنی ئەم فەلسەفەیە. زاراوەی "ما Me" یاسا کە سۆمەریەکان بە تایبەتمەندێتی شارستانییەتیان گوتووە، بە واتای هزری سەرەکیش دێت. لای ئەفلاتون "ما"کان بە واتای "ئیدیا" و هزر دێت. عیساش لەمیانەی زاراوەی وەکو "رۆحی پیرۆز"، "ووتەی خودا" هەڵوێستەی بەرامبەر دەکات. لەسەر بنەمای پشتبەستن بەم زاراوە سەرەکیانە یان ئاینێك یاخود سیستەمێکی فەلسەفی پێکدێت. هەرچی حەزرەتی مەحەمەدە ئەم زاراوەیە بە "هەبوون و یەکبوونی خودا" ناو دەبات. باس لەوە دەکات کە خوداوەند نەوەد و نۆ تایبەتمەندێتی هەیە. لای سۆمەریەکانیش ژمارەیەکی نزیك لەمەی تایبەتمەندێتی دەژمێردرێ. ئەفلاتۆن ئەم داتاشینەی بە شێوەیەکی سیستەماتیکانە پێشخستووە.

ئەم قۆناخانە بۆ مرۆڤایەتی قۆناخێکن بە نائاسایی و سەرنج راکێشانە دەبیندرێن. پیرۆزییەکی خودایی بە پێشکەوتنی ئەم زاراوە و واتایە دەبەخشرێ. هۆکاری بەهێزی و بە توانایی خودای حەزرەتی مەحەمەد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تەواوی زاراوە و توانستە هزرییەکانی ئەم قۆناخە مێژوویییە لە تاکە هەبوونێکدا "خودای تاك و هەمیشەیی" کۆ کراوەتەوە. هەروەکو بڵێی هزری خودایان وەکو ئەتۆم لێکردووە و هەموو تایبەتمەندێتیەکیان تێدا کۆکردۆتەوە. هەر بۆیە ئەو هەڵمەتانەی لەژێر ناوی خوداوەند ئەنجامدرا، بە ئەندازەی بەهای بۆمبای ئەتۆمی کاریگەر بووە. کاتێك کاریگەری ئەم زاراوانە لەمیانەی ئەنجامە سەرنج راکێشەکانی لە بواری کرداریدا خۆی سەلماند، ئەوا بایەخ و بەهایەکی یەکجار بەرز بە پراکتیزە کردنی فەلسەفە و، پەیڕەوکردنی فەلسەفە بەسەر ئاییندا دراوە. بە تایبەتیش ئەفلاتون گەڕێتی نوێ کە لە ئەنجامی یارمەتی فەلسەفەی ئەفلاتون وەکو شرۆڤەی هزری ئایینی پێشکەوت، ئەوا لە ئامادە کردنی ئەو زەمینەیەی ئیسلامییەت و مەسیحییەتی دەرخست و لە دایکبوون و پێشکەوتنیاندا کاریگەرییەکی گرنگی هەیە.

مەسیحییەت کە سەرەتا بە شێوەی قاڵبەکانی باوەڕی و یاسا ئەخلاقییەکان خاوەنی گەوهەرێکی سادەی ئایدیۆلۆژی بوو، لەمیانەی کاریگەری مەیلی فەلسەفی بەهێزی" ستۆواییەکان"ی ئەم قۆناخە، پێویستی شرۆڤەیەکی فەلسەفی دەرکەوتۆتە پێش. لەو گۆڕەپانەی تێیدا جموجۆڵیان کردووە، فێرگە فەلسەفییەکان هزری مرۆڤیان بەرەو پێش بردووە. ئیتر مرۆڤ تەنیا لە رێگای باوەڕییەکانەوە (ألعقائد) تێر نابن. ساینت ئۆگستۆنیۆس لەمیانەی ئەفلاتونگەرایی، نوێ وەڵامی ئەم پێداویستیە دەداتەوە. ئیتر مەسیحییەتی کە بە تیۆلۆژیای خۆی گەیشتووە بەهێزتر دەبێ. هەڵسەنگاندنی دەستپێکەکانی ئیسلامییەت و حەزرەتی مەحەمەد وەکو نوێنەرێکی بەهێزی ئەفلاتونگەرایی نوێ، هەڵە نییە. رادەی بەرزی ژیری ئیسلامییەت و تایبەتمەندێتیە بەهێزەکانی خودا، پتەوترین بەڵگەی ئەفلاتونگەرایی نوێیە.

ئەو مشت و مڕە فەلسەفیانەی لە قۆناخەکانی گەیشتنە لوتکەی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی ئەنجامدەدرێن، ئەرستۆ بە بنەما دەگرن. ئەرستۆش هەروەکو دەوڵەتی ـ شاری ئەتینا، بەرهەمی قۆناخی هەرە پێشکەوتووی شارستانییەتێکە. فەیلەسوفێکی قۆناخی لێواری رووخانی، کە هەبوونی پێکهاتە مەزنەکان روون دەکاتەوە، بەدوای چارەسەری ئەوە دەگەڕێت چۆن لەسەرپێیان بمێنێتەوە. تیۆری زان و بیریاری قۆناخەکانی لوتکە و رێگرتنە لە داروخان، نەك هی قۆناخی دامەزراندن و پێشکەوتن. باش دەزانرێ کە هەموو هەوڵ و کۆششەکانی بۆ ئەوە بوو کە شارستانییەتی رۆما و نوێنەرە هەرە بەهێزەکەی، ئەتینا، رزگار بکات. ئەم تایبەتمەندێتیەی فەلسەفەی سیاسی لە سەردەمەکانی گەیشتنە لوتکە و رووخانی شارستانییەتی دەرەبەگایەتیدا وەکو ئامرازێکی گفتوگۆ بەکار دەهێنرێ. چونکە لەبەر ئەوەی سیستەم گەیشتۆتە لوتکە و ئاڵۆز بووە و نیشانەکانی هەڵوەشانەوە نیشاندەدات، پێویستی بە تیۆریەکی سیاسی پێشکەوتوو و بە توانا هەیە. کاتێك باشترین ئامرازی فەلسەفی دەبێتە ئەرستۆ، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە لەم قۆناخەدا هەم لەلایەنی ئیسلامییەت هەم مەسیحییەت، بە ئەندازەی کتێبە پیرۆزەکان، هزری ئەرستۆ بە بایەخ و بەهادار بێت. ئەو هزرانەی پێشتر بە مەترسی و هەڕەشە دەبینران، ئیتر دەخرێنە ریزی هزرە رزگاریخوازەکان. هەوڵدەدرێت هزرەکانی ئەرستۆ وەکو راستیە رەهاکانی کۆڵەکە بەهێزەکانی زانستی خوداناسی بسەپێنرێ و پەسند بکرێ. لە کاتێکدا تۆماسی ئەکوینی لە مەسیحییەتدا پێشەنگایەتی ئەوە دەکات، ئیبن سینا و ئیبن روشد بە بەرفراوانی لە ئیسلامییەتدا تاوتوێی دەکەن. لەبەر ئەوەی پێشکەوتووترین بیریارانی ئەو قۆناخە لەمیانەی پێکهێنانی تیۆلۆژیادا، ئاستی هزری ئەو قۆناخەیان نیشانداوە کە تێیدا ژیاون، زۆر بایەخدارە. کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی پێگەیشتوە و تێکچڕژاو و ئاڵۆز بووە. چەندین دەزگا و هزری نوێ کەڵەکە بوونە و ئەندامەکانی خۆیانیان پەروەردە کردووە. ئاستی باوەڕی و هزری قۆناخەکانی لە دایك بوون و پێشکەوتن تێرا ناکات. ئیتر مرۆڤ زیاتر لێپرسینەوە سەبارەت بە هۆکار و ئەنجام و بۆچی و چۆنیەتی هەموو شتێك دەکات. شرۆڤە فەلسەفییەکان ئەم پێشکەوتنانە وەکو چارەسەرییەکی کێشە سەرەکییەکانی ئەم قۆناخەی دوایی دەبینێ. ئەمەش بەرلەوەی بەرەو قۆناخی هەڵوەشانەوە و رووخان بچێت، وەکو دوا هەڵمەتی پاراستن دەبینرێ. دوای ئەوەی رۆڵی خۆی لەم سەردەمەدا بینی، ئیتر قۆناخی موحافەزەکاری و پاشڤەڕۆیەتی سەردەمی هەڵوەشانەوە و رووخان دەستپێدەکات. ئیتر فەلسەفە جێگای خۆی بۆ قاڵبە موحافەزەکاری و کۆنەپەرستییەکان بەجێ دێڵێ؛ ئیتر باوەڕی پێهێنانی ناچاری و زۆرەملێ لەمیانەی ئەشکەنجەوە دەکەوێتە گەڕ. هەموو چالاکی و گفتوگۆیەکی ئایدیۆلۆژی کە لە قۆناخەکانی سەرەتا و کۆتایی هەر چاخێکی مێژوویی چڕ دەبێتەوە، لە نزیکەوە پابەندی ئەو شێوەبەندییە ئابووری ـ کۆمەڵایەتیانەیە کە تازە سەرهەڵدەدات و رووبەرووی کێشەکانی بەردەوامبوون دەبێتەوە. ئەم جۆرە پێشکەوتنانە لەناو یەکتردا بەڕێوە دەچن. ئەو باوەڕ و هزرانەی لە دەستپێکدا لەمیانەی هێزێکی مەزنی بیر و باوەڕ بەرز دەکرێتەوە، لە راستیدا مژدەی ئەو سیستەمەیە کە تازە لە دایك دەبێ. دەشێ ئەمانە وەکو هەوڵ و کۆششەکانی لە دایك بوون هەڵسەنگێنرێ. هەروەکو بڵێی پرۆگرامی سیستەمی نوێ و پرەنسیپەکانی ئاراستە کردنی دەستنیشان دەکات. هەوڵدەدرێ تایبەتمەندێتی ئەو سیستەمە یەکلابکرێتەوە کە لە دایك دەبێت. هەروەها لەبەر ئەوەی لە ئەنجامی هەوڵێکی یەکجار مەزن لە دایك دەبێت، بۆیە لە ناوزەد کردنی بە زاراوەی نوێوە بگرە تا دەگاتە گەوهەرەکەی هەوڵدەدرێ لەمیانەی چەمکێکی بەهێزی ئایینی خودایی پیرۆز بکرێت. کتێبی نوێی پیرۆز، فەرموودەکانی

دامەزرێنەر و هەڵسوکەوتەکانی، عیبادەتی کە پێشخراوە، پەرستگاکان، وەکو ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئەم لە دایکبوونە لە ڕێگای پرۆپاگەندەیەکی فراوان و بەردەوام لە مێشکدا دەنەخشێنرێ و دەکرێت بە سەرەکیترین خۆراکی ڕۆح.

ئەو کێشانەی دوای بەدەزگابوونی سیستەمی نوێی کۆمەڵگا و سیستەماتیك بوونی دەردەکەون، پابەندی ئەو پێکهاتە ناوخۆیی و دەرەکیانەیە کە سیستەم بەڕێوە دەبات. لێرەدا سیستەم چۆن ئەم کێشانە بەلاوە دەنێت و بەردەوامی بە هەبوونی خۆی دەدات؟ ئەمە پرسی سەرەکییە، کاتێك ئەم پرسەش تەواوی سیستەم پەیوەندیدار بکات، ناچارییە کە گفتوگۆ لە بەرزترین ئاستدا و زۆر فراوان ئەنجام بدرێت. چونکە ئەگەر ئەو ئۆپۆزسیۆن و بۆچوونە نوێیانەی بەرامبەر سیستەم پێشکەوتوون بە وەڵامێکی تێروتەسەل و جێگای باوەڕ پێکردن، نەگەن، ئەوا مەترسی و هەڕەشەی هەڵوەشانەوە سەرهەڵدەدات. کاتێك ئەم ڕەوشەش بێتە ئاراوە، پێکدادانی دژوارانە دەبێتە ناچارییەك. تەبایی و یەکێتیەکەی دەستپێك جێگای خۆی بۆ دوودڵی و ڕکابەری بەجێ دێڵێ. پێویستە ئەم پێشکەوتنە ئاسایی و سروشتی ببینرێ. هەر دووڕیان و ڕکابەرایەتییەك خراپ نییە. هەروەکو ماتریالیزمی، دیالەکتیك شیکردۆتەوە، لێرەدا گرنگ ئەوەیە، ئایا تێز و ئەنتی تێز (بیرۆکە و دژە بیرۆکە) بە شێوەیەکی دروست پێشکەوتوون یاخود نا. هەروەکو لە دایکبوونێکی پێش وەخت بە مردن ئەنجامگیر دەبێ یاخود منداڵ لەبەرچوون گیانی بە بەردا ناکرێت، ئەوا هزری نوێ و ڕکابەرایەتییەکی لە نێو زەمینەیەکدا دەرکەوتوون کە هەلومەرجە ماددییەکانی بە گوێرەی پێویست پێنەگەیشتووە، دووچاری هەمان ڕەوش دەبن، ئەمانەش بوویەرێکن کە زۆرجار بینراوە. مێژوو پڕە لە نموونەی بێ ژماری ئەم جۆرە ڕووداوانە. ڕەوشی پێچەوانەی ئەمەش خراپە و ڕزین قووڵتر دەکاتەوە. کاتێك تەواوی بونیادەکانی سەرخان و ژێرخانی سیستەمی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی لەبەر هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان دەکەوێتە نێو ڕەوشێك ناتوانێ بەردەوام بێت، ئەگەر دژە بیرۆکە، واتە پاراستنی هزری نوێ لە لایەن ڕکابەرەکان بە شێوەی دووڕیانێك پێشنەکەوێت، ئەوا ڕزین و قەیران دەبێتە ناچاریەك. ئەم جۆرە قۆناخانە لە مێژوودا بە سەردەمی قەیران و ڕزین ناوزەد دەکرێت و گەلێك نموونەی لەم جۆرە لەهەر سیستەمێکدا دەبینرێ.

باڵابوونی شارستانیdەتی ڕۆژئاوا، لە نزیکەوە گرێدانی بەوە هەیە کە ئەم پەیوەندیە دیالەکتیکیەی شیکردۆتەوە و ڕەنگیداوەتەوە سەر تەواوی چالاکیە کۆمەڵایەتییەکان. هەوڵدەدرێ بە ڕێچکەی زانستیانە، کێشەکان دەستنیشان بکرێت و لەمیانەی کەمترین ئێش و زیانەوە ئەنجام بەدەست بهێنرێ. ئیتر پێویستی و مەیل بۆ شێوازە کۆنەکانی توند و تیژی دژوار، شەڕ یاخود ملکەچ کردن، شێوازە هەرزان و خیانەتکارانەکانی بەکرێگیراوی نییە؛ هەوڵدەدرێ بە گوێرەی پێویستی یاسای دیالەکتیکی و لە ڕێی دژە تێزێکەوە بە سەنتێزێك بگەن، سوودبەخش ترین بوویەر، ئەوەیە پەیوەندی و دیاردە و سیستەم ئاوا بکرێت. بە شێوەیەکی مێژوویی باوەڕی بەوە دەکات کە گونجاوترین سیستەم شارستانێتی دیموکراسیانەیە.

ئەو مشتومڕە چڕ و بەرفراوانانەی جیهانی مەسیحی و ئیسلامی کە لە ساڵانی ١٢٠٠ ی زایینی بەخۆیانەوە بینی، بەهۆی ئەو کێشە جددیانەی ناوخۆ و دەرەوە بوو کە دووچاری هاتبوون. ڕۆژ بەدوای ڕۆژ سیستەم بەرەنگاری ڕەخنە و ڕکابەرایەتی زیاتر دەبێتەوە، بۆ باوەڕ پێهێنانیش ڕوونکردنەوەکانی دەستپێکی تێر ناکات. کۆمەڵگا مەزن بووە، کێشەکان زیادبوون، هزر پێشکەوتووە و لێپرسینەوە دەکات. لە دەرەوە پەلاماری نوێ بەردەوام بوون و هیچ کاتێك کەم نەبۆتەوە. هەڵبەتە بەخۆشیان بەردەوام لەمیانەی شاڵاوبردن، پێشکەوتوون. هێرش و پاراستن، دژە هێرش و خۆپاراستن یەکتری بانگهێشت دەکەن. کاتێك کێشە ناوخۆییەکانی سیستەمیش زیاد بکات، بۆ نموونە کاتێك دەوڵەمەندی ئابووری جاران نەمێنێ، ژمارەی دانیشتوان زیاد بێ، داڕووخانی سروشتی پێشبکەوێت، ئەوا پەلامارەکانی دەرەوە بە کاریگەر دەبن. تەواوی ئەم بوویەرانە ڕەنگدانەوەی هزری خۆی دەدۆزێتەوە و هەوڵدەدا چارەسەری کرداریانە پێشبخات. کاتێك چارەنووسی سیستەم جێگای باس بێت، ناچارییە گفتوگۆ تیۆری و چارەسەریە کردارییانەکان، بەرفراوان و ئەنجامگیر بێت.

لە مێژوودا گەلێك نموونە دەبینرێ خواستویانە لەمیانەی دوو شێوازە ڕێچکە ئەم قۆناخانە بەلاوە بنێن.

ا ـ نوێکردنەوەی سیستەم لە ڕێی ریفۆرم. دەبێ ڕەستوراسیۆنیش بخرێتە سەر ئەم قۆناخە. بەڵام ڕەستۆراسیۆن، ریفۆرم نییە؛ لەو بونیادنانە دەچێت کە لەسەر بنەمای هەمان بناخە و بە هەمان شێوەی جاران ئاوا بکرێتەوە، بەڵام بەرد و چیمەنتۆکەی بگۆڕدرێت. هەرچی ریفۆرمە ـ لەسەر بنەمای دەست بەرنەدان لە پرەنسیپە سەرەکییەکان ـ گوزارشت لە بونیادنانێکی نوێ دەکات کە هەم کەرەستەکانی و هەم بناخەکەی دەگۆڕدرێ، لەسەر بناخەیەکی نوێ ئاوا دەکرێتەوە. لەمیانەی ئەم ڕێبازەوە، گەلێك سیستەم تەمەنی خۆیان درێژ دەکەن و تەنانەت وەرچەرخان قووڵدەکەنەوە و دەبنە خاوەنی بەردەوامییەکی تۆکمە و هەمیشەیی.

ب ـ شێوازی موحافەزەکاری کە ئامانجیەتی لە ڕێی زەبرەوە سیستەم لەسەر پێیان بهێڵێتەوە. لە مێژوودا دەبینرێ کە ئەم شێوازەش بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکار هێنراوە. ئەگەر ڕەوشێکی بەمجۆرە جێگای باس بێت کە گەوهەر و ناوەوەی بە تەواوەتی ڕزی بێت و فاڵا بوو بێت و باوەڕییەکی بەمجۆرە لە ئارادا بێت کە پەلامارەکانی دەرەوە لە ئاستێکدان کە ڕێگای سازشکاری نەماوەتەوە، ئەو کاتە پەیڕەو دەکرێت و تاقی دەکرێتەوە. بەرخودانێکی چاو کوێرانە، خنکاندنی هەموو شتێك و ڕێگرتن لەپێش نوێبوونەوە، سەرچاوەی خۆی لە چەمکی "یان سەرکەوتن، یان هیچ" دەگرێت. کاتێك سیستەم تواناکاری وەرچەرخان لەدەست بدات، ئەوە بۆ ئەوەی لەسەر پێیان بمێنێتەوە، بەکارهێنانی هەموو شێوازەکانی توندوتیژی و سەرەڕۆیی وەکو تاکە بژار و ڕێگای چارە دەبینێ. لە ڕەوشی بەمجۆرەدا ڕووخان لە ڕێی شۆڕشەوە دەبێتە ناچارییەك. پاشماوەی ئەو کەسایەتی و دەزگایانەی ڕووخێنراون بە تەواوی دەخرێنە نێو قۆناخی ملکەچ بوون. دابڕان لە ناسنامە کۆنەکان ڕیشەییە. بە گوێرەی سیستەمی فەرمانڕەوا سەرلەنوێ دەبنەخاوەن ناسنامە. لەو پەیوەندی و دەزگا کۆمەڵایەتیانەی کە هزری دۆگماتیکیانەی بەسەردا زاڵە و لەناو پاشڤەڕۆیی ماوەتەوە و زێدەڕۆیی لە موحافەزەکاری دەکرێت، ئەم شێوازە ڕووی تراژیدی ئەم مێژووەیە کە پڕە لە ئێش و خوێن ڕشتن. کاتێك مرۆڤایەتی تەنیا دەرك بەوە بکات کە گۆڕانکاری و وەرچەرخان تاکە ڕاستینەی هەمیشەیی سروشتە، ئەوا دەست لەم شێوازە بەردەدات. کاتێك دەرك بەوە بکات کە ڕاستی، چاکە و جوانی لە ڕێگای هەڵسوکەوت و هزرە پاشڤەڕۆ و موحافەزەکار و بێ واتاکان بەدینایەت، بەڵکو لە ڕێی ئەنجامدانی گۆڕانکاری و وەرچەرخانێکی لە کات و شوێنی خۆیدا بەدیدێت، دەست لەم شێواز و ڕێبازە بەردەدات.

وەکو هێزی هاوچەرخی شارستانییەتی چاخی ناوین، ئیسلامییەت و مەسیحییەت لە ڕەوشێکی تەنگەتاوی مێژوویی بەمجۆرەدا بوێرانە هەنگاویان بۆ هزری فەلسەفیانە هاوێشتووە. هۆکاری گفتوگۆ کردنی فەلسەفە و ناسنامەی ئایدیۆلۆژییان هەروەکو جەختمان لەسەر کردەوە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەڵوێستیان لەگەڵ قۆناخەکانی دەستپێك و پێشکەوتن جیاوازە. نابێ هیچ کاتێك لە بیر بکەین کە هزری فەلسەفی لە سەردەمی لە دایکبوونیان خزاوەتە ناو ناسنامەی ئایینی هەردووکیان. ئەمانە ناسنامەی تێکەڵاوی نیوە بە نیوەی فەلسەفە ـ ئایینن. لەم قۆناخەدا پێویستە چەمکە ئایینیەکان لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا بن. بە شێوەیەکی چڕ لە هیند، ئێران، یۆنان و ڕۆما و شرۆڤە ئایینیەکانی چاخەکانی ناوین، وەك پێشکەوتنی فەلسەفی دەبینرێ. بە گوزارەیەکی ڕێکتر بیڵێین، ئیسلامییەت و مەسیحییەت، بە شێوەیەکی کارامەیی پشت بە سەنتێزی ئایدیۆلۆژیای سیستەمی کۆیلەداری (میتۆلۆژیا) و هزری فەلسەفی دەبەستن کە دواتر وەکو کاردانەوەیەك پێشکەوت؛ بە گۆڕانکاری و وەرچەرخانی پێویستی دا دەرباز دەکات و یەکانگیریان دەکات و وەکو ناسنامەی خۆی پێشکەشی دەکات. لێرەدا سەرچاوەی ڕەسەنی سۆمەریەکان لە ئارادا نییە. هەروەها ڕەوشێکی لە جۆری لە دایکبوونی فەلسەفەی یۆنانیش لە ئارادا نییە. تایبەتمەندێتیەکی گرنگی ئایدیۆلۆژیای پێغەمبەران ئەوەیە.

گفتوگۆی فەلسەفی هەردوو سیستەم گرێدراوی هەژاندنی بنەماکانی سیستەمە، کە باوەڕی لاواز بووە و دووچاری تێکدان هاتووە و جیاوازی هاتۆتە ئاراوە. پەنا بردنیان بۆ ئەرستۆ، سەرچاوەی خۆی لە هێزی پێکهاتەکەی لۆژیك دەگرێت. ئەرستۆ گەورەترین دەسەڵاتە کە تاوەکو ئێستا پێکهاتەی لۆژیك و هزرەکانی تێپەڕ نەکراوە. لە واقیعدا بەها مەزنەکەی ئەرستۆ لە بە سیستەم کردن و باسکردنی ئاستی ئەو هزرەدا شاراوەتەوە کە بەرهەمی ڕاستینەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە. لە لوتکەدا نوێنەرایەتی توانستی مەعریفی و هێزی بیرکردنەوە دەکات. هەر

کەسایەتی و سیستەمێك بخوازێ لەمیانەی زاراوە و هزرەوە کار بکات، گەڕانەوەی بۆ سەر راستینەی ئەرستۆ، بۆ ئەم ناوەڕۆکەی دەگەڕێتەوە. هەروەکو بڵێی کۆمپیۆتەری چاخەکانی دێرین و سەرەتا و ناوینە.

لەم چوارچێوەیەشدا، کەسانی وەکو تۆماس ئەکوینی و ئیبن سینا و ئیبن روشد، کە لە قۆناخی هەنگاونان بەرەو رووخان خواستیان لەمیانەی فەلسەفەوە بە هانای ئایینەوە بێن، شرۆڤەکاری ئەرستۆ گەرایی قۆناخی خۆیانن. ئەمانە تیۆلۆژییان خستۆتە نێو رەوشێکی ئاڵۆزتر. ئەوەی کە هەرە زێدە پێیەوە خەریك دەبن، هزری سەلماندنی خودایە لەمیانەی لۆژیکەوە. لێرەدا بە پێچەوانەی لێکدانەوەکان، لە خوداوەند زیاتر هەوڵدەدرێ هەمیشەیی سیستەم بسەلمێنرێ.

ئەوە ئاشکرایە کە سەلماندنی خوداوەند لە رێگای لۆژیکەوە لە گەوهەری خۆیدا ئامانجی رزگارکردنی سیستەمە. هەروەکو چۆن ئەرستۆ بە ئامانجی رزگارکردنی دەوڵەتی شار ـ هزری سیاسی پێشخست، ئەوا تیۆلۆگەکانی (زانایانی خوداناسی) ئەو قۆناخەش لە رێگای سەرلەنوێ سەلماندنەوەی هەبوون و یەکبوونی خودا، سیستەمی دەوڵەتی ئیسلامییەت و مەسیحییەت کە سێبەری خودان، لەسەر زەوی دەسەلمێنرێن، پیرۆز دەکرێن و بەردەوام بوونی دەخەنە ژێر گەرەنتییەوە. ئەمە چالاکییەکی رووکاری بەهێزکردنی ناسنامەیە. هەبوون و نەبوونی خودا، کێشەیەکی نەزانراو و بێ واتایە. هەرچەندە وەکو راستیەکی مەزن پێیەوە خەریك بن و تەنانەت تاوەکو دواییش باوەڕیان بەوە هەبێت کە ئەنجامی دەدەن، وەلێ ئەوەی لە بواری کۆمەڵناسییەوە ئەنجامدراوە، گفتوگۆیە سەبارەت بەوەی "سیستەمێکی زاڵ هەیە، ئەمە ئەو تاك سیستەمەیە کە پێویستە هەبێ یان نە؟". ئامانج ئەوەیە سەرلەنوێ سیستەمی باڵادەست بکەنە خاوەن ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی. پێویستە لە بواری کۆمەڵناسیەوە شیبکرێتەوە کە بۆچی تیۆلۆگەکانی چاخەکانی ناوین هێندە بە بایەخەوە هەڵوەستەیان سەبارەت بە زاراوەی خودا (ئەڵڵا) کردووە.

لە کتێبی تەوراتی پیرۆزدا بە شێوەیەکی زەق و بەرچاو ئاماژە بەوە دەکرێت کە چۆن حەزرەتی ئیبراهیم و موسا بەرلە هەموو تیرەکانی نیمچە دورگەی عەرەب، هەستیان بەوە کرد "ئەل " بە واتای خودای ئاسمان دێت و لە تیرەی عیبرانی

خۆیان نزیك کردەوە، هەروەکو بڵێی کردیان بە موڵکی میللی، کردیان بە سەمبۆڵی ناسنامەی کۆمەڵایەتی خۆیان. ئەمەش ئەو شێوەبەندیە نوێیەی تیرە عیبرانیەکان نیشاندەدات کە لەمیانەی یەکبوونەوە پێی گەیشتن. ناویان لە "ئەلۆهیم" بۆ "یاهۆڤا" گۆڕی، بەم شێوە گونجاندیان. دواتر لەگەڵ بەهێزبوونی هەبوونی کۆمەڵایەتی، یاهۆڤاش بەهێز دەکرێت. هەروەکو چۆن تەواوی ئەو تایبەتمەندێتیە نوێیانەی کۆمەڵگا بەدەستی هێناوە رەنگدانەوەی خۆی لە خوداوەندا دەبینێتەوە، ئەوا بە پێچەوانەوە خوداوەند یاهۆڤا بەردەوام دەبێتە سەرچاوەی متمانە و باوەڕی کۆمەڵگا بەخۆی.

تایبەتمەندێتی جیاواز لە خودای (رەب)ی عیسا رەنگ دەداتەوە. خودای عیسا تەنیا هی یەهودیەکان نییە، بەڵکو خودای تەواوی مرۆڤەکانە و خاوەنی هەڵوێستێکی یەکسانە، بۆیە دەکرێت بە ئومێدی رزگاری چەوساوەکان. کاتێك جیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵایەتی بەسەر ناوەڕۆکی خودا رەنگدەداتەوە، دەکەوێتە نێو رەوشێك هەروەکو بڵێی نوێنەرایەتی جیابوونەوەی چینایەتی دەکات. ململانێی نێوان عیسا و کاهینەکانی سیستەمی بەکرێگیراو رەنگدانەوەی خۆی دەکاتە سەر پێکهاتەی رەب، لە یاهۆڤای فەرمی جیا دەبێتەوە، دەگۆڕێ و دەبێتە خودا (رەب)ی تەواوی مرۆڤایەتی، لەنێو بوویەرەکانی تێکۆشانی کۆمەڵایەتیدا دەبێتە فۆرمیلە (هاوکێشە)یەکی ئایدیۆلۆژی. دەبێتە ئیلهامی مانیفێستۆی ئەو کۆمەڵگا نوێیەی بۆتە ئامانج.

ئەم قۆناخە لەلایەنی حەزرەتی مەحەمەد زیاتر قاڵکراوەتەوە. لەمیانەی فەلسەفەی ئەفلاتونەوە بەهێزتر کراوە و زاراوەی رەب ی تاکخودایی کە بنەما کۆمەڵایەتیەکەی بەهێزترە، لە ئەنجامی قەڵەمبازی حەزرەتی مەحەمەدەوە، تایبەتمەندێتی ئەو کۆمەڵگایەی دژی وەستاوە و تایبەتمەندێتی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیەی خواستویەتی ئاوای بکات، پێ بەخشیوە، هەروەکو قورئانیش ئاماژەی پێکردووە نەوەد و نۆ سیفەتە، واتە لە رێی تایبەتمەندێتیەوە بەهێز دەکرێت. ئەمەش زاراوەیەکی بەهێزی ئەڵڵایە. لەم چوارچێوەیەدا لە زاراوەی سەرەکییەوە دیارە کە کۆمەڵگا نوێیەکە بەهێز دەبێت. خودا (ألله)ی خاوەن نەوەد و نۆ سیفەت، لە لایەنێکەوە بە واتای ئۆتۆپیا و مانیفستۆیەکە. بەردەوام هەرسکردن و باوەڕ پێهێنانی لەلایەن موئمینەکانەوە، بە مەبەست گرێدانیانە بە ئامانجی مانیفستۆیەکە. باوەڕهێنان بە خودا، باوەڕهێنانە بەو کۆمەڵگا نوێیەی کە چوارچێوەکەی دەستنیشانکراوە. کۆمەڵگای نوێ بە گوێرەی ئەم سیفەتە خوداییانە پێشدەکەوێ و زاڵ دەبێت. بە گوێرەی زاراوەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەرنامەڕێژ و پراکتیزە دەکرێت و دەبن بە هێزی دەسەڵات.

هێڵە سەرەکییەکانی شیکردنەوەی کۆمەڵناسی سەبارەت بە شێوازی هزر و شێوەبەندی مەعنەوی چاخەکانی ناوین کە لە تەوەرەی خودا (الله)دا بووە بەمجۆرەیە. چەندە راستینەیەکی بە ئێشە کە هیچ تیۆلۆگێك (زانایەکی خوداناسی) هێزی ئەوەی لە خۆڕا نەدیوە ئاماژە بەم راستینە ساکارە بکات. تەنانەت لەمەش خراپتر ئەوەیە لە رۆژگاری ئەمڕۆشمان لەژێر ناوی زانست و کۆمەڵناسییەوە شیکردنەوەیەکی بەمجۆرە لە زانکۆکانی ئیلاهییات و کۆمەڵناسی ناخوێندرێ، ئەمەش راستییەکی پڕ لە ئێشە. تاوەکو ئێستا گفتوگۆ لە نێوان بانگەشەی تیۆلۆژیا "خودا هەیە، یاخود نە؟" کە مەسەلەکەی کردۆتە گرێکوێرە و هەڵوێستی نکۆڵی قەبەی ماتریالیزمی کۆمەڵناسی بەڕێوە دەچێت. لە راستیدا ئەوەی پێویست بوو ئەنجام بدرێت، گەیشتن بوو بەو راستینەیەی کۆمەڵگا کە بنەمای گفتوگۆکەیە، بەمجۆرەش نەدەکەوتنە نێو گەمەی خۆ شاردنەوە. نابێ لە بیر بکرێ کە گەورەترین چەکی شەڕی خوداوەندەکان خۆ شاردنەوەیە، و بە دەمامککراوی خۆی نمایش دەکات و پەسند دەکات. بە بێ ئەملا و ئەولا سەرەکیترین لەیستۆکی تەواوی سیستەمە خوداوەندیەکان لەسەر بەندەکان بەمجۆرەیە و تاوەکو ئەم لەیستۆکە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەردەوام بێت، بەو واتایە دێت ئەو سیستەمەی نوێنەرایەتی دەکەن و هێزی لێ دەگرن و پێی دەبەخشن لەنێو گەرەنتی و پاراستندایە. کاتێك لەیستۆك تێك بچێت و دەمامك بەلاوە بنرێ، هەڵبەتە سیستەم وەکو راستینەی خۆی ئاشکرا دەبێت و ئەو کاتە ئاستەمترین قۆناخی بەردەوامکردنی سیستەمە. هەروەها پێویستە هیچ کاتێك لە بیر نەکەین، کاتێك دەمامکە ئایدیۆلۆژییەکانی سیستەمەکان بکەوێت، ئەوا هیچ هێزێك ناتوانێ لەسەر پێی خۆی رابگرێت و رۆژی خۆیان هاتووە.

تیۆلۆژیای تۆماسی ئەکوینی تا رادەیەك دەرفەتی هەنگاوێکی بۆ مەسیحییەت رەخساندووە؛ رێگا لەپێش پرۆتستانییەت، رێگای ریفۆرمیزە کردنی مەسیحییەت کراوەتەوە. ئەمە پێشکەوتنێکی زۆر گرنگە. رەوتەکەی دیکەی مەسیحییەت، واتە رەوتی موحافەزەکاری کە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو کۆنەپەرستی دەچێ، هەوڵدەدات لە رێگای ئەنگیزسیۆن رێگا لەپێش رووخان بگرێت. سزای زۆر سەرسوڕهێنەر و تۆقێنەرتر لەوەی بەرامبەر عیسا پەیڕەو کرا، بەرامبەر راهیبە ریفۆرمخوازەکانی کڵێسە و فەیلەسوفە علمانی و ئەو زانایانە پیادە دەکرێ کە تازە بە تازە پێشدەکەون. Giordano Bruno بە زیندوویی دەسووتێندرێ. دوای ئەوەی گالیلۆ لە ووتەی خۆی پەشیمان دەبێتەوە لە هەمان سزا رزگاری دەبێت. راهیبی چیکی Jean Huss بە زیندوویی دەسوتێندرێ. لەم قۆناخەدا بە هەزاران کەس لە ئەندامەکانی تەریقەتە سۆفیگەراییەکان و سیحرباز و ئەوانەی رەوتی نوێی کڵێسە ئاوا دەکەن دەسوتێندرێن. دادگاکانی ئەنگیزسیۆن وەکو مەزنترین میکانیزمی لەناو بردن لە مێژوودا بەکار دەهێنرێ. تەواوی ئەمانەش لە رووکاردا بە ناوی خودا، لە گەوهەری خۆشیدا بەرامبەر بەو مرۆڤە ئازادانەی کە راپەڕیون و ئەو گەلانەی هێواش هێواش بە وشیاری نەتەوەیی گەیشتوون، بە ناوی پاراستن و رزگار کردنی دەسەڵاتی کڵێسە ئەنجام دەدرێت. هیچ کاتێك خوداوەندەکان پێویستیان بە پاراستن و رزگار کردن نییە، بە پێچەوانەوە سیستەمی فەرمانڕەوای کە چەندەی تەنگەتاو دەبێت زیاتر پەنا دەباتە بەر دەمامکی خودا و کەوتۆتە نێو رەوشێکی قێزەوەن، ئەم سیستەمە پێویستی بە پاراستن و رزگار کردن هەیە. بە تایبەتی لە ماوەی نێوان ١٠٠٠ تا ١٨٠٠ ی زایینی ئەوروپا لەنێو دژوارترین و بێ رەحمانەترین شەڕی بەرژەوەندی خوازیدا دەرباز بووە کە لەژێر ئەم جۆرە دەمامکانەدا بەڕێوە چووە. لەبەر ئەوەی لە دێرزەمانەوە ئەم لەیستۆکانە لە رۆژهەڵاتی ناوین بەڕێوە چووە کەم و زۆر یاساکانی دەزانرێ. گەرچی لەبەر ئەوەی ئەوروپا جاری یەکەمە رووبەڕووی ئەم شێواز و جۆرە شەڕانە دەبێتەوە، دوای ئەوەی دەکەوێتە نێو بنبەستبوونێکی مەزن و لەنێو شەڕە درێژ خایەن و خوێناویەکاندا مایەوە،

توانیویەتی راستیەکان ببینێ. پرەنسیپی علمانییەتی کە ئەوروپا لە ئەنجامی شەڕەکانی کڵێسە هێنایە ئاراوە، سەرچاوەی خۆی لەم هەلومەرجە سەخت و بێ ئامانەوە دەگرێت کە خۆ رزگارکردن لێی ئاستەمە. لە دوو لایەنەوە پێهەڵگرتن ئەنجامدراوە.

١ ـ ریفۆرمیزەکردنی مەسیحییەت، گوزارە لە بە نەتەوەیی بوونی کڵێسە و دیموکراتیزە کردنی دەکات. ئەم قۆناخەی کە لە ساڵانی ١٥٠٠ ی زایینی بەرەو سەرکەوتن چوو، بە دەوڵەتی هاوچەرخی دەستووری دیموکراسیانە ئەنجامگیر بوو. هەروەکو گەلێك نموونەی لەمێژوودا بینراوە پشت بەستنی ریفۆرم بە بۆرژاوازییەت وەکو چینێکی نوێی کۆمەڵایەتی، وەرچەرخانێکی ئایدیۆلۆژییە بەرەو پێش. ئەمە یەکێکە لەو هەنگاوە سەرەکیانەی کە لە ئەوروپا کۆتایی بە شارستانییەتی دەرەبەگایەتی چاخەکانی ناوین هێنا.

ب ـ قەڵەمبازی علمانی زانستیانە، نوێنەرایەتی ئەو بیرکردنەوە زانستیە دەکات کە تەواوی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کڵێسە دەبڕێت. ئیتر ئەو تاکەی پشت بە زانست دەبەستێ، بە بێ ئەوەی پەنابباتە بەر هیچ خودایەك، هەوڵدەدات بە هێزی خۆی چارەنووسی خۆی دیار بکات. لە راستیدا هەوڵ دەدات ببێت بە ئایینێکی نوێ، هەربۆیە دەتوانین بڵێین رێبازێکی ئایینی زانستی دیاریدەکات کە چەندین مەترسی لەناو خۆیدا حەشار داوە. یەکێك لەو لێشاوانەی شێوە بەم چەرخەمان دەدات ئەمەیە.

لەمیانەی زمانی نەتەوەیی و کولتوور و وێژە کە لە رێی ئەم دوو رەوتەوە پێشدەکەون، بە شێوازی نەتەوەیی و زانستی  تاك هەڵدەکشێ. ئەو کۆمەڵگایەی بە شێوەیەکی زێدەڕۆیی خۆی پیرۆز کردووە بە خودایی، ئەمجارە بە پێچەوانەوە بە تەواوی لە پیرۆزی و خودایی دادەبڕێ و لەمیانەی ئەو تاکەی خۆی بە پیرۆز دادەنێ رێگا لەپێش سەرچاوەی هەڕەشە و مەترسییەکی دیکە دەکاتەوە یاخود کۆمەڵگا دەکەوێتە نێو مەترسییەوە.

کڵێسەی بە شان و شەوکەت کە ژێر کەوتووە، بە رِك و کینەوە پێشوازی لەو پێشکەوتنانە دەکات، بەڵام لەمیانەی خۆ گونجاندن بە گوێرەی پێشکەوتنە هاوچەرخەکان، درێژە بە وابەستەبوون و یادگاری ئەو عەزیز و عەزیزانە دەدات کە بە واتای بەهای ئێجگار مەزن دێن. سەبارەت بە گەیشتنی ئەو کۆمەڵگایەی بێ ویژدان بووە بە ویژدانێکی دروست هەوڵەکانی خۆیان نوێدەکەنەوە و درێژەی پێدەدەن.

لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عەباسییەکاندا کۆمەڵگای ئیسلام بووە خاوەنی زانستی کلاسیك. ئەم شێوەیەی پشت بە شرۆڤەی مەزهەبی سوننی ئیسلامییەت دەبەستێ ئەو کۆمەڵگایەیە کە بۆتە خاوەن دەوڵەت و مۆرکێکی فەرمی. بە گوێرەی گەوهەرە ئایدیۆلۆژییەکەی ئیسلامییەت زوو بەرەو "مۆنارشییەت" دەچێ. ئەم ئەنجامە سروشتیەی زاراوەی ئەڵڵای حەزرەتی مەحەمەد، سوڵتانێکی بەهێز و توانایە. بە گشتی ئایدیۆلۆژیای تەواوی کۆمەڵگا چینایەتییەکان، لە ئەنجامی ئەو زاراوەیەی خودا کە لە گەوهەردا پێکیان هێناوە، سیناریۆی دەسەڵاتی سیاسی ئامادە دەکات. گەورەترین چەواشە کاری لە مێژوودا لە رێگای دەمامکەکانی خوداوەندەوە ئەنجام دەدرێت. هەروەکو مەزندە دەکرێ و لێکدەدرێتەوە، تەواوی چالاکییەکانی پیرۆزی و بە خودایی کردن و قووڵبوونەوە هزرییەکان، لەپێناو دۆزینەوەی راستینەی مەزن و پیرۆز نییە. هەرچەندە باوەڕی پێ بهێنرێ و دەرکیشی پێ نەکرێت، بنەماکانی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگای چینایەتی تازە پێشکەوتوو ئامادە دەکات، هێزێکی مەعنەوی دەسەڵات دەخولقێندرێ. هیچ کاتێك بەبێ پشت بەستن بە باڵادەستییەکی بەهێزی هزری و مەعنەوی مرۆڤایەتی دەسەڵاتێکی سیاسی رەهای وشکی پەسند نەکردووە. بە وریایی و وردەکارییەوە خۆیان دەمامك دەدەن، بە تایبەتیش رووخسارەکانی خودا بە بنەڕەتی دەگیردرێت و رێگا لەپێش دەسەڵاتی سیاسی دەکرێتەوە و پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکرێت.

سەرەکیترین کاری راهیبەکانی سۆمەر و میسر خوڵقاندنی دەمامکی خودایی ئەو دەسەڵاتە سیاسیانەیە کە پێشکەوتوون. ئەمە لە میتۆلۆژیەکانیاندا زۆر ئاشکرا و سەرنج راکێشە. لە کاتێکدا هیتیت و گریکەکان وەکو دووەمین کۆپیە بەرەو رۆژئاوای دەگوازنەوە، ئەوا هیندستان هەزار و یەك رەنگی ئەم دەمامك کردنە پێشدەخات و دەبێتە پێشکەوتووترین بەرهەمهێنەری رۆژهەڵات و بەمجۆرە پێشکەشیان دەکات. خوڵقاندنی میتۆلۆژیا، ئاواکردنی خوداوەند، گرێدراو بەمە پێشخستنی رێوڕەسم، لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆیلەداریدا گرنگترین شوێنگەیان هەبووە. هێزی چینی راهیبەکان لەوەوە دێت کە ئەم کارە بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە ئەنجام دەدەن. هۆکاری بە کاریگەر بوونیان لە مێژوودا بۆ ئەو رۆڵە ژیانییەیان دەگەڕێتەوە کە لە ئاواکردن و بەردەوامکردنی دیاردەی دەسەڵاتدا بینیویانە. بەلاوەنانی ئەم رۆڵە سەرەکیە و پیرۆزکردنی خودایەکی تاقانە و نادیار، لە سایەیدا پێشخستنی گفتوگۆ و پێکدادان بە جۆرێك هەروەکو بڵێی واقیعییە، یەکێك لە چەواشە کاریە بنەڕەتیەکانە. ئەگەر ئەم چەواشەکاریە نەبێت، هیچ هێز و دەسەڵاتێکی ماددی و دەسەڵاتی سیاسی ناتوانێ بە شێوەیەکی رووت درێژە بە هەبوونی خۆی بدات.

باوەڕی پادشای خوداوەند کە دەمامکێکی سەرەکی سیستەمی کۆیلەدارییە، تەنیا دەشێ لە سایەی پێکهاتەیەکی هزری، سەردەمی منداڵێتی مرۆڤایەتی فەراهام بکرێت. چەندەی چالاکی و کرداری بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای چینایەتی گەشە بکات و پەیوەندی نێوان دەسەڵات و چەوسانەوە ئاشکرا بێت، ئەوەندە دەمامکەکانی خوداوەندیش ئاشکرا دەبن، پێویستی بە شێوەی نوێ و دەمامکی شاراوەتر دەبێت. دروست کردنی ئەم دەمامکانە بە ئەنقەست بە مەبەستی خەڵەتاندنی خەڵك نییە. ئەمە کولتوورێکی باوەڕییە. تەنانەت لەبەر ئەوەی تایبەتمەندێتی بەهێز و پیرۆزییان پێدراوە، هێزێکی ئەوتۆیان بەدەست هێناوە کە وەکو راستیەکی مەزن لە هزردا بەجێ ببن. دەبێ بەباشی دەرك بەوە بکرێت لە سەردەمە سەرەتایی و دێرینەکانی کۆمەڵگای چینایەتی لە بواری هزریدا رەوشی مرۆڤایەتی بۆ ئەمە گونجاو و لەبار بوو. بەردەوام دەبێ ئەوە رەچاو بکەین کە بەڕێوەبردنی چەوسانەوە و فشاری سیاسی، لەمیانەی گەورەترین درۆوە و پێشکەشکردنی وەکو مەزنترین راستی، یاسایەکی کۆمەڵگای چینایەتییە.

چاخی دەرەبەگایەتی لەمیانەی دەمامکەکانی خودای قۆناخی منداڵێتی مرۆڤایەتی بەڕێوە ناچێت. هەڵبەتە بنەڕەتیترین بانگەشەی پێغەمبەران و فەیلەسوفەکان ئەوەیە کە مرۆڤ نابێت بە خوداوەند. بەمجۆرە ئاشکراکردنی دەمامکەکانی خودایی زۆر گرنگ و بایەخدارە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە رەوشی هزری و وشیاری مرۆڤ زۆر بە باشی لەیستۆکەکەی ئاشکرا کردوە و لێی تێگەیشتووە. پێویستی بە زاراوەی نوێی خودا و شرۆڤە کردنی سروشت هەیە. پێغەمبەرەکان زاراوەی خودایان بۆ تاکخودایی کەم کردۆتەوە کە ئەویش لە شێوەی مرۆڤ نییە، بەڵکو رەنگدانەوە و یەکێتی هەموو هێزەکانی کۆمەڵگا و سروشتە، بەمرِەنگە بۆ ئەوپەڕی ئاسمان و بۆ شوێنێك بەرز کراوەتەوە کە نازانرێ و بەمجۆرە نابینرێ. لەبەر ئەوەی شێوازی بەڕێوەبەرایەتی نەمرود و فیرعەون لەگەڵ خۆیاندا بەلاوە دەنێن، رەوش و بوویەرێکی مێژوویی جێگای باسە. مرۆڤایەتی هەوڵدەدات هەنگاوێك لە بەڵای مرۆڤی ـ خواوەند، پادشای ـ خوداوەند، دوور بکەوێتەوە. نمایشکردنی گریان و فرمێسك رژاندن، خۆشەویستی، نیشاندانی عیبادەت کە بەرامبەر ئەو هەبوونانە نیشاندەدرێ کە ترسێنەر و تۆقێنەرن، بە ئامانجی رزگاربوونە لە بەڵا. لەبەر ئەوەی لە چاخی نئۆلیتیکدا چەوسانەوە نەبوو، ئەم دیاردانە زیاتر رۆڵ و گوزارشتی سوپاس کردنیان هەبوو. هەرچی فەیلەسوفەکانن لەمیانەی دانانی خودا بە فاکتەری یەکەم، یاخود لە رێگای هەڵوێستێکی بەمجۆرەی کە لە هەموو گەردیلەیەکدا هەیە، دەیکەن بە بەردەوامی سروشت، بەمرِەنگە هەنگاوێکی دیکە هزری مرۆڤ بەرەو پێشەوە دەبەن و، مرۆڤ لە ترسی خوداوەند رزگار دەکات (لە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و چەوسانەوە). پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی و رزگاربوونی هزر لە قۆناخی منداڵێتی، رۆڵیان لە پێشکەوتنی ئەم دوو رەوشەدا بینیوە. خودای نوێ پێویستی بە زاراوەی فەلسەفە و ئایین دەبینێ. نەریتی مێژوویی بەم جۆرە پێشدەکەوێ و بەردەوام دەبێت.

زاراوەی ئەڵڵای حەزرەتی مەحەمەد ئەم قۆناخە مێژووییە لەخۆوە دەگرێت. کاتێ پێناسەیەکی خوداوەندی هەم زاراوەکانی خوداوەندی میتۆلۆژیای میسر و سۆمەریەکان هەم زاراوە فەلسەفییەکانی یۆنان و رۆما لەخۆوە نەگرێت، ناکەوێتە خزمەتی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی. هەروەکو دەزانرێ مەحەمەد دەرك بە قووڵایی ئەم راستینەیە دەکات و لەنێو تەنگەتاوییەکی ئایدیۆلۆژی مەزندا دەژی، تەنانەت لە هۆش خۆی دەچێت و لەنێو ئارەقەدا دەمێنێ. کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی لە ئاستێکی پێشکەوتوودا لەنێو قووڵبوون و گەردوونی بووندا دەژی. ناسنامە ئایدیۆلۆژییەکەشی دەبێ بە گوێرەی ئەوە بێت. بە تایبەتی پێویستە زاراوەی خودا، لێهاتوو، جێگای باوەڕ، لە هەموو شوێنێك ئامادە بێت؛ دەبێ لە شادەمار زیاتر نزیکی مرۆڤ بێت.

بەمجۆرە ڕێگای مەعنەوی دەسەڵاتێکی دەرەبەگایەتی دەکرێتەوە. خوڵقاندنی فکری و ئایدیۆلۆژی ئەنجامدەدرێت. وەکو فێڵبازی و وردەکاری هونەری بەڕێوەبردنی چینایەتی، لە کاتێکدا خودا بە مەزنترین هێز ناودەبن کە لە راستیشدا ڕەنگدانەوەیەکە، ئەوا دەسەلاتی دەرەبەگایەتیش بە سێبەری خودا ناو دەبەن، بەمجۆرە ڕەوشێکی بەرەواژوو کردن ڕوودەدات. ئەم راستینە کە سوڵتان (دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی) بێت، ئەوا ڕەنگدانەوەکەشی خوداوەندە. کاتێك ناسنامەی کۆمەڵایەتی بەمجۆرە هاوسەنگ دەکرێت، ئەو کاتە بەرامبەر بەم هەڵوێستە زانستیانە ڕوون دەبێتەوە کە گفتوگۆکانی سەبارەت خوداوەندی کە چەندین سەدە ئەنجامدران، ڕێگایان لەپێش ئەنجامی دیماگۆجیانە کردۆتەوە.

لێرەدا مەبەستمان بچووککردنەوەی زاراوەی خودا نییە، بە پێچەوانەوە واتای واقیعی خۆی پێدەبەخشین. زاراوەکان وەکو هەبوونێکی کۆمەڵایەتی هەر یەکە و راستیەکن و بە لایەنی کەم بە ئەندازەی ئابووری کاریگەریان هەیە. ناشێ بە بچووکی و هەرزان تەماشای پێشخستنی زاراوەی خودا بکرێت لەلایەن حەزرەتی مەحەمەدەوە. هەڵەکانی ماتریالیستە قەبەکان لەم بوارەدا، بە لانی کەم هێندەی ئەوەی ئایدیالیستەکان خراپەکارانەیە. نکۆڵیکردنی ماتریالیستەکان لە خودا و بانگەشەی ئایدیالیستەکان وەکو فەرمانڕەوایەتی ڕەهایی خودا، هەمان ئەنجام لەگەڵ خۆیاندا دێنن و ئەوە چەواشە دەکەن کە لە ڕێگای هەڵوێستێکی کۆمەڵناسی لەنێو هەبوونەکانی کۆمەڵگادا واتای راستەقینەی خۆی پێبدرێت.

خوڵقاندنی بواری ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی، لە خوڵقکاری کرداری ئاستەمترە و کارێکە پێویستی بە کارامەیی هەیە. ئەمەش وەکو جیاوازی نێوان منداڵ بوونێکی دروست و مەزن بوونە سروشتییەکەی وایە. دەمامکی خودایی کۆمەڵگای یۆنان کە نزیك لە مرۆڤ، کە لە مرۆڤ دەچێ، زێدە خوڵقکار نییە و زیاتر لە شێوەی فیدراسیۆنی تیرە دەچێت، ئەوا کاریگەری خۆی کردۆتە سەر بە دەوڵەت بوون و دیموکراسییەتی ئەتینا کە دواتر بەدی هاتن. هەرچی لە ئایینە تاکخودابیەکانە، لە مرۆڤی یەکجار بەهێزکراو و زاراوەی جیاوازی خودا، ڕێگای لەپێش کۆمەڵگای بە دەسەڵات و سەلتەنەت (میرنشینی)ی بنەماڵەکان کردۆتەوە. بە شێوەیەکی گشتی لە شێوە گرتنی کۆمەڵگا، بە تایبەتیش لە پێکهاتنی دەسەڵاتی سیاسی و دەزگاکانیدا، ناسنامەی ئایدیۆلۆژی رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ. ئەمەش وەڵامێکی گرنگی ئەو پرسیارەیە "بۆچی دیموکراسییەت و، کۆمار لەناو کۆمەڵگای ئیسلامدا پێش ناکەوێت؟" ئەمەش بەو واتایە دێت تاوەکو ئەو ناسنامەیەی کۆمەڵگای ئیسلامییەت بەلاوە نەنرێت کە لەژێر سایەی ئەم پێکهاتە ئایدیۆلۆژیە شێوەی گرتووە، واتە تاوەکو علمانیەتێکی جێگیر بەدی نەیێت، بە سانایی دیموکراتیزە نابێت. هەروەکو چۆن علمانیەتێکی راستەقینە لەمیانەی شیکردنەوە و بەلاوەنانی ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژیە باوە دەبێت کە بە درێژایی مێژوو بەهێز کراوە و تاوەکو گەردیلەکانی کۆمەڵگا جێگیر بووە، ئەوا کۆمارێکی علمانی و کۆمەڵگا و سیاسەتێکی دیموکراتیش، گرێدراو بەمە ئاوا دەکرێت.

سەربارى ئەمە زاراوەی خودای حەزرەتی مەحەمەد، لە سەرەتا رۆڵێکی پێشکەوتووخوازی هەیە؛ خوڵقێنەر و بە وورژمە، هێزبەخشە و هاندەری پراکتیزەکردنە. لە بواری هزریشەوە هەڵکشانە. بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە رۆڵی مێژوویی خۆی بینیوە. بەڵام کاتێك دەگاتە قۆناخی پێگەیشتن پێکهاتە کولتووریە فرە ڕەنگییەکان، ئەم زاراوەیە تەنگەتاو دەکەن. قەوم و گروپە ئەتنیکیە خۆجێیەکان زاراوەی خودای کولتووری خۆیان لەمیانەی دەمامکی الله پەردەپۆش دەکەن و درێژەیان پێدەدەن. تەواو قۆناخی خەڵەتاندنی خودا (الله) دەستی پێکردووە. هەموو گروپێك بە گوێرەی ئاست و بەرژەوەندییەکانی خۆی زاراوەیەکی تایبەت بە خودای هەیە. لەگەڵ گروپی (مەزهەبی) فەرمی سوننی، ئەوا گروپە نافەرمییەکانی باتینی و سۆفیگەرایی بە شێوەیەکی بەرفراوان و هەرەس ئاسا بڵاودەبنەوە.

لایەنە رکابەرەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە فاتیمی و قەرمەتییەکان بەرەو دەسەڵات ئاراستەیان گرتووە. گەلێك بیروباوەڕی لادەرانە دەردەکەوێ، سۆفیگەرایی پێشدەکەوێت. کاتێك کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامی دەگاتە قۆناخی لوتکە، هەروەکو چۆن ئەرستۆ وەکو گەورەترین فەیلەسوفی رزگارکردنی کۆمەڵگا و دەوڵەتی یۆنانە، ئەوا فەیلەسوفە ئیسلامییەکانیش رووبەڕووی ئەرکی رزگارکردنی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلام بوونەتەوە. ساڵانی نێوان سەدەی ١٠ تا ١٢ ی زایینی لەم بوارەدا پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینی. پێشکەوتن و گۆڕانکارییە ئاڵۆزەکانی بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی، ڕەنگدانەوەی خۆی دەکاتە سەر پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی سەرخان. وەکو ئەرستۆکانی کۆمەڵگای ئیسلامییەت، ئەلکندی، فارابی، ئیبن سینا و ئیبن روشد فەلسەفەیان بۆ نێو ئیسلامییەت دەگواستەوە. لێرەدا ئامانج سەلماندنی زاراوەی خودا نییە کە پێویست بە سەلماندنی هەیە، لە گەوهەری خۆیدا رزگارکردنی ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتەیە کە نیشانەکانی پەرتەوازە بوون تێیدا سەریهەڵداوە. گفتوگۆی مەزن، ئاماژە بە قەیرانی مەزن و چۆنیەتی بە پەتەوی رزگاربوون لەم قەیرانە دەکات. لەهەر قۆناخێکی بەمجۆرەدا گەوهەری گفتوگۆکان وەکو یەکە. لێرەدا ئەوەی پێویستی بە رزگاربوونە خودی کۆمەڵگا و دەوڵەتە، نەك خودای نەبینراو و شاراوە. بەڵام چەندە زاراوەی خودا ببێتە جێگای باوەڕپێهێنان، بە تایبەتیش چەندە لەمیانەی لۆژیکەوە بسەلمێنرێ، هێندە باڵابوونی ئایدیۆلۆژی بەدەست دێنێ، بەمجۆرەش خزمەتێکی مەزن بە مانەوە و بەردەوامبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکات. فەیلەسوفەکان رۆڵی راهیبەکان دەبینن. لە راستیدا ئیسلامییەت بە گوێرەی مەسیحییەت هزرێکی فەلسەفی تیۆلۆژی پێشکەوتووتری خوڵقاندووە. ئیبن سینا بە ئەندازەی ئەرستۆ خاوەن شاکارە. توانست و هزری زانستی زۆر لە ئەوروپا لەپێشترە. هەروەکو چۆن لەم رۆژگارەدا پەڕاوە زانستی و فەلسەفییەکانی ئەوروپا وەردەگێڕدرێت، ئەو کاتە ئەوروپا پەڕاوە فەلسەفی و زانیارییە زانستییەکانی رۆژهەڵاتی وەردەگێڕا. هەروەکو چۆن لە رۆژهەڵات وەکو مەسیحییەت لە ئەوروپا هزری زانستی باڵانەبوو، ئەوا شێوازی هزری موحافەزەکارانەی ئیسلام ئەو دەسکەوتە زانستی و فەلسەفیانەی کە بەدیهاتبوون، بە کفر لە قەڵەمدا و ڕێی لێگرت و بە توند و تیژی وەڵامی دایەوە.

لەمیانەی ئیمام غەزالی و ئەشعەری، قۆناخی فەلسەفە دادەخرێت. سەدەی دوانزدەهەمی زایینی بۆ ئیسلامییەت بە واتای دەستپێکردنی قۆناخی موحافەزەکاری ئیسلامییەتە کە، دۆگما وشکەکان زاڵ بووە، باوەڕ بە ژێری نەماوە، گرێدان بە قورئان و سوننەتەکان وەکو تاکە ڕێگای زانست دانراوە. لەگەڵ ئەوەی ڕەوتێکی بەمجۆرە لە مەسیحییەتیشدا پێشدەکەوێ کە موحافەزەکار و ئەنگیزسیۆن پیادە دەکات، ئەوا زیاتر ڕێگای پێشکەوتنی سەربەخۆی ریفۆرمخوازی و ئاقڵمەندێتی کراوەتەوە. کاتێك ئیسلامییەت ڕێگا لەپێش پێشکەوتنی رێبازی ئاقڵمەندانە و ریفۆرمخوازی خۆی ناکاتەوە، دەکەوێتە ناو تاریکترین قۆناخە مێژووییەکانی خۆی. ئەگەر قۆناخەکانی پێشکەوتنی مێژوو هەڵسەنگێنین دەبینین کە کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین لە ١٠٠٠٠ ساڵ پ.ز تاوەکو ١٢٠٠ ی زایینی ڕێبەرایەتی هەبوون و بەردەوامبوونی مرۆڤایەتی کردووە، لەم مێژووە بەدواوە ئەم رۆڵەی خۆی بۆ هەڵکشانی شارستانییەتی سەرمایەداری ئەوروپا بەجێ دێڵێ. لە راستیدا گرنگترین ئەرکی مێژوویی ئەنجامدانی شیکردنەوەی هەمەلایەن و بەرفراوانە سەبارەت بە فاکتەر و هۆکارەکانی ئەم رۆڵ گۆڕینەوەیە. بە هیچ شێوەیەك ئەم ئەرکە جێ بەجێنەکراوە. تەنیا لەمیانەی هەوڵی تایبەتی هەندێ لە مێژوو نووسانی رۆژئاوا (Gordon Child , S.N.Kromer) هەوڵدەدرێ ئاراستە و تێڕوانینی دەرهەق بە مێژوو بخرێتە سەر راستەڕێ. پاراستنێکی وشکی ئایین هیچ کاتێك سەرکەوتوو نەبووە. پاراستنی باڵابوونی سەردەمی رابردووش هیچ واتایەکی نییە. ئەوەی گرنگە هۆکارەکانی ئەم پاشکەوتنە مێژووییەیە و ئاشکرا کردنی ئەم قۆناخەیە لە هەموو بوارێکەوە.

ئاشکرا کردنی ئەو قۆناخە پاشڤەڕۆیەتی و موحافەزەکاریەی کە بە ناوی ئیسلامییەتەوە هاتە ئاراوە و سەرەتا لە بواری ئایدیۆلۆژیدا دەستییپێکرد، ئێمە بەرەو ڕێگای راست دەبات. لەم سەدانەدا لە بواری دەوڵەمەندی ماددیی، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و شارەکانەوە رۆژهەڵاتی ناوین لە ئەوروپا لەپێشتر و باڵاتربوو. پاشکەوتن لەم بوارەوە نییە. لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە رۆژهەڵاتی ناوین زۆر سەرنج ڕاکێشە. هەمەرەنگی و دەوڵەمەندییەکەی نوێنەرایەتی باڵابوونی شێوەی ژیانەکەی دەکات. یەکێك لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی پەلامارەکانی مەسیحییەت (سەلیبیەکان) بەهۆی باڵابوونی رۆژهەڵاتی ناوینە لەم بوارەوە. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا دەبێتە ناچارییەك کە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا لە هۆکارەکانی موحافەزەکاری و دواکەوتن بگەڕێین. لە سەدەی سێنزدەهەم دا ئەوروپا هەنگاوی گرنگ لە بواری زانستیەوە دەهاوێژێ؛ لە سەدەی چواردەهەمدا لە گۆڕەپان و بواری ئاییندا دەست بە قۆناخی ریفۆرم دەکات. هەرچی سەدەی پانزدەهەمە سەردەمی دەستپێکردنی ڕێنسانسە. لە کۆمەڵگاکانی ئیسلامییەتدا گۆڕانکارییەکی پێچەوانەی ئەمە لە ئارادایە. فێرگەکانی فەلسەفە بە زەندیقی تاوانبار دەکرێن، دەرگا لەپێش "اجتهاد" داخراوە، ئەوانەی هزری نوێ پێشبخەن، سزا دەدرێن و بە ئەشکەنجەدا دەرباز دەبن. ئەوانەی بەدوای پێشخستنی هزری ئازاد و فەلسەفی بکەون وەکو سوهرەوەردی کەوڵ

دەكرێن (١١٩٠ ی زایینی). بێباوەڕی بە زانست و ژیری یەكێك لە مەرجەكانی پتەوی بیر و باوەڕ دادەنرێت. فەیلەسوف و بیریار و بلیمەتانی وەكو ئیبن سینا و فارابی وەكو كافر مەحكوم دەكرێن. بۆ جاری یەكەمە لە رۆژهەڵاتی ناویندا قۆناخێكی پاشڤەرۆیەتی و تەڵەكەبازی دەستپێدەكات كە مەترسیدارترین موحافەزەكاری هزری بەهادار و پیرۆز دەبینێ و بە هەموو جۆرێك دەرگای بە رووی زانیاری زانستی داخستووە، هزری سەربەخۆ و ئازادانەی مێشك بە كاری شەیتان لە قەڵەم دەدات، ئەزبەركردنی قورئان و فەرموودەكان بە زانست دادەنرێ و تەنیا پشت بە گێڕانەوەی چیرۆك و زانیاری دەبەسترێ. هەروەكو چۆن ئەم بەخت رەشیەی رۆژهەڵاتی ناوین، واتە ئەم قۆناخە نوێیەی پاشڤەرۆیەتی كە شایستەی رۆژهەڵاتی ناوین نییە، هۆكاری سەرەكی ون كردنی تەواوی مێژووە شكۆدارەكەی و هزرەكەیەتی، ئەوا بە واتای دەستپێكردنی بێ مێژوویی و ونكردن و دواكەوتنی بەردەوامە، كە دواتر پێشدەكەوێت.

هەڵسەنگاندنی ئەم قۆناخە وەكو گەورەترین ئافاتی كۆمەڵگاكانی ئیسلام و رۆژهەڵاتی ناوین لە جێگای خۆیدا دەبێت. ئەمە قۆناخێكە كە گەورەترین خیانەت لە كولتووری ئەو جوگرافیایە دەكرێت، كە نزیكەی ١٥٠٠٠ ساڵ لە ئاستی پێشەنگایەتیدا بەهای بۆ مرۆڤایەتی خولقاندووە، چاخی نوێی كردۆتەوە، شارستانییەتی دەستپێكردووە، هەروەها نكۆڵی لە مەزن بوونەكەی دەكرێت و هەروەكو بڵێی لە گۆڕنراوە. تەنیا گۆڕستانە سەرسوڕهێنەرەكانی میسر و سۆمەریەكان گرنگ و جێگای بایەخ نییە؛ لەم قۆناخەدا گۆڕستانی پڕ بە ئێش و درێژخایەنتری كولتوورە شكۆمەندەكان لە رۆژهەڵاتی ناویندا دەستپێكرد؛ گۆڕستانێكن تاوەكو ئەمڕۆ نەزانراوە چی تێدا ژێرخاك كراوە.

ئەگەر لە چوارچێوەیەكی گشتیدا تەماشای مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین بكرێ، دەبینرێ كە ئیسلامییەت رۆڵێكی پێشكەوتنی سنووورداری بینیوە. بەهایەكی خوڵقكارانەی ئەوتۆی نییە. لە بواری ناسنامەی ئایدیۆلۆژییەوە دەتوانرێ وەكو سێیەمین جۆر و شێوەی سۆمەریەكان شرۆڤە بكرێت. لە بواری هەنگاونان لە فرە خوداییەوە بۆ تاكخودایی، میتۆلۆژیا بۆ ئایین، كشتوكاڵ بۆ بازرگانی، لە كۆیلایەتییەكی وشكەوە بۆ كۆیلایەتییەكی نەرمكراو، لە تیرەگەرێتییەوە بەرەو بەرزبوونەوەی قەوم، ناتوانرێ لە پێشكەوتنی شارستانییەتدا نكۆڵی لە رۆڵەكەی بكرێت. بەڵام تەواوی ئەم دیاردانە پێشتریش لەناو پێشكەوتن دا بوون. شتێكی تازە خوڵقێنراو لە ئارادا نییە. زاراوەی "هەبوون و یەكبوونی خودا، نێردراوی پێغەمبەر" كە جێگایەكی مەزنی بۆ تەرخانكراوە، دیاردەیەكن كە زۆر پێشتر كراونەتە زاراوە و بە دەزگا كراون، لەناو داب و نەریتی كۆمەڵگا و هزری مرۆڤدا جێگیر و زاڵ كراون. ئەوەی ئیسلامییەت لە بواری ناسنامەی ئایدیۆلۆژییەوە ئەنجامیداوە، لەمیانەی شێوازەكانی شۆڕشەوە خێرایی و هێزی بە شارستانییەتی دەرەبەگایەتی داوە كە تاكەكانی بوونەتە سەپان و رەنجدەری خاك بە ناوەند دادەنێت. لێرەدا چەندی بڵێی ئیسلام سەركەوتووە. رۆڵی ئیسلامییەت لە خێرایی بوونی دەرەبەگایەتی، قاڵبوونەوە، بوونی بە خاوەنی هێز و دام و دەزگا و ئەنجامدانی بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتنێكی گەردوونی مسۆگەرە. تەنانەت ئەو هێزەی رۆڵێكی دیاریكراوی لە ناچاركردن و وروژاندنی ئەوروپا و هیند و چین بینی كە شارستانییەتی دەرەبەگایەتی پێشبخەن، ئیسلامییەتە. بە گوێرەی گوزارشتێكی گشتی، ئیسلامییەت باشترین هێزی ناردنی (تصدیر)ی دەرەبەگایەتییە. بێگومان لەبەر ئەوەی ئایینی بازرگان و پیشەكار و جووتیارانە، بۆ بینینی ئەم رۆڵە دەیوروژێنێ و لەبارە. هێندە بەرزكردنەوەی چەمكی جیهاد و پیرۆزكردنی شێوازەكانی ڤەبوون (فەتح) كە لە داگیركاری بەولاوە واتایەكی دیكەی نییە؛ ئەگەر بمرێ شەهید دەبێ و یەكسەر دەچێتە بەهەشت، ئەگەر وەكو كەم ئەندام بمێنێ وەرگرتنی زۆرترین بەشی دەسكەوتەكان، لە نزیكەوە گرێدراوی هەناردنی (تصدیر)ی دەرەبەگایەتییە.

هەرچەندە لە یەكەمین قۆناخەكانی دەركەوتن تاوەكو قۆناخی پێگەیشتن ماوەی نێوان سەدەی حەوتەم و دەیەمین ئەگەر وەكو قۆناخی بڵاوكردنەوەی شۆڕشی دەرەبەگایەتی هەڵسەنگێندرێت، ئەوا تەواوی قۆناخەكانی دوای ئەوە پەلامارەكانی تالانكاری و شەڕە بەرژەوەندیخوازییەكانی ئەو ئەمیر و بنەماڵانەیە كە هیچ رۆڵێكی پێشكەوتنخوازانەیان نەبووە. لە سەدەی دوانزدەهەم بەدواوە ئەم قۆناخە بە تەواوەتی دەبێت بە ئافاتێك پیرۆزی و مەزنایەتی ئایین لە قۆناخەكانی دەستپێكدا، لەپێناو بەرژەوەندی تاكە كەسی ئەو میر و بنەماڵەی قێزەوەن، وەكو ئامرازێك بەكاردەهێنرێ. لە كاتێكدا سوننە دەبێتە مەزهەبی فەرمی و هەرە موحافەزەكار، ئەوا عەلەوی وەكو ئەو مەیلە ئایینیە پێشدەكەوێ كە پەیوەندی خۆی لەگەڵ بەها كولتوورییەكانی گەلان نەپچڕاندووە، زیاتر مەیلی چەوساوەكان و زەحمەتكێشان و بەرخودانڤانەكانە. چەندین مەزهەبی باتینی بەرامبەر بە زۆرداری و ساختەكاری دەردەكەون. جارێكی دیكە سۆفیگەرایی بەهێزدەبێت. لە راستیدا لەگەڵ ئەوەی تەریقەتگەرایی چاخە سەرەتاییەكان، سۆفیگەرایی كاردانەوەیەكی بەرامبەر بەو ئایینە فەرمیانە بوون، لەهەمانكاتدا لە بواری داخراوبوون، لە جیاتی جیهانی ماددی ئومێد گرێدان بە دەسەڵاتی مەعنەوی ئاخرەت واتە دونیای دیكە، بەمجۆرە ئایدیالیزمی بەخێوكردووە. ئەمانە ئەو گروپ و لێشاوە پاسیفانەن كە دوای لاوازبوون و ژێركەوتن، پێشكەوتن و لە گروپە چەپەكانی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچن. شیعەگەرایی ئێران و فاتمییەتی میسر ئەو شێوەیەی عەلەویەتن كە گەیشتونەتە دەسەڵات و سیستەمی دەوڵەتیان ئاواكردووە، لەوە دوورن كە ریفۆرمێكی ئیسلامی جێگیر پەرەپێبدەن. جگە لە چەمكی تەسكی "ئەهلی بەیت" پرۆگرامێكی سیاسی و فەلسەفەیەكی پێشكەوتوو لە بنەماكانی ئایدیۆلۆژیایان نابینرێ. بانگەشەیەكی ئەوتۆیان سەبارەت بە نوێنەرایەتی كردن و خوڵقاندنی بنگەیەكی نوێی كۆمەڵایەتی نییە. تەنیا بە گوتنی "ناهەقی بەرامبەر بە ئەهلی بەیت كرا" ریفۆرم ئەنجامنادرێ؛ هۆكارە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكانی ئەو ستەمكاریە شیناكرێتەوە. هەربۆیە سەرەڕای ئەوەی پشت بە زەمینەیەكی چەوساوەكان و مافدار دەبەستێ، پێشكەوتنی عەلەوییەكان لە ئاستی ریفۆرمخوازی مەسیحییەكان دا نییە. هێندە گشتگیر و بەرفراوان نییە كە ئەو رۆڵە پێشكەوتووخوازانەیەی چاوەڕوانكراوە ببینێ. مەیلێكە پڕ لە سۆز، كاتێك دەسەڵاتیش بگرێتە دەست دیسان گرێدراوی هەمان قاڵبی كۆمەڵایەتی ـ ئابووری دەبێت، لە بواری سیاسییەوە جیاوازی لەخۆوە ناگرێت، دەتوانرێ لەبەرەی چەپڕەوەكان دابنرێت.

هەربۆیە شەڕی نێوان ئایینزاكان كە بە سەدان ساڵ بەردەوام بوو لە خوڵقاندنی رەوشێكی پارچە پارچەیی و لەدەستدانی هێز و بنبەستبوون بەولاوە، رێگای لەپێش ئەنجامێكی دیكە نەكردۆتەوە. بە شێوەیەكی گشتی ئەو ئیسلامییەتە سنووردارەی كە هەیە، تەنیا بە شێوەیەكی پاشڤەرۆیی نامێنێتەوە؛ بەڵكو لە بواری سیاسیشدا دووچاری رەوشێك دێت كە پارچە پارچە بووە و بۆتە مەیدانی شەڕێكی كوێرانە و خوێناوی. بەهۆی ئەم ئاڵۆزییەوە ئابووری و دەستكاری زێدە پێشناكەوێت. لە كاتێكدا بازرگانی ئەوروپا كە بەرەو بازرگانی سەرمایەداری (ماركانتیلیزم: بازرگانی بازاڕی ئازاد) هەنگاوی هاوێشتووە و بەرەو خوڵقاندنی چینی بۆرژوا هەنگاو دەهاوێژێ، لە كۆمەڵگا ئیسلامییەكاندا بازرگان خۆی لە زێدە بەها ئاڵاندووە و بووە بە چینێكی پاشڤەرۆ. ئەو رژێمە میرییانەی كە لەسەر خاكە بە پیتەكان ئاواكراون دەرفەت بە دەرەبەگایەتییەك نادەن لە نێو ئاساییشدا بێت، بەردەوام دەرەبەگایەتی ناوەندی بەهێز دەكەن، هەر لە سەرەتاوە بۆرژوازییەتی شار خەفە دەكەن و دەیخنكێنن. لەبەر ئەوەی چینێكی بۆرژوا پێشنەكەوتووە تاوەكو ئەوروپا پێشكەوتنی ناوەندیبوون پارسەنگ بكات، بۆیە پاشڤەرۆیەتی زیاتر دەبێتە ناچارییەك. دوای ئەوەی فەتح لە ئارادا نامێنێ، ناوەندیبوون كە پشت بە فەتح دەبەستێ، دەبێتە دەزگایەكی بێ واتا و گەندەڵ، لەنێو تەواوی كۆمەڵگاكانی ئیسلام و رۆژهەڵاتی ناوین بە ستاتۆی دەزگایەك دەگات كە لە بنەوانیەوە كەوتۆتە ناو پاشڤەرۆیەتیەوە. ئیتر سەڵتەنەت وەكو سەرچاوەی نەخۆشیەكان لە هەناوی هەموو كۆمەڵگاكاندا دەمێنێتەوە. نەخۆشیەكە بەردەوام گیان دەخوات و دەیرزێنێ! لە بواری ئیسلامییەتیشدا ئیتر گرێدان بە ئایدیۆلۆژیا و پرەنسیپ نەماوە. شێوازی بێزەنتیەكانی كە هەموو شتێك وەكو لەیستۆك و تەڵەكەبازی دەسەڵات دەنرخێنێ، قۆناخێكی هەرە گەندەڵ جێگای باسە. ماوەی نێوان سەدەی دوانزدەهەم و پانزدەهەمی زایینی قۆناخی لە لوتكەوە چوونە بەرەو رووخان.

قۆناخی سەدەی پانزدەهەم تاوەكو سەدەی بیستەم دەتوانرێ لە مێژووی كۆمەڵگاكانی ئیسلامدا بە قۆناخی شەوەزەنگ هەڵسەنگێنرێ. لە هیچ بوارێكدا نیشانەكانی پێشكەوتن دیار نییە. هەموو تایبەتمەندێتیەكانی لە لوتكەوە چوونی بەرەو رووخان، دەركەوتۆتە روو. زاراوەی نەفرەت كردن كە بە چڕی لە كتێبە پیرۆزەكاندا هەیە، سەرتاپا تەواوی دەزگا و هزرەكانی گرتۆتەوە. تراژیدیترین ناكۆكی دەركەوتۆتە مەیدان. لەمیانەی (نفی النفی) بەرەو قۆناخی هەرە بە ئێش و بەكاربردن چووە. ئەو بیرۆكانەی (تێزەی) كە بە واتای بەلاوەنانی ئەو پاشڤەرۆتیانە دێت كە بە هەزاران ساڵ لە پێكهاتەكانی كۆمەڵگا و هزر و دەزگاكاندا جێگیركرابوو و بە واتای خولقاندنی نوێتر دەهات، لەلایەنی هێزەكانی (دژە تێز) مەحكومی قۆناخی ژێركەوتن و پووكانەوە و بێ واتابوون دەبێت.

لێکدانەوە و بۆچوونێکی بەمجۆرە کورت دێنێ ئەگەر بڵێین ئەم قۆناخەی ڕۆژهەڵاتی ناوین تەنیا سەرچاوەی خۆی لە ئیسلامییەتەوە دەگرێت. پێویستە ئەمە بە هۆکاری قووڵترەوە گرێبدرێت. شێوەی کولتوور و شارستانییەتێك چەندە ڕەگ و ڕیشەی خۆی لە قووڵایی داکوتابێت، ئەوا بەو ئەندازەیەش دەرکەوتنی کولتوور و شارستانییەتی نوێ و دژبەر، هێندە ئاستەم دەبێت. خاك و خوێنی تازە بۆ نوێبوونەوە پێویستە. ئەگەر نموونە هێنانەوە پێویست بکات، کولتووری ماگدەلیانی (تاوەکو ١٠٠٠٠ ساڵ پ.ز) کە بە ڕێژەیەکی هەرە زێدە کۆمەڵگای ماڵیکردن و کۆکردنەوە پێشیان خستووە، لەو هەرێمەی فەرەنسا و ئیسپانیای ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینرێ. سەرەڕای ئەوەی بە شێوەیەکی بنەڕەتی بە قۆناخی سەرەتایی پالیۆلیتیکدا دەرباز بووە، وەلێ ناتوانێ دەربازی نیۆلیتیك ببێت. جگە لە هەندێ هۆکاری دیکە، بەڵام گرنگترینیان ئەوەیە کە کولتووری پالیۆلیتیکی قۆناخی سەرەتایی هەلومەرجێکی بەمجۆرەی نییە کە نکۆڵی لەخۆی بکات. دینامیکیەتی ناوخۆی و دەوروبەرەکەی تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەیان نییە کە ئەمە تێپەڕ بکەن. بۆیە ناچاریە کە لەمیانەی کاریگەرییەکانی دەرەوە تێپەڕ بکرێت. هەروەکو چۆن یەکێك عاشقی خۆی بێت، خۆی باڵا دەبینێ، لەخۆی ڕازییە، خۆی لەگەڵ کەس ناگۆڕێتەوە، ئەوا کولتوورێکیش کە بە قوڵایی و بۆ ماوەیەکی دەم درێژ خۆی بژێنێ و تاوەکو دوایی لە ناواخنی خۆیدا هەرسی کردبێت، تا ڕادەیەك خۆی بە سەنتەر ببینێ کە بیر لە هیچ هەبوونێکی دیکە ناکاتەوە، ئەوا ئەو هێز و کولتوورەی ناچاری گۆڕانکاری دەکات، دەبێ لە دەرەوە کاریگەری لێبکات. بەمرەنگە هەڵوەشانەوە و نوێبوونەوە دەبێتە میراسی دینامیکی هێزەکانی دەرەوە.

لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بەرێوەچوونی قۆناخی نیۆلیتیك بە قووڵایی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن؛ لە نزیکەوە گرێدراوی کولتووری ئاژەڵداری، دانەوێڵە، جوگرافیا و کەش و هەواکەیەوە هەیە. دۆڵەکانی نیل و ڕافیدەین کە لە تەنیشتیەوە، وەکو دووەمین نەوەی جوگرافی خاوەن هەلومەرجێکی لەبارن بۆ ئەوەی سیستەمی کۆیلەداری وەکو ئەلتەرناتیڤێکی نیۆلیتیك پێشبکەوێت. ئەمەش دەبێتە شانس و دەرفەتێکی مێژوویی. دوو چاخی مێژوویی بۆ ماوەیەکی درێژ یەکتری تێر دەکەن و بەیەکەوە دەژین. ئەو بابەت و لایەنەی پێویستە سەرنج بدرێ ئەوەیە کە لە ناواخنی یەکتردا، لە هەناوی یەکتردا دەرناکەون. شرۆڤەکانی دیالەکتیکیانەی هاوچەرخ سەبارەت بە مێژوو لە جێگای خۆیدا نییە کە دەڵێن، سیستەمەکان لەسەر هەمان بنچینەی یەکدی، لە هەناوی سیستەمەکەی دیکە دەردەکەون. تێڕوانینەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەمە زیاتر لەسەر بنەمای کاریگەری دەرەوە پێشکەوتووە. مسۆگەر سیستەمی کۆیلەداری سۆمەر لەو شوێنانە پێشناکەوێت کە ناوەندی نیۆلیتیك بوون و شانبەشانی کاریگەری بەهێزی نیۆلیتیك بەسەریدا، ئەو شوێنەی کۆیلەداری لێ دەرکەوتووە، ناوچەیەکی زەلکاوییە دواکەوتووترین تیرەکانی کۆکردنەوە (بەروبووم کۆکردنە) تێیدا دەژیان. ئەم ناوچەیەی کە بە میزۆپۆتامیای خواروو ناودەبرێت، بە هیچ شێوەیەك نیۆلیتیکی نەناسیوە، کولتووری تیرەی سەرەتایی تێپەڕ نەکردووە، ڕۆڵی خاکی دەست لێنەدراو دەبینێ.

کاتێك بەهاکانی کولتووری نیۆلیتیك لەگەڵ ئەو زەویانە بە یەکتر بگەن کە بۆ ئاودێری گونجاون، سیستەمێکی نوێی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. ڕەخساندنی زەمینەی دوو کولتووری مێژوویی تەنیشت بەیەك لە لایەن میزۆپۆتامیای سەروو و خواروو، دەرئەنجامێکی شانسە. ئەو شانسەیە کە دەبێتە لانکەی بە پیتترین شارستانییەتی مێژوو، مێژوو دەخولقێنێ. شارستانییەتی دەرەبەگایەتیش، دیسان لە هەرێمی دیکە، لە دەرەوە، لە ناوەندی شارێکی بیابان دەردەکەوێ، کە بەرهەمی بازرگانییە و کاروانسەرای چوارڕیانە. لە دەوروبەری میزۆپۆتامیا و نیل شارستانییەتی دەرەبەگایەتی ناتوانێ دەربکەوێت. چونکە کولتووری ئەم هەرێمە، کە تادوایی لەخۆی ڕازییە، تاوەکو سەر ئێسقان کەوتۆتە ناو شێوازی هزر و ژیانی کۆیلەداری و فێری دەزگاکانی بووە، ناتوانێ لە هەناوی خۆیدا سیستەمێکی نوێ بخولقێنێ. لەناو هەمان سیستەمدا دەتوانێ بە نێو قۆناخەکانی پێشکەوتندا دەرباز بێت. سیستەمە نوێ و جیاوازەکە، لە دەرەوە پێشدەکەوێ، کاری تێدەکرێ و کاریگەر دەبێت. ئەمەش بە گوێرەی یاسای (نفی النفی)یە کە یاسایەکی پەرەسەندنی مێژووە. ئەو گۆڕەپان و ناوچەیەی سیستەمی نوێی تێیدا سەرهەڵدەدات، هەروەکو هێزی تەقینەوەی چەك و تەکنۆلۆژیایەکی نوێ، ناوچەکانی پێشوو کپ و بێ دەنگ دەکات. واتە لەلایەنی نوێکەوە، کۆن ڕووبەڕووی پەلامار دەبێتەوە و دەخرێتە ژێر باری ئاگرەوە و تێکدەشکێنرێ و بەلاوە دەنرێت.

دوای ئەوەی ئیسلامییەت وەکو سێیەمین قەڵەمبازی مەزنی ڕۆژهەڵاتی ناوین ڕۆڵ دەبینێ، هەروەکو بڵێی مێژوو پشتی لێ دەکرێت و لەبیر دەکرێت، بە واتایەکی دیکە دووچاری نەفرەت و خیانەت دێت و دەستی لێبەر دەدرێت. ئەمە زۆر خەمناکە، بەڵام ئەنجامێکە دەرکی پێ دەکرێ. پێشبینی حەزرەتی مەحەمەد سەبارەت بەوەی دوا پێغەمبەرە، زۆر واتادارە. هەروەها مەسەلەی زیندوو بوونەوەی لە ڕۆژی مەعشەر و دەرکەوتنی مەحەمەد بۆ پاڕانەوە و لێبوورین، پەیوەندی بەمەوە هەیە.

خاکێکی زۆر خۆشەویست بێت، هەندێ جار پێویست دەکات نەکێڵدرێ و چاندنی تێدا نەکرێت. دارێکی ڕزیوو بێت دەبێ یەکی نوێی لە شوێنیدا بڕوێنی. شتێکی زۆر بەکار بهێنرێت کۆن دەبێت. دوای ئەو تەقینەوەیەی بیابان زەویەك نەماوە کە بەها بخولقێنێ و بەرهەم بێنێ. هەموو دەرهاوێشتەکانی شارستانییەت دەرکەوتووە، تەواوی ئەو هێز و توانستەی خاك مژراوە کە بۆ مژین لەبار و گونجاوە. دایك بەساڵاچووە، لە ڕەوشێکدایە ناتوانێ شیر بەرهەم بێنێ. لە ڕەوشێکی وەهادا نییە کە لە ڕێگای شرنقەیەکی نوێ یاخود مێردێك، بەرهەم بێنێتەوە. تەواوی ئەو منداڵانەی بەرهەمی هێناوە لە توانایدا بووە، لەمیانەی شیری زەوەندی خۆیەوە بەخێویان بکات، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە دووبارە بگەڕێتەوە ناو خاکی خۆی. هەر چییەك بۆ خێزانی مرۆڤایەتی پێویست بووبێت، ئەم دایکە ئەو خاکانە، بەرهەمیان هێناوە و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەهەر چوار لای جیهاندا بڵاویان کردۆتەوە. بوونەتە هابیل و قابیلی ئادەم و حەوا، کە شوانکار و جووتیار بوون. بوونەتە چوار کوڕەکەی نوح، بوونەتە چوار نەژاد و ڕووی زەمینیان لەپێش شارستانییەت کردۆتەوە؛ کشتوکاڵ، دانەوێڵە، ئاژەڵ ماڵیکردن، گوند، شار، چین، دەوڵەت، خودا، تەواوی پیشەکان، کتێبە پیرۆز و پێغەمبەرەکان، وێژە و هونەرەکان، مۆسیقا، بیناسازی، چەك، ڕێگا و هەموو شتێکیان خولقاندووە کە بۆ مرۆڤایەتی پێویستە، ئەمانەیان بەخێو کردووە و بەدیاری پێشکەشی هەموو لایەکیان کردووە. ئەمانە هەمووی ماندووی دەکات. ڕۆژهەڵاتی ناوین، کولتووری دایکی زایین، ئیتر بۆ پشت پەردە دەکێشێتەوە، لەوانەیە بۆ گۆڕستان بێ، کێ دەزانێ لەوانەیە بۆ سەرلەنوێ خولقاندنی شارستانییەتێکی زیندوو و هەمە ڕەنگ ئاوا دەبێ و پاشدا دەکێشێتەوە، دەخەوێ و دیسان سەرلەنوێ هەڵدەستێتەوە، ڕێنسانسێکی شایستەی ڕابردووەکەی ئەنجام دەدات.

تەواوی ئەم بەڵگانە نیشاندەدەن کە تەواوی ئەنجام و هۆکارەکانی دواکەوتن و ڕزین ناخەینە سەر ئیسلامییەت. بەڵام دیسانیش ئەو کۆمەڵگایانەی لەبن شێوەی ئیسلامییەتدان هەروەکو بڵێی دۆڕاون و ڕووبەڕووی ڕزین بەجێ هێڵراون. بە شێوەیەکی بەرەڵایی بن پێ دەکرێ، یاری بە کەرامەتەکەی دەکرێ، واقی وڕماوە و پەشۆکاوە. ڕاهیبە مەزنەکانی میتۆلۆژیایان خولقاند، پێغەمبەرە مەزنەکانی ئایینیان خولقاند، سەرجۆنە بە شان و شکۆکانی ئیمپراتۆرییەتیان ئاوا کرد، تەواوی ئەو خوداوەندە ژنانەی مێژوو دەیانناسێ، ئەوانەی تا دوایی ستەمکارییان کردووە، شاعیرەکان، ئەوانەی باشترین ئاسوودەیی مۆسیقایان بەخشیوە، ئەوانەی بۆ یەکەمجار داستانیان نووسی، خاوەن گەورەترین ویژدانەکان، لەنێو ئەم کولتوورەوە سەریان هەڵدا، تێیدا ژیان، مردن، چەندین جار سەرلەنوێ لە دایك بوونەوە، بۆچی بە شێوەیەکی بەهێزتر و دەوڵەمەندتر و فرە ڕەنگ، هەمە ڕەنگی شین نەبێتەوە؟

بە ڕاستی ئەگەر مێژوو پڕ لە پەند و ئەزموون بێت، لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا سەرەکیترین ئیش و کارێ پێویستە بکرێت ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ڕاست دەرك بە هۆکارەکانی نەفرەت و ڕزین بکرێت. ئەگەر هیچ گومانێك لە نەخۆش بوون نەبێت، ئەوا سەرەتا پێویستە نەخۆشییەکە دەستنیشان بکرێت، نەك شرنقەی لێبدرێت و خۆراك و دەرمانی پێبدرێت.

بەر لە هەموو شتێك پێویستە بەباشی دەرك بەم مەسەلە و بابەتانە بکرێت: هزری میتۆلۆژی ڕۆژهەڵاتی ناوین پارچە پارچە بووە. لە مێژە ئایینی لەدەستداوە. هیچ کاتێك نەبۆتە خاوەن زانست. هەروەکو بڵێی لەژێر منارەی بابل سەرلەنوێ دیالۆگی کەڕەکان زیندوو بۆتەوە کە بە هەموو زمانێك قسە دەکەن و لە یەکدی تێناگەن. دیمەنێکی چەندە بە ئێش و ئازارە. ئێرانی سەفەوی لە ڕۆژهەلاتی ڕۆژهەڵاتی ناوین، عوسمانییەکانی ئەنادۆڵ لە ڕۆژئاوا، ئەو ئەکتەرە لاوەکیە بێ مێشك و ترسنۆکانەن، کە لە یارییەکانی منداڵانەدا، هەمان ڕۆڵ دووبارە دەکەنەوە. ئەمانە هیچ پەیوەندییەکیان بە مێژووی هاوچەرخ و دێرینەوە نییە. پەیوەندیان لەگەڵ شارستانییەتی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات نەماوە. پەیوەندیان بە مەسیحییەت و موسوڵمانێتیەوە

نەماوە. یەکێك بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست ١٧ حەڤدە برای خۆی دەخنکێنێ و تا ئەم رادەیە پەیوەندی خۆی لەگەڵ مرۆڤایەتی بڕیوە، هەر لە زووەوە میتۆلۆژیا، فەلسەفە و زانست لەبیر کراوە. لەسەر ئەو خاکەی کە خاوەنە راستەقینەکانی خۆی ونکردووە، نوێنەرایەتی خراپترین دەڵاڵ دەکەن، تەنیا دەڵاڵێتی!

ماوەی نێوان سەدەی پانزدەهەم تاوەکو سەدەی بیستەم قۆناخی هەڵکشانە مەزنەکەی ئەوروپایە؛ ئەو سەردەمەیە کە ژیری، زانست، تەکنۆلۆژیا تێیدا دەگەشێتەوە و پڕشنگدارە. ئەو قۆناخە مێژووییەیە کە بۆ یەکەمین جارە تاك باوەڕ دەکات کە دەتوانێ هەموو جۆرە زنجیرەکانی کۆیلایەتی بپچڕێنێ و لەم پێناوەشدا هەنگاوی بە باوەڕ و سەرکەوتووانەی هاوێشت. شارستانییەتێکی راستەقینەی مەزن و نوێیە، شارستانییەتێکە هاتۆتە دونیاوە و مەزن دەبێ. ئایا هیچ رۆڵێکی رۆژهەڵاتی ناوین لەوەدا نییە؟ چۆن نەبێت؟ تەواوی کەرەستە پێویستەکانی بە ئەوروپا بەخشی. بە درێژایی ١٥٠٠٠ساڵ، بۆ ئەوەی ئەوروپا بەمجۆرە بژێت، رۆژهەڵاتی ناوین مامانێتی بۆ کرد. ١٠٠٠٠ ساڵ مامانێتی نئۆلیتیك، ٥٠٠٠ ساڵ مامانێتی شارستانییەتی کرد. راستە ئەو منداڵەی دێتە دونیاوە، باپیرەی خۆی ناناسێ، رێز و حورمەت نازانێ، واتای بەهاکان تێناگات. راستە وەکو خوداوەندێك هێندە مەغرورە کە خاوەندارێتی لەخۆی دەکات، کەوتۆتە نێو ئەشق و کۆمپلێکسی خۆ مەزن بینین و بە زلزانین. بەڵام ئەمەش راستە کە هەرزەکار و بێ ئەزموونە و لەنێو مەترسی هەڵدێراندا دەژی. دەبێ زۆر بە باشی دەرك بەمانە بکەین. بە بێ ئەوەی خولیای رزینەکانی خۆمان بین، بەڵام بە بێ ئەوەی لە بیر بکەین کە دایکی راستەقینەی شارستانییەت و لانکەی بەخێو کردنی ئەو شارستانییەتەین، ئەو راستینەیە دەناسین. بە بێ لاسایی کردنەوە فێر دەبین. بەڵام لە خاکەکانی دایکی شارستانییەت، لە رەنگ و خوێنی ئەم خاکە، وەکو کچ و کوڕە رەسەنەکانی، ئەمجارە بۆ سەرلەنوێ لە دایکبوون، ئەوروپای بەساڵاچوو دەکەین بە مامان، سەرلەنوێ ئەم لە دایکبوونە پیرۆزە ئەنجام دەدەین.

تەواوی ئەو پەند و ئەزموونانەی لە رۆژهەڵاتی ناوین بە تایبەتیش لە مێژووی ئیسلامییەت کەڵەکەبوونە، بۆ رێنسانسێکی رۆژهەڵاتی ناوین بوونەتە گلۆك. دەبێ ئەوە پەسند بکەین کە ناسنامە ئایدیۆلۆژیە شکۆدارەکان و تەواوی ئەو بەهایانەی گوزارشتی لێدەکەن لەمێژە واتایان نەماوە، ئیتر ئەو رزینەی کە ماوەیەکی درێژە دووچاری هاتوون کۆتایی پێهاتووە. یەکەمین کاری رۆشنگەری کە پێویستە ئەنجام بدرێت، ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی بەرفراوانی تەواوی فاکتەرەکانی ئایین و میتۆلۆژیاکانی رابردووە بە گوێرەی پێودانگە زانستییە راستکراوەکانی کۆمەڵناسی. ئەو گفتوگۆ هەمەلایەن و بوێرانەی لەژێر رۆشنایی ئەمەدا ئەنجامدەدرێ، یەکلابوونەوە و زەلال بوونێکی راست لەگەڵ خۆیدا دێنێ. دیالۆگی کەڕەکانی ژێر منارەی بابل بە هەموو شتێکەوە جێگای خۆی بۆ چەمکێکی راست و پتەو و بە توانا بەجێ دێڵێ، بەرەو نوێنەرایەتی کردنی کار و بڕیاری تۆکمە و پتەویان دەبات. دیاریکردنێکی راستی پێگەکان و نوێنەرایەتیکردنی بڕیارە تۆکمە و لێهاتوەکان، کۆتایی بە پراکتیکی کوێرانە و ژیانێکی بێ ویژدانی و هەڵە و قێزەوەن دێنێ. بە ئەندازەی ئەوەی بە واتای فەرمانی مێژوو دێت، ئەوا ناسنامەی نوێی ئایدیۆلۆژی کە پشت بە نەخشەیەکی راست دەبەستێ، رێگای ئەو ئەرکانە رۆشن دەکاتەوە کە دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵگا، ئازایەتی پێویستی پێدەبەخشێ. هەرچەندە خودی پراکتیکێکی شۆڕشگێڕی، درەنگیش کەوتبێت، وەلێ رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین دەخولقێنێ.

نموونەکانی هیند و چینی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، خاوەنی سەرچاوەیەکی رەسەنی ئەوتۆ نییە. هیند و چین لە ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز بەدواوە قاڵبەکانی نئۆلیتیك و دەسکەوتەکانی شۆڕشی کشتوکاڵی رۆژهەڵاتی ناوینیان بردووە و بە گوێرەی خۆیان گونجاندوویانە. بۆیە هاتوونەتە سەر هەمان رێبازی مێژوویی. شیمانەی هەرە لەپێش ئەوەیە کە لە ساڵانی ٢٥٠٠ پ.ز هەراپا و مەهانجادرۆی دۆڵەکانی رووباری پەنجاب و ئیندۆس وەکو شارە پێشکەوتووە کۆلۆنییەکانی سۆمەریەکان، هاتوونەتە سەر شانۆی شارستانییەت. ئاریانیەکان (ئاریەکان)ی لە قۆناخەکانی کۆتایی بەربەرییەتدان و لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز بناخەی شارستانییەتی هیند دادەنێن. پێشکەوتنێکی هاوشێوە لە دۆڵەکانی رووباری زەردی چینیش بەدی دێت. سیستەمی کۆیلەداری لە شێوەی سۆمەریەکان، دوای درەنگ کەوتنێکی ٢٥٠٠ ساڵی پێشدەکەوێت. یەکەمین نموونەکانی دەوڵەتی راهیبێتی، رژێمی مەرکەزیەتی رەهای پادشا خوداوەندەکان دێنێتە ئاراوە. ئەم رژێمانەی بە درێژایی نزیکەی ٥٠٠ ساڵ باوەڕییان بە خوداوەندێتی خۆیان هێنابوو، بە تایبەتی لە بواری ئایدیۆلۆژیدا و دواییش لە بواری سیاسیەوە پارچەبوون و قۆناخێکی درێژخایەنی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لەمیانەی ئەو ریستراسیۆنەی (سەرلەنوێ بونیاد نانەوە) سیستەمی کۆیلەداری لە ماوەی نێوان ساڵانی ٢٥٠ ی پ.ز و ٢٥٠ زایینی بەخۆیەوە دەبینێ، جێگای خۆی بۆ شێوازی پەیوەندی نوێ و پێشکەوتنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی بەجێ دێڵێ. کۆنفۆشیۆس و بودا وەکو پێغەمبەرە ریفۆرمخوازەکانی رۆژهەڵاتی دوور، رۆڵی پێشەنگایەتیکردنی سیستەمێکی سیاسی و چەوسانەوەی نەرمتر دەگێڕن.

دوای قۆناخێکی درێژخایەنی کپ بوون، ساڵانی ٥٠٠ ی زایینی قۆناخی وەرچەرخانی دەرەبەگایەتییە. پێشکەوتنەکانی رۆژهەڵاتی ناوین کاریگەرییەکانی خۆی بۆ سەر دەرەوە درێژە پێدەدات. کاریگەری سەرکوتکردن و فشار هێنانی دەرەبەگایەتی ئیسلامییەت، دەرەبەگایەتیەکەی چین و هیندستان بەهێز و خێرا دەکات. لە کاتێکدا قۆناخی ساڵانی ١٠٠٠ تا ١٥٠٠ ی زایینی قۆناخی پێگەیشتنە، ئەوا دوای ئەوە بەرامبەر بە شارستانییەتی ئەوروپای تازە هەڵکشاو، قۆناخی پابەند بوون و رزینە. پێشکەوتنێکی هاوشێوەی ئەمە، وەکو درەنگترین ئەڵقە، لە شارستانییەتی ئازتك و ئینکا (مەکسیك و پیرۆ)ی باشووری ئەمریکا روودەدات. ئەم قۆناخەی لە ٥٠٠ پ.ز دەستیپێکرد، لە ساڵانی ١٥٠٠ ی زایینی لەژێر کاریگەری ئیسپانییەکان سەربەخۆ دەبێت و دووچاری هەڵوەشانەوەیەکی هاوشێوە دەبێت و لە مێژووی شارستانییەتدا رووبەڕووی سڕینەوە دەبێت.

## هـ. لە جیاتی ئەنجام

ناوەڕۆکی بنچینەیی سیستەمی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی و جێگای لە مێژوودا، گرنگی و بایەخی خۆی دەپارێزێ. ئەو ناکۆکییە سەرەکیەی بووە هۆکاری رووخانی کۆیلایەتی ئەوەیە کە رەنجی کۆیلەی بەرهەمهێنەر، بایەخی جارانی لەدەستدا و بووە کۆسپ لەپێش پەیوەندیە نوێکانی بەرهەمهێنان. خاوەندارێتی کردن لە مرۆڤ وەکو سەرمایە، فاکتەری سەرەکییە کە سیستەم لە دەرکەوتن و پێشکەوتنی خۆیدا بە بنەمای گرتووە. بەڵام کاتێك ژمارەی کۆیلەکان هێندە زێدە بوو کە ئیتر بۆ بەرهەمهێنان بەکار نەدەهێنران و ببوونە دەستەی مشەخۆرە دەست بە تاڵ و بێکارەکانی خاوەنەکانیان، ئەوا رزینی سیستەم ناچارییە و راکردنی بۆ نییە. کاتێك کۆڵەکە سەرەکیەکە ببێتە هۆکاری بێ بەرهەمی، ئەوا هەڵوەشانەوە خێرا دەبێت. هەروەها دەبێ ژیانی بەها مەسرەفی شارەکان و شەڕەکانیشی بخەیتە سەر. ئەو شارانەی کە ژمارەی دانیشتوانی زیادبووە و بەخێو کردنیان بۆتە کێشەیەکی سەخت و ئاستەم، ئاکامێکی سەردەمی بە پیتی و بەرهەمداری سیستەمە. کاتێك بە پیتی و بەرهەمهێنان دەوەستێ، ئەوا درێژەدان بە هەبوونی ئەو شارانەی کە هەرەس ئاسا زیاد و مەزن بوون، پێ بە پێ ئاستەم دەبێ. زیادبوونی ژمارەی شارەکان و گران مەسرەفی گوزەران، گرنگترین هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەن.

سەبارەت بە شەڕەکانیش رەوشێکی هاوشێوە جێگای باسە. لەگەڵ ئەوەی لە قۆناخی دەستپێکدا بۆ بەدەستهێنانی گۆڕەپانی نوێی شارستانییەت بە سوود بوون، بەڵام کاتێك بوون بە ئامرازی پاراستنی سنوورەکان و سەرکوتکردنی یاخیبوونەکان، ئیدی بوونە دەزگایەك کە نەبوونیان لە هەبوونیان باشتر بوو. سوپاکان لە جیاتی ئەوەی رۆڵی بەدیهێنانی ئارامی و تەبایی ببینن، لە پێشخستنی ئاڵۆزیدا رۆڵیان گێڕا؛ بوونە ئامرازی شەڕەکانی ناوخۆ. لەبەر ئەوەی زەوییە کشتوکاڵییەکان بە شێوەی کێڵگەی مەزن دابەشکران و جووتیار پەیوەندی لەگەڵ زەوی پچڕێنرا، بوونە سەرچاوەیەکی دیکەی سەرەکی بێ بەرهەمی. کاتێك فاکتەرە سەرەکییەکان سیستەم دەخەنە ناو قەیرانێکەوە، ئەوا ئەو دەزگا و پەیوەندیانەشی لەکار دەخست کە بە پتەوی مابوونەوە. لە هەموو ئاست و بوارێکدا رەوشێکی لە جۆری ئەو رزینە هەیە کە سەرمایە لەکارکەوتووەکە لەگەڵ خۆیدا هێناوە و رێگای لەپێش کردۆتەوە. ئیتر ئەو لێشاوە بەربەریانەی لەگەڵ یاخیبوونە ناوخۆییەکان یەکانگیر بوونە، کۆتایی هێنانیان بە سیستەم چارەنووسێکی (قەدەرێکی) چاوەڕوانکراوی قۆناخ بوو. هەرچەندە مەرکەزییەتی دەوڵەت و فشارەکان بەهێز و زیاد بکرێن، ئیتر هەڵوەشانەوەی سیستەم و لەدایکبوونی سیستەمێکی نوێ، بۆتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو و ناچارییەك. ئەم سیستەمە نوێیەی تازە

سەریهەڵداوە چارەسەری بۆ هۆکارەکانی رووخان دێنێ. کاری لەپێشینەی ئەوەیە کێشەکانی ئەو کۆیلەیەی لە بەرهەم دابڕاوە، سەربازی دەست بەتاڵ، ئەو خاکەی بەکار ناهێنرێ، ئەو شارانەی وەکو نەخۆشی مەزن بوونە، شەڕە بێ سوود و کەشی بێ متمانەیی و نەبوونی ئاسایش، چارەسەر بکات. ئەمانە لەو جۆرە کێشانە نین لە رێگای سەرلەنوێ ئاوا کردنەوە بەلاوە بنرێ. لە شارەکانەوە راکردن بۆ لادێ، پەرتەوازە بوونی سوپا مەزنەکان، خۆ دزینەوە لە شەڕ، ئەو شوێن و ناوچە پارێزراو و تەنگانەی پێك دێن، ئاراستەی سیستەمە نوێیەکە دەستنیشان دەکات. رەوشێك لە ئارادایە کە لە پاشەکشێ کردن دەچێ. هەروەکو بڵێی سەرلەنوێ بۆ کۆمەڵگای نیئۆلیتیك گەڕاونەتەوە. بەڵام ئەمە لە رووخساردا بەمجۆرەیە. هەرچەندە ژمارەی دانیشتوان کەم بووبێتەوە، بەڵام زۆربەی شارەکان بەردەوامی بە ژیانی خۆیان دەدەن. کێڵگە مەزنەکان بەرامبەر بە رێژەیەکی دیاریکراو وەکو نیو ـ موڵکێك بەسەر جووتیاران دابەش دەکرێت، سەرلەنوێ پەیوەندیەکەی لەگەڵ بەرهەمهێنان ئاوا دەکرێتەوە. بە لایەنی کەم بنەماڵە (خێزان)ێکی هەیە، دەتوانێ ببێتە خاوەن بەروبوومی یەك ساڵەی گوزەرانی. هێدی هێدی موڵکایەتییەکی تایبەت پێشدەکەوێت. بەمجۆرە سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ خاك، هەستی گرێدانێکی مەزن بە خاك پێشدەخات. زاراوەی خاکی دایك هێز بەدەست دێنێ و دەبێتە سەرەکیترین ئامرازی بەکارهێنان. ئیتر شەڕ لەپێناو دەست بەسەرداگرتنی خاك دەکرێت نەك زیاد کردنی کۆیلە. خاك دەبێتە بابەتی سەرەکی موڵکایەتی، نەك مرۆڤ. ئەوەی خاوەنی زێدەترین رووبەری خاك بێت، وەکو گەورەترین هێز دەبینرێ.

بەمجۆرە دابەشکردنی موڵکایەتی خاك، رژێم و سیستەمی میرنشینی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لەمێژە شێوازی گوندی هاوبەشی سەردەمی نیئۆلیتیك تێپەڕ کراوە. میرنشینەکان بە گوێرەی بنەماکانی سیستەمی موڵکایەتی بەکار دەهێنرێن و جووتیارەکانیش وەکو نیو کۆیلەیەك لەمیانەی پەیوەندییەکانی خاکەوە گرێدراوی دەرەبەگە. هەروەکو بڵێی شێوازێکی تێکەڵاوی نیئۆلیتیك و کۆیلایەتی هاتۆتە ئاراوە. لە دەوروبەری میرنشینیەکاندا تەنیا دەشێ شارۆچکەی بچووك ئاوا بکرێت. لە کاتێکدا شارەکانی ئیمپراتۆرییەتی کۆیلەداری دەبن بە وێرانە، ئەوا ئەو شارۆچکە و شارانە هێدی هێدی پێشدەکەون کە سیستەمی ئاقڵمەندانەتر و شێوازی نوێی بەرهەمهێنان بە بنەما دەگرن. هەم لادێ، هەم شار لەسەر بنەمایەکی نوێوە رێکدەخرێن. لە پاشەکشێ کردنەوە بەرەو پێشەوە دەچن و فەڵەمبازێك ئەنجام دەدەن. هیچ کاتێك پاشەکشێیەکی زێدەڕۆیی بە گەڕانەوە بۆ نیئۆلیتیك ئەنجامگیر نابێت. کاتێك پێشکەوتنێکی سنوور بەدەر لەگەڵ پاشەکشێیەکی سنوور بەدەر پارسەنگ دەکرێ، سەرەداوی دەستپێکردنی سیستەمی نوێ بەدەست دەهێنرێ، دەبێتە هێڵکاری ئەو ژیانە نوێیەی کە بەرەو ژوور هەڵدەکشێ.

ئەم پێناسەیەی سەبارەت بە دەرەبەگایەتی ئەنجامماندا هاوکاریمان دەکات لەوەی کە تێبگەین بۆچی دەرەبەگایەتی لە بواری میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفییەوە سەرچاوەیەکی رەسەنی نەهێناوەتەوە ئاراوە. رەوشی سیستەمێکی تێکەڵە، پێویستی بە ئایدیۆلۆژیایەکی تێکەڵ دەبێت. سیستەمە رەسەنەکان، رێگا لەپێش شێوەی هزری رەسەن دەکەنەوە. لەبەر ئەوەی دەرەبەگایەتی پشت بە شێوەی کۆمەڵگای نیئۆلیتیك و کۆیلایەتی دەبەستێ، ئەوا ناچارە پێکهاتەی ناسنامە ئایدیۆلۆژیەکانیان بۆ خۆی بە بنەما بگرێت. هێز و تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی نییە نوێبوونەوە بخولقێنێ. تەنانەت ئەو پێکهاتانەی وەکو خاوەن ناوەڕۆکێکی شۆڕشگێڕیش دەبینرێن، وەکو شێوەیەکی دووەمین و سێیەمین دەست بەولاوە، هیچ واتایەکی دیکەیان نییە. تەنیا بە واتای ریفۆرمخوازی دێن. ئەم رەوشەش ئەوە روون دەکاتەوە، کە پێکهاتەی لۆژیك و باوەڕی و ئەخلاقی سیستەم، کۆپیەکراوی شێوەی رابردوون. گەورەترین پێشکەوتنی رۆژهەڵاتی ناوین لە بواری لۆژیکدا، لە کۆتاییەکانی تەمەنی خۆیدا، گەیشتە ئاستێك بتوانێ ئەرستۆ شرۆڤە بکات و لێی تێبگات. هیچ هێزێکی ژیری لە ئارادا نییە کە ئەرستۆ تێپەڕ بکات. سەروەری ژیری ئەرستۆیە، تەواوی لۆژیکەکان گرێدراوی خۆیەتی. مامۆستای مەزن ئەمەیە.

لە بواری باوەڕییەوە مرۆڤەکان لە ئەزبەرەکردنی دۆگما ئایینیەکان بەولاوە رۆڵێکی دیکەیان نییە و نووسین و ئەزبەرە کردنی کتێبە پیرۆزەکان بە واتای پایەی گرنگترین بلیمەت و زانای ئایینی دێت. لەم قۆناخەدا بە رادەیەکی هەرە زێدە دۆگماتیزم هەموو قورسایی بەڵای خۆی خستە سەر هزری مرۆڤایەتی. دەرفەت بە چەکەرەکردنی هیچ هزرێکی خولقێنەرانە نادات، کاتێك هزرێکی ئایدیالیستی و میتافیزیکیایەکی وشك بێتە سەر ئەم باوەڕیانە، ئەو لایەنەی چاخەکانی ناوین دەردەکەوێتە روو کە بە تاریك ناوی دەبەین. هاوتەریبی گۆرانکاری لەو مرۆڤەی کە کۆیلەی پادشای خوداوەندە بەرەو ئەو مرۆڤەی کە دەبێتە بەندەی خۆشەویستی خودا، مۆڵەت بەوە دەدرێ ئیرادەیەکی لاوازی مرۆڤ سەرهەڵبدات. هێشتا زۆری ماوە بە ئیرادەی ئازاد و ئەخلاق بگات. مرۆڤایەتی تەنیا بە رێژەی سێبەری خودا دەتوانێ خاوەندارێتی لەخۆی بکات.

پێویستە زۆر بە باشی رووکاری ناوەوەی ئەو تاریکاییە روون بکرێتەوە کە چاخی نوێ چاخەکانی ناوینی پێ پێناسە دەکات. لە گەلێك لایەنەوە ئەم تاریکاییە قووڵتر دەکرێتەوە و درێژەی پێدەدرێت. لەدەستدان و ونکردنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی بناخەی تاریکایی چاخی ناوینە. بە شێوەیەکی گشتی خۆ پڕچەك کردنی ئایدیۆلۆژی کە قۆناخەکانی لە دایکبوونی سیستەمەکان رۆشن دەکاتەوە و رۆحیان پێدەبەخشێ؛ بە ئەندازەی ئەوەی دەبێتە هێزی ماددی و بە دەزگا ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی خۆی دەگات، بایەخی خۆی لەدەست دەدات و دووچاری گۆڕان دێت. ئەگەر جولانەوەیەکی نوێی رۆشنگەری نەبێت ئەم رەوشە بە واتای تاریکایی دێت. دابڕاندنی ئایدیۆلۆژیای کۆن لە گەوهەرەکەی و بەکارهێنانی لەپێناو بەرژەوەندیە تایبەتیەکان، سەبارەت بە کۆمەڵگا رێگا لەپێش تێکچوونی شێوە و سەرلێشێواندن و لادان دەکاتەوە. وشەبازی، ئایینزایی ساختە، شێوازی دیماگۆجی کە هەر شوێنێکی پڕ لە درۆ کردووە، بە تایبەتیش سیستەمەکانی پەرستگا ـ فێرگە کە ناوەندی ئایدیۆلۆژین بوونە بە ئامرازی بڵاوکردنەوەی تاریکایی.

تاریکایی بەرجەستەی چاخەکانی ناوین لەوەدا دەبینرێت کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ رۆشنگەری چاخی دێرین پچراندووە و لەوەش ترسناکتر ئەوەیە فەلسەفەی کردۆتە ئامرازێکی روونکردنەوە و سەلماندنی تیۆلۆژیا. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا تاریکاییەکی دوو پەردەیی پێکدێت. یەکەمیان لەدەستدانی ئەو پەیامە ئایینییەیە کە بێگەردە و واتایەکی ویژدانی دیاریکراوی هەیە، بە گوێرەی قۆناخی خۆی بە لانی کەم رێگا بە هەڵوێستێکی ئەخلاقی بەمجۆرە دەدات کە فەڵەمبازێك لەگەڵ خۆیدا بێنێ. بەمجۆرە بناخەی رەوایەتی سیستەم نامێنێ، تەنیا بەرژەوەندی ماددی ئاشکرا دەمێنێ، شەڕ و ململانێ لەم پێناوەدا دەکرێت. دووەمیان، تیۆلۆژیای فەلسەفی کە بە ئامانجی پڕکردنەوەی بۆشایی ئایدیۆلۆژی پێشخراوە، رەوشی هزری تێکەڵ و ئاڵۆزتر دەکات. مەیلە سۆفیگەراییەکان کە وەکو بەرپەرچدانەوەیەك بەرامبەر ئەم رەوشە پێشکەوتن، لەمیانەی راکێشانی گفتوگۆکان بۆ دواوە، پارچەبوونی ئایدیۆلۆژی قووڵ دەکەنەوە؛ ئەم دوو هەڵەیە یەکتری تەواو دەکەن و تاریکاییەکە قووڵتر دەکەنەوە. سەرەکیترین لاوازی و نەخۆشی چاخی ناوین ئەوە بوو. لەمەش بەولاتر، شۆرشی کشتوکاڵی رەسەن و داهێنانی سیستەمی کۆیلەداری لە کاتێکدا دەسکەوتێکی هزری بوون، لەبەر ئەوەی شێوازی گواستنەوەی ئەزبەرە کردن لە زووەوە گەوهەرەکانی وون کردووە، دەبنە دۆگمای پڕوپووچ، گەورەترین ئافات بۆ رەوشی گشتی هزری مرۆڤایەتی دێنێ.

لەم بوارەدا پێویستە رۆژهەڵاتی ناوین بە "تاریکایی" مەحکوم بکرێت، شیبکرێتەوە و راستەڕێ و رێبازی بەلاوەنانی نیشانبدرێت. تەنیا لەگەڵ ئایدیۆلۆژیاکانی خۆیان ناکۆك نین، ناوەڕۆکی توانستی هزری ١٥٠٠ ساڵەی مرۆڤایەتیان پووچەڵ کردۆتەوە، وشەبازی و ئەستاتیکای لۆژیك  دەکرێن بە رەوت و ئایینزایی ساختە و دووچاری گەورەترین تێکدان دەکرێت، رێگا لەپێش تاریکاییەکی قووڵ و نامۆ بوون دەکاتەوە. بێگومان لەم بوارەدا. پێهەڵگترنە زێدەڕۆییەکانی فەلسەفی و ئایینی لەدوا قۆناخەکانی کۆیلەداریدا، رەوشی هزری خستبووە نێو مەترسییەوە. چاخی ناوینیش هەنگاو بە هەنگاو ئەمە قووڵ دەکاتەوە. سەردەمی رۆژئاوابوون لەنێو تاریکیدا خەفە دەکات و دەبێتە شەوەزەنگ. بالاّبوون و بەهای رۆشنگەری شارستانییەتی ئەوروپا تەواو لەم خاڵەدا رۆڵێکی هەستیار دەبینێ. لێکۆڵینەوەی قووڵی سەبارەت بە سروشت و هەڵوێستەی بە گومانی بەرامبەر قاڵبەکانی کۆمەڵگا، لە راستیدا بناخەی رێنسانس پێکدێنن. لە دوو لایەنەوە ئەو تاکە دەگرێتە دەست و تاوتوێی دەکات کە ئیرادەکەی نەماوە و رەوشی هزری لەنێو تاریکاییدا خنکاوە، رۆشنی دەکاتەوە و بوێری پێ دەبەخشێ و کاروانی ئازادی ئامادە دەکات. رێبازی زانستی دروستترین و پتەوترین رێگای رۆشنکردنەوەی هزرە. لێگەرینەکانی ئازادی تاك کە لە دۆگماتیزم دابڕاوە ئیرادە و ئەخلاقی ئازاد پێشدەخات.

گرنگترین پرسیارێ پێویستە بکرێت ئەوەیە "ئایا سیستەمەکانی شارستانییەتی کە ریشەکەیان لە رۆژهەڵاتی ناوینە، نەیاندەتوانێ قەڵەمبازێکی بەمجۆرە لە ناوە خۆیاندا ئەنجامبدەن؟". دیسان لە رۆژگاری ئەمرۆشماندا لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەگەڕێن. لە راستیدا لە ماوەی نێوان سەدەی ١٠ تا ١٢ هەم لە کەسایەتی ئەلکندی، فارابی، ئیبن سینا، سوهرەوەردی و تەنانەت مەنسووری حەللاج هەوڵ و فیداکارییەکی مەزن لەپێناو رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین دەدرێت. ئەمانە تینووی گەڕان بەدوای راستین. هەروەکو دەزانرێ گەڕان بەدوای راستی زۆر لە بەرژەوەندییە سیاسی و ئابووریەکان باڵاتر و جێگای رێز بوون. ئەڤینی راستی، بە شێوەیەك دەدرکێندرێ کە لە هیچ قۆناخێکدا، جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین بەخۆیەوە نەبینیوە. سۆفیگەرایی مەزنی وەکو مەولانا و محیالدین عرابی دەردەکەون، واتە لەمیانەی هەستەکانەوە رێبەرەکانی راستی پێدەگەن. لە بواری زانستەکانیشدا پێشکەوتن لە ئارادایە. لە بوارەکانی لێکۆڵینەوەی بیرکاری، پزیشکی، ئەستێرەناسی، دانەوێڵە و ئاژەڵ پێشکەوتن بەدیهاتووە. لە تەواوی ئەم بوارانەدا باڵابوونی رۆژهەڵاتی ناوین بەرامبەر بە ئەوروپا راستییەکی حاشا هەڵنەگرە. باڵابوونی بواری وێژە و ئەدەبیات زۆر زەقترە. وێژە و ئەدەبیاتی داستانی چاخی ناوین، لەمیانەی کلاسیکییاتی شانامە و لەیلا و مەجنون خۆی سەلماندووە. فەلسەفەی مێژووی ئیبن خەلدون نزیکی ماتریالیزمی دیالەکتیکییە. سەرباری ئەمانەش رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین پێشناکەوێت. سەرەڕای ئەو تواناکاریە لەبار و گونجاوانە، ئەو پرسیارە زیاتر بایەخدار دەبێت بۆچی رێنسانسێکی لەو جۆرەی بناخەی ئەوروپای دانا، لە رۆژهەڵاتی ناوین پێشنەکەوت؟ لێرەدا دەتوانرێ باس لە پەلاماری مەغۆلیەکان بکرێت. بەڵام ئەمە نابێتە هۆکارێکی سەرەکی و دیاریکراو. سەرەڕای ئەو هەوڵە مەزنانەی کە دران ئەوا دەبێ هۆکارە سەرەکییەکانی لە پووچ بوونی ئایدیۆلۆژی و حاکم بوونی دۆگماتیزمە بەسەر هزر و قووڵایی وشك بوونی سیاسیدا بگەڕێین.

دۆگماتیزمی ئایینی مەسیحی کە ریشەکەی لە رۆژهەڵاتی ناوین دەرکەوتووە، بە شێوەیەکی بابەتی سەبارەت بە کارەکتەری پێکهاتە و هزری گەلانی ئەوروپا رۆڵێکی پۆزەتیفانە دەبینێ. ئەو گەلانەی کە بە شێوەیەکی زیندوو لەناو نەریتی بەربەرێتیدا دەژین، ئەوا لەمیانەی ئەو سەنتێزە رووکەشیەی لە رێگای مەسیحییەتەوە ئەنجامی دەدەن، سوودمەند دەبن. نابێ لەبیر بکرێت کە مەسیحییەت گەورەترین دیاری کولتووری رۆژهەڵاتی ناوینە کە پێشکەش بە ئەوروپا کراوە. هەروەکو چۆن مەسیحییەت ئەوروپاییەکانی ناچار کردووە هەنگاوێکی مەزن لە بواری پێکهاتەی هزرییەوە بهاوێژن مسۆگەر ئەخلاقەکەشی خوڵقاندووە. بە رادەیەکی هەرە زێدە مەسیحییەت هزری یاسا و دیسپلین و خوێندن و نووسینی بۆ ئەوروپا بردووە. ئەگەر ئەو بناخەیە نەبوایە کە مەسیحییەت داینـاوە، ئەوا مەحاڵ بوو بیر لە ئەوروپایەکی شارستانی بکرێتەوە. ئەگەر مەسیحییەت نەبوایە، ئەگەری ئەوە هەبوو بە هەزاران ساڵی دیکە ئەوروپا لەژێر چنگی کۆیلەداری بمێنێتەوە. مەسیحییەت رۆڵێکی مەزنی لەوەدا بینیوە کە بەبێ ئەوەی بە کۆیلایەتیدا دەرباز ببن دەسکەوتەکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوینی بۆ ئەوروپا گواستۆتەوە. شانسی ئەوروپا لێرەدایە. دەسکەوتەکانی وەرگرتووە. بەڵام کاتێك ئەمانە لەگەڵ کەسایەتی ئازاد و بەهێزی کۆمەڵگای بەربەر یەکانگیریان دەکات، هەروەها لەمیانەی کۆ کردنەوەی دواترین دەسکەوتە زانستییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، هەڵمەتە مێژوووییەکەی خۆی ئەنجام دەدات.

کەواتە مەسیحییەت و توانستی زانستی رۆژهەڵاتی ناوین و ئاکتیفی و زیندوویی کۆمەڵگای بەربەر، بناخەی هەڵمەتی شارستانییەتی نوێ پێکدێنێت. لەمانەش گرنگتر، هەروەکو چۆن کۆنکرێت بوونێکی ئایدیۆلۆژی بە قووڵایی لەسەر هزر پێشنەکەوتووە، ئەوا بەدەزگابوونێکی سیاسی و دەوڵەتیش لە ئارادا نییە کە بۆ هەزاران ساڵ پێشتر بگەڕێتەوە. هەڵوەشانەوەی رۆما، پێشنەخستنی فەرمانڕەوایەتی بێزەنتیەکان دواتریش عوسمانیەکان بەسەر ئەوروپا، شانسێکی مەزنە بۆیان. نەرمی میرنشین و کۆنفیدراسیۆنە سیاسییەکان، بە گوێرەی رۆژهەڵاتی ناوین کەش و هەلومەرج لەبارتر دەکات. پێشنەکەوتنی کۆنکرێت بوونی سیاسی و ئایدیۆلۆژی، بە واتای زەمینە و ناوەندێکی لەبار دێت بۆ شێوەگرتنی تاك و هزری ئازاد. بێ بەختی رۆژهەڵاتی ناوینیش لێرەدایە. واتە ئەو بوار و بابەتانەی بۆ ئەوروپا دەبنە شانس، بۆ رۆژهەڵاتی ناوین دەبنە بێ شانسی. هەروەکو چۆن کولتووری سیاسی دەرفەتی ئەوە نادات بۆرژوا بوون وەکو چینێك پێش بکەوێت، ئەوا دەرفەت بە فیدراسیۆن و میرنشینە نەرمەکانیش نادات. ئەو دۆگماتیزمەی کە رەگی خۆی داکوتاوە، هەروەکو چۆن رێگا بە دەرکەوتنی قەڵەمبازی تاکی ئازاد نادات، کاتێکیش سوور و بەردەوام بێت، ئەوا بێ رەحمانە سزای دەدات.

مێژووی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین کە بۆ خۆی وەکو دارچنارێکی بە ساڵاچووی لێهاتووە، کاتێك بۆ ئەوروپا دەگوازرێتەوە، بەهاکەی وەکو تازە نەمامێك وایە. لێرەدا لەمیانەی موتوربە تازەکاندا دەبێتە دارێکی نوێ، بەرووبوومێکی زۆری دەبێت. هەربۆیە ئەوروپا بەرهەمی ئەوروپاییەکان نییە. دوای ئەوەی ئەوروپاییەکان نەمامی شارستانیەتیان چاند، لە سایەی تواناکاری موتوربەکردن سەرکەوتنیان لە نوێبوونەوە بەدەست هێنا، لەم بوارەدا ئەوروپا میراسی ئەوروپاییەکانە. ئەو جیابوونەوەیەی سەبارەت بە دانوستاندنی شارستانییەتەکان دەکرێت، گرنگییەکی ژیانی هەیە سەبارەت بە تێگەیشتن و دەرککردن بە راستییەکان. کەسایەتی رۆژهەڵاتی ناوین کە بڵاوە بە مێشکی کراوە، هەروەکو چۆن نازانێ خاوەنی چییە، هاوکات بە شێوەیەکی راستیش نازانێ چی بە ئەوروپا بەخشیوە و پێویستە چی لە ئەوروپا وەربگرێت. کاتێك جیابوونەوە و بژار، راست دەرنەکەوێت، بۆیە چەندین سەدەیە ناتوانێ لەسەر بنەمای ئەم سەرچاوەیە نە رۆشنگەری ئەنجامبدا و نە هەنگاو بۆ رێنسانس بهاوێژێت.

ئاشکرایە کە هۆکارەکانی بنبەستبوونی رۆژهەڵاتی ناوین چەندە ریشەییە، یاخود بە لایەنی کەم پێویستە بەمجۆرە ببینرێ. چەندە موتوربەی نوێ و تازە بۆ دارچنارێکی بە ساڵاچوو بکەن، وەکو دارێکی تازە و نوێ ناژێتەوە؛ بە هەمان شێوە پشت گوێ خستنی و ئەو نەمامە نوێیانەی (زانست، تەکنۆلۆژیا، قاڵبەکانی ژیان) لە ئەوروپاوە دەهێنرێ لەژێر رەگی ئەستووری ئەم دارە بەجێ ناکرێت. لەبەر ئەوەی رەوش بەمجۆرەیە، شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین ناتوانێ سەرلەنوێ خۆی بخوڵقێنێتەوە.

هەوڵدەدەین هۆکارەکانی ئەوە شیبکەینەوە کە بۆچی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین ناتوانن لە رێگای گواستنەوەی زانست و تەکۆنۆلۆژیاکانی دەرەوە پێکهاتەی هزری خۆیان شیبکەنەوە. نکۆڵی لەوە ناکرێت کە چین و ژاپۆن و تەنانەت هیندستانیش لەمیانەی ئەو بەهایانەی لە ئەوروپاوە گواستیانەوە، بژاری خۆیان پێشخستووە. چینی سۆسیالیست، ژاپۆنی لیبرال ـ موحافەزەکار و هیندستانی دیموکراتیك، ئەوە نیشاندەدەن لەمیانەی هەلومەرجە ماددی و تواناکارییەکانی کە پێشکەوتنێکی مەزن بەخۆیانەوە دەبینن لەسەر رێبازی شارستانییەتی ئەوروپا بەرەو پێشەوە دەچن. ئەمانە هەروەکو چۆن سەردەمێك تەواوی دەسکەوتەکانی قۆناخەکانی شارستانییەت و نئۆلیتیکی رۆژهەڵاتی ناوینیان پەسند کرد و رێگایان لەپێش پێشکەوتنی مەزن کردۆتەوە، ئەوا بەرامبەر بە ئەوروپاش پێشکەوتنێکی هاوشێوە بەخۆیەوە دەبینێ. بەڵام رۆژهەڵاتی ناوین و ئەو هەرێمانەی هاوشێوە و پاشماوەی ئەون لەنێو بەرخودانێکی مەزندان. نە لەمیانەی تواناکارییەکانی خۆی، نە لە رێگای دەست تێوەردانەکانی دەرەوە گۆڕانکاری پێویست بەدینایەت. لە راستیدا دەبێ دەرك بەوە بکەین سەرچاوەی کێشەکە زۆر قووڵ و بنەڕەتییە. ئەوەی بەرخودان بکات مێژووە، کولتوورە و خودی کۆمەڵگایە، ئەم دیاردانە گرنگن. لەدوا بەشەکانی بەرگرینامەکەمدا هەوڵدەدەم بە شێوەیەکی قووڵ ئەم راستینەیە شیبکەمەوە. لێرەدا بە کورتی ئاماژەی پێدەکەم.

شیکردنەوەی زاراوەکانی عەشقی خودا، عەشقی راستی کە لە سەردەمی حەزرەتی مەحەممەدەوە گرنگی و بایەخی خۆی لەدەست نەداوە رۆڵی کلیل دەبینێ. باوەڕی بەوە دەکرێت لە رێگای ئایینەوە، تاڕادەیەك نزیکی راستی بوونەتەوە. فەلسەفەی یۆنانیش رێگای ئەوە دەکاتەوە کە دەتوانرێ لە رێگایەکی نوێوە بە راستی بگەیت، ئەویش رێگای مێشکە. هەرچی ئەوروپایە دەڵێ راستترین رێگا، رێگای ئەزموونە، رێگای ئەزموون و تاقیکردنەوەی زانستی دەکاتەوە.

لێگەڕینەکانی ئەشق (راستی) کە چڕبۆتەوە، بە ئەندازەی جیهانی ونبوو، گوزارشت لە خەیاڵی جیهانی ئایینده دەکات. لێگەڕینەکانی ئەشق بەدوای میتۆلۆژیای لەدەستدراو، ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکانی چارەسەر نەکراون، نهێنیە بێ کۆتاییەکانی سروشت، بە تایبەتیش بەدوای بێگەردی مرۆڤ دەگەڕێت. لە دەستپێکی چاخی ناوین وا مەزەندە دەکرا کە لە رێی خودا (الله) ئەم لێگەڕینە دۆزراوەتەوە. وەکو زاراوە نەوەد و نۆ سیفەت بە خودا (الله) دەبەخشرێ. تەواوی خەیاڵەکانی مرۆڤ دەکرێتە موڵکی ئەو خودایەی ئاشقی بوونە. وەکو پێغەمبەر و بەندە

خۆشەویستەکانی داوای بەخشندەیی لێدەکەن. هەموو شتێکی کە تەنانەت ناتوانرێ لە خۆشەویسترین کەسیش بخوازرێ، لە خودا دەخوازرێ. جیهانێکی ئایدیۆلۆژی دەخولقێندرێ، رزگاربوون لە تەواوی ناکۆکییەکان بەدی دێت و ئارەزوو و داخوازییەکان تێر دەکرێن. ئەوانەی دیکەش وەکو یاساکانی عیبادەت، یاساکانی شەریعەت و هێزی پراکتیزە کردن دیار دەکرێت و جێبەجێ دەکرێ. خودی حەزرەتی مەحەممەد بە پێشکەوتووترین کەس دادەنرێ کە لەمیانەی نزیکبوونەوەی خۆی لە ژن، شێوەی ئەو ئەشقەی خۆی بۆ خودا نیشانداوە. ئەم ژیانەی ئەشق کە دوایی دەکەوێتە نێو ڕەوشێکی چەواشەکراو، لە ڕاستیدا بە گوێرەی قۆناخی خۆی پایەدار کردنی ژن و خێزانە. مەودای نێوان ئەشقی خودایی و ئەشقی ژن هێندە دوور نییە. بەڵام لەگەڵ ونبوونی گەوهەرەکەی، ئەم پەیوەندییەش تا دواڕادە چەواشە دەکرێت و دەکرێتە ئامرازی دزێوترین و گڵاوترین کردار.

لێگەڕینی ئەشق کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین زێدەتر چڕدەبێتەوە و زیاد دەبێ لە ڕاستیدا بانگهێشتە بۆ تەواوی بەهاکانی شارستانییەتی مێژووە لەدەستدراوەکە. هەروەکو بڵێی بۆ ئەو بەهایانە دەگریین کە لە ماوەیەکی نزیکدا بە تەواوی لەدەست دەچێ. تەواوی لە خودا پاڕانەوەکان بە قووڵاییەوە پەیوەستی ئەم ونکردن و لە دەستدانەیە. ونکردنی پڕ بە ئێش و خەمناک، کەم و کوڕییەکان و خیانەت کە لە کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناویندا ریشەدارە، بە شێوەیەکی چڕوپڕ لە هۆنراوەکانی ئەشقدا گوزارشتی لێدەکرێت. تراژیدیای مەنسووری حەللاج و بە سەدانی وەکو ئەو، نیشاندەدات ئەم ڕاستینەیە چۆن لە تاکەکەسدا ژیاوە. مەسنەوی مەولانا و تەرتیلی ئەشقی یونس ئیمرە، ئاوازی هەرە خەمناکی کۆی بەها ونبووەکانە، کە بە زمانێکی شیعر ئامێزانە گوزارشتی لێدەکرێت. پێویستە ئەمە بگوترێ: کاتێك شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئەوەی جێگای خۆی بۆ ئەورووپا بەجێ بێڵێ، خۆی ژێرخاك کرد، گەلێك ئێش و ئازار دەبینێ، شەهید دەدات، داستانەکانیان دەنووسێ. تەواوی ئەدەبیاتە ڕەسەنەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئەم گریانەیە. فزوڵی گەورەترین شاعیری ئەم قۆناخەیە. ئەمەش لاوانەوەکانی شاعیرە سۆمەریەکانمان دێنێتە یاد کە ۲۰۰۰ ساڵ پ.ز گوتوویانە. ئومێد لەم ئەدەبیاتەدا بەدی ناکرێ. لە کۆتایی تەواوی ئەشقەکاندا سووتان و بوون بە خۆڵەمـێش هـەیـە. لـەیـلا و مـەجـنـون، کەرەم و ئاسلی، فەرهاد و شیرین، مەم و زین، شێوەی ڕەنگدانەوەی ئەم ڕاستینەیەیە لە ئەدەبیاتی میللی (فۆلکلۆر).

ئەگەر قۆناخی نێوان سەدەی دەیەم و پانزدەهەم وەکو دوا قۆناخەکانی پەلەقاژەی سەرە مەرگ شرۆڤە بکەین، ئەوا لە دوای سەدەی پانزدەهەمەوە سەری ئەو بەها کولتووریە ۱۵ هەزار ساڵییە کۆنکریت دەکرێت کە ژێرخاك کراوە. کاتێك کە مەغۆلەکان بە خێرایی و لە ڕێگای زەبرەوە پاشماوەکەشیان ژێرخاك کرد، ئەوا عوسمانیەکان لە"پاسەوانی گۆڕستان"ی ڕۆژهەڵاتی ناوین زیاتر ڕۆڵێکی دیکە نابینن. دوای چەند پەلەقاژەی سەرەمەرگی سوڵتان مەحەممەدی فاتح، کاتێك لەگەڵ سۆفو بایەزیت بەڕێوەدەچوو و پیاسە دەکات، تەنیا دوعای بۆ گۆڕستانەکان دەکرد. قۆناخی دواتریش هەروەکو پیسایی کردنی عەرەبە بەدەوییەکان وایە لەسەر ئاسەوارەکانی شارستانییەتی میسر، هەندێ جاریش وەکو سەما سەرەتاییەکانی ئەفریقیا زۆر نەزانانە یاریدەکات. سیستەمی کۆشکی عوسمانی بێ دەنگی مردنە. ئەمەش هێندە ئاشکرایە بۆ سەلامەتی و پاراستنی دەسەڵات تەنانەت کۆرپەلەکانیش دەکوژرێن. ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامییەتەوە نییە. بە گوێرەی چەمکی ئەهلی بەیت تەواوی تاکەکانی بنەماڵە لە پایەی پیرۆزیدا دەپارێزرێن و جێگای خۆشەویستین. خراپترین شێوەی بە دەسەڵاتبوونی لادەرانە بەمجۆرەیە، لە جیاتی ژیان پشت بە کوشتن و مردن دەبەستێ. دەسەڵاتی مردنی (کوشتن) کە لە سەرەتای دەرکەوتنی مەسیحییەتدا لەسەر عیسا پەیڕەو کرا، لە ڕۆما نیرۆن دەکرێت بە سەمبۆڵەکەی، ئەوا لە سەردەمی بێزەنتیەکاندا لەنێو شەوە زەنگدا پراکتیزە دەکرێت. عوسمانیەکانی کە بە بەرگی ئیسلامییەت خۆیان ڕەونەقدار کردووە، سێیەمین پەردە و دواترین ڕۆڵی ئەم شانۆگەریەی مردنە. تەواوی مۆسیقا و شیعرەکانی کۆشکی عوسمانیەکان هەروەکو بڵێی دەم بەگریانەوە ئەو دروست بوونە نامەشروعانەی ئارەزووە هەرزان و گەندەڵەکان دێنێتە زمان. ئەوەی خواستمان ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە، کاتێك ئەو بەها مەزنانەی شارستانییەت لە دەستدراون و وونبوون، دەگریان، ئەوا ژیانی کەیف و سەفا و ڕابواردن نوێنەرایەتی ئەو سەما سەرەتاییە دەکات کە لەسەر گۆڕستانی مردووەکان ئەنجام دەدرێت. تووڕەبوون و قەهری بەسۆی ژیانی ڕۆژهەڵاتی ناوین تەنیا بەهۆی گەرمایی، بێکاری، تەواوی ناکۆکییە پڕوپووچەکان و نەزانییەوە نییە، زیاتر سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت کە لەو خیانەتە نابوورێت کە لە ڕابردووەکەی کراوە و تۆڵە دەسێنێتەوە.

هەربۆیە شیکردنەوەکانی دەرەبەگایەتی سەبارەت بە چاخی ناوین بە تایبەتیش ئەوانەی دەرهەق بە قۆناخی تاریکایی کراوە ناتەواون و کورت دێنێ. بەرلە هەموو شتێك باسکردنێکی ڕاست و سەرکەوتووانەی شیکردنەوەیەکی گشتی و بەرفراوانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی پێویستە. ناشێ تەنیا لەمیانەی شوێنەوار ناسییەوە بە بەڵگەنامەکانی تەواوی چاخەکان بگەین. بەڵگەکانی سەبارەت بە پیرۆزی و نەفرەت، خیانەت و قارەمانێتی، خۆشەویستی و ئازار و بوێری زۆر کەم دەبن. خاکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین کە بۆتە شوێنی پیرۆزییەکانی خوداوەندەکان؛ ئیتر لەمیانەی چیرۆکە زۆر و ناقۆڵاکانی خیانەت و مەتەڵە درۆ و دەڵەسەکانی و ئەو دەمامکە خوداییانەی کە ناوەڕۆکەکەی فاڵاکراوە و لە ڕێگای ئەو گرگنانەی ڕۆڵی قەشمەری دەبینن بۆ وڵاتە مردوو و نەفرین لێکراوەکان پارچە بووە. هەموویان هێندە ساختەن، هێندە بەرامبەر مێژوو بێ ڕێزن، خاوەنی قسەی خۆیان نین و خائینن، هێندە لە ڕاستیەکان نامۆن کە هیچ بەهایەك نەماوە لەپێناو بچووکترین بەرژەوەندی تاکەکەسی و بنەماڵێتی بە هەرزانترین نرخ نەیفرۆشن. دەسەڵاتەکانی وڵات هێندە کەوتوون. ئیتر پێویستی بە دۆزەخی دیکە ناکات. ئەو دۆزەخەی لە کتێبە پیرۆزەکاندا باسی لێدەکرێت، بەڵاترین و دژوارترین شێوەی بەڕێوە دەچێت. تەنانەت هەموو کەسێکی تێکەوتووە و هەروەکو بڵێی بەندەیەکی بەهەشتی نەما. تەنیا شەڕ و پێکدادانی ئیسرائیل ـ فەلەستین یش بۆ باسکردنی ئەوە بەسە، چۆن مێژووی نەفرەت لێکراو لەمیانەی سیستەمێکی تۆقێنەرانەوە تۆڵەی خۆی لەم خاکە پیرۆزانە دەکاتەوە و خستوویەتیە نێو ڕەوشێك کە ژیانی تێدا نەماوە. لە ڕاستیدا ئەوەی تۆڵە دەسێنێتەوە ئەو بەها شارستانییەتە زۆرانەیە، کە شایستەی نەبوو.

هەرچەندە ئەمە پڕ بە ئێشە، بەڵام ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبکرێت و یەکجار سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە، خوداوەندی ژن ئینانا بۆ جاری دوایی دەچێتە بەرامبەر خوداوەندی فێڵباز ئەنکی و دەڵێ "ما، کانی من بدەوە"، بە بەهای خۆ دۆڕاندنیش بێت ئەو بەهـایـانـە لـە ئەریدۆوە دەگرێت و بە هەوای سەرکەوتن دەگەڕێتەوە ئۆرگ. خوداوەندە فێڵبازەکان بەردەوام دزیان و فرۆشتیان. لە سایەی ئەوانەوە ژن هەموو شتێکی لەدەستدا. کاتێك هەموو شتێکیان لەدەست ژن دەرهێنا، ئیتر مەزنترین هەژاری کۆمەڵگا وەکو قەدەرێك بەڕێوە دەچێت. دواتر مرۆڤیان کرد بە کۆیلە. هەموو جۆرە شێوازێکی زۆرداری و چەوساندنەوەیان لەمیانەی ساختەکاری، بەسەریاندا کرد بە مافێکی پیرۆز. ئەوانەی دواتر بەردەوام ئەم دوو کارە نالەبارەیان ڕتوش کرد و بریقەداریان کرد، وەکو باشترین هونەری ژیان دەستنیشانیان کرد. بە شێوەیەکی زۆر تۆقێنەرانە کوشتاریان ئەنجامدا، بە شێوەیەکی سەیر ئامرازەکانی کوشتنیان پێشخست. ئەو خوداوەندە ژن و پیاوانەی کە لەگەڵ مرۆڤدا دەژیان و بەردەوام هێزی پێدەبەخشین، هەموویان کردن بە بکوژ و تۆڵەسێن. ژیانی بەهەشتی جیهانیان کرد بە دۆزەخ. بەمجۆرە ڕۆژهەڵاتی ناوین نەفرەتی لێکرا. بەمجۆرە وڵاتەکان بوون بە خاکی نەزۆك و مردوو. هەموو شتێك لە ڕێگای ئەو قەدەخەنامانەوە بەڕێوەدەبرێن، کە لە زاری دەمامکەکانی ئەو خوداوەندانەوە دەڕژێنرێن کە گیانیان لەبەردا نەماوە و لەمیانەی نوێنەرە بێ گیانەکانەوە دەدرکێنرێن. هیچ دیاردە و پەیوەندییەکی کۆمەڵگا و کردارێکی مرۆڤ نەماوە کە پێشتر بڕیاری لەسەر نەدرابێت. بە تێڕوانینێکی ئازاد و نوێخوازانە تەماشای هیچ شوێن و دیاردە و پەیوەندییەك ناکرێت. لە زووەوە تێڕوانین و نیگاکانی چاو دیاریکراوە، هەر لە زووەوە دەنگ لە مەکارە (کاسێت)کان تۆمار کراوە، ژیانی بێ واتای دەمامك کراو یاسای کوشندەن. ئیتر قەدەرگەرایی ئەبەدی و ئەزەلی بەسەر ژیانێکی ڕۆبۆتی (ألی) باو و زاڵە.

لە ڕۆژهەڵاتی ناوین، مێژوو وەکو ئەڵقەکانی زنجیرەی ئەو کێشمەکێش و شەڕەی نێوان تەواوی هێزەکانی پەرەسەندنی ژیانی کۆمەڵگا و ڕکابەرەکانی وایە. لەوە دەچێ لە ناوەڕاستی چاخەکانی ناوین ئەم زنجیرەیە پچڕابێت. لێرەدا چۆن ئەڵقەی نوێی پێوە دەبەسترێ و بەرز دەکرێتەوە؟ کاتێك لە جیاتی ئەوەی شارستانیەتی ئەورووپا وەکو ڕکابەرێك ببینین، وەکو یارمەتیدەرێکمان بینی و خستمانە نێو ڕەوشێکی بەمجۆرە، ئەو کاتە بە واتای هەنگاوێکی گرنگ دێت. شارستانیەتەکان تەنیا شەڕ لەگەڵ یەکتریدا ناکەن، زیاتر دەبنە دۆستی یەکدی. ئەگەر پێویست بێت، بە بلدۆزەر مێشکیان دەکێڵن، بە شێوەیەکی ئازا و ئازادانە دڵ و هەناویان بۆ هەموو شتێك دەکەنەوە، جارێکی دیکە بەناوی تەواوی مرۆڤایەتی ڕێنسانسی خۆی ئەنجام دەدات کە تا ڕادەیەك شایستەی بەها ڕەسەنەکان بێت و بەمجۆرە خاکە مردوو و نەزۆکەکان دەکەنە شوێنی ژیانێکی پیرۆز.

# بەشی سێیەم

## شارستانییەتی سەردەمی سەرمایەداری

**پێناسە** کردنی بە کۆمەڵگا بوون وەکو پۆلێن کردنی کەڵەکە بوونی هێز، بە واتای بە زاراوە کردنی دێت لە بەرزترین ئاستدا. ئەم زاراوە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە. لە کاتێکدا مرۆڤ بە تەنیا لاوازترین و بێ هێزترین ئاژەڵە، ئەوا چۆن دەتوانێ ببێتە فەرمانڕەوای تەواوی هێزە سروشتییەکان؟ وەڵامی ئەم پرسە خۆی لە بە کۆمەڵگا بووندا مەڵاس داوە. پرسی گرنگتر ئەوەیە ئەو کۆمەڵگایە چ دیاردەیەکە توانیویەتی تاك هێندە بەهێز بکات. لە سروشتدا گەلێك گروپی چۆنییەك لەگەڵ یەکتردا دەبینرێن، بەبێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان گیانلەبەر ـ جەستەی بێ گیان بکەن هاتوونەتە لای یەکتری. شتێکی هێندە سەیر نییە گروپێکی مرۆڤ لەگەڵ یەکتردا ببینرێ. بەڵام شتی سەیر لێرەدا ئەوەیە: جگە لە مرۆڤ، تەواوی گروپەکانی دیکە، هێزێکی بەمجۆرە لە ناوخۆیاندا ناخوڵقێنن کە هێزێکی جوداتری هەبێت. بە شێوەیەکی سروشتی وەکو یەکن. کۆبوونەوە، جیاوازی لە ناویاندا ناخوڵقێنێ. گەردیلەکانی هایدرۆجین لە هەموو شوێنێکدا چۆنیەکە، هەمان شتە. چیمەن لە هەموو شوێنێك چیمەنە. مێروولە هەمان مێروولەن. لێرەدا وتووێژ لەسەر ئەوە ناکرێت کە کۆمەڵگا وەرچەرخان و جیاوازی هێناوەتە ئاراوە. هەروەکو دەزانرێ هەندێ جیاوازی نێو گروپەکان هەن سەرچاوەی خۆی لە سروشتەوە دەگرێت. هەرچەندە نموونەی بەمجۆرە بهێنرێتەوە، ئەوا بەراورد کردن و لێکچواندنی لەگەڵ کۆمەڵگای مرۆڤ هێندە پەند و دەرئەنجامی لێبەدەست ناهێنرێ. تایبەت بوونی کۆمەڵگا خۆی لە خۆیدا جیاوازییەکی مەزنی چۆنایەتی لە خۆوەدەگرێت، بەر لە هەموو شتێك ئێجگار خوڵقێنەرە. زۆر بە سانایی دەتوانرێ ئەمە ببینرێ و دەستنیشان بکرێت کە لە گەلە مێروولەوە تاوەکو دەگاتە گەلە مەیموونەکان ، هیچ گروپێکی گیانلەبەران، تایبەتمەندێتی خوڵقکارییان نییە کە پێشبکەوێت. هەرچی لە کۆمەڵگای مرۆڤدایە، لە هەموو کاتێکدا خوڵقاکارییەك جێگای باسە کە گەشە دەکات و خێرا دەبێت.

سێیەمین پرسی کە گرنگە و جێگای بایەخە، تا چ رادەیەك دەبێ تاك و کۆمەڵگا بایەخی پێبدرێت و لەپێشەوەبێت. بە کۆمەڵگا بوون تا چ رادەیەك لە خزمەت و بەرژەوەندی تاك دایە، لە کوێ لە دژی دەبێت؟ بە پێچەوانە تاکە کەسێتی (بوونی تاك بە خاوەن کەسێتی خۆی ـ و) چەندە لە خزمەتی کۆمەڵگا دایە و پێویستە، لە کوێ زیانبەخش دەبێت و تا چ رادەیەك زیانبەخش دەبێت؟ بێگومان پەیوەندی تاك ـ کۆمەڵگا پێویستی بە شیکردنەوەیەکی راست هەیە. ناشێ مرۆڤ بەرامبەر بە رەوشێکی بەمجۆرە سەرسووڕماو و واقی وڕنەمێنێ، سەرەڕای ئەوەی کێشەی شیکردنەوە بە ئەندازەی جودابوونەوە و یەکبون گرنگە، بەڵام سەبارەت بە بابەتێکی هێندە ژیانی و گرنگ، بە نەزانی ماوەتەوە یاخود سنووردارە و لە نێو ژیانێکدا دەژی کە پڕە لە زانیاری هەڵە و نابەجێ.

بۆ پێناسە کردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری پرسیار کردنی ئەم سێ پرسە سەبارەت بە سەرەکیترین زاراوە کە رۆڵی کلیل دەبینێ، گرنگ و بایەخدارە. تاوەکو وەڵامێکی راستی ئەم پرسیارانە بەدەست نەهێنرێ، ئەو پێناسەیەی دەرهەق بە کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەنجام بدرێ بە رووکەشی دەمێنێتەوە. لە رەوشێکی بەمجۆرەشدا هەموو هەوڵەکانی داهێنانی زاراوە و پێشخستنی تیۆری، یەك بە دوای یەك تەنگ بوون و کەم و کوڕی لە خۆوەدەگرێت. هەربۆیە کاتێك شیکردنەوەیەکی راست سەبارەت بەو بەهێزبوونە بکرێت کە کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا هێناوە، خوڵقکاری خێرا و هەمیشەیی ئەم بەهێزبوونە و قازانج و زیانەکانی تاك لە ئاکامی بە کۆمەڵگابوون بە شێوەیەکی راست و لێهاتووانە شیبکرێتەوە، بەو ئەندازەیە کۆمەڵگای سەرمایەداری و تاکڕەوێتی پێناسە دەکرێت.

ئەمە روون بۆتەوە کە ئەو سۆسیالیزمەی وەکو رەوتێکی رکابەر خاوەن بانگەشەیەکی مەزنی زانستیبوون بوو، شیکردنەوەکانی سەبارەت بە سەرمایەداری، تێری نەکردووە. ئەو شکستانەی سۆسیالیزم دووچاری هات بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بە گوێرەی پێویست زانستی نەبوو، نەك ناهەق بوو. لەوە دوور ماوە کە دەرك بە کۆمەڵگا بکات بە تایبەتیش دووالیزمی تاك و کۆمەڵگا. باڵابوونی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەسەر کۆمەڵگا سۆسیالیزمی، تاکی سەرمایەداری بەسەر تاکی سۆسیالیستی تێپەڕنەکراوە. ئەو دواکەوتن و زانیارییە ناتەواوانەی سەبارەت بەم مەسەلەیە خاوەنی بوون، رۆڵێکی سەرەکی لەم رەوشەدا بینیوە.

مێژووی بە کۆمەڵگا بوون پێویستی بە توانەوەی تاك هەیە، کە ئەمەش دژی تاك دەشکێتەوە. کاتێك باسی تۆقێنەری دەکەین، تەنیا مەبەستمان شێوازە قەبەکانی فشار نییە. واتە لەگەڵ لایەنە ئەرێی و شێوازەکانی سەرنج راکێشی و بەزەیی هاتنەوە، لە ناو یەکتردان. ئەوەی لە قۆناخی پێکهاتنی یەکەمین بە کۆمەڵگابووندا دەبینرێ، لەسەر بنەمای ترساندن و بەخشینەوە، ماڵیکردن و ئامادە کردنییەتی بۆ بە ئەندام بوونی کۆمەڵگا. ئەوە ململانێیەکی هێندە بێ ئامانە، کاتێك پێویستییەکانی جێبەجێ نەکرێت، ئەوا زیان و وونکردنی هەمە لایەنە ، لەسەرووی هەمووشیانەوە مردن دەبێتە ناچارییەکی دەست لێبەرنەدراو. راستتر بڵێین، کاتێك پێویستییەکانی ئەندامێتی کۆمەڵەکە جێبەجێ بکرێت، دەرفەتی ژیان هەیە. پێداویستییەکانی ئەندام بوون جێبەجێ نەکرێت، ناشێ ژیان بەردەوام بێت. وەکو لاوازترین گیانلەبەر، لە قڕبوون رزگاری نابێت. بێچوە چۆلەکەیەك لە ماوەی پانزدە رۆژدا دەتوانێ بفڕێ و درێژە بە ژیان بدات؛ بەڵام ئەمە بۆ بێچووی مرۆڤ لە دە ساڵ کەمتر نابێت. کاتێك بە تەنیا بمێنێ، رۆڵەیەکی (منداڵێکی) مرۆڤ زۆر لە بێچووی چۆلەکەیەك بێچارەترە. بەڵام کاتێك ببێتە ئەندامی بنەماڵە (قلان)ییەکی بچووکیش دەتوانێ ببێتە پادشای جیهانی هەموو گیانلەبەران. کاتێك ئەم رەوشە هەستی پێدەکرێت، بە کۆمەڵگابوون وەکو هێزێکی هێندە مەزن و ئاوارتە دێتە ئاراوە کە، لەمیانەی هەموو جۆر و شێوەیەکی یەکەمین بیرکردنەوە، لەمیانەی زاراوەکانی ئایین و خوداوەندەوە گوزارشتی لێدەکرێت. واتە دەرکەوتنی ئایین و سەرەکیترین زاراوەکەی کە خوداوەندە، سەرەکیترین رەنگدانەوەی ناسنامەی ئەم بەهێزبوونە سیحراوی و ئاوارتەیەی کۆمەڵگایە. بە کۆمەڵگابوون بناخەی ماددی خوداوەندیبوونە، خودی خوداوەندە. رەنگدانەوەیەکی پاسیفانەش جێگای باس نییە. ئەو هێزەی هاتۆتە ئاراوە توانای هەموو جۆرە خوڵقکاری و داهێنانێکی هەیە، کە ئەمەش سەرەکیترین تایبەتمەندێتی خودایە. چ ماوە کۆمەڵگا نەیخوڵقاندبێت؟ لەوانەیە بگوترێ شتێك لە نەبوونەوە ناخوڵقێنرێ. بەڵام کاتێ ئەوە بێنینە بەرچاوان کە رەوشێکی بەمجۆرە لە ئارادانییە کە ئەوە سەلمێنرابێ لە نەبوونەوە خوڵقکاری بکرێت، ئەوا تایبەتمەندێتی خودایی خوڵقکاری کۆمەڵگا دەبینرێ.

لێرەدا دەردەکەوێت کاتێك دەرك بەو هێزە مەزنە دەکرێ کە کۆمەڵگا دەیبەخشێ، هەنگاونانی زیاتر بەرەو بە کۆمەڵگابوون دەبێتە ناچارییەك. لە ئەنجامی بە کۆمەڵگا بوون، لە رەوشی خشۆکی سروشت و بوونەوەرێکی (کائن) بێ کاریگەر رزگاری دەبێت؛ بە پێچەوانەوە، لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگا دەبێت بە هێزێك کە بەسەر تەواوی بەهاکانی سروشتدا زاڵ بێت. قۆناخەکانی دەستپێکی مێژووی کۆمەڵگا، لەبەر ئەم هۆیە پێکهاتەیەك دێنێتە ئاراوە، بەردەوام بە کۆمەڵگابوون بەهێزدەکات و لە شێوەی ژێر بۆ ژوور، لە بەشێکەوە بۆ بەشەکەی دیکە بەردەوام لە نێو قەڵەمبازدایە. لەمیانەی پێکهێنانی شێوە پەیوەستدارەکانی کۆمەڵگا، وەڵامی تەواوی ئەو کۆسپ و گیروگرفتانە دەداتەوە کە سەرهەڵدەدەن. زانیارییە پوخت و کورتەکانی سەبارەت بە کۆمەڵناسی ئاماژە بەوە دەکەن کە راستی بەم ئاراستەیەدا رێڕەوی گرتووە، پێشکەوتنێکی بەمجۆرە لە ئارادابووە کە بەبێ پچڕاندن، لە نێو مەزن بوون و بەردەوامیدا بوون. پچڕاندن و پارچەبوون و قڕکردنەکانی ناوە بە ناوە روودەدەن، هێزێکی ئەوتۆی نییە کە وزەی هەڵکشان و بەهێز بوونی و مەزن بوونی مەیل و هەڵوێستی گشتی ریشەکێش بکات. لەوانەیە پاشماوە و دەرهاوێشتەی لە کارکەوتنی کۆنە بەرامبەر نوێ، کە ئەمەش پێویستییەکی پێشکەوتنی کۆمەڵگایە. هەروەکو بڵێی توانەوەی تاك لە نێو کۆمەڵگادا یاسای سەرەکییە. لە پەیوەندی نێوان دیاردەی کۆمەڵگایەکی بەهێز و تاك، داب و نەریتەکانی کۆمەڵگا زاڵە. نەریت وەکو یاسای کۆمەڵگایە. کاتێك هەنگاو بە هەنگاو کۆمەڵگا بەرەو پێکهێنانی داب و نەریتێکی

وشك و برینگ دەچێت، ئەمە بە دژی دەستپێشخەری و وزە و توانای تاك دەشكێتەوە. دوای قۆناخێك، كۆمەڵگا و داب و نەریتەكەی كە تاكە ڕێگای لەسەرپێمانەوە و ژیانی تاك بوو، ئیتر دەبێت بە هێزی كۆن و بەند كردنی تاك.

لە كۆمەڵگای چینایەتیدا، یاسای فەرمی دەوڵەت كە  لەسەرووی داب و نەریتە، ئەگەر پێویست بكات لەمیانەی بەكارهێنانی توند و تیژییەوە بە شێوەیەكی وشكتر پیادە دەكرێت. پابەند بوون و گرێدانی تاك بە كۆمەڵگا، دەگۆڕدرێ بۆ كۆیلایەتی و بەندێتی. وابەستەیی تەنیا بە گوێرەی هەلومەرجەكانی بەرهەم هێنانی ماددی كۆمەڵگا نییە، بەڵكو بەسەر جیهانی هزر و هەستیشدا زاڵ دەبێت. هەلومەرجە ئایدیۆلۆژی و ماددییەكان، لەمیانەی پیرۆزییەوە وەكو ڕەنگدانەوەی سیستەمی خودایی بەسەر تەواوی توێژەكانی كۆمەڵگا دەچەسپێنرێ. هێندەی ئەوەی تواناكارییەكانی چەوسانەوەی چینایەتی زیاد دەبێت، هاوكات پەیوەندییەكانی وابەستەیی كە ڕێگا بەم چەوساندنەوەیە دەدات، هەم لەمیانەی فشار و ئەشكەنجەی ماددییەوە، هەم لەمیانەی ئەو میتۆلۆژیانەی مژدە و ترسی مەعنەوی لە خۆوەدەگرن، چەندی بڵێی تۆكمەدەكرێن. ئیتر داخوازی و ئاواتی ڕزگاربوون لەلای تاك گەڵاڵە دەبێت، قۆناخی ڕاكردن لە فشاری كۆمەڵگا دەستپێدەكات كە گەیشتۆتە نایەكسانی و ستەمكارییەكی یەكجار مەزن. لە ئاكامی جڤات بوون و كۆمەڵەی خۆییەوە، هەڵوەشانەوە لەو كۆمەڵگایەدا خێرا دەبێت كە وابەستەیی و كۆیلایەتی دەسەپێنێ. سەرەتا مرۆڤ باس لە ئێش و ئازار دەكات، دوایی سكاڵا پێشدەكەوێت و لە دواییشدا دەبێتە یاخیبوون. بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزە فەرمییەكانی سیستەم، بەدوای تواناكارییەكانی خۆیدا دەگەڕێت. لێگەڕینە نوێكانی سەبارەت بە خودا و پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكان، پێویستی جیاوازی لە هزر و مێشكدا دەچەسپێنێ.

كۆمەڵگای ڕكابەر زیاتر نزیكی تاكە و كراوەیە. بە واتایەك قۆناخی ئازادبوون، جوڵانەوەیەكی نوێی كۆمەڵگایە؛ لێگەڕینێتی بەدوای ناسنامەی ئایدیۆلۆژی و سیستەم. ئەگەر كۆمەڵگا و ئایدیۆلۆژیای نوێ لەمیانەی ئەزموونەوە، بەرامبەر بەو سیستەمەی كە دژی وەستاوە لەسەر پێیان بمێنێ و تەنانەت ئەوە بسەلمێنێ لەو دەوڵەمەندتر و بەرهەمدارترە، ئەوا دەرفەتی ئەوەی بۆ دەرەخسێ ببێتە ئەلتەرناتیف و جێگای كۆن بگرێتەوە. ئەو هەڵوێست و مەیلانەی دژی سیستەمی كۆیلەداری پێشخراون، ئیتر چ ئایینە تاكخوداییەكان بێت یاخود تەریقەتە نیو فەلسەفی ـ نیو ئایینیەكان بێت، هەروەكو لە نموونەی عیسادا دەبینرێ ئەم هەڵوێستانە بە تەواوی دەبن بە ڕەوتێكی ڕزگاریخواز. دوای قۆناخێكی درێژخایەنی بە كۆمەڵگابوون، هزر و ویژدانی تاك وریا دەبێتەوە. ڕزگاربوون لە كۆت و بەندەكانی داب و نەریتە باوەكانی كە سەدان هەزار ساڵ بەردەوام بووە، داننانی دیاردەی كۆمەڵگابوونە بەوەی كە زێدەڕۆیی كردووە و سنوورەكانی تێپەڕاندووە. دوای خولقاندنی سیستەمی دەرەبەگایەتیش دیسان ئەم مەیلە بەردەوام دەبێت. ئەشقی خودایی یاخود ئەشقە كلاسیكییەكانی چاخەكانی ناوین. هەروەها ڕاكردن و خۆدزینەوەی تاك لە بە كۆمەڵگابوونێكی بێسنوور، گوزارشت لە لێگەڕینەكانی ئازادی دەكات. ئەم لێگەڕینە مەزنانەی دەرهەق بە ئەشق بەڵگەی زەقی ئەوەن كە تاك لە نێو مەحكوومییەتێكی چۆندا ژیاوە. لە كۆمەڵگا ڕادەكات، پەنادەباتە بەر خودا، چاوەڕوانی و ئاواتی هاوكاری لە ئەڤینی تاك دەخوازێ. لێگەڕینەكانی فەلسەفە و تەریقەتەكانی سۆفیگەرایی وەكو پارچەیەكی ئەم قۆناخە بەردەوام دەكات. هەرچەندە لە ڕێگای ئامراز و ئامانجی هەڵە و سنوورداریش بێت، ئەو تاكەی ڕابۆتە سەرپێیان، سەركوت ناكرێتەوە.

كاتێك بە شێوەیەكی بەرفراوانی بەمجۆرە تەماشای تاكڕەوێتی بكەین كە یەكێكە لە فاكتەرە سەرەكییەكانی لە دایكبوونی سەرمایەداری، ئەو كاتە باشتر دەرك بەوە دەكرێت كە لیبرالیزمی بۆرژوازی ڕیشەیەكی چەندە بەهێزی مێژوویی و كۆمەڵایەتی هەیە. وەكو دەرئەنجامێكی ئەم ڕاستینەیە دەتوانین دەرك بە قووڵایی ئەوە بكەین كە سەرەڕای مافدارێتی و ڕەوایەتییەكەی، بۆچی كۆمەڵگای سۆسیالیزمی زانستی نەیتوانی باڵابێت. تاوەكو كۆمەڵگا وەكو ناوەندێكی پۆڵایین درێژە بە هەبوونی خۆی بدات، بەردەوام لیبرالیزمی تاكە كەسی لە سۆسیالیزم باڵاتر و پایەدارتر دەبێت. كاتێك كۆڵەكە و ناوەندی كۆمەڵگای كۆن پەرتەوازە بكرێت، ئەو كاتە هەلومەرج و زەمینەی ئاواكردنی هاوسەنگییەكی ئاسایی دێتە ئاراوە.

لێرەدا لە ئاستی پێناسەكردندا باس لەو هەڵوێست و مەیلە مێژووییانە دەكەین كە سەرمایەدارییان هێناوەتە دونیاوە. بێگومان ڕەوتی تاكڕەوێتی  لەسەرووی ئەم مەیل و هەڵوێستانەوە دێت. هۆكاری ئەم كاریگەرێتییە مەزنەی كردوویەتی، بۆ ئەو فشارەی كۆمەڵگا دەگەڕێتەوە كە بە سەدان هەزار ساڵ بەردەوام بووە. هەروەكو بڵێی تاك تواوەتەوە. كۆمەڵگاش هەروەكو بڵێی ئەلكترۆنەكانی ژینگەی فووت داوە، مەزن بووە و لە خانەیەكی ئەتۆمی دەچێت كە بۆ پارچەبوون گونجاو و لەبارە. بەڵێ تاكڕەوێتی ڕۆڵی ئەم پارچە بچكۆلانەیە دەبینێ كە كەوتۆتە ناو سیستەم و ڕێگا لەپێش كاردانەوە یەك بەدوای یەكەكانی دەكاتەوە و كۆمەڵگا كۆن و لە پەلوپۆ كەوتووەكە پارچە دەكات. ئەو سەرمایەدارییەی دێتە ئاراوە هێزی خۆی لەم تەقینەوەیە وەردەگرێت و لە ڕاستیدا ڕێگا لەپێش ئەنجامێكی مەزنی مێژوویی دەكاتەوە.

بە شێوەیەكی سەرەكی سەرمایەداری هێز و توانای خۆی لەو بڵاوبوونەوەیە وەردەگرێت كە لە ئەنجامی پێكدادانی تاك لەگەڵ ئەو كۆمەڵگایە دێتە ئاراوە كە بە سەدان هەزار ساڵ مەزن ببووە. نهێنی خولقكاری لێرەدایە. پێبەپێ ڕوون دەبێتەوە، سۆسیالیزمی زانستی سەبارەت بەم بابەتە، بە شێوەیەكی تەسك و سنووردار بیری كردۆتەوە و هەڵوەستەی كردووە، كاتێك بووە بە دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی ئەوتۆ زۆر بە كۆمەڵگای كۆن بچێت تەنانەت كاتێك توندتر بووە، لەگەڵ مەیلی ئازادیخوازانە ناكۆك بووە كە بەردەوام بانگەشەی بۆ كردووە.

جگە لە بواری كەسێتی تاك، ئەوا پێناسەكردنی دەركەوتنی كۆمەڵگای سەرمایەداری لە بواری كات و شوێندا، گەلێك پەند و ئەزموونی لێدەكەوێتەوە.

هەروەكو چۆن ئەگەر بواری كات و شوێن نەبێت، ناشێ بیر لە هەبوونی ماددەیەك بكرێتەوە، ئەوا كۆمەڵگاش وەكو دیاردەیەكی ماددی تایبەتمەندێتی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت كە بە چڕییەوە گرێدراوی دیاردەی كات و شوێنن. شێوەیەكی كۆمەڵگا كە كات و سەردەمی خۆی بەسەر نەبردبێت، لەناو ناچێت. كاتێك لەنێو نەچێت و بە شێوەیەكی ڕاست خۆی بگەیەنێ بەو شێوەیەی دوای ئەو دێت، دەرفەتی ئەوەی بەدەست دەكەوێت بە شێوەیەكی دروست بەڵاوەی بنێت. ئەگەر ئەم ڕەوشە نەڕەخسێنێ، ناشێ وەرچەرخان بەدیبێت. هەلومەرجی ئەوە دێتە ئاراوە یان لەمیانەی توانەوە یاخود پەرتەوازەبوون لە هەلومەرجەكانی، لە ناوچوونی بڕەخسێت. ئەگەر بەرخودانی سەركەوتن بەدەست بێنێ لەسەر پێییان دەمێنێتەوە. دەكەوێتە نێو پێشكەوتنی سروشتی. ئەگەر بەرخودان سەركەوتوو نەبێت، گەوهەری خۆی لەدەست دەدات. لە كاتێكدا شێوەگرتنە سروشتییەكان یەك بەدوای یەكەوە بێن، كۆمەڵگایەك بە كات و ماوەیەكی ئاساییدا دەربازدەبێت. لە ئەنجامدا ئەو كۆمەڵگایەی سەركەوتنی لەمەدا بەدەست هێناوە، بە كۆمەڵگایەك دادەنرێ كە بە ڕۆحی سەردەم گەیشتووە و پێویستییەكانی پێگەیاندووە و ئامادەی كردووە. هەربۆیە لە شێوەگرتنی سیستەمەكانی كۆمەڵگادا هیچ كاتێك لە بنگەدا لە سەرەتاییەكانەوە قەڵەمباز بەرەو سەرمایەداری ئەنجام نادرێت. ئەگەر هەندێ بنەماڵە لەگەڵ سەرمایەداریدا ببن بە یەكیش بە واتای ئەوە نایێت سیستەمە دەرەبەگایەتییەكان تێپەڕكران. بە پێچەوانەوە، لەبەر ئەوەی ئەم سیستەمانە كاتی خۆی پڕكردۆتەوە و بەسەرچووە و جێگای خۆیان بۆ سەرمایەداری بەجێهێشتووە، ئیتر تەواوی سیستەمە كۆنەكان لەلایەن سەرمایەدارییەوە فووت دەدرێن. بەڵام بە خۆیان بەو قۆناخە سروشتییانەی پێشكەوتندا تێپەڕنابن كە پێویستە بە خۆیانەوە ببینن. جیاوازی نێوان پێكهاتنی قۆناخەكان و فووتدان، لێرەدا شاراوەیە. هیچ شێوەبەندی و سیستەمێكی كۆمەڵگا تاوەكو بە ڕۆحی سەردەم نەگات و پێیدا دەرباز نەبێت و قۆناخەكانی نەبڕێت، ئەوا لەمیانەی گەوهەر و ناسنامەی خۆیەوە پێی ناگات.

لە ڕەوشێكی بەمجۆرەدا شێوەگرتنی كۆمەڵگای سەرمایەداری، وەكو دواترین ئەڵقەی تەواوی ئەو شێوەگرتنە كۆمەڵایەتییانەی پێش خۆی بەدیدێت. ئەڵقەكانی پێشوو لە كوێ و تا چ ڕادەیەك ژیابن ئەوا سەرمایەداری وەكو دواترین ئەڵقە پێیانەوە دەلكێ. ڕاكردن لە كاریگەرییەكانی كات (سەردەم)، مەحاڵە. هەروەكو جەختی لەسەركرایەوە چۆن ماددە بێكات (زمان) نابێت، ئەوا سیستەمەكانیش بەبێ كات پێك نایەن و ناخرێنە سەر یەكتری.

لەم بوارەدا ئەو هەڵسەنگاندنانە گرنگە و جێگای بایەخە: هەروەكو بڵێی سەرمایەداری ئەوروپا، لە شێوەی ڕوانی كوارگ لە كیشوەری ئەوروپا دەركەوتووە و وەكو شێوەیەكی كۆمەڵگا پێشكەش بە مرۆڤایەتی دەكرێت. باڵادەستی ئایدیۆلۆژی ئیمپریالیزم لە ئاستێكی هەرە بڵندا، لادان و چەواشەكاری زانستی لەم بوارەدا ئەنجام دەدات. بەمجۆرە ئەوروپا وەكو سیستەمێك دەسەپێنێ كە بێهاوتایە، كەس پێیناگات و قەرزاری كەس نییە و هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت. لە مێژوودا بە تایبەتی ئەو كۆمەڵگایانەی كارەكتەری ئیمپریالیستانەیان هەیە، لەنێو

نزيك بوونەوە و هەڵوێستێكی هاوشێوەدان. خۆیان بە سەنتەر و دەستپێكردنی هەموو شتێك دەبینن. ئەوانەی دیكە بە تەواوكەری سادە و پاشماوە دەبینن. ئەم تێڕوانینە ناهێڵێ دەرك كردن و تێگەیشتنی مێژووی كۆمەڵگا بەدیبێت. سەرەڕای هەموو بانگەشەكانی زانستی بوونی ئاستی وشیاری و تێگەیشتنی كۆمەڵگای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، پشت بە چەمكێكی ڕاستی سەبارەت بە مێژوو نابەستێ. ئەمەش بە واتای ئەوە دێت زانستێكی كۆمەڵایەتی ڕاست و دروست پێش ناكەوێت. هەروەكو تەواوی دیاردەكانی سروشت، هیچ دیاردەیەك نییە بێكات (زمان) بێت. شوێن پەنجەی مێژووی سروشت لە هەموویاندا هەیە. لەمیانەی مێژووەوە، واتە لە ڕێگای كاتەوە دەتوانرێ دەستنیشان بكرێت كە تا چ ڕادەیەك و چۆن پێكهاتوون. لە تەقینەوەی ئەستێرە بریقەدارەكانەوە تاوەكو دەگاتە هەڵهێنانی جووجەڵە لەلایەن مریشكەوە، هەموو دیاردەیەك، كاتێكی تایبەت بە خۆی هەیە. بە گوێرەی ئەوەی كۆمەڵگاش دیاردەیەكی ماددییە، وابەستەی كاتێكی دیاریكراوی پێكهاتنە. مێژوویێكی جددی كۆمەڵگا، كاتێك ئاماژە بەوە بكات كە شێوەبەندییەكانی كۆمەڵگا لە كوێ و چۆن و لەمیانەی كامە تایبەتمەندێتیەوە پێكهاتووە و سەرەتا و ئەنجامەكەی چی بووە؟ ئەو كاتە دەبێت بە مێژوویێكی ڕاستی كۆمەڵایەتی و بەمجۆرە دەتوانێ بانگەشەی ئەوە بكات كە بووە بە زانستی كۆمەڵگا (كۆمەڵناسی).

دەشێ هەڵسەنگاندنێكی هاوشێوەی ئەمە دەرهەق بە بواری شوێن (جوگرافی) كۆمەڵگابوون پێش بخرێت. هەر شێوەگرتنێكی كۆمەڵگا بە شێوەیەكی بەهێز گرێدراوی هەلومەرجەكانی شوێن (جوگرافیا)یە. بەر لە هەموو شتێك پێویستە هەلومەرجێكی جوگرافی ئەوتۆ هەبێت كە مرۆڤ بتوانێت تێیدا بژی و بەرگە بگرێت.

ئەوەی زیاتر جێگای بایەخە ئەوەیە، یەكەمین شێوە بەندییەكانی كۆمەڵگا، لەو شوێنانە دەرفەتی پێشكەوتنیان هەیە كە تواناكاری ڕاو و كۆكردنەوەی بەروبوومیان هەیە. لەو شوێنانەی ئەم تواناكارییانەیان لێنییە، ناشێ هیچ شێوەیەكی كۆمەڵگا پێكبێت. شێوەبەندی كۆمەڵگایەكی وەكو كۆمەڵگای نیئۆلیتیك لە قۆناخەكانی سەرووتردا لەو شوێنانە دێتە ئاراوە كە بە شێوەیەكی سروشتی گیانلەبەرەكانی ڕاوكردن و دانەوێڵەی تێدا دەروێ و زۆر دەبێت. لەهەمانكاتدا ئەم شوێنانە هەبوونی كۆمەڵگایەك كە لەمیانەی ڕاوكردن و كۆكردنەوە خۆی بەخێودەكات و دەژێنێ، دەكات بە مەرجێكی لەپێشینە. ئەمەش ڕاستینەیەكی دیكەیە تەواوی ئەو هەلومەرجە لەپێشینانە، تەنیا لە چەند شوێنێكی سنووردااردا كەڵەكەدەبێت. ئەگەر داهێنانە مەزنەكانی ئەڵقەی نیئۆلیتیك نەبوایە. ئەوا هەنگاو بەرەو شێوەبەندی كۆمەڵگای چینایەتی نەدەهاوێشترا. مێژوو ئەوە نیشان دەدات تەنیا دەشێ لە نێو كەوانەكانی ناوەوەی زاگرۆس ـ تۆرۆس، لەمیانەی كۆمەڵگای گوند كە لە دۆڵی میزۆپۆتامیا ئاوا بووە، لە نێو پەیوەندییەكی بەهێزدا ڕێگا لەپێش شۆڕشی شار بكرێتەوە كە هەنگاوێك لەپێشترە. بەڵام تواناكاری ئاودێری و پێكهاتەی خاكە بە پیتەكەی حەوزەی خوارووی میزۆپۆتامیا شوێنێكی لەبار و گونجاوی شۆڕشی شارە و سەرەتا لێرە پێك دێت. ئەڵقەكەكانی كۆمەڵگا چڕتربووە. كاتێك لە نێو پەیوەندییەكی دیالەكتیكیدا ، كۆمەڵگای نیئۆلیتیك كۆمەڵگای چینایەتی كۆیلەداری پێك دێنێت، بەمجۆرە ئەڵقەیەكی دیكەی ئەڵقە سەرەكییەكان پێك دێت. ئەم شێوەبەندییە نوێیە، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەكی درێژ و لە ڕووبەرێكی بەرفراواندا بڵاودەبێتەوە و بەردەوام دەكات، تاوەكو ئەو قۆناخەی لە ئەنجامی ناكۆكییەكانی ناوخۆ ناچاری بەلاوەنان دەبێت، ئیدی لەمیانەی ئەو هێزەوە دەژی كە لە ناوەندی نیئۆلیتیكەوە وەری دەگرێت. هەروەكو كات، شوێنیش (جوگرافیا) تایبەتمەندییەكی بەمجۆرەی هەیە كە مۆركی خۆی لە شێوەبەندی كۆمەڵگا دەدات. دەبێ دەرك بەوە بكرێت لە دیاردەی كۆمەڵگادا، دەستپێك و دوایی، سەرەتا پێشكەوتنەكانی ناوەند و دەوروبەر، لە نێو یەكێتییەكی دیالەكتیكییانەدا خاوەنی ڕاستینەیەكن. ئەم ڕێسایەی بەهای یاسایەكی گشتی هەیە، ئەوە  نیشان دەدات بەبێ ئەوەی بوارەكانی شوێن و كات ڕەچاوبكرێت، دەركی پێناكرێت. سەرباری ئەوەی ڕاستینەكە بەمجۆرەیە، ئەوا تایبەتمەندێتی خۆ جودابینین و خۆ بە ڕەسەن نیشاندانی ناسنامە ئایدیۆلۆژییەكان، فاكتەرێكی لەپێشنەیە كە كۆسپ دەخاتە بەردەم باسێكی ڕاست و دروستی مێژوو. خۆ بەسەنتەر دانان ئامانجێكی شەڕی ئایدیۆلۆژیە. خۆ بە زلزانین، نكۆڵیكردن لەوانەی دیكە، وەكو باڵا بوونێك دەبینێ و بەمجۆرە پەی پێدەبات. چەندەی هێزی چەواشەكردنی ڕاستی نیشان بدرێت، بەو ئەندازەیە خۆی بە سەركەوتوو لە قەڵەم دەدات. لە چاخە سەرەتاییەكانەوە تاوەكو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، تەواوی شێوەبەندییە بە شان و شكۆكانی كۆمەڵگا، وەكو ڕێچكەیەكی بەردەوام كردنی ژیانی خۆیان ئەمەیان بەكارهێناوە.  لەسەردەمی تەوتەمگەراییدا، هەر گروپێك تەنیا بتی خۆی بەهادار دەبینێ و پەسندی دەكات. سەرباری ئەوەی لە ناوەڕۆكدا هەمان ڕۆڵ دەبینن، لە میتۆلۆژیا هەنگاوێك بەرەو پێشەوە دەهاوێژرێ. ڕەنگدانەوەی كۆمەڵگا بە شێوەی ئەو خودایەی لە ئاسمان جێگیربووە، لەمیانەی میتۆلۆژیاوە دەبێتە خاوەن نوێنەرایەتییەك. لەبەر ئەوەی شارەكان گرنگترین ناوەندی كۆمەڵگایە، ڕێگا لەپێش دەركەوتنی بەهێزترین خوداوەندی پارێزەری شار دەكاتەوە. ناوەندیبوونی سیستەم، یەك بوونی چەندین شار، ناوەندیبوونی هاوشێوە لە نێو خوداوەندەكانیشدا لەگەڵ خۆی دێنێ. گەیشتن بە ئیمپراتۆرییەتێكی گەردوونی، زەمینەی سیاسی بۆ تاكخودایی ئامادە دەكات. ئیتر بۆچوونی تاكە پادشایی زەوی و تاكخودایی ئاسمان، جێگای خۆی لە هزردا دەكاتەوە. لە كاتێكدا پێشكەوتنەكان ئاراستەیەكی بەمجۆرە وەردەگرن، ئیتر چی لە ناوەوەی كۆمەڵگای چینایەتی بێت یاخود دەرەوە، ئەو بەرخودانانەی لە بەرامبەری پێشدەكەون، لە نێو پەیوەندی كارتێكردن و كاردانەوە سەمبۆل و نەریتەكانی خۆیان بەرەو پێش دەبەن و دەخوازن بەردەوامی پێبدەن. پێشكەوتنێكی هاوشێوە لە پەیوەندییەكانی بەرهەمهێنانی ماددیشدا بەردەوام دەبێت. مێژوو وەكو هێزی لێشاوی ڕووبارێك كە هەم كات و هەم شوێنی هەیە، گونجاوترین كات و زەمینە بۆ خۆی دەستنیشان دەكات، لەمیانەی شوێن و ساتی خۆیدا نوێبوونەوە دەكاتە ناچارییەك و بەردەوام دەبێت.

هەروەكو چۆن بە گوێرەی یاسای فیزیا، لافاوێكی كە بە جۆش و تەوژمێكی ئێجگار خێراوە دێت، ناتوانرێ ئاراستەی بەرەو بەرزاییەك یاخود پێچەوانە بكرێتەوە و ئەمە ناچارییە لە مەیل و ئاراستەی گونجاو و خێرایی خۆی درێژە بە لێشاوی خۆی دەدات، ئەوا كۆمەڵگاكانیش لەپێناو ئازادی خۆیان كارەكتەرێكی بەمجۆرەیان هەیە. مێژووی كۆمەڵگا (ئۆرگانیزاسیۆنێكی ) ڕێكخستنێكی زیندووە كە، هێزێكی بەمجۆرەی هەیە تەواوی لق و پۆپەكان لەخۆوە دەگرێت و لە هێزێكی بەمجۆرە دایە كە وەكو ڕووبارێك درێژە بە ڕێڕەوی خۆی بدات. مێژووی كۆمەڵگا دیاردەیەكە ئەقڵ و هێز و ئیرادەی بەڕێوەبردن و خەیاڵ و حافیزەی هەیە. كێشە ئەوەیە كە بە وشیارییەكی ڕاست سەبارەت بە مێژوو بگەیت و ئەوە دەستنیشان بكرێت لقەكانی ئەم لێشاوە سەرەكییە لە كوێ و كەی و تا چ ڕادەیەك هێزی بەدەست هێناوە و مەودای بڕیوە. ئەوەی ئێمە هەوڵدەدەین لێرەدا ئەنجامی بدەین؛ ئەوەیە ڕوونی بكەینەوە ئەو چەمكانەی كە گەلان و زەحمەتكێشان و بەها خوڵقێنەرە بێژمارەكان لە بیردەكەن و ئەو فشار و تەنگەتاوییە ئایدیۆلۆژییە زلكراوانە وەكو مێژوو بەسەر مرۆڤایەتیدا دەسەپێنن، كە بە شێوەیەكی زۆر خراپ كاریگەری لەسەر مێژوو دەكات، مێژوو نییە. لەم چوارچێوەیەدا یەكێك لە گرنگترین كێشە زانستییەكانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان نووسینی مێژووە.

ناوەندە ئایدیۆلۆژییە پێشەنگەكانی كۆمەڵگای سەرمایەداری، كە سەركەوتن لەوەی ڕۆڵێكی مەزن لەپێشكەوتنەكانی زانست ببینن، سەبارەت بە مێژوو نووسینیش گرنگییەكی مەزن بەوە دەدەن چەواشەكارییەكانی جاران لەمیانەی وردەكاری و باوەڕپێهێنانەوە ئەنجام بدەن. لای مێژوونووسەكانی ئەوروپا هەروەكو بڵێی جێگای ئەو دەسكەوتە و بەهایانە نییە كە ١٠٠٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا چاخی نیئۆلیتیك لە ناوەندی كەوانی بەپیت پێشكەشی تەواوی مرۆڤایەتی كردووە و لەپێشكەوتنەكانی كۆمەڵگادا باس لە ڕۆڵەكەی نەكراوە. هەڵبەتە دەبێ ڕاشكاوانە ئاماژە بەوە بكەین خوڵقێنەرەكانی چاخی نیئۆلیتیك نەبوایە، كە بۆ یەكەمین جار كشتوكاڵ وماڵیكردنی ئاژەڵیان پێشخست و گوندی جێگیریان ئاواكرد و لە ئاستی پێشەنگایەتیدا بە تەواوی جیهانیاندا بڵاوكردەوە، ئەوا نەدەشیا باس لە مرۆڤایەتی و پێشكەوتنەكەی بكرێت. ئەوەی ڕێخۆشكەر بووە و دەرفەتی بە چاخی شارستانییەتی كۆیلەداری و كۆمەڵگای چینایەتی داوە كە لەگەڵ سۆمەرییەكانەوە دەستیپێكرد، پێشكەوتنی پلەبەپلەی (تدریجی) كۆمەڵگای نیئۆلیتیكە. بەبێ ئەوەی چالاكی داهێنەرانەی ئەم قۆناخە ڕەچاوبكرێ كە بە هەزاران ساڵ درێژەیخایاند و ڕۆڵێكی سەرەكی هەبوو لە پێكهاتنی نەخشەی بۆهێڵەكانی (جینەكانی) مرۆڤ، مێژوو نانووسرێ.

شارستانییەتی یۆنان ـ ڕۆما كە لە بناخەی شارستانییەتی ئەوروپا شاراوەیە، نوێنەرایەتی قۆناخی لوتكەی شارستانییەتەكانی میسر و سۆمەر دەكات. لە تەواوی پێشكەوتنە مێژووییەكاندا دەردەكەوێ، ناشێ و نابێ ئەم شارستانییەتە لە خۆوە و سەربەخۆ پێكبێت. مێژووش ئەوەی سەلماندووە تەواوی بەها سەرەكییەكانی لە جۆری گاسن تاوەكو چەرخ، لە نووسین تاوەكو بیركاری، لە فافۆن تاوەكو ئاسن، لە جام تاوەكو تەون، لە ئاشی دەست تاوەكو ئاشی چەرخی ئاو، لە تەواوی جۆرەكانی دانەوێڵەوە تاوەكو ئاژەڵەكانی ماڵیكردن، لە بیناسازی تاوەكو

پەیکەرتاشی، لە شیعر تاوەکو مۆسیقا، لە میتۆلۆژیا تاوەکو ئایینی تاکخودایی، هەر هەموویان لەسەر بنەمای شۆڕشی نئۆلیتیکی کەوانی بەپیت و شارستانییەتی میسر و سۆمەر خوڵقاون و دواتر بۆ خۆیان بردوون و گونجاندوویانن. ئەم گواستنەوەیە تەنیا بەوە سنووردار نابێ لە ساڵانی ٥٠٠٠ پ.ز سیستەمی نئۆلیتیك بۆ ئەوروپا بگوازێتەوە. هەروەها تاوەکو ساڵانی ١٥٠٠ ی زایینی بەهاکانی شارستانییەتی ئیسلامی گواستراوەتەوە. ئەم گواستنەوە لە خودی شێوەبەندی کۆمەڵگاوە تاوەکو تەواوی بەهاکانی کولتوور و پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخان لەخۆوە دەگرێت. کاتێك ئەم بەهایانە گواسترانەوە، هێشتا ئەوروپا لە شێوەی ژیانی کۆمەڵگای بەربەری رزگاری نەبووبوو.

تەنانەت ئەم کورتە باسەش ئەوە دەسەلمێنێ کە، ئەو بنەمایانەی شارستانییەتی ئەوروپا پشتی پێدەبەستێ لە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان تاوەکو فۆرمە سەرەکییەکانی هزر، لە بەها ئەخلاقییەکانەوە تاوەکو باوەڕییەکان، زۆربەیان لەنێو هەلومەرجی کات و شوێنێکی جیاوازتردا خوڵقێنراون. بواری کات و شوێنی شارستانییەتەکان، ئەو هێزانەن وەکو سیمێکی پۆلایین تەواوی بەها کەڵەکەبووەکان بە شێوەیەکی هەرە پتەو و بە توانا رادەکێشێ، پچڕان پەسند ناکات، هەموو نوێبوونەوەیەکی لە ناواخنی خۆیدا هەڵگرتووە. ئەگەر بە زمانی میتۆلۆژی ئاماژەی پێبکەین هێزەکانی خوداییە.

دەستنیشان کردنی بەهاکانی شارستانییەتی رابردوو لە ئاراستەکردنی بەرەبەیانی شارستانیەتی سەرمایەداریدا، تەنیا سەبارەت بە مێژووناسیەکی راست، پێویست نییە، بەڵکو بۆ زانین و دەستنیشان کردنی ئەوەی، کامە بەهای رژاندۆتە نێو رووباری شارستانییەتی ئەوروپا، راسترین رێچکەیە. پێشخستنی شیکردنەوەکانمان لەمیانەی ئەم شێواز و رێبازەوە، تاوەکو دوایی سوودبەخش دەبێت و پەند و ئەزموونی لێدەکەوێتەوە.

## ا ـ لە دایکبوونی شارستانییەتی سەرمایەداری و ناسنامەی ئایدیۆلۆژی

ئەو پێناسە و تێڕوانینەی کە بە شێوەیەکی گشتی پەسند دەکرێت ئەوەیە، ئەو فاکتەر و تایبەتمەندێتیە هەرە سەرەکیانەی گەوهەری سیستەمەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن، هەلومەرجەکانی بەرهەمی ماددی و پەیوەندییەکانی موڵکایەتییە کە پشت بەوەی یەکەم دەبەستێت. کامە تواناکاری لە ئاستی هەرە زێدە دەرفەت بە بەرهەمهێنان بدات و رۆڵ ببینێ، ئەو کۆمەڵگایەی لە دەوروبەری ئەم تواناکارییە شێوە دەگرێت و هەمان ناوی لێدەنرێت. لەبەر ئەوەی لە سیستەمەکانی کۆمۆنەی سەرەتاییدا ئەو ئامرازانە رۆڵیان دەبینی کە لە بەرد دروست دەکران، بۆیە ئەم قۆناخانە بە چاخی بەردینی کۆن و نوێ (پالیۆلیتیك و نئۆلیتیك) ناودەبرێت. هەروەها لەبەر ئەوەی لە قۆناخەکانی کۆمەڵگای چینایەتیدا ئەوەی لە بواری کەسێتییەوە بۆتە بابەتی موڵکایەتی و لە بەرهەمهێناندا رۆڵی هەرە سەرەکی دەبینێ مرۆڤی کۆیلەن، ئەم سیستەمانەش بە کۆمەڵگای کۆیلەداری ناوزەد دەکرێن. بەپیتترین ئامرازەکانی بەرهەمهێنان خودی کۆیلەیە. ئامرازەکانی دیکە لە رێگای کۆیلەوە رێ لەپێش زۆرترین بەرهەم دەکاتەوە. ئەو ئامرازەی لە چەرخەکانی ناویندا رادەی بەرهەمی زیادکردووە زەوییە. بە تایبەتیش بڵاوبوونەوەی گاسنی ئاسنین و بەڕادەیەکی زیاتر بەکارهێنانی زەوی لە بەرهەمهێناندا، سنووردارکردنی پەیوەندی موڵکایەتی لەسەر کۆیلە و رێدان بەوەی زیاتر لە بەرهەمهێناندا رۆڵ ببینێ، گەوهەری شێوەی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی دیاردەکات. ئەوەی شێوە بە کۆمەڵگای سەرمایەداری دەدات، بەرهەمی کارگەیە کە لە بواری بەرهەمی ماددییەوە بە باڵادەستییەکی مەزن گەیشتووە. لەم بەرهەمهێنانەدا زەوی و هێزی بازووی مرۆڤ کەوتوونەتە ریزی دووەمەوە. کاتێك بەرهەمی زێدە و خێرایی کارگە، دوای ئەوەی لەمیانەی بەرهەمێکی بێ هاوتا خۆی سەلماند کە تا ئەو کاتە لەرێگای هێزی بازووەوە نە لە زەوی و نە لە پیشەکاریدا بینرابوون، ئەو سیستەمەی لە دەوروبەری پێکهات، لەم چوارچێوەیەدا بە کۆمەڵگای سەرمایەداری ناوزەد دەکرێت.

چڕترین شێوەی کاپیتال کە بە مانای سەرمایە دێت، کارگەیە. هەروەکو دەزانرێ سەرەتا کارگە و سەرمایە لەمیانەی پەیوەندییەکی نزیك لەگەڵ بازرگانی مارکانتلی (سیاسەتی بازرگانی ئازاد) پێشکەوت، ئەم پەیوەندییەش بووە شێوەی سەرەتایی کەڵەکە بوونی سەرمایە، ریشەکەشی بۆ سەردەمی سۆمەریەکان دەگەڕێتەوە. بەرهەمی کارگە، بە واتای دەربازبوون دێت لە شێوازی بەرهەمی پیشەکاران (لەسەر بنەمای هێزی بازووە) بۆ بەرهەمهێنانێك کە پشت بە ئامێر دەبەستێت. بە واتایەکی دیکە، لە مانیفاکتۆراوە دەربازبوون بۆ کارگە، لە شێوەی بەرهەمهێناندا رێگا لەپێش زێدەبوونێکی ئەوتۆی بەرهەمهێنان دەکاتەوە کە تا ئەو کاتە هاوتاکەی نەبینراوە. لەگەڵ ئەوەی گەوهەری پێناسەی سەبارەت بە کۆمەڵگای سەرمایەداری بەمجۆرەیە، بەڵام کەم و کوڕی و لاوازی جددی لەخۆوە دەگرێت و ئەگەر بەلاوە نەنرێت، گەلێك بە هەڵەداچوونی مەزن لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

هەڵوێستەکانی ماتریالیزمی قەبا، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی زوو هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو. لەمەش بەولاتر، سەرمایەداری زۆر لە دواوەی ئەم پێناسەیە ماوە، کە هەوڵماندا دەرهەق بە کۆمەڵگا ئەنجامی بدەین و بە تەسکی و سنوورداری دەیگرێتە دەست. رۆڵی ئەخلاق و ئایدیۆلۆژیا و چەمکی مێژوو و پێناسەی دەوڵەتی زۆر بچووك و هەرزان کردووە. شێوازێکی نزیك بوونی وەها کە تەنانەت لە ئاستی پێناسەکردنیشدا هێندە کەم و کوڕی لەخۆوە دەگرێت، چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت رێگا لەپێش شێوەیەکی کۆمەڵگای ئەلتەرناتیف بکاتەوە. هەروەکو گەلێك نموونەی لە مێژوودا بینراوە، ئەم هەڵوێستە لە پەیڕەوکردنی هاوبەشێتییەکی سنووردار بەولاوە، تێپەڕ ناکات. ئەمانە بە ئایینزایی و تەریقەتی سۆفیگەرایی ناو دەبرێن، هەرچەندە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا لە نێو هەڵوێستی ئایدیۆلۆژی جیاوازدابن و خۆیان بە رەوتی چەپڕەو و راستڕەو ناوزەد بکەن، وەلێ لە راستیدا تایبەتمەندێتی بەو جۆرەیان نییە کە سیستەم تێپەڕ بکەن. بە رادەی هەرە زۆریش لەلایەن سیستەمەوە دەتوێنرێنەوە و دەبن بە پارێزەرە شێواوەکانی سیستەم و لە رەوشێکی بەمجۆرە رزگاریان نابێت.

هەربۆیە پێشخستنی پێناسەیەکی بەرفراوان سەبارەت بە چوارچێوەی دەرکەوتنی سەرمایەداری، ناچارییەکە. تێپەڕ کردنی ئەو پێناسانەی کە لەلایەنی ئەو چەمکە راستڕەو و چەپڕەوانەوە دەرهەق بە کۆمەڵگای سەرمایەداری کراوە و سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، یەکەمین کارە پێویستە ئەنجام بدرێت. ئەوانەی هەڵسەنگاندنی بەرفراوان بە پێی سروشتی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێش نەخەن، ئەوا چەمکێکی راستی مێژوو، لە لایان گەلاڵە نابێت. هەروەها شێوە ئەلتەرناتیفەکانی کۆمەڵگا کە پێشبینی و پێشنیاری دەکەن، لە خەیاڵێك بەولاوە تێپەڕنابێت، ئەو فشار و زێدەڕۆییانەی ئەنجامی‌دەدەن دەبێتە سەرچاوەی پێشکەوتنە تراژیدی و کۆمیدییەکان، هەربۆیە دەستنیشان کردنی ئەمە بایەخێکی ئێجگار زۆری هەیە. تراژیدیا و کۆمیدیاکان گوزارشتی هونەرییانەی لە دایکبوونەکانی پێش وەخت و مردنە. سەرچاوەی ئەمانە لە گەوهەری خۆیدا، بۆ چەمکی ناتەواو و پەیڕەو کردنی توند و تیژی دەگەڕێتەوە.

یەکێك لەو ئەنجامە ترسناکانەی کە رێگە لەپێش پێناسەکردنێکی ناتەواو سەبارەت بە کۆمەڵگای سەرمایەداری دەکاتەوە، ئەو تێکۆشانە پڕ لە کەم و کوڕییانەیە کە بەرامبەری پیادە دەکرێت و رێگا لەپێش ژێرکەوتن و زیان دەکاتەوە. لە کاتێکدا ئەم رەوشە، سەرمایەداری بەرەو موحافەزەکارییەکی زیاتر دەبات، هاوکات رکابەرەکانی دووچاری زیان و ئەشکەنجەیەکی مەزنی نابەجێ دەکات. بە گشتی پێناسە نەکردنێکی لێهاتووانەی دیاردەی کۆمەڵگا، رێگا لەپێش میتۆلۆژیا و چەمکی خاوی فەلسەفی و ئایینی دەکاتەوە؛ ئەمەش ژیانێکی تراژیدی ـ کۆمیدی مرۆڤ دەکاتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو. شەڕە جیهانییە مەزنەکانی لەسەر بنەمای سیستەمی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتن لە نزیکەوە پەیوەندییان بەم راستینەوە هەیە. لە هەموو کات و شوێنێکدا ناتەواوی و لاوازی زانیاری و نەزانی لەگەڵ خۆی دێنێ، نەزانیش پێکدادانی کوێرانە دێنێتە ئاراوە. هەربۆیە یەکەمین کار و ئەرك کە زانا و بلیمەتەکان پێیەوە خەریك دەبن، بەلاوەنانی نەزانییە. بە ئەندازەی ئەوەی نەزانی بەلاوەبنرێت، دەشێ هەر کارێك بە شێوەیەکی راست و دروست ئەنجام بدرێت. تەنانەت لە ئەنجامی زانیاری تەواو،

مردنیش لەو رەوشە دەردەکەوێت کە سەرچاوەی ئێش و ئازار بێت. هەروەها دیسان سەرچاوەی تەواوی تیرۆر و تۆقاندن و ئەو بزووتنەوە پاسیف و چەکدارییانەی پشت بەم تیرۆر و ترسە دەبەستن، بۆ ئاستی لاواز و ناتەواو و هەڵەی زانیاری و زانست دەگەڕێتەوە.

پێناسەیەکی پوختتری کۆمەڵگای سەرمایەداری لە کاتێکدا ئەنجامگیردەبێ کە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئەو کۆمەڵگایە لەخۆوەبگرێت. دیاردەیەك کە پێویستە بەردەوام رەچاو بکرێت ئەوەیە، پێش هەموو شتێك سیستەمەکانی کۆمەڵگا کە لەسەر بنەمای هزر و ئیرادە دێنە ئاراوە و بەڕێوە دەچن. هەرچەندە هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان لەبار و گونجاویش بێت، لە خۆیەوە کۆمەڵگا بەڕێوە نابات. ئەگەر ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نەخوڵقێنرێن و جڵەوی ئیرادە نەگرنەدەست، ئەوا هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان لە جەستە و ماددەی بێ گیان بەولاوە نابن بەشتێکی دیکە. لە دایکبوونی سیستەمەکان، تەنانەت کۆمەڵە بچووکەکانیش رەچاونەکردنی جیاوازی و گرنگی هزر و ئەو ئیرادە و کردارانەی کە هزر ئاراستەیان دەکات و روونکردنەوەیان لە رێگای فاکتەری دیکە، هۆکاری سەرەکی جێبەجێ نەکردنی رۆڵی کۆمەڵناسی رۆژگاری ئەمڕۆمانە. سەرەکیترین نەخۆشی کۆمەڵناسی سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت کە بە شێوەیەکی راست رۆڵی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی دەستنیشان نەکردووە. بە لایەنی کەم بە ئەندازەی بەرپرسیارێتی زانا ئایینیەکان، ئەوانەی بە کۆمەڵناسییەوە خەریکن، دەبێ هەست بە بەرپرسیارێتی ئەرکێکی پیرۆز بکەن.

خەریکبوون بە کۆمەڵگا لە خەریکبوون بە فیزیا جیاوازترە و لێك ناچن. تەنانەت لە فیزیاشدا تاقیکردنەوەیەکی هەڵە، داهێنانێکی لە ژێر کۆنترۆڵدا نەبێت، لەوانەیە رێگا لەپێش کارەسات بکاتەوە. بۆمبای ئەتۆمی لەبەرچاوترین نموونەیە. گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) بە تەواوی وەکو پەرستگایەکی پیرۆز وایە. بە هەمان هەستیاری و وورياييەوە دەرككردن بە هەر پەیوەندی و دەزگایەکییەوە و دەستنیشانکردنی ئەو هەڵوێستەی پێویستە بەرامبەریان نیشانبدرێت، بە لایەنی کەم هێندەی پزیشکێك دەبێ بە کارامەیی و بەرپرسیارێتییەوە پێیەوە پەیوەستداربێت. لەبەر ئەوەی ئەمە ئەنجامنەدراوە، چارەنووسی تراژیدی کۆمەڵگا دەرکەوتووە؛ هەموو شێوەکانی دیلێتی بەڕێوە دەچێت، تا دەگاتە تۆقێنەرترین ئەشکەنجە و شەڕ و پێکدادان  رۆژ بە رۆژ گرنگی ئەوە ئاشکرا دەبێت پێویستە گەورەترین رەخنەدان سەبارەت بە کەم و کوڕی و هەڵە و ناتەواوییەکانی زانستی کۆمەڵگا (کۆمەڵناسی) بدرێت.

یەکێك لەو ئەزموونە گرنگانەی لە پێناسە ناتەواوەکانی مارکسیزم بەدەستدەهێنرێ ئەوەیە، پێویستی بە کەسایەتی زانا و بلیمەتی وەها هەیە بە لانی کەم هێندەی پێغەمبەرەکان هەست بە پیرۆزی و بەرپرسیارێتی نزیکبوونەوەی زانستییانەی سەبارەت بە کۆمەڵگا بکەن.

کێشەیەکی دیکەی گرنگی سەبارەت بە شێوەگرتنی کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەوەیە، بۆچی لە ناوەندی شارستانییەت لە رۆژهەڵاتی ناوین نەبوو، بەڵام لە ئەوروپا لە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی پێشکەوت. سەرچاوە و بناخەی پێشنەکەوتنی کۆمەڵگای سەرمایەداری لە رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئەو راستینەیە دەگەڕێتەوە کە لە رێگای ئیسلامییەتەوە گەوهەری تەواوی داب و نەریتە سیاسی و ئایدیۆلۆژیە بنەڕەتیەکانی شارستانییەت پووکێنراوەتەوە و لەکارخراوە. لە بوارەکانی وەرچەرخانی مێتۆلۆژیاکان بۆ ئایین و گەیاندنی دەسەڵاتی سیاسی بە پێشکەوتووترین ئاست،  لەسەردەمی سۆمەریەکان بەدواوە، ئیسلامییەت نوێنەرایەتی باڵاترین ئاست دەکات. هەرچییەکی لە عەمباری سیستەمی شارستانییەتدا هەبووە، ئیسلامییەت تا دوایی هەمووی بەکارهێناوە. ئەوەی ماوەتەوە توێکڵی وشك و ئەو تۆوە وشکەیە کە بەملا و بەولادا بڵاوی کردۆتەوە. زۆر باش دەزانرێ تەنانەت لە ناوەڕاستی چەرخەکانی ناوینیش هەم لە بواری هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنانی ماددیدا ، هەم لە بواری دەسەڵاتی سیاسی، هەم لە بوارەکانی زانست و فەلسەفە و ئایینیدا، ئیسلامییەت و رۆژهەڵاتی ناوین، بە بەراورد کردنی لەگەڵ مەسیحییەت و ئەوروپا، زۆر باڵاترە. هەروەکو چۆن هەڵوەشانەوەی ناوەوە، هۆکاری سەرەکی رووخانی ئیمپراتۆرییەتی رۆما بوو، ئەوا هەمان راستینە بۆ ئیسلامییەتیش لە جێگای خۆیدایە. هەروەکو چۆن چەند هێرش و پەلامارێکی بەربەرییەکان هۆکاری رووخانی ئیمپراتۆرییەتی رۆما نییە، ئەوا چەند لێدانێکی مەغۆلەکانیش هۆکاری رووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلام نییە. لە ناوەوە لەدەستدانی ناوەڕۆکەکەی و نەمانی بەهایەکی ئەوتۆی، لەگەڵ ئەمەشدا مانەوەی توێکڵەکەی بۆ ساڵانێکی درێژ و بەبێ ئەوەی بڕزێت، هەنگاو بە هەنگاو وشك و برینگبوونی دەزگا سیاسییەکان کە توێکڵی سیستەم پێکدێنێت، چارەنووسی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین دیاریدەکات.

لە شوێنێك سیستەمێك بە شێوەیەکی ریشەیی لە ئارادابێت، هێندە بە سانایی رێگا بە سیستەمێکی نوێ نادرێت. بەروبوومە تازە گەشەسەندووەکان لە خاك و زەوییە دەست لێنەدراوەکان پێدەگات، نەك لەو زەوییانەی هەموو کاتێك چاندنیان لێکراوە. تەواوی دەرئەنجام و دەرهاوێشتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ناوەڕاستی چاخەکانی ناوین شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین ماندووبووە و لەپەلوپۆکەوتووە. لێرەدا باشتر لەوە تێدەگەین، تەنانەت ئیسلامییەتیش پێهەڵگرتنێکی ئیرادی و زیادبووە کە لەمیانەی هێزی خوێنی تازەی ئەو هۆزانەی بیابان ئەنجامدرا کە تازە بە رووی شارستانییەتدا کرابوونەوە. هەڵسەنگاندن و راگەیاندنی خۆی وەکو دواترین پێغەمبەر، گرێدراو بە هێزی لەبەر بڕاوی سیستەم، دەتوانرێ بە واتایەکی راستتر بگەیەنرێ. ئیسلامییەت، نەڕەی دواترین شێری رۆژهەڵاتی ناوینە؛ بە داب و نەریتی هەزاران ساڵەی شارستانییەت دەڵێ "ئەوەندە لەدەست من دێ" دواترین چالاکی خۆی ئەنجامدەدات. تەنانەت لە ئاکامی خیانەتی ئەمەوییەکانەوە، هەر لەسەرەتای دەرکەوتنی ئەو دەنگە ئاشکرابووە، چەندە تەمەن کورتە. بەڵام دیسان دواترین نەوەی داب و نەریتی شارستانییەتی مەزن لەوە دواناکەوێت مەزن بوونێکی بەمجۆرە نیشانبدات کە کاریگەرییەکەی هەزاران ساڵ بەردەوام بکات. بەڵام ئەوانەی لە دوای ماونەتەوە، دەستبڵاوی بە میراس دەکەن، تەنانەت نازانن بیخۆن، بێخێرن، میراسگرێکن هەم لە گەوهەری ئایدیۆلۆژی هەم لە تواناکارییە ماددییەکان سوودمەند نابن؛ بوونەوەرێکن لە شێوەی مرۆڤ، بەڵام لە ئاژەڵ دواکەوتووترن و لەسەر بنەمای گەنجینەکانی ژێرزەوی، زەڕینی لە شێوەی کەر بۆ خۆیان بە ژیان لەقەڵەمدەدەن. لە کاتێکدا قۆناخی هەڵوەشانەوەی چاخەکانی ناوینی رۆژهەڵاتی ناوین بەم شێوەیە بوو، چۆن دەتوانێ ببێتە چاوگی شارستانییەتێکی نوێ؟ دایك لە تەمەنی ٧٠ ساڵاندایە چۆن دەتوانێ زگێکیتر بکات و بزێ؟

وەکو یاسایەك سیستەمە کۆمەڵایەتییە مەزنەکان، لە ژێر سایەی مامانێتی سیستەمی کۆن، لە ناوچە پاکیزە و دەست لێنەدراوەکان لە دایکبێت. دواترین خاکی دەست لێنەدراو و پاکیزەی رۆژهەڵاتی ناوین، مەککە و دەوروبەرەکەی بوو کە دەکەوێتە ناوەڕاستی بیابانی عەرەبی. دوای ئەوەی لەمیانەی ئیسلامییەتەوە دواترین نەوەی خۆی پێشکەشکرد، ئیدی بۆ هەڵمەتێکی دیکەی شارستانی خاکی دیکەی نەمابوو، گۆڕەپانی دەست لێنەدراوی نەما تاوەکو شارستانییەتێکی دیکە بێنێتە دونیاوە. لە دەریای سپییەوە تاوەکو زەریای مەزن گواستراوەتەوە، لە ئاستی هەرە بەزردا بڵاوبوونەوە تا قووڵایی ئەفریقیا رۆیشتبوو. تاوەکو بنارەکانی سیبریا و دوورگەکانی ئەندەنوسیا بڵاوبۆتەوە. هەرچی کیشوەری ئەمریکا و ئوسترالیایە هێشتا نەدۆزرابۆوە. تەواوی لێکدانەوە و دەرهاوێشتەکان ئەوروپای وەکو خاکی دەست لێنەدراوی شارستانییەتی نوێ نیشاندەدا.

بەر لە هەموو شتێك لە ساڵانی ٥٠٠٠ پ.ز بەدواوە ئەوروپا لەلایەن بەهاکانی چاخی نئۆلیتیکەوە تێرخۆراك کراوە. لە ساڵانی ٢٥٠٠ پ.ز بەدواوە ئاشنای شارستانییەت دەبێت. شارستانییەتی گریك ـ رۆما بۆ ئەوەی لە کەنارەکانی دەریای سپی بۆی ببێت بە لانکە، شانەی سەرەتایی کۆرپەلەی خوڵقاندبوو. لە راستیدا شارستانییەتی گریك ـ رۆما، وەکو شارستانییەتێکی ئەوروپا کە پێش وەخت هاتۆتە دونیا، دواترین منداڵی رۆژهەڵاتی ناوین وایە. یاخود لە بەرهەمی ئەو مارەییە دەچێت کە لە نێوان دواترین و بەساڵاچووترین پادشای رۆژهەڵاتی ناوین و کچە تازە گەنجەکەی ئەوروپا دەچێت. ئەو منداڵانەی کە لێیان دەکەوێتەوە، ئەوروپای راستەقینە ئامادە دەکەن. مەسیحییەتیش وەکو دواترین هێزی رۆژهەڵاتی ناوین، ئەوروپای پەروەردەکرد و لە بەربەرییەتی رزگاری کرد، دوای هەوڵ و کۆششێکی مەزن، بۆ لە دایکبوونێکی نوێی ئامادەکردووە و گەیاندویەتییەوە رەوشێك بتوانێ وەڵام بداتەوە و تێر بکات. دوای ئەوەی لە رێی ئیسلامییەتەوە دواترین زانیارییە فەلسەفی و زانستییەکان گواستراوە و تا رادەیەك لە رێگای ئیسپانیا و بەلقکانەوە تەنگەتاو کرا و رۆڵی مامانێتی بینرا، هۆکارێك لە ئارادا نەما کە ئەوروپا کۆرپەلەی شارستانییەت نەهێنێتە دونیاوە. (ئەوروپا، بە ناوی کچی پادشای فینیقیەکان ئەگۆنۆر ناونراوە؛ میتۆلۆژیای گریکیەکان باس لەوە دەکات کە

کچێکی ساویلکە و هەرزەکارە) چیرۆکی لە دایکبوونی کۆرپەلە بەنازەکەی کە بە ئەوروپا ناودەبرێت، ریشەکەی بۆ ئەم باسە دەگەڕێتەوە و ئەمەش تا دواڕادە نزیك بە واقیعە. چیرۆکە میتۆلۆژییەکان بەردەوام وەکو یەکەمین باسی رووداوە واقیعەکان بەهایەکی مەزنیان هەیە و پێویستە پشتگوێ نەخرێت.

دوای ئەوەی لە نێو چوارچێوەیەکی گشتیدا شوێنگەی شارستانییەتی ئەوروپامان لە ناو پێشکەوتنەکانی مێژوو و کۆمەڵگاکاندا پێناسە کرد، با هەوڵبدەین بوارە جیاو و وردەکارەکانی تایبەتمەندێتی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی بناسین کە ڕێگای لەپێش لە دایکبوونی کردەوە:

١ ـ یەکێك لەو تایبەمەندێتییە لەپێشینانەی کە دەرکەوتنی شارستانییەتی سەرمایەداری لەگەڵ تەواوی سیستەمەکانی دیکە جیادەکاتەوە، پێکهاتەی هزرە کە پشت بە زانیاری زانستی شێوازی بیرکردنەوە دەبەستێ. لەگەڵ دەستپێکردنی چاخی سەرمایەداری، پێکهاتەی هزری میتۆلۆژیای چاخە سەرەتاییەکان و پێکهاتە هزرییە ئایینیەکانی چاخەکانی ناوین بەلاوە دەنرێت. شێوازی هزری زانستییانە کە شێوازی هزری فەلسەفی چاخەکانی سەرەتایی و ناوین و ڕێگای لەپێش دەکاتەوە، لەم قۆناخەدا دەردەکەوێتە پێش و قورسایی پەیدا دەکات. گەوهەری ئەم شێوازەی بیرکردنەوە بەبێ پێویستی هەبوونی هێزێکی دەرەکی، لەمیانەی خودی یاساکانی ناوخۆیەوە پشت بە روونکردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان سروشت و کۆمەڵگا دەبەستێت. جیاوازی لەگەڵ فەلسەفەدا، لە کاتێکدا فەلسەفە هەوڵی شیکردنەوەی تەواوی بوونەوەرە لە ڕێگای زاراوە گشتییەکانەوە، ئەوا زانست لە گۆڕەپانێکی سنوورداری دیاردەکاندا، شێوازێك بە بناخە دەگرێت کە دەشێ تاقیبکرێتەوە و روونبکرێتەوە.

سەرباری ئەوەی تایبەتمەندێتی ناکۆکیان لە نێواندا هەیە، ئەوا پەیوەندییەکی دیالەکتیکی لە نێوان پێشکەوتنی شێوەکانی هزریاندا هەیە. لە پێکهاتەی هزری رۆحگەرایی ( (Animist هەمموو شتێك زیندووە، بە خاوەن رۆح و گیانلەبەر لە قەڵەمدەدرێت. لە بواری زیندوویییەوە جیاوازی لە نێوان گیانلەبەر و بێگیان، سروشت و کۆمەڵگا، مرۆڤ و ئاژەڵ ناکرێت. ئەو تەکنیکەی ئەم شێوازەی هزر ڕێگای لەپێشدا کردۆتەوە، واتە شێواز و ڕێچکەی پراکتیزەکردنی سیحربازییە. وا لە قەڵەمدەدرێت کە لە ڕێگای سیحر و جادووەوە دەتوانرێت ئەم دیاردانە کۆنترۆڵ بکرێن و بهێنیرێنە سەر ڕەوشی خوازراو. لە راستیدا هونەری سیحربازی، کە کەسانی بە توانا و خاوەن پێشبینیەکان لە ناو چالاکی و ژیانی کرداری کۆمەڵگادا پێیەوە خەریك دەبن، بە واتای یەکەمین پایەی ڕێبەرایەتی کۆمەڵگا دێت. سیحرباز کەسێکە کە خاوەن توانا و پێشبینیەکی پێشکەوتووە، هەربۆیە ڕێبەرە. لە نێو هەلومەرجێکی تەنگ و هەستیاری ژیاندا دەرکەوتنی یەکیك کە خاوەنی ئەم تواناییانە بێت، بە ڕەوشێکی ئاوارتە هەڵدەسەنگێنرێ، ڕێزێکی مەزنی بەرامبەر نیشاندەدرێ و باوەڕی پێدەهێنرێ. چونکە تەنانەت رۆڵ و دەسکەوتێکی بچووکی ئەمانە بۆ کۆمەڵگا گرنگییەکی ژیانی هەیە. کۆمەڵگا هەم خۆی لەوانە بە دوور دەگرێ، هەم پێویستی پێیان هەیە. کاتێك سیحربازەکانیش هەست بەم شێوازەی پابەندێتی کۆمەڵگا دەکەن، خۆیان بۆ شوێنگەیەکی جیاواز بەرزدەکەنەوە و دەبن بە دەزگایەك. لەوانەیە یەکەمین دەزگای کۆمەڵگا، ئەوەی سیحربازانە.

ناوێکی دیکەی سیحربازی شامانیزمە. جیاوازی نێوانیان ئەوەیە، شامانەکان پێشکەوتووترن و بوونە بەدەزگا. ئەم شێوازەی هزرکردن و پراکتیزەکردن لە تەواوی کۆمەڵەکانی چاخی (کۆنی بەردین) پالیۆلیتیکدا پەیڕەودەکرێن. شێوازی هزری قۆناخی چاخی (نوێی بەردین) نئۆلیتیك کە نوێنەرایەتی قۆناخێکی لەپێشتری کۆمەڵگا دەکات نیو ـ رۆحگەرایی و پێکهاتەی ئایینی تەوتەمە. تیرە کە یەکینەی سەرەکی کۆمەڵگایە، زیاتر جیادەکرێتەوە، دەرك بە گرنگێتی ئەندامبوون لە تیرەدا دەکرێت. لە ناو تیرەدا رۆڵ و پایەی ڕێبەرایەتی و خوڵقکاری دایك دەردەکەوێتە پێش. هەندێ بوونەوەر، ئاژەڵەکانیماڵیکردن و دانەوێڵەکان لە تەواوی بوونەوەرەکانی دیکە باشتر دەناسرێ و بە پێویست دەبینرێ. هەربۆیە گرنگییەکی زیاتر بە رۆحی ئەم بوونەوەرانە دەدرێت. رەنگدانەوەی ئەم هەلومەرجانە لەسەر پێکهاتەی هزردا، لە قۆناخێکی بە ناو دایکسالاریدا، ژن رۆڵی خوداوەندی دایك دەبینێ، سەمبۆلی هەر تیرەیەك لەمیانەی تەوتەمەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، شێوازێکی هزرە کە تەواوی دانەوێڵە گرنگ و دار و ئاژەڵ و هەمموو شتێك لە ڕێگای خوداوەندێکەوە نوێنەرایەتی دەکات. تەوتەم زیاتر گوزارشت لە رەمزی تیرە دەکات، تەواو بە واتای خوداوەند نایەت. وەکو شتێك وایە کە نیو ـ خوداوەندە. بەڵام تەواوی سەمبۆلەکانی دیکە دەکرێن بە خوداوەند. خوداوەندی دایك لە سەرووی هەمووویانەوە دێت. چونکە خوداوەندی دایك دامەزرێنەری کۆمەڵگای نوێ و هێزی خوڵقاندن و زاوزێیە و هەر ئەویشە  کە دەیانپارێزێ.

کۆمەڵگای نئۆلیتیك هێندە مۆرکی ژنی پێوەیە و ژن تێیدا بە کاریگەرە، وەکو بڵێی پیاو سڕاوەتەوە. ئەمەش هەروەکو ژنانی رۆژگاری ئەمڕۆمان وایە کە وەکو هێزێکی سەرەکی کۆمەڵگا نین. ژن ئەم هێزە لە پێگەیاندنی دانەوێڵە،  ماڵیکردنی ئاژەڵ، ئاواکردنی شوێنی حەوانەوە،  لە چنین و هاڕین و منداڵ بوون و بەخێوکردنیدا بەدەستدێنێ. ئەمەش بەهێز بوونێکی نائاساییە. هێندە کاریگەری و رەنگدانەوە دەکاتە سەر هزر، تەنانەت لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا زاراوەی مێ کە لەسەر هەمموو زمانێکە و ژمارەی زیادی خوداوەندە ژنەکان لە میتۆلۆژیادا و ڕێزگرتن لە دایك سەرچاوەکەی بۆ ئەم قۆناخە مێژووییە دەگەڕێتەوە. تەنانەت پێکهاتەی زمانی سۆمەریش  لەسەرەتادا بە رادەیەکی زیاتر کارەکتەرێکی مێیینە لە خۆیەوە دەگرێت. یەکەمین دامەزرێنەرانی شار خوداوەندە ژنەکانن. تەواوی پەیکەرەکانی سەرەتا هی ژنانن. کاریگەری و باڵابوونی ژن لە ناولێنان و زاراوەکاندا زاڵە. تەنانەت ناوی کیشوەرەکانی ئەوروپا و ئاسیاش لە میتۆلۆژیای گریکدا ناوی ژنە.

لەسەر بنەمای پشتبەستن بە رەگەزی مێینە، پێکهاتەیەکی هزری مرۆڤ ـ خوداوەند بەسەر شێوازی هزری قۆناخی نئۆلیتیك زاڵە، تەواوی بوونەوەرەکان دەکرێن بە خوداوەند و بەپێی گرنگییان لە نێو کۆمەڵگادا ریزبەند دەکرێن. لە هەمموو ئاست و بوارێکدا لەسەر بنەمای پشتبەستن بە خوداوەندی دایك، پێکهاتەیەکی باوەڕی و هزر گەشە دەسێنێ. بۆ یەکەمین جار کەوانی بەپیت خوداوەندی دایك لە ژێر ناوی ستێرك یان ستار بۆ ئاسمان بەرزدەکرێتەوە و دەگەیەنرێتە ئاستی نەمری.

سۆمەریەکان کە هەنگاو بۆ دەستپێکردنی کۆمەڵگای چینایەتی دەهاوێژن، سەرەکیترین شێوەی هزری میتۆلۆژیایە، واتە لەسەر بنەمای پشتبەستن بە ئەفسانە و چیرۆکەکان بە سیستەمێك دەگات. میتۆلۆژیاش کە هەم لە ناو کۆمەڵگا و هەم لە سروشتدا گرنگترین و پێویستترین هێزە، بەرهەمهێنان و تەواوی سەرچاوەکانی دیکەی ژیان وەکو جیهانێکی خوداوەندەکان نیشاندەدات. دەرك بە جیاوازی نێوان یاساکانی سیستەمی کۆمەڵگا و سروشت دەکرێت، جیهانێکی خوداوەندەکان پێکدەهێنرێ کە بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ جیابوونەوەی چینایەتی ناو کۆمەڵگا جیاوازی کۆیلەدار ـ کۆیلە نیشاندەدات، بە گوێرەی ئەمەش چەمکێکی فرە سیستەمی پێشکەوتنی میتۆلۆژیا زاڵ دەکرێت. لەوانەیە گەورەترین دیاری سۆمەریەکان بۆ مرۆڤایەتی ئەوەبێت، پێکهێنان و ئاواکردنی ناسنامەخوداییەکانە کە نوێنەرایەتی سیستەمە نەگۆڕەکەی ئاسمان دەکەن و وەکو شێوازێکی سەرەکی هزر و باوەڕی بەسەر تەواوی هزرەکانیدا جێگیر و زاڵ کرد. ئایینە تاکخوداییەکانیش لەناودا، راهیبە سۆمەریەکان خوڵقێنەری هەرە مەزن و نوێنەری شێوازی هزری ئایینین. میتۆلۆژیا و ئایین و پێغەمبەر و راهیبەکانی دواتر رۆڵێکی بەمجۆرەیان هەیە کە ئەم ناسنامانە جێگیربکەن و یاخود وەرچەرخێنن و بە گوێرەی خۆیان ئاوای بکەن.

شێوازی فەلسەفە سێیەمین قۆناخی گرنگ و مێژووی شێوازی بیرکردنەوەیە. فەلسەفە بە واتای خۆشەویستی زانیاری دێت، بە واتای قۆناخی پێناسە کردنێکی واقیعیانەی دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵگایە. کاتێك لە نێو ژیان و کردەوەی کۆمەڵگادا شێوازی هزری ئەفسانەیی تەنیا وەکو ئەدەبیاتێك راڤەکرا، ئەو کاتە پێویستی بە شێوەی روونکردنەوەی واقیعیانەتر دەبێت. لە سەدەی ٦ می پ.ز زۆر چاك دەرك بەوە دەکرێت زیۆس و دەستەی خوداوەندەکان ئەو هێز و توانایەیان نییە کە مەزەندە دەکرێ. ئیتر گومان لە خوداوەندەکان دەکرێت. ئەم ڕەوشەش قۆناخێکی هزری بەمجۆرە بە بنەمادەگرێت، زۆر بە باشی دەرك بە پۆلێنکردن و جیاوازی نێوان کۆمەڵگا ـ سروشت، گیانلەبەر ـ بێگیان و چالاکی بەرهەمهێنان کراوە. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەی هزردا روونکردنەوە ئەفسانەییەکان جێگای پێکەنینە، یاخود شێوازێکی نوێی شرۆڤەکردن دەکات بە ناچاری کە واقیعیانەتر ببینرێ. هەروەها پێکهاتەی کۆمەڵگای کە تێکەڵ و ئاڵۆز بووە و ئەو زانیارییە زۆرانەی دەرهەق بە جیهان هاتۆتەئاراوە، ئەو دیاردانەی کە لە ئاکامی ئەزموونی کرداری و ژیاندا زانیاری بەرجەستەیان سەبارەت بە دەستهاتووە،

روونکردنەوەی وەها لەگەڵ خۆیدا دێنێ کە پێویست بە خوداوەندەکانی میتۆلۆژیا ناکات. شێوازێکی هزر پێشدەکەوێت ئایین و خوداوەندەکان تێکەڵی نابن و ڕێگایان پێنادرێ خۆیان تێهەڵقورتێنن.

دەتوانین ئەم شێوازە هزرە بە یەکەمین شێوازی هزری دونیایی و علمانی ناوی ببەین، ئەم پێشکەوتنە بە هزری فەیلەسوفانە ناودەبرێت. بە بناخەگرتنی مرۆڤ وەکو خاوەنی هزر، پێشکەوتنی لە دەرەوەی پەرستگا و بۆ یەکەمین جاری ڕێکردنەوە لەپێش سیستەمەکانی فێرگەی ئەکادیمی و ئامادەیی، ئەو تایبەتمەندیانەن کە لە شێوازەکانی دیکەی هزری جیادەکاتەوە. بەمجۆرە بناخەکانی پەروەردە و فێرگەی علمانی دادەنرێت. بەڵام ناتوانرێ بانگەشەی ئەوە بکرێ، بە تەواوی لە میتۆلۆژیا و ئایین دابڕاوە.

لێرەدا دەبێ ئەمەش روونبکەینەوە: جیاوازی نێوان ئایین و میتۆلۆژیا بەمجۆرەیە، لە کاتێکدا ئایین باوەڕی و عیبادەتی ناچاری لەخۆوە دەگرێت، لە میتۆلۆژیاکاندا ناچارییەکی بەمجۆرە لە ئارادا نییە. هەرچی فەلسەفەیە، نە باوەڕی ناچاری و زۆرەملێیی بە بنەما دەگرێت، نە شێوازی چیرۆك جێگای باسە. فەلسەفە شێوازێکی هزرە لە سۆزداری بەولاوە، بە خۆبەختی لەلایەن پێکهاتەی هزر و لۆژیکی مرۆڤ پەسند دەکرێت و تەنانەت تایبەتمەندێتی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت کە دەتوانرێ بسەلمێنرێ، بە تایبەتیش لە ئاکامی بیرکردنەوە پەسند دەکرێت. باوەڕی بە پێکهاتەی هزری مرۆڤ دەکات، هەربۆیە پەسندکردنی مرۆڤ دەردەخاتەپێش. بەمجۆرە یەکەمین تۆوی کەسێتی تاك و مرۆڤپەروەری، گرێدراوی شێوازی هزری فەلسەفییە. لەم چوارچێوەیەشدا فەلسەفە دەبێتە گرنگترین زەمینە و دەرفەتی سەرەکی شێوازی هزری کۆمەڵگای سەرمایەداری. هەرچەندە ململانێی نێوان فەلسەفە و هزری ئایینی و میتۆلۆژیا پەرە بسێنێ و ئەم ململانێیەش بەلای فەلسەفەدا بشکێتەوە، ئەمە دەروازە لەپێش ئەوە دەکاتەوە بەرەو شێوازی هزری زانستییانە هەنگاو بهاوێژرێت. شێوازی هزری زانستی لەسەر بنەمای ڕێڕەو و شوێن پەنجەی فەلسەفە پێشدەکەوێت. شێوازی هزری فەلسەفی زیاتر بەرهەمی ژیانی پێشکەوتووی شارە. شتێکی ڕێکەوت نییە ئەو شوێنانەی تێیدا سەریهەڵداوە زیندووترین و بە جموجۆڵترین شارن. پێشکەوتووترین شارەکانی چاخی سەرەتایی، ئەو ناوەندانەن کە هزری فەلسەفیان تێدا پێشکەوت. میلتۆس کە بە شوێنی لە دایکبوونی فەلسەفە دەناسرێ، لەسەردەمی خۆیدا گرنگترین ناوەندی ژیانی شار بوو. دوایی بە پێی ڕیزبەندی گرنگییەکەیان، ئەتینا و ڕۆما و ئەسکەندەرییە دەردەکەونەپێش.

ڕۆڵی فەلسەفە لە ڕێخۆشکردن لەپێش زانست بچووك ناکرێتەوە. بەڵام تاکە ڕێگا نییە. بەڵام ئەوەی بە کاریگەرترە؛ گرێدراو بە ئامێرەکانی بەرهەمهێنان، بەردەوام زیادبوونی زانیارییە کردارییەکانە. خودی ئەزموون و کرداری ژیان و بەرهەمهێنان، دیاردەکان و پەیوەندییەکانی نێوانیان پێناسە دەکات، تاوەکو دەیگەیەنێ بە پەیوەندی نێوان هۆکار ـ ئەنجام. ئەو ئامێرانەی بەکاردەهێنرێ بەردەوام تایبەتمەندێتیەکانی سروشت دەدۆزنەوە و ژمارەیان زیاد دەکەن. بەمجۆرە لە کاتێکدا لە ڕێگای فەلسەفەوە ئەم هزرە ئایینی و ئەفسانەییانە لاوازدەبن کە لەسەرەتادا زاڵ و باوبوون، ئەوا گرنگی و بایەخی زانست زیاد دەبێت، کە بە یەکەوە لەگەڵ فەلسەفە لە ناو یەکتردا پێشدەکەون. پراکتیزەکردنی سێیانەی تێز ـ ئەنتیتێز ـ سەنتێز لەم بوارەدا، بەلای زانستدا دەشکێتەوە و ئەنجامگیردەبێ. یەکەمین تێز (بیرۆکە) هزری ئایینی و ئەفسانەیە؛ دژەتێز (دژە بیرۆکە) فەلسەفەیە. ململانێی نێوانیان هزری زانستی دێنێتە ئاراوە. ئەگەر بە شێوەیەکی تقریبی ئەمە بەسەر کاتدا پەیڕەو بکەین، بەمجۆرەیە،ساڵانی ٣٠٠٠ تاوەکو ٥٠٠ ی پ.ز چاخی باوبوونی ئایین و متیۆلۆژیا، ساڵانی ٥٠٠ پ.ز تاوەکو ١٥٠٠ ی زایینی چاخی دەرکەوتن و بەرزبوونەوەی فەلسەفەیە، ١٥٠٠ ی زایینی بەدواوە چاخی هزری زانستییە. شەڕە مەزنەکەی جیهانی هزری مرۆڤایەتی بە سەرکەوتنی هزری زانستی ئەنجامگیردەبێت.

کەڵەکە بوونی ئەو زانیارییانەی لە ڕێگای فەلسەفە و ئەزموونی کردارییەوە بەدەستهاتوون، هەروەکو بڵێی لە سەدەی سێزدەهەمدا لە ئەوروپا بە قۆناخی کورکبوون دەربازدەبێت. یەکەمین زانکۆی ئاواکراون، لەم سەدەیەدا لە ژێر کاریگەرییەکانی دۆگما ئایینیەکان ڕزگاریان دەبێ و یەکەمین هەنگاو بەرەو ڕێڕەوی پشتبەستن بە ئەزموون و تاقیکردنەوە دەبەستن. ڕۆگەرباکۆن ( ,(Roger Baconلەم قۆناخەدا بەردی بناخەی دەستپێکردنە. ڕۆڵی پێشەنگایەتی کردنی چاخی تاقیکردنەوە و ئەزموونگەرایی دەبینێ. ئەو ڕێنسانسەی لە سەدەی پانزدەهەم بەدواوە پێشدەکەوێت، ڕۆح و هزری مرۆڤ لە دۆگما ئایینیەکان ڕزگاردەکات و لە ئاکامی ڕاپێچکردن و ئاراستەکردنی بۆ جیهانێکی مرۆڤانە، تاوەکو دوایی ڕێگای زانست ئاواڵا دەبێت. گەلێك شەهیدی مەزن لەم ڕێگایەوە پێشکەش دەکرێت، لەسەرووی هەمووشیانەوە برنۆ. بەڵام لەهەمانکاتدا ئەم شەهادەتانە بە واتای سەرکەوتنی چاخی هزری زانستیانە دێت. ئیتر مرۆڤ رووبەڕووی شێوازێکی نوێی ژیان دەبێتەوە. ناوبردنی چاخی زانست بە شارستانییەتی سەرمایەداری تەنگ و و سنووردارە و واتای خۆی نابەخشێ. هەڵبەتە ئەمە چاخێك نییە لەلایەن کۆمەڵگای سەرمایەدارییەوە خوڵقێنرابێت. بە پێچەوانەوە، سەرکەوتن و زاڵبوونی هزری زانستیانە، ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە شارستانییەتی سەرمایەداری خێرا بێت و بە باڵادەستی بگات. دەبێ چاخی زانست وەکو گرنگترین دەسکەوتی پێکهاتەی هزری مرۆڤ ببینرێ لە ڕێبازی پێشکەوتنی درێژخایەنی کۆمەڵگادا. لە کاتێکدا لە ئاکامی ئەم هزرە پەردە لەسەر قۆناخی ئەو خوداوەندانە داخرا کە سرووش (وەحی) دەنێرن و نوێنەریان لەسەر زەوی هەیە، ئەوا قۆناخەکانی کۆمەڵگا، هەنگاو بۆ چاخی کۆمەڵگای زانستی دەهاوێژێت کە مرۆڤ بە خۆی یاساکان دادەنێ و بەڕێوەیان دەبات. لەم چوارچێوەیەدا چاخی کۆمەڵگای زانستی دەستپێدەکات.

هەرچەندە ئەم چەرخە بە چاخی زانیاری و گەیاندن ناوببرێت، بەڵام تاوەکو ئێستاکەش لە تەواوی دام و دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگا، لەسەرووی هەمووشیانەوە دەزگا سیاسییەکان، لەمیانەی ئەو یاسا و پەیوەندییانەوە بەڕێوە دەبردرێت، کە پاشماوەی میتۆلۆژیاکانی چاخی کۆیلەدارین. لە دوای شیکردنەوەکانمان دەرهەق بە شارستانییەتی سەرمایەداری دەبینرێ داب و نەریتی کۆمەڵگاکە بە تایبەتیش دەزگاکانی دەوڵەت سەنتەرەکەی پێکدێنێ، پێنج هەزار ساڵە نەگۆڕاوە و بەردەوام بەهێزکراوە. ئەم بە دەزگابوونە لە گەوهەری خۆیدا لەگەڵ زانستدا ناکۆکە. بەردەوام ئاستەنگ خراوەتەپێش ئەوەی زانست ببێتە سەرەکیترین پرەنسیپ کە سیستەمی کۆمەڵگا دیاری بکات. هەربۆیە ناکۆکی سەرەکی لە نێوان ئەو دەوڵەتەی کە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا خۆی نوێ کردۆتەوە، بەڵام وەکو دەزگای فشار و هەڕەشە بەردەوام دەکات، لەگەڵ زانستە کە لەسەر بنەمایەکی زانستیانە سەرلەنوێ شێوە بە کۆمەڵگا دەدات.

چەرخی زانیاری کە بەردەوام بەکاردەهێنرێ، هێشتا شێوەی کۆمەڵگای تایبەت بە خۆی نەخوڵقاندووە. بێگومان زانستیش دیاردەیەکە بەردەوام لە نێو پێشکەوتندایە. لەگەڵ ئەمەشدا تاکو ئێستا ئاکاری زانست لە ئاستی پرەنسیپدا دەستنیشان نەکراوە. هەربۆیە شتێکی ئاستەم و مەحاڵ نییە کە زانستێکی بێ کۆنترۆڵ، ڕژێمێك بخوڵقێنێ کە زۆر لەو سیستەمانە مەترسیدارتر بێت کە نوێنەری ئایینە تاکخوداییەکان و خوداوەندەکانی میتۆلۆژیا بوون. گەلێك نموونەی سەرەڕۆ و تۆتالیتاری ئەو سیستەمە بەڕێوەبەرایەتییانە بینراوە کە لەو بنەما ئەخلاقییانەی کۆمەڵگا دابڕاون، کە پشت بە زانست دەبەستێ.

یەکێك لەو دەرئەنجامانەی بەدەست هاتوون ئەوەیە کە زانست سەرچاوەکانی هێزی سروشتی پێشکەشی کۆمەڵگا کردووە. ئاشکرایە کۆمەڵگا لەو ڕۆژەی لە دایکبووە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بێ زانیاری و زانست نابێ، لە ڕاستیدا یەکەم مرۆڤ کە بەرد یاخود داری بەکارهێناوە، بە زانیاری گەیشتووە. نەخشەکردنی یاسایەکی فیزیا و بەکارهێنانی لە خزمەتی بەرهەمهێناندا، هەرچەندە فۆرمیلەش نەکرابێت، بەڵام ئەوە نیشاندەدات کە زانست پەیڕەوکراوە. دەبێ بگوترێ: کۆمەڵگا هەر لەسەردەمی لە دایکبوونییەوە، لەگەڵ دیاردەی زانستدا لە ناو پەیوەندی و ناکۆکی دایە. هێندەی ناکۆکیەکەی شیدەکاتەوە، پەیوەندی بۆ زانست دەگۆڕێت. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە ڕۆشنگەری بەردەوام دیاردەیەکی زانستە. لێرەدا کێشە دەستنیشان کردنی ئاست و ڕێژەکەیەتی لەهەر چاخێکدا. ڕۆڵ و کاریگەری زانست چەندە زیاد بێت، ڕۆشنگەری هێندە بەهێز دەبێت. نیشاندانی ئەم دیاردەیە تەنیا وەکو پێشکەوتنێکی قۆناخی کۆمەڵگای سەرمایەداری ڕاست نییە. دەتوانرێ تەنیا باس لەوە بکرێت کە ڕۆڵ و کاریگەری کۆمەڵگای سەرمایەداری زیادی کردووە.

دەبێ زۆر باش بزانرێ کە شارستانییەتی سەرمایەداری تەنیا ڕێگای لەپێش پێشکەوتنی زانست نەکردۆتەوە، بەڵکو لە ئاستێکی بەرزدا ڕێگای لەبەر دەم تەسکبوون و سنوورداربوونی کردۆتەوە. ئەو ناکۆکیانەی لە ناواخنی خۆی دەگرێت ناهێڵێ زانست هەموو هێز و توانای خۆی بخاتەگەڕ. بە تایبەتیش بەرامبەر بە زانستەکانی کۆمەڵناسی، موحافەزەکارترین ڕژێمە. بەڵام ئەو سیستەمەی تاوەکو ئێستا لە هەموو شێوەکانی کۆمەڵگادا زیاتر لەمیانەی زانستەوە دەزگاکانی ژێرخان و سەرخانی خۆی بەهێزکردووە، کۆمەڵگای سەرمایەدارییە. ئەم

تایبەتمەندێتیەشی رۆڵی خولْقاندنی قۆناخەکانی رێنسانس و رۆشنگەری سەردەمی لە دایکبوونی سەرمایەداری ئاشکرا دەکات. چونکە لێهاتووترین کۆمەڵگایە کە هێزی خۆی لەپێشخستن و بەدەزگابوون و بەڕێوەبردنی زانست وەرگرتووە. شتێکی رێکەوت نییە کە سەرکەوتووترین کۆمەڵگایە لە گەیشتن بە زانستی بوون، یاخود هەندێ توێژی کۆمەڵگا بۆ بەهێزترین پایە بەرزبوونەتەوە. زانستی بوون، واتای بەهێزبوونە. راستر بڵێین، زانستی بوون واتای رۆشنگەرییە. رۆشنگەری واتای ئەنجامدانی کاری راست و چاکە. ئەنجامدانی کاری راست واتای سەرکەوتن و بەرهەمی باش و زێدەیە. بەرهەمی چاك و زێدە لە هەموو ئاستێکدا لە بواری سیاسەتەوە تاوەکو ئابووری، واتای بەهێزبوون و گەیشتنە بە رۆڵی پێشەنگایەتی.

لەم چوارچێوەیەدا دەتوانرێ دەرکەوتنە پێشی لایەنی زانستی شێوەگرتنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی شارستانییەتی سەرمایەداری پێناسە بکرێت. تاوەکو ئێستاکەش درێژە بە رەوشی ناکۆکی و پەیوەندی بەردەوامی خۆی دەدات. بە تەواوی لە ناسنامە ئایدیۆلۆژیاکانی دیکە و ئایین و فەلسەفە دانەبڕاوە؛ توانای ئەوەی نییە دابڕێت. بۆتەی کۆمەڵگا، مەحکوومی فەلسەفەیەکی ئایدیالیستی و ئایینی دەکات.

دواترین و گرنگترین پرس کە پێویستە بکرێت ئەوەیە: ئایا زانست تەنیا و سەربەخۆ دەتوانێ ببێتە هێزێکی رزگاری؟ ئایا بە تەواوی دەتوانێ ئەو مرۆڤە لەنێو ببات کە لە سروشتی مرۆڤدا هەیە؟ ئایا زانست هەموو شتێکە؟ پرسیاری سەرنج راکێشتر ئەوەیە: ئایا مرۆڤەکانی سەرەتا کاتێ بەرەو هزری خوداوەند ئاراستەیان گرتووە کاری هەرە راستییان کردووە؟ واتە ئایا زانست خودایە؟ گەیشتنی تەواو بە زانست یەکسانە بە بوون بەخودا؟ لە رەوشێکی بەمجۆرەدا باوەڕی "أنا الحق = من خودام" کە لە رێگای هەستەوە بە گەوهەری زانست دەگات، ئایا ئەم هزرە، ناگاتەوە زانستی خوداناسی؟ ئایا ئیسلامییەت کاتێك دەڵێ خودا هەموو شتێك دەزانێ، بە واتای ئەوە نایەت هەر لە زووەوە هاوکێشەی زانست =خودای راگەیاندووە؟ دەتوانرێ گەلێك پرسی دیکەی لەم جۆرە پێشبخرێ. ئەگەر بێتو هێزی خودایی زانست بە پرەنسیپێکی ئاکاری گرێنەدەین، کە پەیڕەوکردنی رەها بێت و بەرژەوەندی هاوبەشی مرۆڤایەتی و ماف و ئاساییشەکەی بە بنەما دەگرێت، واتە ئەگەر بە پرەنسیپێکی سەرەکی ئاکاری و هەڵسوکەوتەوە پابەند نەکرێت، ئەوا لە شێوەی ژیانی بەندکراوی ئەو سیستەمانە رزگارمان نابێت کە سەرەڕۆن و مرۆڤ دەکەن بە رۆبۆت و زۆر لە فیرعەون و نەمروودەکان مەترسیدارترن و لە کۆیلەکانی ئەو سەردەمە زیاتر مرۆڤ وابەستە دەبێ. سەدەی بیستەم کە بە رادەی هەرە زێدە زانستی تێدا پەیڕەو کرا، لەمیانەی ئەو شەڕە تۆقێنەر و ترسناکانەی لێی کەوتەوە، روونی کردەوە و سەلماندی کە زانست چ رۆڵێکی بینیوە، گەوهەرێکی بەمجۆرە لە خۆوە دەگرێت کە ئەم مەترسییە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا چ قیامەتێك لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لە کاتێکدا تاوەکو ئێستا مرۆڤایەتی لەو سەرەڕۆیی دەسپۆتیزمە (أستبداد) رزگاری نەبووە کە میتۆلۆژیای کۆیلەداری و سیستەمی دەرەبەگایی نوێنەری ئایینی تاکخودایی خولْقاندوویانە، ئایا ئەو سیستەمە سەرەڕۆ و تۆتالیتارە بێ ژمارانەی کە زانست دەیکات بە خودایی، بە واتای مەعشەر نایەت؟

٢ ـ تاکڕەوێتی تایبەتمەندێتی سەرەکی و رۆحی ئەو سیستەمەیە کە کۆمەڵگای سەرمایەداری خولْقاند. هەروەکو چۆن زانست گوزارشت لە رەوشی گشتی هزری ئەم کۆمەڵگایە دەکات، تاکڕەوێتیش تایبەتمەندێتی رۆحی کۆمەڵگاکە پێکدێنێت. تاکڕەوێتی، شێتایەتی ئەو تاکەیە کە لە بەرژەوەندی خۆی بەولاوە هیچ شتێکی دیکەی لا پیرۆز نییە و لەگەڵ دەرکەوتنی سەرمایەداری زنجیری خۆی پساندووە و گەیشتۆتە ئاستی سەرشێتی و هاربوون، بوونی تاك سەرەکیترین هێزە کە بەردەوامی پێدەدات. تەنانەت هێزێکە رۆڵەکەی لەپێشەوەی زانستیش دێت.

تاکی سەرمایەدار، جوڵانەوەی تۆڵەسەندنەوەیە لە دیاردەی کۆمەڵگا. بە تایبەتیش لە قۆناخی لە دایکبووندا تینوێتی تاکڕەوی هیچ سنوورێك ناناسێت. لەمیانەی خۆ دابڕین لە تەواوی پەیوەندییەکانی رابردوو، لەو باوەڕە دایە ئازاد بووە. هێزی پارە وەکو خودا دەبینێ. واتە هاوکێشەی خودا = پارە بە رادەی هەرە زێدە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری دەوەشێتەوە. پارە دەبێتە گوزارشتی بەرجەستەی رۆحی سیستەم. هێزێکی سیحراوییە، دەتوانرێ بۆ هەموو بەهایەك بگۆڕدرێ. لە کاتێکدا لە شێوەگرتنی کۆمەڵگاکانی پێشوودا تەوتەم و خودا و پادشا خوداوەندەکان وەکو سەمبۆل دەنرخێنرا، لە شێوەگرتنی سەرمایەداریدا پارە گەوهەریترین هێزە، کە رۆحی تاك بۆ خۆی راکێش دەکات، لەپێناویدا هەموو شتێك رەچاو دەکرێت، تەنانەت کاتێك پێویست دەکات لەپێناویدا رێگا لەپێش شەڕی بەمجۆرە دەکاتەوە مرۆڤایەتی خوێنی لێ بچۆڕێ. ناسنامەی رۆحێك باوە کە لە دەورەی پارە شێوەی گرتووە.

هێندە بە جۆش بوون و رابوونی تاکڕەوێتی سەرچاوەی خۆی لەم رق و کینەوە دەگرێت کە بە سەدان هەزار ساڵ بەرامبەر بە کۆمەڵگا بوون هەبووە. تەواوی سیستەمەکانی پێشوو، بە کۆمەڵگا بوونیان بە گوێرەی بەرژەوەندی توێژەکانی خۆیان پێش خستووە. بە کۆمەڵگا بوون پیرۆزترین چالاکی و کرداری ژیانە کە دەستی لێبەرنادرێت، ئیتر ئەمە بە شێوەیەکی کراوە یان داخراو یاخود بە ئارەزوومەندی بێت یان لەمیانەی توند و تیژییەوە. ناچارە تەواوی ئایین، ئاکار، بەرهەمهێنان و سیاسەتێك گرێدراوی ئەم ئامانجە بن. هەموو داب و نەریت و هەر کەسێك پڕوپاگەندەی ئەم یاسایە دەکات. کاتێك دەگاتە قۆناخی سەرمایەداری، ئەو بە کۆمەڵگا بوونەی بارێکی ئێجگار زۆر و گرانی لێ نراوە لەمیانەی تاکڕەوێتییەوە دەتەقێنرێتەوە (وەکو تەقینەوەی ئەتۆم) و هەر وەکو بڵێی بە هێزێك گەیشتووە تازە دۆزراوەتەوە. لە هەستیارترین خاڵی کۆمەڵگادا تەقاندنەوەی بۆمبای تاکڕەوێتی، رێگا لەپێش سامانێکی ئێجگار مەزن دەکاتەوە. کاتێك تاقیکردنەوەکانی سەرەتا سەرکەوتن بە دەست دێنێ، ئیتر ئەوەی دەمێنێتەوە، گەیاندنێتی بە سیستەمێك. ئیتر تەکییەی تاك پەرستگا نییە. روو لە خودا ناکرێت، گوناهکاری لە ئارادا ناهێڵدرێ. کەعبەی نوێ کارگەیە، خودای نوێ پارەیە، بەرژەوەندی تاك پیرۆزە. گوناهکاری جۆرێکە لەو کۆسپانەی پێش قازانج.

بێگومان لێرەدا بە هەموو شێوەیەك و بە تەواوی سەرمایەداری ناهەق نییە. بە سەدان هەزار ساڵ تاك بە قوربانی کۆمەڵگا کرا. لە راستیدا چەندین ئایین بەبێ چاوتروکاندن، بەهادارترین هەبوونی خۆیان، منداڵەکانیان وەکو قوربانی پێشکەش بەو خوداوەندانە کرد کە بەرامبەر بەختەوەری کۆمەڵگا بەرپرسیار دەبینران. بەمجۆرە لە ژێر ناوی ئایین رێگا لەپێش ویژدانی کوێرانەی کۆمەڵگا کرایەوە. لەمیانەی پێشکەش کردنی قوربانییەکی بێ سنوردا تۆڵە لە تاك سەندرایەوە. بەمجۆرە لە ژێر ناوی رزگارکردنی کۆمەڵگا، مێژووی کۆمەڵگا گۆڕا و بوو بە مێژووی بە قوربانی کردنی تاك. تەواوی شەڕ و عیبادەت و رێ و رەسمەکان لەم پێناوەدا بەکارهێنران. لێرەدا ئەوەی لە ژێر ناوی بە کۆمەڵگا بوون ئەنجام دراوە گەیشتۆتە ئاستی شێتایەتی. پێشێل کردنێکی بچووکی رێ و رەسمێك، تەنانەت بێ تاوانیش بێت و لە ئارەزوویەکی مافداریشەوە سەرچاوەی گرتبێت، بە گەورەترین تاوان لە قەڵەم دەدرێت. هەروەکو چۆن بەوە ناوەستێ کە دونیای سەر زەوی دەکات بە دۆزەخ، ئەوا لەمیانەی دۆزەخی دونیاکەی دیکە، قۆناخی ئەشکەنجەدان دەکات بە هەمیشەیی و بەردەوام. بەندێتی تاك هێندە پێشکەوتووە تەنانەت خاوەنی سێبەری خۆشی نییە، کەوتۆتە ئاستێك کە سێبەری سێبەرە. لە ژێر ناوی بە کۆمەڵگا بوون تاك خراوەتە نێو ئەم رەوشە.

ئا لەم خاڵەدا قۆناخی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کە رێگا لەپێش سەرمایەداری دەکاتەوە، لەمیانەی گرتنە دەستی تاکڕەوێتییەوە خاڵی هەرە هەستیار و ژیانی بەدەست هێناوە. هەست بەوە دەکات لەمیانەی دەرخستنە پێشی تاك دادپەروەرانەترین هاوسەنگی لە نێوان تاك ـ کۆمەڵگا ئاوا بکات کە لە مێژە کاتی هاتووە. شتێکی ئاشکرایە کە هێز و مافدارێتی خۆی لە کەڵەکە بوونی ئەم مێژووە وەردەگرێت. زۆر باش هەست بەوە دەکات چەندە ئەم کۆمەڵگا موحافەزەکار و کۆنەپەرستە هەڵوەشێتەوە کە هێندە بە دژی تاکدا شکاوەتەوە و مەحکوومی ژیانێکی کردووە کە لەمیانەی قەدەخەنامەکاندا خنکاندوویەتی و کردوویەتی بە رۆبۆت (الە)یێکی هەتاهەتایی، هێندە رۆڵێکی شۆڕشگێڕی و ئازادیخوازی دەبینێ. بەمجۆرە لە مێژوودا بۆتە خاوەن پایەیەکی مەزنی مافداری و ئازادیخوازی. دیاردەی بە کۆمەڵگا بوون لەسەرەتای ئاوا بوونیدا هێزێکی خودایی بێ هاوتا و نەبینراوی هێنایە ئاراوە،کە ئەم جارە بە پێچەوانەوە، هێزێك دەخولْقێنێ کە تا دوا ئاست بەرەو تاکە کەسێتی دەچێت. تاك بە خۆی بەرەو خودایی بوون بەرز دەبێتەوە. لەم خاڵەی بادانەوەی مێژوودا دەرفەتی هاوسەنگییەکی رەوا و پێویستی تاك ـ کۆمەڵگا دەخولْقێنێ. لە راستیدا سەرمایەداری بە تایبەتیش لە قۆناخی لە دایکبووندا دڵەڕاوکێ و لێکدانەوەیەکی بەمجۆرەی سەبارەت بەم هاوسەنگییە، زۆر سنووردارە. زیاتر لە قۆناخی کاردانەوەی سۆسیالیستییانە، هەڵوەستە سەبارەت بە هاوسەنگی تاك ـ کۆمەڵگا دەکرێت. بەڵام مسۆگەر بۆ گەیشتن بەم هاوسەنگییە پێویستی بە قەڵەمبازی بەهێزی تاك هەیە. شۆڕشی تاك وەکو بەرهەمێکی ئەم پێویستییە مێژووییە دێتە ئاراوە.

کاتێك تاك هەر زنجیرێکی کۆیلایەتی دەپچڕێنێ، ئەوا هەست بە ژیانێکی نائاسایی دەکات. ئیتر دونیا دەبێت بە بەهەشت. ئەو ئارەزووانەی بە گوناه و تاوان لە قەڵەم دەدران، دەگۆڕێ و دەبێتە جوانترین و خۆشترین شێوەی ژیان. علمانییەتێکی سەرسووڕهێنەر دەست پێدەکات. دەرك و هەست بەوە کراوە لەمیانەی هونەرەوە ژیان جوان بکرێت. ئیلهام گرتن لە میراسە هونەرییە شکۆدارەکانی چاخەکانی سەرەتا، ڕێگا بە لە دایکبوونەوەیەکی نوێ و ڕێنسانس دەدات. لەمیانەی ئەو بوێری و ئازایەتییەی لە زانستەوە وەری دەگرێت، بە بێ هیچ ترسێك لە فەرمانی دۆگماکان، لەمیانەی هونەرەوە دونیا جوانتر دەکرێت و بە ئاستێك دەگەیەنرێ جێگای حەز و شایستەی ژیان بێت، هێزێکی مەزن بە بوون بە تاك دەدات. بوون وەکو تاکێك، زیاتر بەرەو بیرکردنەوەی ئازادانە و ژیانێکی بە کەیف و سەفا و حەز و ئەشقێکی نوێی دەبات. گەیشتن بە زاراوەی وڵات، لە چەمکی ئۆمەتەوە، دەرباز بوون بۆ چەمکی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی، بە دونیایی بوون، دەوڵەمەند بوون، لەم جیهانەدا گرێدان بە ژیان و نرخ و بەها نیشاندان بەرامبەر بە هەموو جۆرەکانی هونەر، لەپێشینەی ناسنامەی نوێی ئایدیۆلۆژی ڕێنسانس دێت. لە رابردوو دابڕان هێندە ریشەیی بوو گرێدان بە شێوەی نوێی ژیانی خوڵقکارانە هێندە بەهێزە، هیچ پەیوەندی و تاکە دەزگایەکیش نییە کە لەپێش ئەوە ببێتە کۆسپ، کۆمەڵگای کۆن بەلاوە بنرێت و سیستەمێکی نوێ لە جێگای ئاوا بکرێت.

٣ ـ تایبەتمەندێتی بەهادارێتی مرۆڤ و دەرخستنە پێشی، واتە پرەنسیپی هیومانیزم (مرۆڤپەروەری) سێیەمین تایبەتمەندێتی گرنگی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی شارستانییەتی سەرمایەداری پێك دێنێت. لە تەواوی شێوەگرتنی کۆمەڵگاکانی چاخەکانی پێشوودا هەروەکو بڵێی مرۆڤ قووت درابوو. لە ناو کۆمەڵگادا تواوەتەوە، بوونەوەرێکی هێندە بێ کاریگەرە لە جێبەجێ کردنی ئەو شتەی لەپێشی دانراوە بەولاوە هیچ ڕۆڵێکی دیکەی نییە. تەواوی مەزنایەتی و بایەخ و گرنگیدان بە هێزی خودایی دەبەخشرێ. بەڵێ ئەوەی بەردەوام لەسەر سەری مرۆڤ گەورە و پیرۆز دەکرێت تەوتەم و خوداوەندەکانن، کە لە دەمامکێك و نەخشەی ناسنامەیەك بەولاوە شتێکی دیکە نین. لە راستیدا لەمیانەی ئەم کردار و چالاکییە ئایدیۆلۆژیانەوە هەوڵ دەدرێ کۆمەڵگا بەڕێوەببردرێت و هێزی پێ ببەخشرێ. بەڵام ئەمە لەمیانەی پێشخستنی زاراوەی مرۆڤەوە نییە، بوونەوەرێك دەخوڵقێنرێن و بەرز دەکرێنەوە کە چارەنووس و قەدەری مرۆڤ دیار دەکات، لەمیانەی ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی ساختەوە ئەنجام دەدرێت.

هەرچی لە قۆناخی کۆمەڵگای چینایەتییە، مرۆڤ بچووکتر دەکرێتەوە و لە کەسایەتی ئادەم و حەوا دا بە تاوانبار رادەگەیەنرێن، مەحکوومی ناسنامەیەك دەکرێن کە هەتا هەتایە دەیانکات بە بەندەی خوداوەندەکان. بەردەوام تاوانەکانیان زیاد دەکرێت، لە بەرامبەر ئەمەش بۆ رزگار بوون، بژاری خزمەت کردنی لەپێش دادەنێت. بەردەوام خستنی مرۆڤ لە دوو تەوەرەدا پێش دەخرێت. لە ژێر ناوی ناسنامەی بوونی نادیار و داڕنراودا، تاك بەرامبەر بە کۆمەڵگا بچووك دەکرێتەوە و بە هیچ دەکرێت. بەمجۆرە هیچ بانگەشە و بایەخێکی جێگای باس نییە. هەموو شتێك لەپێناو مانەوەی کۆمەڵگایە. هەر شتێکی لەپێناو هەبوون و مانەوەی کۆمەڵگا فیدا نەکرێت هیچ بەهایەکی نییە. بە گوێرەی ئەوەی مرۆڤەکە دەگات بە کۆمەڵگا بوون، سەرەتا ئەو فیدا دەکرێت. دووەمین تەوەرەی گرنگ ئەوەیە، بۆ ئەوەی بەرامبەر بەراستینەی چینی دەسەڵاتدار بە تەواوەتی بانگەشە لەدەست بدات، مرۆڤ بە بێ بایەخ دادەنرێت، وەکو تاکێك لە قەڵەم دەدرێت کە تاوانی زۆرە و تەنیا شایستەی خزمەتکارییە. بەمجۆرە لەلایەکدا هەندێکیان لە شێوەی بوونەوەری خودایی بەرز دەکرێنەوە و لە پایەی ئاستی مرۆڤ نامێنن، لە تەنیشت ئەم کۆیلەدارانەشەوە سیستەمی کۆیلە و بەندەکان ئاوا دەکرێت کە وەکو ئاژەڵ دەکرێن بە موڵك و بەردەوام کاریان پێدەکرێت. بە درێژایی چەندین چاخ ئەم جۆرە هەڵوێستانە بەرامبەر بە مرۆڤ پێشخراوە.

لە ئایینە تاکخوداییەکان و قۆناخی بەرخودانی کۆمەڵگای نئۆلیتیك بەرامبەر بە کۆیلەداری، هەرچەندە سنوورداریش بێت بەڵام دیسان بەرگری لە شەرەف و ویژدانی مرۆڤ دەکرێت. زاراوەی مرۆڤایەتی پێکدەهێنرێت کە پێویستی بە رزگار بوون هەیە. بۆ یەکەمین جار لەژێر ناوی نامووس و ویژدان سەرهەڵدەدرێت. شۆرشی ئاکاری زەردەشت، ریفۆرمخوازی هاوشێوەی بودا، دەرخستنە پێشی مرۆڤ لەلایەن فەلسەفەی گریکەوە، هەنگاوی دیکەی زۆر گرنگن. ئەو مرۆڤەی کە ئازارێکی مەزنی چەشتووە و خاوەنی رەنجی رەسەنە هەستی پێدەکرێت. هێندە خاوەندارێتی کردنی مرۆڤایەتی لە عیسا، بەهۆی پێشکەوتنی گرنگییەکەی و زەمینەی ئەوەی ئاوا کردووە کە ببێتە ڕێبازێك. بە بێ هیچ جیاوازییەك، بۆ تەواوی مرۆڤایەتی وەکو فریادڕەسێك دەناسرێت. کاتێك حەزرەتی مەحەمەد مرۆڤ وەکو شەڕەفمەندترین بوونەوەر "أشرف المخلوقات" رادەگەیەنێ، هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوەی دەبات. ئەو بەهایەی بە مرۆڤ دراوە لەپێشەوەی ئەو فاکتەرانەوە دێت لە پەسند کردنی ئیسلامییەتدا ڕۆڵ دەبینێ.

سەرەڕای ئەم هەنگاوە مێژووییانە، ئەو مرۆڤەی کە لەمیانەی پەیوەندییەکانی کۆیلایەتی و خاکەوە بچووك کراوەتەوە و نزم کراوە، زۆر لەوە دوورە ببێتە خاوەنی بایەخێکی ناوەندی. ژنیش لە رەوشێکدایە بە چارەنووسی خۆی رازی کراوە، مەحکوومی ناسنامەیەك بووە کە خزمی شەیتانە، ناتەواوە، بێ ئەقڵە و بەردەوام بانگێشتی تاوان دەکات. لە کاتێکدا کەمێك مرۆڤایەتی پێشدەخرێت، ئەو هێشتا بە مرۆڤ دانانرێت. هەرچی چینی باڵادەست و چەوسێنەرە، لەمیانەی خەسڵەت و تایبەتمەندێتیە خوداییەکانەوە خۆی نیشان دەدات و وەکو بوونەوەرێکی لە رەچەڵەکی مرۆڤ جیاوازتر پێناسە دەکرێت؛ وەکو گرنگترین کار ناسنامەی ئایدیۆلۆژی بە گوێرەی ئەوە پێشدەخرێت. ئەو راستینە و چارەنووسەی شارستانییەتەکانی کۆن شایستەی مرۆڤایەتییان دەبینی، هێڵە گشتییەکەیان بەمجۆرەیە.

ئەوە لە جێگای خۆیدایە سێیەمین و گرنگترین دیاردەی لەسەردەمی لە دایك بوونی چاخی سەرمایەداری تۆڵەی کراوەتەوە ئەو رەوشە بوو کە مرۆڤ تێیکەوتبوو. لەمیانەی بەرز کردنەوەی مرۆڤ، واتە لە ڕێگای هیومانیزمەوە تۆڵە لە کۆمەڵگای کۆن و چینی باڵادەست دەکرێتەوە. هیومانیزم (مرۆڤپەروەری) کاریگەرترین چەکی تێکۆشانە بەرامبەر بەوانەی کە درێژە بە کۆمەڵگای کۆن دەدەن. مرۆڤ دەرفەت و توانای هەڵسانە سەرپێ و ئازاد بوون و زانست و گەیشتن بە شەرەفمەندی لە هزری هیومانیزم بەدیدەکات. لەخۆڕا نییە هیومانیزم یەکێکە لە زاراوە سەرەکییەکانی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ.

خودا لە ناوەندی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای کۆن جێگیر کراوە. بەمجۆرەش بە شێوەیەکی تۆکمە و تەواو باڵادەستی ئایدیۆلۆژی چینی چەوسێنەر و دەسەڵاتدار ئەنجامگیر دەبێت. لە راستیدا هێزی یاسای خوداوەندەکان، بە واتای سیناریۆیەك دێت تاوەکو ڕێگا لەپێش هێزی یاسادانانی دەسەڵاتداران بکاتەوە. بڕیارە لەپێشینەکان کە بە یاسای خودایی (ئیلاهی) ناوزەد دەکرێن،  لەسەرووی ئەو ڕێچکە بە کاریگەرانەوە دێ کە هزر بەند دەکات و چۆنی بخوازێ بەمجۆرە بەکاریان دێنێ و کاریان پێدەکات. هیچ کاتێك سێبەری ئیرادە نامۆکان لەسەر مرۆڤایەتی کەم نەبۆتەوە. بەندبوونی ئایدیۆلۆژی وەکو مەترسیدارترین جۆری وابەستەیی مرۆڤێکی بێ ئیرادە و رۆبۆت (الی) دەخوڵقێنێ.

هیومانیزم تازە سەریهەڵداوە، مرۆڤ لە بن فەرمانڕەوایەتی تەواوی ئەم سێبەرانە رزگار دەکات. خوڵقاندنی باشترین مرۆڤ، کار، رۆڵێکی سەرەکی ئایدیۆلۆژیە. کاری تەواوی ئایدیۆلۆژیا کۆنەکان، خوڵقاندنی بوونەوەرەکانی لە جۆری خودا، تەوتەم، قارەمان، جنۆکە، شەیتان و فریشتەیە کە هەموویان لە دەرەوەی مرۆڤن. سەرەکیترین کار و رۆڵی ئەم بوونەوەرانەش بێ کاریگەرکردنی مرۆڤە. لە راستیدا ئەمانە وەکو ئامرازی باڵادەستی ئایدیۆلۆژی، لە سەرووی ئەم پەیوەندییانەوە دێن کە کاریگەرێتی کۆیلەداری لەسەر هزری مرۆڤ دروست دەکەن. هیومانیزم لە ژێر ئاڵای مرۆڤدا تەواوی ئەم بوونەوەرە دروست کراوانە (ألمصگنعە) رەت دەکاتەوە و مرۆڤ و تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی لە شوێنی بەرزترین و مەزنترین بەها دادەنرێ. بۆ یەکەمین جارە بە شێوەیەکی فراوان تێڕوانینێك زاڵ دەبێت کە کاریگەری لەسەر کۆمەڵگای نوێ دەکات و ناوەندەکەی مرۆڤی ئازادە. ئیتر مرۆڤ لە جیاتی ئەوەی بەندەی دۆگما ئامادە کراوەکان و خوداوەندەکان بێت، ئیتر لەوان دادەبڕێ و دەبێتە خاوەنی ناسنامەیەکی خوڵقکار و لەمیانەی ئیرادەی خۆیەوە، خۆی پەروەردە دەکات. شێوازێکی هزری زاڵە کە لە بیر کردنەوەدا سەربەخۆیە و بۆ هەموو هزرێکی نوێ کراوەیە. لەمیانەی سۆزەکانییەوە ئەو رەنگ و دەنگ و تام و گەرمییە هەڵدەبژێرێ کە ئارەزووی لێیە؛ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە نەزۆکی رزگاری دەبێت و ڕێگا لەپێش واتایەکی سیحراوی دەکاتەوە و دەبێتە خەیاڵی هەموو جیهان. ئەو دونیایەی دەسەڵاتدارەکان لە مرۆڤیان زەوت کردبوو، بە هەموو شان و شکۆیەکییەوە

سەرلەنوێ لە دایك دەبێتەوە. هەموو لایەنێکی سروشت پڕ لە نهێنی دەبینرێ و چاوەڕوانی دۆزینەوە و کەشف کردنە. هەستی باوەڕی کردن بە خود دەچەسپێ، خوڵقکاری دەکات بە تایبەتمەندێتیەکی مرۆڤ و لەو ڕەوشەی دەردەخات کە کارێکی خودا بێت. ئیتر مرۆڤ بە قۆناخێك گەیشتووە دەتوانێ چارەنووسی خۆی دیار بکات. ئەو مرۆڤەی کە بە درێژایی هەزاران ساڵ لە دەرەوە لەپێناو بەرژەوەندی هەندێ هێزی دیکە ئاراستە دەکرا، ئیتر بەو توانا و لێهاتووییە گەیشتووە کە بخوازێ خۆی بەڕێوە ببات. ئیتر تەواوی ئەو دەمامك و لەیستۆکانەی بەرامبەر بە مرۆڤ پێش دەخرا، فڕێ دران و تێك دران و ئەو قۆناخە دەکرێتەوە کە دەتوانێ ببێتە خاوەنی خۆی. ئەم تایبەتمەندییانەی کە دەتوانین چەندینی دیکەی لێ بژمێرین، گوزارشت لە شۆڕشێکی هومانیستی دەکات. لە کاتێکدا تەواوی شۆڕشەکانی تا ئەو سەردەمە، بەردەوام مرۆڤیان لە سیستەمێکی دەسەڵاتدارێتی و وابەستەییەوە بەرەو شێوازێکی دیکەی وابەستەیی و باڵادەستی دەبرد، بەڵام شۆڕشی نوێ مرۆڤ دەخاتە نێو قۆناخێك کە لە تەواوی جۆرەکانی پاشکۆیەتی ڕزگاری دەبێ و بە خۆیەوە پابەند دەبێت.

لەو ڕەوشە نوێیەی مرۆڤایەتیشدا، دیسان هاوسەنگی دەبێت بە کێشەیەکی گرنگ. مرۆڤێك کە تەواوی داوەکانی خۆی پچڕاندبێت نابێتە ئاژەڵ؟ لە کاتێکدا ناهاوسەنگی و زێدەڕۆیی بە کۆمەڵگا بوون کە مرۆڤی کرد بە مرۆڤ، ڕێگای لەپێش کۆیلەیەك کردەوە لە ئاژەڵ خراپتر بوو، لێرەدا ئەو تاکەی لە ناو کۆمەڵگادا بەهێز بووە و ئێستا لێی دابڕاوە، لە کوشندەترین دڕندە ترسناکتر نابێت؟ ئەو مرۆڤەی لەمیانەی زانست و پارە بەهێز بووە و جیهان وەکو مەیدانێکی تاڵانکاری دەبینێ، ئایا لەو مرۆڤە ترسناکتر نابێت کە کۆمەڵگا پابەندی خۆی کردبوو؟ پرسی لەم جۆرە لە خۆڕا نین. لە چاخی تاکڕەوێتی (الفردیە)، لەژێر ناوی مرۆڤایەتی، گەورەترین کوشتاری بە کۆمەڵ، تاوان و جینۆساید و قڕکردن بەرامبەر مرۆڤایەتی پیادە کراوە. کردنەوەی ڕێ لەپێش گەورەترین دوو شەڕی جیهانی مێژوو و چەندین شەڕی هەرێمی، ناوخۆیی، ئەتنیکی و ئایینی، ئەوە نیشان دەدات کە ئەو بانگەشانەی سەبارەت بە ترسناکییەکەی دەکرێت وشك و لەخۆڕا نییە. ئەو مرۆڤەی کە ئاژەڵەکەی ناواخنی خۆی بە شێوەیەکی زۆر بەهێز وشیار کردۆتەوە، ئیتر ڕووبەڕووی سیستەمێکی بێ بەرپرسیارانە بۆتەوە کە لە ئەخلاق بێبەرییە و بازاڕ (بۆرسە) دەپەرستێ و بە جۆرێك ژینگەی پیس کردووە کە ڕەنگە لە نێوی ببات.

لە کاتێکدا ناسنامەی ئایدیۆلۆژی و پێکهاتەی ئاکاری سەرمایەداری شێوە دەگرێت، لەگەڵ ئەوەی بناخەی ئەوتۆی هەیە کە مرۆڤ بە بنەما دەگرێت و مرۆڤایەتی بەرز دەکاتەوە، بەڵام هەر لە قۆناخی لە دایکبوونییەوە ئەوە دەدات بەدەستەوە هەموو جۆرە مەترسییەکی لە ناواخنی خۆیدا حەشار داوە.

بوونی ئەوروپا بە بێشکەی شارستانییەتی سەرمایەداری، لە نزیکەوە پێویستی بە شیکردنەوەیەك هەیە. لەگەڵ ئەوەی ئەو باسەی تا ئێستا ئاماژەی پێدەکەین چوارچێوەی گشتی دیاری دەکات، وەلێ ئەو پێشکەوتنەی ناوەڕۆکەکەی پێك دێنێت، هەروەها توانستی مێژوویی و هەلومەرجی جوگرافی لەبار و پێکهاتە قاڵبۆوەکانی کۆمەڵگای چینایەتی، ڕۆڵی دیاری کراو دەبینن. ئەو کۆمەڵگایانەی لە قۆناخێکی مێژوویی دوورەوە لە نێو شارستانییەتە کۆنەکاندا دەژین، تەنیا لەمیانەی تێکۆشانی دەرەوە دەشێت شێوەبەندییە نوێکانیان تێدا پێش بکەوێت. لە خۆیەوە بە سانایی شێوەی نوێ پەسند ناکات. پێکهاتەی کەش و جوگرافیا فاکتەری بە کاریگەرن لە شێوەبەندی نوێدا.

ئەگەر لەم چوارچێوەیەدا تەماشا بکرێت دەبینرێ، لە ساڵانی ١٠٠٠ ی زایینی تەواوی توانستەکانی مێژوو بۆ ئەوروپا گواستراوەتەوە. لە شۆڕشی کشتوکاڵەوە تا دەگاتە شۆڕشی شاری کۆیلەداری و لەوێشەوە تا دەگاتە تەواوی دەسکەوتەکانی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، هەرچییەکی لەدەستدا هەبێت بۆ ئەوروپا گواستراوەتەوە. ئەم گواستنەوەیە تەواوی پێشکەوتنە ئایدیۆلۆژی و زانستی و تەکنۆلۆژییەکان (ئامێر) دەگرێتەوە. شارستانییەتی ئیسلامییەتیش کە لوتکەی دواترین شارستانییەتە، تاوەکو سەدەی پانزدەهەم تەواوی بەها و دەسکەوتەکانی دەگواسترێتەوە. هەروەها کەرەستە و زانیارییەکانی سەبارەت بە چاپخانە و کاغەز و باروت، لە (چین)ەوە وەردەگرن کە لە مێژە دۆزراوەتەوە و پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆوە بینیوە و شوێنگەیەکی گرنگی هەیە لەپێشکەوتنی ئامێرەکان (تەکنۆلۆژیا)دا. زیاد بوونی دەرفەت و تواناکارییەکانی بازرگانی، ئەوروپا بە بەرهەمی ئەم پەڕ و ئەو پەڕی دونیا ئاشنا دەکات. ئەم بەروبووم و زانیارییانە لە کەش و هەوای گونجاو و زەوییە بە پیتەکان، ڕێگا لەپێش زێدە ـ بەرهەمێك دەکاتەوە کە تا ئەو کاتە نەبینراوە. پێشکەوتنی زێدە ـ بەرهەم، زیادەکە بە زێدەییەوە پێشکەش بە کارە پیشەکاری و بازرگانی و زانستی و فەلسەفییەکان دەبەخشێت. خوێندەواری ڕوو لە زیاد بوونە، باشترین دانیشتوانی پەروەردە کراو دێتە ئاراوە. دیاردەیەکی بناخەی ئەم پێشکەوتنانە پێك دێنێ ئەوەیە، بۆ ماوەیەکی درێژ و بە شێوەیەکی قووڵ ئەوروپا بە کۆمەڵگای چینایەتیدا دەرباز نەبووە. سیستەمی کۆیلەداری هێندە بۆ دەرەوەی نیمچە دوورگەکانی گریك و ئیتالیا نەگواستراوەتەوە، تەنیا توانیویەتی لە شێوەی کۆلۆنی و مۆڵگە چەند کاروانسەرایەك ئاوا بکات. هەرچی شارستانییەتی دەرەبەگایەتییە تازە و نوێیە. تەنیا لەسەرەتاکانی ١٠٠٠ ی زایینی لە تەواوی ئەوروپا بڵاوبۆتەوە. هەروەها لەم قۆناخەدا چینی بۆرژوازیش لە ئاسۆی شار پێدەگەیشتن. شتی گرنگتریش ئەوەیە کە سیستەمەکانی نئۆلیتیك و کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین سەرچاوە دەگرن، ناتوانێ ڕیشەکانی خۆی دابکوتێ. تیرە و هۆزە نۆرمان و فرانك و جێرمانەکان کە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە نێو دواترین قۆناخی بەربەرییەتدا دەژین، ڕقیان لەم سیستەمانەیە. سەربەستی خۆیان بە قووڵایی لەدەست نەداوە. ئەوانیش وەکو زەوییەکانی ئەوروپا، لە بواری چینایەتیدا لە نێو قۆناخێکدا دەژین زیاتر لایەنی پاکیزەیی (دەست لێنەدراوی) لەپێش و سەنگینە.

کاتێك ئەم نوێ بوون و دانەبڕانە لەسەربەستی هۆزایەتی لەگەڵ توانستەکانی شارستانییەت دەبن بە یەك، چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت لەسەر خاکی ئەوروپا و لە بن ناوی مرۆڤایەتیدا ڕێگا لەپێش دەرکەوتنی سەنتێزێکی مەزن بکاتەوە. لە بنەڕەتدا گەیاندنی ئەو تێز و دژە تێزە دەوڵەمەندانەی شارستانییەتی ئەوروپایان خوڵقاند بە سەنتێزێکەوە، لەلایەن ئەو پێکهاتەیەی هزری مرۆڤەوە درێژی نەخایاند کە گەیشتبووە ئاستێکی پێشکەوتووی هەرسکردن. کاتێك کەرەستە و پێداویستییەکان ئامادە بێت، هەروەکو دروست کردنی خواردنی ئاشوورە وایە. لە کاتێکدا ڕۆشنبیرەکان و پیشەکاران و زانا ئایینیەکانی ئەوروپا توانیان لە سەدەی پانزدەهەمدا ڕێنسانس، لە سەدەی شانزدەهەمدا ریفۆرمی ئایینی، لە سەدەی حەڤدەهەمدا جوڵانەوە فەلسەفی و زانستییە مەزنەکان دەست پێبکەن، ئەو کات توانیویانە مۆرکی کیشوەری ئەوروپا لە سێیەمین و گەورەترین شارستانییەتی مێژوویی بدەن.

لە نموونەی ئەوروپاشدا سەلمێنراوە هەر شارستانییەتێك لەسەرەتادا پێویستی بە شۆڕشێکی ڕۆحی و هزری هەیە. تەنیا بازرگانی و پیشەکاری ناتوانن شارستانییەت بخوڵقێنن. بە بێ ئەوانیش نابێت؛ بەڵام سەرەتا خۆ سەلماندنی خوڵقکاری (نوێ) لە بوارەکانی هزری و ڕۆحیدا، دواتریش لە میانەی هێز بەخشین پێیانەوە، بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری زاڵ دەکات و لە ڕێگای شۆڕشی سیاسیشەوە بە شێوەیەکی خێراتر ئەنجامی دەدات، ئەمەش پێکهاتەی دیالەکتیکی پێشکەوتن نیشان دەدات و دەیسەلمێنێت.

## ب ـ پێشکەوتن و بە دەزگا بوونی شارستانییەتی سەرمایەداری

گەوهەری شارستانییەتی سەرمایەداری پشت بەوە دەبەستێت کە خاوەن ڕەنجەکان (کارکەرەکان) بەرامبەر بە کرێیەکی کە پێشتر دیاریکراوە و لە چەند کاتژمێرێکی دیاری کراودا، گرێدراوی کاریان بکات و بەکاریان بێنێ. لە سیستەمی کۆیلایەتیدا تاکی کۆیلە بە هەموو شتێکییەوە تاکو مردن موڵکی خاوەنەکەیەتی. ئەگەر بخوازێ و ئارەزووی لێبێت کاری پێدەکات، دەیفرۆشێ و تەنانەت دەتوانێ بیکوژێ. جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئاژەڵدا نییە. سیستەمی دەرەبەگایەتی لەسەر بنەمای هاوبەشێتی زەوی پشت بە وابەستەیی جووتیار دەبەستێ. لەسەر بنەمای هاوبەشێتییەکی (شریك) سنووردارەوە بە خاوەن زەوییەوە گرێ دەدرێت. لە نێو ڕەوشێکی نیو ئازاد دایە. دەتوانێ ببێتە خاوەن خێزان.

بەڵام تا دوایی دەرفەتی دابڕانی لە خاك سنووردارە. بەڵام هەرچی لە سەرمایەدارییە، تاك گرێدراوی هیچ کەسێك نییە. بەرامبەر بە کرێیەکی دیاریکراو دەتوانێ لە بازاڕدا ڕەنجی خۆی بفرۆشێتە هەر کەسێکی کە خۆی ڕای لەسەربێ.

به گوێرەی پەیوەندی خاك (جووتیارێتی) هەنگاوێكی دیكە بەرەو ئازادی چووە.

دووەمین بابەت و فاكتەر كە رۆڵێكی دیاریكراو لەپێشكەوتنی سیستەمدا دەبینێ، كارەكتەری پیشەسازی بەرهەمهێنانە. بەرهەمی كارگە بە بناخە دەگیردرێت. گرنگترین هەنگاوی پێشكەوتنی شارستانییەت دەربازبوونە لە مانیفاكتۆراوە بۆ كارگە. هەروەكو دەزانرێ بەرهەمی مانیفاكتۆرا هێزی بازوو بە بنەما دەگرێت و شێوازێكی دەزگای بەرهەمهێنانی سەردەمی نئۆلیتیكە. كارگە یەكینەیەكی بەرهەمهێنانی تایبەت بە سەرمایەدارییە. كاری بە كۆمەڵ و ئامێری دیاریكراو، كۆڵەكەكەی پێكدێنێ.

سێیەمین فاكتەری سەرەكی كە سەرمایەداری پێشیدەخات، پێكهاتەی ئامێرەكانە. بە ئەندازەی ئەوەی ئامێر رۆڵی لەپێشكەوتنی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا هەیە، هاوكات كارتێكردنی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریش لەسەر ئامێر و پێشكەوتنی زیاتری، فاكتەرێكە لە سەرووی ئەوانی دیكەوە دێت. لێرەدا پێشخستنی روونكردنەوەیەكی بەرفراوان سەبارەت بە مەسەلەی ئامێر (تەكنیك) سوودبەخش دەبێت.

ئەگەر یەكەمین پەیوەندی كە مرۆڤ لەگەڵ سروشت بەستوویەتی بە تەكنیك ناوببرێت، لە جێگای خۆیدایە. یەكەمین دار و بەردی بەكار هێنراون، یەكەمین ئامرازە (تەكنیك) كە بەكار هێنراون. زیاتر لەم بوارەوە لەگەڵ ئاژەڵەكان جیا دەكرێتەوە. گرنگترین لایەنی مرۆڤ ئەوەیە كە ئامراز دەخاتە نێوان خۆی و سروشت و هەنگاو بەرەو ڤەبوونی (فتح) مەزن دەهاوێژێت. ئەو دیاردەیەی هێزێكی مەزن بە مرۆڤ دەبەخشێ بەرامبەر بە سروشت، ئەو ئامرازەیە كە بەكاری دێنێ. تاوەكو ئێستاش یەكێك لەو بابەتە سەرەكییانەی كە شینەكراوەتەوە ئەوەیە، بۆچی مرۆڤ هەنگاوی بەرەو بەكارهێنانی ئامراز (أدوات) هاوێشت. بە هۆی گرنگی و بایەخەكەیەوە ئامرازە سەرەكییەكان رۆڵێكی سەرەكی لە دیاریكردنی چاخەكانی مرۆڤایەتیدا دەبینێ. چاخی پالیۆلیتیك بەوە جیا دەكرێتەوە كە تەلزمی بەرد وەكو ئامراز و چەكێكی راو و خۆپاراستن بەكار دەهێنرێ. مرۆڤایەتی لە سەردەمی پەیدابوونییەوە لە سەدا نەوەدوهەشتی تەمەنی خۆی لەم چاخەدا ژیاوە. ئەم قۆناخەی كە راوكردن و كۆكردنەوەی میوە و دانەوێڵە بە بنەما دەگیردرا. بەرد وەكو سەرەكیترین ئامراز (أداة) لە خزمەتی مرۆڤدایە.

قۆناخی نئۆلیتیك كە دووەمین چاخی گرنگە پشت بە بەردی داتاشراو دەبەستێ. ئەو بەردانەی لە شێوەی جیاوازەوە دەتاشرێن، لە بواری هەمەجۆردا بەكار دەهێنرێن. لەمیانەی ئەم ئامرازانەوە هەنگاو بۆ شۆڕشی كشتوكاڵی وماڵیكردنی ئاژەڵ هاوێشتراوە. بەرد لە كێڵانی خاك و بۆ خۆپاراستن لە بەرامبەر گیانلەبەرە دڕندەكان وەكو چەك بەكارهێنان، ئاواكردنی خانو و كون كردن و بڕین دا، وەكو ئامرازێكی سەرەكی رۆڵ دەبینێ. مس كانزای هەرە سەرەكییە كە دەكرێت بە ئامرازی تیژ و لەجیاتی تەور و گاسن بەكاری دێنن، یاخود دەیكەن بە قاپ و قاچاخ و چەك. هەربۆیە بە چاخی مس ناوزەد دەكرێت. لە كاتێكدا چاخی نئۆلیتیك نزیكەی ساڵانی ١٠٠٠٠ تاوەكو ٣٠٠٠ پ.ز دەگرێتەوە، چاخی مسیش لە ماوەی ٣٠٠٠ تاوەكو ١٠٠٠ ی پ.ز دەگرێتەوە. چاخی ئاسن، گوزارشت لە قۆناخێكی پێشكەوتوتر دەكات و پشت بەو ئامرازانە دەبەستێ كە لە كانزای ئاسن دروستكراون. ئەو ئامرازانەی لە ئاسن دروستی دەكەن رۆڵێكی باڵا لە كشتوكاڵ و پیشەكاری و سەربازیدا دەبینن. ئامرازە ئاسنینەكان یەكێكە لە كۆڵەكە گرنگەكانی بەرز كردنەوەی مێژووی مرۆڤایەتی. لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز تاوەكو رۆژگاری ئەمڕۆمان گرنگی و بایەخی خۆی پاراستووە و وەكو باڵاترین كانزا درێژەی بە رۆڵی خۆی داوە. لەپێشكەوتنی سەرمایەداریشدا وەكو گرنگترین ئامراز درێژە بە رۆڵ و پایەی خۆی دەدات. دەزگای ئاسنین، گاسنی ئاسن و زرێپۆشاكی ئاسنین نزیكترین یارمەتیدەری پیشەكاران و جووتیاران و سەربازەكانن، واتا ئامرازی دەستیانن.

لەگەڵ ئەوەی كە بە گوێرەی چاخەكان بەم شێوەیە دەستنیشان دەكرێت، تەكنیك (ئامێر) هەر لە سەرەتاوە تاوەكو رۆژگاری ئەمڕۆمان وەكو زنجیرەیەكی هێڵكاری، درێژەی بە پەرەسەندنی خۆی داوە؛ لەمیانەی تەكنۆلۆژیای ئەتۆم و خۆزا (فچاو) گەیشتۆتە ئاستی لوتكە. لە سیستەمی سەرمایەداریدا سەبارەت بە ناوەڕۆكی تەكنۆلۆژیاش، شۆڕش ئەنجام دەدرێت. بە تایبەتی كەوتنە گەڕی ئامێرە میكانیكییەكان، گرێدراوی سەرمایەدارییە. ئەو قۆناخەی بە ئامێری هەڵمی و خەڵووز دەستیپێكرد، هەرەس ئاسا رێگای لەپێش چاخی تەكنۆلۆژیا كردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەی شێوازی بەرهەمهێنان رۆڵێكی دیاریكراوی لە شۆڕشی تەكنۆلۆژیدا هەیە، ئەوا شۆڕشی زانستیش رۆڵێكی دیاریكراو دەبینێ. زانست و تەكنۆلۆژیا كە تاوەكو ئەو سەردەمە بە شێوەیەكی جیا پێش دەكەوتن، ئیتر پێبەپێ بەناو یەكدا دەچێ، یەكدی تێردەكەن. هەروەكو چۆن زانست رێگا لەپێش چەندین ئامێری نوێ دەكاتەوە، ئەوا تەكنۆلۆژیاش دەبێتە چاوگی ئیلهامی چەندین پێشكەوتنی زانستی، وەكو ئامرازێكی تاقیكردنەوە خزمەت دەكات. وەرچەرخانی شۆڕشی سەرمایەداری بۆ شۆڕشی تەكنۆلۆژی پەیوەندی بەو مەودا زۆرەوە هەیە كە زانست بڕیویەتی. بۆ یەكەمین جار تێركردن و تەواوكردنی یەكدی لەلایەن زانست و تەكنۆلۆژیاوە، لە پێكهاتەی بەرهەمهێناندا رێگا لەپێش تەڤینەوە دەكاتەوە؛ وزە شاراوەكانی سروشت بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی دەكاتەوە. وزەی ئەلەكترۆنی و ناووكی ئەتۆمیشی دۆزیوەتەوە و لەگەڵ وزەی (با) و ئاو خستۆیەتیە خزمەتی مرۆڤایەتییەوە. لەمیانەی تەكنۆلۆژیای جینۆلۆجیا دەست لە جیهانی زیندەوەران دەدات و هەوڵ دەدات موعجیزەی نوێ بخوڵقێنێ.

گرنگترین رەخنە كە سەبارەت بە تەكنۆلۆژیا بكرێت ئەوەیە، لە كۆنترۆڵ دەربكەوێت و ببێتە دڕندەیەك. هەر لە ئێستاوە پشتبەستنی زێدەڕۆیانە بە تەكنۆلۆژیا رێگای لەپێش چەندین نەخۆشی كردۆتەوە كە هەڕەشە لە ژیانی مرۆڤ دەكات؛ مرۆڤی رووبەڕووی مەترسی لەدەستدانی تایبەتمەندێتییە سروشتییەكانی خۆی كردۆتەوە. بەئەندازەی تاكڕەوێتی بەردەوام ئەو لایەنانەی پێشدەكەوێت كە هەڕەشە لە ژیانی كۆمەڵگا دەكات. بۆیە هێندەی مرۆڤی تاكڕەو كۆنترۆڵكردنی شێوەكانی یاخود لایەنە زیانبەخشەكانی تەكنۆلۆژیا و دانانی سنووری ئەخلاقی بۆیان ناچارییە.

بە كورتی لە مێژووی بەرهەمهێناندا لەگەڵ كەوتنەگەڕی شێوەی بەرهەمهێنانی بە ئامێر و تەكنۆلۆژیا رێگا لەپێش گەورەترین گەشەكردن دەكاتەوە. بە ئەندازەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی شارستانییەتی سەرمایەداری لەمیانەی پێكهاتەی بەرهەمهێنانییەوە لە نێو مێژووشدا گوزارشت لەو لوتكەیە دەكات كە بە شێوەیەكی چڕوپڕ بەرزدەبێتەوە. ئیتر لەجیاتی كێشەكانی بەرهەمهێنان، كێشەكانی بەكاربردن دەردەكەوێت. لەو كۆمەڵگایانەی سیستەمی سەرمایەداری تێدا باڵادەستە، بەرهەمی زیادە كێشەی جددی دەخوڵقێنێ. لە كاتێكدا لە رابردوودا كێشەكان سەرچاوەی خۆیان لە بەرهەمی زێدە دەگرت، دواتر كەمی و سنوورداری بەكار بردن دەبێتە سەرچاوەی كێشەكان. زیاد بوونی دەرفەتەكانی بەدەست هێنانی كەرەستەی خاو و بازاڕەكانی دەرەوە بۆ بەرهەمهێنان، پێشكەوتنی زیاتری سیستەم لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هەرزان بوونی بەرهەمەكانیش، رۆڵێكی گرنگی لەپێشكەوتنەكاندا هەیە. دەتوانرێ بگوترێ لەگەڵ ئەوەی سەرمایەداری بۆ یەكەمین جار دەرفەتی ئەوەی بۆ مرۆڤایەتی رەخساند بە چاوگە بێ كۆتاییەكانی بەرهەمهێنان لە سەرووی هەمووشیانەوە بە وزە بگات، بەڵام لەبەر ئەوەی سیستەم پشت بە چەوسانەوەیەك دەبەستێ كە لە شێوەی قازانجە، ئەم وزە و توانایە لەكار دەخات. واتا پەیوەندییەكانی بەرهەمهێنان كەوتوونەتە نێو رەوشێك، هێزەكانی بەرهەمهێنان سنووردار دەكات. شێوەی موڵكایەتی كە لەسەر تەكنۆلۆژیا هەیە، بە ئامانجی بەدەست هێنانی زۆرترین قازانج، بەرهەمێكی بێ سنوور و بێ بایەخ دەكاتە ناچارییەك. كاتێك پێویستییە ژیانییەكانی مرۆڤ لەگەڵ یاسای زێدەترین قازانج ناكۆك بێت، یەكسەر بەجێ دەهێڵدرێ و روو لەم بوارانە دەكرێت كە زیاترین قازانجی لێدەكەوێتەوە. جارێكی دیكە مرۆڤایەتی دووچاری رەوشێكی بەمجۆرە دەبێت كە ئەو توانست و تواناكارییانەی بە دەستیەوەیە نەتوانێ بە پێی داخوازییەكان و خزمەتكردنی خۆی بەكاری بێنێت، بەڵكو بە گوێرەی هەوەس و ئارەزووی خاوەن قازانجەكان دەستنیشان دەكرێت.

سەرباری ئەم خراپییانەشی، سیستەمی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەمیانەی سەلماندنی باڵابوونی خۆیەوە لە لوتكەی مێژووی مرۆڤایەتیدا جێگیر بووە. كاتێك هزری زانستییانە، رۆحی كەسێتی تاكی خوڵقكار و ئەو لایەنانەی كە مرۆڤ رادەكێشێتە پێش، خۆ سەلماندنی لە بواری بەرهەمهێناندا لە یەك بۆتەدا بە یەكتر بگەن، ئەوا باڵابوونی كۆمەڵگای سەرمایەداری راستییەكی حاشاهەڵنەگرە. سەرمایەداری لەمیانەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی و شێوەی بەرهەمهێنانی، كە ناسنامەی ماددییەتی، زۆر لەو سیستەمانەی پێش خۆی لەپێشترە.

پەیوەندی پێکهاتەی بەرهەمهێنان کە لەگەڵ دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیا بەربڵاو ببوو، لە بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتیشدا ڕێگا لەپێش سەراوبن بوونێکی گەورە دەکاتەوە و دەزگای سیاسی و کۆمەڵایەتی بە گوێرەی پلە و پایەی خۆیان پێك دێنن. لەگەڵ ئەوەی کە ستاتۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی، زیاتر بە شێوازی پلە بە پلە دەستنیشان دەکرێت، بەڵام هەڵوەستەی زۆر و وشك و موحافەزەکارانەی ستاتۆی کۆن، ئەوە دەکات بە ناچارییەك کە لەمیانەی کرداری شۆڕشگێڕانە پارچە بکرێ و تێك بشکێنرێ. قۆناخەکانی شۆڕشی سیاسی و کۆمەڵایەتی زیاتر لەو رەوشانەدا دەبێت بە رۆژەڤ، کە ستاتۆی کۆن هەموو جۆرە هەوڵێکی گۆڕانکاری پلە بە پلە (تدریجی) رەت بکاتەوە و نەهێڵێ بە قۆناخی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەدا تێپەڕ بکرێت. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا قەیرانی کۆمەڵایەتی قووڵ دەبێتەوە. لە راستیدا قەیران ئەو قۆناخەیە کە، ئایدیۆلۆژیا و دەزگا کۆنەکان کورت دێنن و تێر ناکەن و قۆناخی پەڕینەوەیە بەرەو ئاواکردنی ستاتۆی بە دەزگا بوون و ئایدیۆلۆژیای نوێ. لە هەموو ئاست و بوارێکدا گوزارشت لە رەوشی ململانێ و کێشمەکێشی کۆن و نوێ دەکات. لە لایەکەوە ڕێگا لەپێش رزانی کۆن دەکاتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە نوێیەکە چەکەرە دەکات و هەوڵی پێشکەوتن دەدات. قۆناخ کارەکتەرێکی بەمجۆرە دەردەخاتە پێش، کە رەوشی پێکدادانی شۆڕش و دژە شۆڕش سەنگین بێت. لە کاتێکدا لە ئەنجامی سەرکەوتنی دژە شۆڕشدا رژێمێکی توند و ستەمکار پیادە دەکرێت، ئەوا لە حاڵەتی سەرکەوتنی شۆڕشدا سیستەمی نوێ بە خێرایی شێوە دەگرێت. لە گەوهەر و شێوەگرتنی بە دەزگا بووندا ئەو گۆڕانکارییانە زاڵ دەبن کە زیاتر لەگەڵ شێوازی ماددی و ئایدیۆلۆژی بگونجێن و لە خزمەتییاندا بێت. گەڵاڵە نامە ئایدیۆلۆژییەکان لەمیانەی بە دەزگا بوونەوە، بوونە خاوەنی ستاتۆیەکی فەرمی. هەرچی شێوازی بەرهەمهێنانە لە ژێر سایەی هێزی بڕیار و بەڕێوەبردنی دەزگاکان دەبێتە خاوەنی پێکهاتەیەکی بە پیت و خێراتر. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا زیاتر دەرك بەوە دەکرێت کە دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بە تەنیا هیچ واتایەکیان نییە و ئەو ستاتۆیەی لە ئەنجامی کاریگەری باڵای خوڵقێنەرانەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی، لە ژێرەوەش فشاری هەلومەرجە ئابوورییەکان پێك دێت، گوزارشت لە بوێری دەوڵەت دەکات. لە راستیدا دەوڵەت بۆخۆی ئامرازێکی بێ لایەنە؛ لە ژووردا لەلایەنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژییەوە، لە ژێرەوەش لە ژێر کاریگەری دژواری هێزی باڵادەستی ئابووری دایە. ئەو ڕێککەوتنەی هێزی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژییانە دەبەستێ کە بە گوێرەی پەیوەندی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەبینێ شێوەی نوێی دەوڵەت دەخوڵقێنێ؛ لە کاتێکدا شێوەی پێکهاتە کۆن و نابەجێیەکان دەڕووخێنێ، هەوڵ دەدات شێوەی نوێی دەزگایەك پێك بێنێت و مۆری خۆی لێبدات. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا کاتێك شێوەی نوێی دەوڵەت لەمیانەی بنەما کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانەوە، گوزارشتە ئایدیۆلۆژیاکانی فەرمی دەبێت، دەبێتە هێزی یاسایی باڵادەستی سیستەمی تەواوی کۆمەڵگا و لە ڕێگای پڕوپاگەندەیەکی چڕوپڕەوە لەلایەن تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگا پەسند کرا و رەوا بوونی پێدرا. وەکو باڵاترین ئۆرگان پیرۆز دەکرێ و لە ژێر ئاڵاکەیدا بە ئامادەباشی سڵاو دەکرێت. نوێ بوونەوەی تەواوی کۆمەڵگاکانی چینایەتی، بە قۆناخی بەمجۆرەدا دەرباز دەبن. لۆژیك هەمان لۆژیکە. شێوە گرتن بە گوێرەی کات و شوێن دەگۆڕدرێت.

کۆمەڵگای چینی سەرمایەداری بە گشتی پشت بە تەواوی توانستەکانی شارستانییەت دەبەستێ و لە نێو ئەو هەلومەرجانەی کە ئایدیۆلۆژیای دەرەبەگایەتی و هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنانی تێری نەکرد و کورتی هێنا، لە ڕێگای پێشکەوتنی پلە بە پلە (تدریجی) توانستە گەوهەرییەکانی خۆی، بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن پێش دەخات. هەڵوێستی موحافەزەکارانە و درەنگ کەوتنی ریفۆرمی رژێمە پادشاییە مۆنارشیەکان ڕێگای لەپێش ئەوە کردەوە، لە ساڵانی ١٦٤٠ ی سەدەی حەڤدەهەم لە ئینگلتەرا، سەدەی هەژدەهەم لە ساڵی ١٧٨٩ لە فەرەنسا، لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم لە چەندین وڵاتی ئەوروپا و جیهان ڕێگا لەپێش ئەو رووداو و دیاردە خوێناوییانە بکاتەوە کە بە شۆڕش ناودەبرێن. ئەو شۆڕشانەی لە ژێر ڕێبەرایەتی چینی بۆرژوا ئەنجام دران، تا رادەیەکی مەزن گەوهەر و شێوەی شارستانییەتیان گۆڕیوە. کەواتە ئەو چینە کۆمەڵایەتیە نوێیەی بۆتە خاوەن کەسایەتی، رۆڵی راستەقینەی خۆی لەوە نیشان دەدات کە دەزگا سیاسییە تایبەتییەکانی خۆی بخوڵقێنێ. بە واتایەکی دیکە سەلماندنی کامڵ بوونی چینی نوێی کۆمەڵایەتی لەگەڵ بوون بە خاوەنی دەوڵەت مسۆگەر دەبێت. ئەو چینە کۆمەڵایەتیەی نەبووبێتە خاوەن دەوڵەت، ناسنامەکەی جێگای گفتوگۆیە. راستتر بڵێین دوودڵ و بێ بڕیارە و لە نێو ستاتۆیەکی کاتی دایە. یان ئەوەتا زاڵ دەبێت و دەکەوێتە رەوشی چینێکی سیاسی فەرمی، یاخود دەکەوێتە نێو رەوشی چینێکی ژێر و ئاراستە کراو و بە گوێرەی بەرژەوەندی سیستەمی فەرمی بەکار دەهێنرێت. ئەو چین و توێژانەی بە رادەیەکی هەرە زێدە رۆڵ لە بەرهەمهێناندا دەبینن، وەکو چین و توێژە سەرەکییەکانی سیستەم سەرلەنوێ لە پێگەکاندا ڕێك دەخرێنەوە. هەرچی چین و توێژە کۆنەکانن، پێبەپێ دەکەونە رەوشی بێ کاریگەری و مارژینالەوە.

وڵات، نەتەوە، کۆمار، هاووڵاتێتی، علمانییەت، دیموکراسی، یاسا و مافەکانی مرۆڤ، لە سەرووی ئەو دەزگایانەوە دێت کە لەگەڵ گەشەکردنی شارستانییەتی سەرمایەداری بایەخیان پەیدا کرد و گۆڕانکاری گرنگ لە ناوەڕۆکەکەیاندا هاتە ئاراوە. لەمانەش زاراوەی مافەکانی مرۆڤ رۆژ بە رۆژ ڤەبوونی نوێ ئەنجام دەدات و بەرفراوان دەبێت. ئەم واتایەی کە تەواوی ئەم زاراوانە لە قۆناخەکانی دەستپێك و پێشکەوتندا گوزارشتیان لێدەکرد، لە هەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا تێپەڕ کراوە و بە واتای نوێتر گەیشتووە.

لە نزیکەوە بینین و ناسینی ئەو زاراوە سەرەکی و دەزگاکانیان لەلایەن ژیانی کۆمەڵگاوە، تێگەیشتن و دەرك کردن بە کۆمەڵگای سەرمایەداری سانایی دەکات.

١ ـ وڵات؛ ناوێکە لەو جوگرافیایە دەنرێت کە سیستەمێکی کۆمەڵگا تێیدا دەژیت توێژەکانی ئەو کۆمەڵگایە لە یەك دەچن و پەیوەندی ئۆرگانییان بە یەکەوە هەیە، لەبەر ئەوەی هەر وەکو چۆن توانستەکانی رابڕدووی تێدایە، ئەوا ئومێدەکانی داهاتوو و دەوڵەمەندی لەخۆوە دەگرێت، هەربۆیە پێیەوە گرێدراون. لە سیستەمی کۆمۆنەی سەرەتاییدا زاراوەی وڵات پێش نەکەوتووە. لەبەر ئەوەی بەردەوام بە دوای ئەو بوونەوەرانەدا رایکردووە کە راو دەکرێن و کۆدەکرێنەوە، کۆمەڵگا پێویستی خۆ گرێدان بە هیچ شوێنێك نابینێ. هەربۆیە زاراوەی وڵات، هەرێم، دەرناکەوێت. لەبەر ئەوەی هێشتا بەهای بەمجۆرە پێك نەهاتوون کە ژیانەکەی بە خۆیەوە گرێ بدات، ئەوا دیاردەیەکی قاڵ بۆوە و بە دەزگا بوونی وڵات پێش ناکەوێت. لەگەڵ شۆڕشی کشتوکاڵیدا ژیانی گوندی نیشتەجێ سەرهەڵدەدات و ئەمەش بە یەکەوە بوونێکی زیاتر لەگەڵ خاکدا دەکاتە ناچارییەك. ئیتر خاك بۆ ژیانی کۆمەڵگا دەبێتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو. دانەوێڵە چاندراوەکان و ئاژەڵەکانی ماڵی دەکرێن بەهای ئەو شوێن و خاکە زیاتر دەکات. ئەو جڤاتانەی لە دەوروبەری دایکدا کۆبوونەتەوە، شان بە شانی ئەمە بە خاکیشەوە گرێ دەدرێت کە خاوەنی هەمان تایبەتمەندێتی خوڵقاندن (زاوزێ)یە. دایك ـ خاك لە یەك دەچوێنرێت. لەگەڵ زیاد بوونی ژمارەی جڤاتەکان، ئەو شوێنانەی کە گوندەکانی لێیە دەبێتە شوێنێکی تایبەت. هێواش هێواش زاراوەیەك لە هزردا دەچەسپێ و بەبێ ئەو ناتوانن بژین. بیرەوەری هاوبەش، هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنانی ماددی و خەیاڵەکانی داهاتوو ئەو جوگرافیایە پیرۆز دەکرێت کە تێیدا دەژین. بەمجۆرە پێکهاتنی زاراوەی، هەرێم، وڵات، مەملەکەت دەبێتە راستینەیەك. وڵات دەبێتە پارچەیەکی جیا نەکراوەی ژیانی ماددی و مەعنەوی کۆمەڵگا.

لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتیدا پێشکەوتنەکان لەم بوارەدا زیاتر پەرەیان سەند. دەرکەوتنی پەرستگای پیرۆز، شار، موڵکایەتی، بازرگانی و ئامرازی دەوڵەت کە بەڕێوەبەرێتی هاوبەشی هەموویانە، ڕێگا لەپێش زاراوەی سنوورەکانی ناوەوە و دەرەوە دەکاتەوە کە پێویستی بە بەرپرسیارێتی هەیە. لە کاتێکدا سنوورەکانی ناوەوەی کۆمەڵگا بە تەواوی بە هی خۆی دادەنێت، سنوورەکانی دەرەوە بە هی بیانییەکان دەبینێ. بەمجۆرە لە کاتێکدا ئەو پارچە خاکەی سنوورەکەی دیاریکراوە و لە ژێر فەرمانڕەوایەتی دەوڵەت دایە بە زاراوەی وڵات ناو دەبرێت، ئەوا ئەوانەی دەرەوەی سنووریش بە خاکە بیانییەکان ناو دەبرێت. لە سەردەمی سۆمەریەکاندا زاراوەی وڵات مەودایەکی باش دەبڕێت. تەنانەت لە ژێر ناوی "دیلمۆن" بۆ زاراوەیەك بەرز دەکرێتەوە کە بە بەهەشت دەچوێنرێ. لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا "دیلمۆن" واتای وڵاتی بەهەشتە. لەم رۆژە بەدواوە ئەم زاراوەیە بایەخ و گرنگی خۆی پاراستووە و بەردەوام بووە. هیچ کۆمەڵگایەك بە ئەندازەی سۆمەریەکان لەوەدا سەرکەوتوو نەبوون کە شار و خاکەکەی خۆیان مەزن بکەن. وەکو دیارە بۆ یەکەمین جار ئاواکردنی ژیانی شار و بەرهەمی هەمەجۆر و بە پیت و زێدە رۆڵێکی دیاریکراوی لەمەدا هەیە. بەرامبەر بەمەش، بێ وڵاتبوون یاخود تێکچوونی وڵات و داگیرکردنی بە گەورەترین کارەسات دادەنرێت.

سۆمەریەکان بە ئێش و ئازارترین لاوك و داستانی خۆیان لە کاتی رووخانی شارستانییەتی شارەکان پێشخستووە. لە داستانی وڵات گەوهەری هەموو داستانەکان پێکدێنێ و تاکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان وەکو رەسەنترین شاکاری ئەدەبی دەناسرێن.

دووەمین قەڵەمبازی مەزن سەبارەت بە زاراوەی وڵات، نیشتیمان، لە هەلومەرجەکانی لە دایکبوونی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا دەبینین. یۆتۆپیای "تۆماس مۆرە" و وڵاتی رۆژی "کامپانێلا"، بانگەشەی بەمجۆرە زیندوو دەکەن کە لە ژێر سێبەری ئەو دۆگما ئایینییانە رزگار بن کە بە درێژایی چەرخەکان ژیانی دونیای کردبوو بە دۆزەخ و وەکو گۆڕەپانێکی تاوانکاری هەڵیدەسەنگاند، ئەم دونیایە و کۆمەڵگاکانی لە ناویاندا دەژین بۆ ژیانێکی نموونەیی وەرچەرخێنن. سەرباری ئەوەی هەر دوو رۆشنبیریش لە نێو ئێش و ئازارێکی گەورەدا ژیان، بەڵام هیچ قەرەبوویەکیان لە یۆتۆپیا نوێیەکانی مرۆڤایەتی نەدا. بە دونیایی بوون و ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی نموونەیی و ئازادی تاك، لە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی رێنسانسدا بە ناو یەکتردا چوون. جارێکی دیکە خەیاڵی بەهەشت بۆ دونیا دەگەڕێتەوە. بە ئەندازەی سۆمەریەکان بەرامبەر بە ژیان بە جۆش و خرۆش بوون و رەوشی شاعیریان پێشکەوتوە.

بە دەزگا بوونی دەوڵەت و پێکهاتەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای سەرمایەداری زاراوەی وڵات بەرجەستەتر دەکات. کاتێك رەوشی بازاڕی نەتەوەیی و زمانی هاوبەش و وشیاری مێژوویی لە نزیکەوە بە زاراوەی نیشتمان پەیوەندیدار دەبن، کێشەکانی سنوور زیاتر تەشەنە دەکەن. تەنانەت لەپێناو "بستێك خاکی نیشتیمان" بیر لە هەڵگیرساندنی شەڕ دەکرێتەوە. لە دەوری تەوەرەی قازانج کردندا هەلومەرجەکانی سەرمایەداری پێبەپێی دەبێتە خاوەن کارەکتەرێك شەڕی نێوان وڵاتان دەورووژێنێ. کاتێك خاکی زیاتر بە واتای قازانجی زیاتر بێت، وڵاتپارێزی کە سەرەتا واتایەکی پیرۆزی هەیە، دەکرێت بە هەستێکی شۆڤێنی و پەلاماردەرانە و پاشڤەرۆ دەبێت و رێگا لەپێش چەندین شەڕی ناڕەوایانە دەکەنەوە. هەربۆیە زێدەڕۆیی سەرمایەداری سەبارەت بە زاراوەی وڵات، لەگەڵ دەمارگیری نەتەوە پەرستی، رێگا لەپێش خوێناویترین شەڕەکانی مێژووی شارستانییەت کردۆتەوە. بە گوێرەی هەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەرژەوەندی خۆپەرستانەی سەرمایەداری لەمیانەی پێشکەوتنێکی بە پێچەوانەوە، هەوڵ دەدات لە رێگای "بە جیهانی بوون" قەرەبووی بکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کۆمەڵگایانەی بە یەکەوە لە دەوری کولتووری هاوبەشدا ژیاون، بە هۆی دۆگماتیزمی چاخەکانی ناوین و شۆڤێنیزمی سەرمایەداری و داگیرکارییە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکان، دەرفەتی ئەوەیان پێنەدراوە تەواو بە زاراوەی وڵاتێکی ئازاد بگەن. ژیانی ئازاد لە وڵاتێکی ئازاد وەکو ئامانجێکی ژیانی لە نێو رۆژەڤیان دایە. ژیانی ژێر دەستی بیانیان و بێ وڵاتی دەبێتە سەرەکیترین هۆکاری نەفرەت لێکردن؛ رێگا لەپێش بێ ئابڕوویی و هزری چەواشە یاخود بێ هزری دەکاتەوە، بەمجۆرە رۆحە پەرێشان بووەکان بەدوای ژیانێکی کوێرانە و هیچ و پووچی ئارەزووەکان دەکەون و بێ رەچەڵەك دەمێنن و بەرەو لە ناوچوونیان دەبات.

٢ ـ زاراوەی نەتەوە، دیارییەکی کۆمەڵناسی و زاراوەیەکە، لە هەلومەرجەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا بە رادەی هەرە زێدە پێش دەکەوێت. بە گوزارەیەکی دیکە، پێشکەوتنی پەیوەندییە نەتەوەییەکان وەکو دیارییەکی سۆسیۆلۆژی و ئاکامی وشیاری بە نەتەوە بوون، دەبێتە سەرەکیترین تایبەتمەندێتی کۆمەڵگای نوێ. سەرمایەداری لە تەواوی شێوەی کۆمەڵگاکانی دیکە زیاتر سەبارەت بە وشیاری نەتەوە و بە تایبەتیش پێشخستنی قەوارەکەی خاوەن رۆڵە. نەتەوە بۆ یەکەمین جار پێشکەوتنی راستەقینەی خۆی لە باخی سەرمایەداریدا بینیوە.

سەرەکیترین هەستی خۆمالیی لەجیاتی جێگرتن لە هەمان ئاییندا، بۆ جێگرتن لە هەمان نەتەوە گۆڕاوە. پەیوەندییە نەتەوەییەکان دەرکەوتۆتە پێش و پەیوەندییە ئایینیەکانیش کەوتۆتە پیلان و ریزی دووەمەوە. دەمارگیری نەتەوەیی جێگای دەمارگرژی ئایینی گرتۆتەوە. پێشکەوتنی نەتەوەیی؛ لە شکاندنی لەمپەرەکانی دەرەبەگایەتی، لاوازکردنی چەمکی ئۆمەتی دەرەبەگایەتی و پێشخستنی وشیاری کولتووری و مێژوویی هاوبەش، رۆڵێکی پێشکەوتوخوازانەی بینیوە. رۆڵی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەمەدا، ئەرێییە. بەڵام کاتێك بەرەو جودا بوون دەخشێت و هەروەکو بڵێی شێوەی ئایینێکی نوێ وەردەگرێت، بەرەو پاشڤەڕۆیەتی چووە. نەتەوە پەرستی شۆڤێنی لەمیانەی چەمکێکی باڵابوونی ناواقیعی بەسەر گەلانی دیکە و راستیدا، بناخەی دوژمنایەتییەکی نوێی داناوە. شەڕە نەتەوەییەکان جێگای شەڕە ئایینی و ئایینزاییەکانی پێشووی گرتەوە. چینی سەرمایەدار بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بشارنەوە و نیگاکان بۆ لای دیکە بڵاو بکەن، هەروەکو تەواوی چینە دەسەڵاتدار و چەوسێنەرەکانی دیکە پەنا دەبەنە بەر لەیستۆکی لادان و چەواشەکانی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی. چەندە ململانێی چینایەتی دژوار بێت، ئەوا ئەم لەیستۆکە زیاتر و چڕتر بەکار دەهێنرێ. دەمامکەکانی لەیستۆکە نوێیەکان لەجیاتی دیمەنە خودایی و ئایینیەکان، دەمامکی نەتەوە و قارەمانە نەتەوەییەکان بەکار دەهێنرێ و درێژە بە گەمەکان دەدرێت.

هەرچی ئەو گەلانەن کە بە ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان نەگەیشتوون، لەمیانەی وشیاری نەتەوەیی و هاوکارییەوە دەتوانن هەنگاوی باشتر بەرەو ئازادی بهاوێژن. بە شێوەیەکی گشتی زێدەڕۆیی و دەمارگیری نەتەوەیی ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە کە ئایین لە ژیانی تاکە کەسدا هێشتوویەتییەوە و لەمیانەی رێخۆشکردن لەپێش هەستە شۆڤێنییەکان، تاوەکو دوایی رۆڵێکی نیگەتیڤانە دەبینێت. بە تایبەتیش کاتێك ئەم رەوشە لە سەدەی بیستەمدا زۆر گران دەبێت، وەکو سەرەکیترین خۆراکی ئایدیۆلۆژی شەڕە خوێناوییەکان، پارچە بوون و نەژاد پەرستی و کین لە جیهانی مرۆڤایەتیدا دەخولقێنێ، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ژەهرخوارد دەکات و هەڵوێستێکی دژ بە مرۆڤپەروەری (هۆمانیزم) پێش دەخرێت. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینرێ کە ئیتر نەتەوە پەرستی بووە بە نەخۆشییەك.

مەیلێکی دیکەی لەگەڵ دیاردەی نەتەوە پێشکەوت، چەمکی دەوڵەتی نەتەوەییە. دەوڵەتی نەتەوەیی دیاردەیەکە لە گەوهەری خۆیدا هەبوونی نییە. هەروەکو چۆن ناشێ دەوڵەتی گشت کۆمەڵگا هەبێت، ئەوا ناشێ دەوڵەتی تەواوی نەتەوەیەکیش هەبێت. دەوڵەت زیاتر مۆرکی ئەو چینە سیاسی و کۆمەڵایەتیەی پێوەیە کە پایەی کارگێڕییان هەیە. لە سەرەتادا کاتێك بەرژەوەندی تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی لە بۆتەی دژایەتیکردنی مۆنارشییەتی نوێنەری چینی کۆن کۆ دەبێتەوە، لە رووخسار و بە شێوەیەکی رێژیی دەشێ باس لە دەوڵەتی نەتەوەیی بکرێت. بەڵام کاتێك جیابوونەوەی بەرژەوەندییەکانی تیژ و دژوار دەبێت، دەوڵەت لە نەتەوەیی بوون دەردەچێ؛ دەبێتە ئامرازی فشار و پاراستنی بەرژەوەندی چینی دەسەڵاتدار. زاراوەی نەتەوەش وەکو زاراوەی ئایین چەندەی یاری لەسەر بکرێت، زیاتر دەبێت بە دەمامکێکی رووتی شاردنەوەی بەرژەوەندییە ماددییەکان.

٣ ـ کۆمار، ئالآیەکی دیکەی گرنگە، کە چینی بۆرژوا لە ژێر ناوی تەواوی نەتەوە، لەپێناو رووخانی مۆنارشییەتی دەوڵەتی دەرەبەگایەتی دەیشەکێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەی وەکو زاراوە بە واتای بەڕێوەبەرایەتی گەل دێت، هیچ کاتێك پێشکەوتنێکی بە گوێرەی گەوهەرەکەی بەخۆوە نەبینیوە. بەڵام دیسان کاتێك لەگەڵ رژێمە ئۆلیگارشی و دیکتاتۆری و پادشایەتییەکان بەراورد بکرێت، سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتە کە لە هەموو چاخێکدا خزمەتی بە پێشکەوتنی کۆمەڵگا کردووە. رژێمە کۆمارییەکان کە لە چاخەکانی سەرەتا و ناویندا لە ناوچەیەکی سنووردار و قۆناخێکی تەنگدا دەرفەتی پراکتیزەکردنی بۆ رەخسا، بەڵام لەگەڵ داگیرکاری فەرەنسا، پێشکەوتنێکی سەرەکی بەخۆیەوە بینی.

لەبەر ئەوەی لە ئاستی هەرە بەرزدا تەواوی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی راکێشایە نێو گفتوگۆی سیاسی و ناچاری ئاواکردنی پارتی تایبەت بە خۆیانی کرد و هانی دان بۆ فێر بوونی هزری رامیاری، تا دوایی پڕ لە پەند و ئەزموونە. رەوتە کۆمارییەکان دژی بەڕێوەبەرایەتییە ئۆلیگارشی و دیکتاتۆری و مۆنارشیەکانە. لەم بوارەدا نوێنەرایەتی پێشکەوتنی شۆڕشگێڕی و دیموکراسییانە دەکات. لەلایەنی ئایدیۆلۆژیشەوە علمانییەت بەرامبەر هەر دۆگماتیزمێکی ئایینی بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی دونیایی و رۆشنبیری بە بناخە دەگرێت. بەرامبەر بە تاریکی چاخەکانی ناوین، پشت بە رێنسانس و ریفۆرم و رۆشنگەری زانستی دەبەستێت. سەرباری ئەوەی لەمیانەی ئەم ناوەرۆکەیەوە دەبێتە دەزگایەکی سیاسی زۆر گرنگ، لە لایەکەوە بەرژەوەندی خۆویستانەی چینی سەرمایەداری، لە لایەکی دیکەشەوە پەسەند نەکردنی هاوبەشێتی و بەشداریکردنی چینە رەنجدەر و کارکەرەکان، پێشکەوتنی لایەنی دیموکراسیانەی دەوەستێنێ و دەیکات بە ئامرازێکی موحافەزەکار و بێ ناوەڕۆك. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەو سیستەمانەی کە بە وتە، خۆیان بە کۆماری لە قەڵەم نەدەن هێندە کەم بوون کە دەتوانرێ بگوترێ نەماوە. بەڵام ئەو رژێمەی بە رادەیەکی هەرە زێدە لە گەوهەری خۆی دابڕاوە کۆمارییە. مەزنترین مەترسی بۆ کۆمار ئەوەیە بکەوێتە رەوشی ئامرازێك لە شێوەی دەوڵەتی کۆن

جیاوازتر نەبێت. تەنیا وەکو ئامرازێکی لێنایەت کە خۆ پەرست و دژی بەرژەوەندی نەتەوە بکەوێتەوە و بەرژەوەندییە تەسکەکانی چینێك بشارێتەوە؛ دەبێت بە ئامرازێکی خەڵەتاندن کە زیاتر لە ژێر کاریگەری و سەر بە دەسەڵاتی دەستەیەکی تەسکی ئۆلیگارشی دەجوڵێتەوە. تەنانەت سەرەڕای ئەوەی چەندین دیکتاتۆر هەناسەیان لەبەر کۆمەڵگا بڕیوە، هیچ زەحمەتی و تەنگەتاوی نابینن لەوەی خۆیان وەکو سەرۆك کۆمار پێشکەش بکەن.

تەواوی ئەم فاکتەر و هۆکارانە ئاماژە بەوە دەکەن، ئیتر کۆمار بۆتە رژێمێکی قەیراناوی. دەشێ پێشکەوتنی پێودانگەکانی دیموکراسی، کۆمار لەو قەیرانە رزگار بکات کە تێی کەوتووە.

٤ ـ زاراوەیەکی دیکەی بایەخی پەیدا کردووە هاووڵاتێتیە. ئەگەر لە نێو پێشکەوتنە مێژووییەکاندا سەیر بکرێت دەبینرێ کە تاك لە ئەندامێتی یەکەمین تیرەوە تاوەکو بە ئەندام بوون لە دەوڵەتی شار، لەوێشەوە بەرەو هاووڵاتییەتی ئیمپراتۆرییەت و ئەندامێتی لە ئایین و تەریقەتەکان؛ زیاتر لە نێو سیستەمی دەوڵەتی بۆرژوازیدا بە بەرفراوانترین پراکتیزەکردنی ئەندامێتیدا دەرباز بووە. ئەم زاراوەی بە شێوەیەکی چڕ و بەربڵاو وەکو هاووڵاتییەتی کۆمار بەکار دەهێنرێ، لە گەوهەری خۆیدا بە واتای ئەندامێتی دەوڵەتێك دێت. پێناسەی هەرە راستیش ئەمەیە. چونکە بوون بە ئەندامی خێڵێك، لە قەڵەمدان وەکو ئەندامی ئۆمەتێکی ئایینی و بوون بە بەندەی ئیمپراتۆرییەتێك لە هاووڵاتییەتی ناوەشێتەوە و شایستەی نییە. بچووکترین و نزمترین پێداویستی هاووڵاتییەتی ئەوەیە بە لانی کەم دان بە یەکسانی (دەستووری)دا دەنێت. لە ئەندامێتی تەواوی کۆمەڵگاکانی دیکەدا بە سانایی دان بەم یەکسانییەدا نانرێت. هەرچەندە گەوهەرەکەی لەسەر بنەمای ئازادی پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدیبێت، وەلێ هاووڵاتییەتی تا دواڕادە هەنگاوێکی پێشکەوتوخوازانە و پۆزەتیڤە. کێشە ئەوەیە ناوەڕۆکەکەی لە رێگای بەهاکانی کۆمارەوە پڕ بکرێتەوە. ئەمەش لە ئەنجامی خۆ پێگەیاندن لە بوارەکانی ئازادی تاکە کەس، رۆشنگەری و تەڤلی بوونی سیاسی بەدیدێت. دیموکراسی بۆ گەل و هاووڵاتییەتی ئازاد بۆ تاك، وەکو زاراوە لەپێشەوەی ئەو دەزگایانەوە دێت کە بایەخی سیاسی رۆژانەی زیاد بووە.

بە درێژایی مێژوو تەواوی دەسەڵاتەکانی کۆمەڵگا بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان سیاسەتێکی توانەوەیان لەسەر تاك پەیڕەو کردووە. ئامانج گونجاندنی تاکە بە گوێرەی یاسا و نەریتەکانی کۆمەڵگای خۆیان. لە میتۆلۆژیاکانەوە تا دەگاتە زیندانەکان، لە تەواوی بوارەکانی باوەڕییەوە تا دەگاتە دەزگاکانی سزا و ئەشکەنجەدان، ئامانجی سەرەکی ئەوەیە کە تاك بهێنرێتە سەر شێوە و داب و نەریتە خوازراوەکان و بەرێوەبردنیەتی. ئەو سیاسەتەی لە رێگای دەوڵەتەوە لە نێو هەلومەرجەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەسەر تاك پراکتیزە دەکرێت، زۆر ئاڵۆزتر بووە. تەنیا بە ئەرکەکانی سەربازی کردن و دانانی باج ناوەستێ کە لەپێش تاك دانراوە؛ بەڵکو ئایدیۆلۆژیایەکی فەرمییان بەسەردا دەسەپێنرێ کە لە دۆگما ئایینیەکان کەمتر نییە. دەخوازن هاووڵاتییەکی ساختە (دروستکراو) دروست بکەن کە پێشتر لە رێگای تواناکاریە تەکنۆلۆژییەکانەوە شێوەبەندی رۆحی و هزرییەکەی دیاریکراوە. ئەو بە دەزگا بوونەی بە کۆیلایەتی هاوچەرخ ناوزەد دەکرێت بەمجۆرە پێش دەخرێت. لە راستیدا ئەو قەڵەمبازەی تاکە کەس کە لە کاتی لە دایکبوونی سەرمایەداری ئەنجام دەدرێ و لە رێگای دۆگماکانەوە ناکرێت بە پاشکۆ، بە شێوازێکی تەڵەکەبازی و وردەکارییەوە پێچەوانە دەکرێتەوە. بە تایبەتیش لە سایەی تەکنۆلۆژیا دێوەزمەکەی گەیاندن، تاك و کۆمەڵگایەکی پاشکۆ دەخولقێنرێ کە لە هیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە. گەورەترین مەترسی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. تاکڕەوێتییەکی سەر شێتانە، دەخوازێ لەمیانەی پاشکۆیەتی سەر شێتی کۆمەڵگاوە، هاوسەنگ بکرێت.

گەورەترین گفتوگۆ و کێشەی سیستەمی شارستانییەتی سەرمایەداری بەخۆیەوە دەبینێ، لەو قۆناخەی هاوسەنگیدا روودەدات. ئایا تا چ رادەیەك هاووڵاتی دەتوانێ لە ناو سروشتی بوونی خۆی و زمان و کولتوور و باوەڕی و وشیاری مێژوویی و لەپێناو ئومێدەکانی ئاییندەیەکی ئازاد چارەنووسی خۆی شیبکاتەوە و دەرکی پێبکات؟ کۆمەڵگای فەرمی تا چ رادەیەك لەمیانەی قالبەکانی خۆیەوە دەسەڵاتداریێتی ئاوا دەکات؟ کۆمەڵگای مەدەنی، مافی مرۆڤ و رێکخراوەکانی ژینگە وەکو کۆمەڵە و رێکخراوەکانی دەرەوەی دەوڵەت کە لەم قۆناخەدا دەرکەوتوونەتە پێش، هەوڵ دەدەن پێناسەیەکی نوێ دەرهەق بە هاووڵاتێتی پێش بخەن. هەڵوەستەی تەریقەتە سۆفی گەراییەکان کە لە قۆناخەکانی بەمجۆرەی مێژوودا دەردەکەوتن، گوزارشت لە ناڕازی بوون بەرامبەر بە سیستەم دەکەن، دەشێ وەکو لێگەڕین بەدوای ستاتۆیەك هەڵسەنگێنرێن کە دەرفەتی هەناسەیەکی زیاتر بە تاك دەدات. ناسنامەی هاووڵاتێتی کە لە ژوورەوە لەلایەنی پێشکەوتوترین و بە بەرنامەترین دەسەڵات دەسەپێنرێ، لەگەڵ ناسنامەی هاووڵاتییەتی ئازاد لە نێو مشتومڕ و پێکدادانێکی گرنگ دایە کە کۆمەڵگای مەدەنی هەوڵی پێناسە کردنی دەدات، چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت ئەو ململانێیەیان رۆڵ و دەسکەوتیان بۆ لە دایکبوونی ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژییە هەبێت کە ئاراستەی پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ دیاری دەکات. بە تایبەتیش سەرنەکەوتنی گفتوگۆ و لێگەڕینە تەسکەکانی مارکسیزم کە زیاتر لە بواری ئابووری بوو، ئەوا کاتێك گفتوگۆکانی قۆناخی نوێ لە رێگای بەکارهێنانی ئامرازە پێشکەوتوەکانی گەیاندن و زانیاری پشت بە شیکردنەوەی تەواوی بوارەکانی کۆمەڵگا دەبەستێت، دەشێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ.

٥ ـ پرەنسیپی علمانییەت، گرنگترین پرەنسیپی شۆڕشگێڕی چینی بۆرژوایە، لەسەر بنەمای بە دونیابوون و رزگار بوون لە ئابلۆقەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی بە ئامانج دەگرێت. بەڵام ناتوانرێ بگوترێ کە بە گوێرەی فووڵاییەکەی هەڵسوکەوت دەکرێت و ئەلتەرناتیفەکەی پێش خراوە؛ دەتوانرێ بگوترێ وەکو جوڵانەوەیەکی کاردانەوە پێشکەوت. لە سەرەتادا ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوا، هێزەکەی زۆر سنووردارە و لە توانایدا نییە بە شێوەیەکی راست و دروست ئایین و خودا شی بکاتەوە. رادیکالترین هەڵوێست دەرهەق بە ئایین و خودا، لە نکۆڵی کردنێکی وشك بەولاوە تێپەڕ ناکات. بە بنەما گرتنی ئەم هەڵوێستەش لەلایەن مارکسیزم کە بانگەشەی نوێنەرایەتی کردنی چینی کارکەر دەکات، کەم و کوڕی ئایدیۆلۆژی بەرچاوی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

لاوازترین لایەنی علمانییەت ئەوەیە کە پشت بە شیکردنەوەیەکی راست سەبارەت بە ئایین نابەستێت. هەروەکو دەزانرێت لە نێو ئەو هەلومەرجانەی کە تێیدایە، کۆمەڵناسی لقێکی زانست بوو کە هێشتا پێشنەکەوتووە، تازە بە تازە هەڵوێست و نزیك بوونەوەی رەخنەگرانە دەرهەق بە ئایین پێش دەکەوت. بە گشتی بوویەری زانستی تازە دەردەکەوت و هەوڵیدەدا لە دۆگماتیزمی ئایینی دابڕێت. پێشەنگەکانیان، بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە، لە دادگاکانی ئەنگیزسیۆن سزا دەدرێن. ئەم ترسەش رێگا لەپێش ئەو پێهەڵگرتنە زانستییانە دەکردەوە کە لایەنی یاخی بوون و سۆزداری لەخۆوە دەگرن. فەلسەفەش رەوشێکی هاوشێوەی ئەمەی بەرامبەر بە ئایینی فەرمی ئەتینا بەخۆوە بینیبوو، لە کاتێکدا سوقرات وەکو دوژمنێکی ئایین تاوانبار کرا و سزای مردنی بەسەردا درا، ئەرستۆ رایکرد و بەمجۆرە توانی گیانی خۆی رزگار بکات. چەندین فەیلەسوف دووچاری هەمان چارەنووس هاتن.

پێشتریش ئایینە تاکخوداییەکان کە رەگەکەی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم دەگەڕێتەوە بەرامبەر ئەو رژێمانەی کە پەرستنی بت، ئایینی فەرمییان بوو، دووچاری هەمان رەوش هاتبوون. بێگومان کاتێك قەڵەمبازی زانستی لە ژێر مۆرکی تاوانباری کردنی بە بێ دینی، بێ پەروا هەوڵی پێشکەوتن دەدات، نابێ سەرمان لەوە سووڕبمێنێ کە چەندین شەهیدی زانست پێشکەش دەکات. قورسترین قۆناخی لە دایکبوونی کۆمەڵگای نوێ شەڕی زانستە بەرامبەر بە دۆگماتیزم. علمانییەت لایەنی سیاسی ئەم شەڕەیە. ئاشکرایە ئەگەر بنەما زانستییەکانی بەهێز نەکرێت، هێندە شانس و دەرفەتی سەرکەوتنی نییە. بە تایبەتی ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت، لێپرسینەوەیە سەبارەت بەو دەوڵەتەی لەسەر بنەمای ناسنامەی ئایدیۆلۆژی دەوروبەری پەرستگاکان و لەلایەن راهیبە سۆمەریەکانەوە ئاوا کران.

لە سەردەمی دەرکەوتنی و تاوەکو پێشکەوتنی بە درێژایی مێژوو، دەوڵەت ئامرازێکی فشاری دەستی دۆگما ئایینیەکانە و بە رادەیەکی هەرە زێدە بەکار هێنراوە. سۆمەریەکان پرەنسیپی دەوڵەتیان داناوە. سەرەکیترین تایبەتمەندێتیەکەشی ئەوەیە مرۆڤی کردووە بە بەندە و کۆیلە و ناچاری خزمەت کاری کردووە. هەروەکو چۆن تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان ئەم پرەنسیپە نەگۆڕاوە، دەست بە دەست ئاڵوگۆڕ کراوە و لە رێگای دەمامکی جیاوازەوە پێش خراوە و پێشکەش کراوە. لە راستیدا بوونی دەوڵەت بە ئامرازێکی کراوە بۆ زۆرداری و ناهەقی و تەڵەکەبازی و سیستەمی کۆیلایەتی کە چەوسانەوەیەکی بێ سنوور لەسەر رەنجی مرۆڤ پیادە دەکات، بۆ گەوهەرەکەی دەگەڕێتەوە؛ رەنگدانەوەی سیاسی ئەو میتۆلۆژیایەیە کە پشت بە

لۆژیکی قەبەی ئەو سیستەمەی ئاسمان دەبەستێت کە راهیبە سۆمەریەکان رووی ناوەوەی نازانن. کاتێك دەوڵەت ئاوا دەکرێ پشت بە زانیاری قەبەترین سیستەم دەبەستێت. کاتێك دەوڵەت دەخولقێنرێ دەبێتە نوێنەری ئیرادەیەکی بێ سنووری ئیرادەی خودایی لەسەر زەوی. کاتێك دەوڵەت ئاوا دەکرێ شێوازی لێپرسینەوە و حیساب خواستن لەهەر کەسێك و حیساب نەدان بە بنەما دەگرێت و دەیکاتە پرەنسیپێك. کاتێك دەوڵەت ئاوا دەکرێ پشت بە پیرۆزی دەبەستێ کە دەتوانێ هەموو شتێك لەهەر کەسێك بستێنی و بە بێ بەرامبەر هەر شتێکی پێشکەش بکرێت.

کاتێك راهیبە سۆمەریەکان درندەترین هەبوونی کۆمەڵگایان دروست کرد، هیچ تەگبیرێکیان نەستاند. تەنانەت بیر لە زاراوەی مافی کۆیلە ناکاتەوە. "دەوڵەت هەموو شتێکە، تاك هیچ نییە" پرەنسیپێکی سۆمەریەکانە. بە پوختی دۆگماتیزم بەمجۆرە دەبێت بە دەوڵەت. دەوڵەت لەمیانەی دەمامکە ساختە و بێ هاوتاکانی خوداوەند، هێزی قەبەی فشار و کۆنترۆڵ نەکراو تەنیا لێپرسینەوە دەکات، بە حاکم و دادوەرەکانییەوە کە تەنیا لێپرسینەوە و دادگایی دەکەن و لە خوداوەندەکان بەولاوە پێویستی حیسابدان بە کەس نابینن، لەگەڵ فەرمانبەرە تالانکارەکانی باج وەرگرتن لە دایك دەبێت. لە کاتێکدا لە قۆناخی سەرەتاییدا بەمجۆرەیە، دواتر کاتێك لە رێگای فشار و تەڵەکەبازییەوە دەرفەت و زەمینەی چەوساندنەوە لە ناو کۆمەڵگا پێش دەکەوێت ئەوا زیاتر پێش دەخرێت. بۆ ئەوەی دەمامکەکانی نەکەوێت و ئاشکرا نەبێت بەردەوام ئارایشت دەکرێت و هەموو لایەکی بە بزمار قایم دەکرێت. تەنانەت مارکسیزمیش کە لەسەر بنەمای بانگەشەی نەهێشتنی دەوڵەت دەرکەوت، نەیتوانیوە خۆی لەوە دوور بخات کە دەوڵەت بەهێز نەکات و بەهەڵەدا چوو، چەندین بزماریتری لێ قایم کرد. ئەم ئەزموونەش ئەوەی سەلماندووە: دەوڵەت تەنیا نوێنەرایەتی هێزی سیستەمی پیاوسالاری ناکات، کە بە هەزار و یەك پەردە دەمامك دراوە؛ بە ئەندازەی ئەوەی بەردەوام لەمیانەی پەردە و دەمامکە بریقەدارەکانی سۆزانی (فاحشە) بەندەیەکی خودا نەماوە کە لە رێ دەرینەخات، ئەمەش دەسەلمێنێ کە بوونەورێکی زۆڵی (غیرمشروع) دوو رەگەزییە (نێرەمووکە). ئەو تەنیا دۆستەکەی بۆرژوازی نییە، بەڵکو ئەو یارە زۆڵ و دووڕەگەزەیە کە پرۆلیتاریاش تاکو دوایی خۆشی دەوێت.

شتی سەیر ئەوەیە پەرستگاکانی سۆمەر کە چاوگی منداڵدانی دەوڵەتن، لەهەمانکاتدا یەکەمین شوێنە کە پیاو و ژنی سۆزانی (فحوش)ی تێدا دەرکەوت. دەوڵەتیش زۆر چاك لەوە تێگەیشتووە تاوەکو بە شێوازی سۆمەریەکان ژن و پیاو نەکەن بە فاحیشەیەکی تەواو، ناتوانێ هەروەکو چۆن بخوازێ کۆمەڵگا بچەوسێنێتەوە. لە کاتێکدا راستی هێندە رووتە و ئاشکرایە، ئەوا هەرچەندە کەمینەیەکیان رەخنەگرانەن، بەڵام زۆربەی زۆری هزرە میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفی و زانستییەکان ئەم پەیوەندیە رووتەی چەوسانەوە دەشارنەوە و چەندین تیۆری و زاراوەی بێ شومار پێش دەخەن کە رۆڵی سەرەکییان چەوسانەوەیە. چونکە ئاشکرایە چەندەی راستییەکان پەردەپۆش بکرێن و تەنانەت وەکو پێویستی و سۆزانی سەرنج راکێش و بریقەدار بکرێت، ئەوا بەو ئەندازەیە کاریگەر و درێژخایەن دەبێت.

بۆ ئەوەی پرەنسیپی علمانییەت رۆڵی تەواوی خۆی ببینێ پێویستە شێواز و تەرزی بە دەوڵەت بوونی سۆمەر بکاتە ئامانجێکی پێکان. هێزی تێگەیشتنی (زانیاری) بۆرژوازی و بەرژەوەندییەکانی بۆ ئەمە لەبار و گونجاو نییە. لە نێو هەلومەرجەکانی سەرمایەداریدا ئەوە نیشاندرا، کردارەکانی دەوڵەتی سۆسیالیزمی بونیادنراو نیازی تێپەڕ کردنی شێوازی سۆمەر نەبووە، تەنانەت بوون بە باشترین پەیڕەوکاری شێوازی دەوڵەتی سۆمەر. گفتوگۆیەکی راست سەبارەت بە علمانییەت گرنگی و بایەخی خۆی پاراستووە. ناچارییە دەبێ علمانییەت لەلایەنی گەوهەرەوە پێش بخرێت. واتا تەنیا هەڵوێست گرتنی دژی ئەو رێکخستنەی دەوڵەت کە ئایین دەکاتە ئامرازێکی سیاسەت بۆ علمانییەت، تێر ناکات. وەکو پێویستیەکی گەوهەرەکەی علمانییەتێك کە دەوڵەت گەرایی سۆمەری بە تەواوی بکاتە ئامانجی پێکان کە پشت بە دۆگما ئایینیەکان دەبەستێت، دەشێ رۆڵێکی مەزنی مێژوویی بگێرێ. ئەوەی شارستانییەتی ئەوروپا ئەنجامی داوە تەنیا بە رەخنە گرتنی هەندێ دەمامکی بێ واتای دەوڵەت سنووردارە. لەوە دوورە گەوهەرەکەی بە نێو وەرچەرخانێکی ریشەییدا دەرباز بکات. هەروەکو دەبینرێ هەندێ لایەنیشی مەترسیدارتر و بەهێزتر کردووە. کاتێك دەوڵەتی بۆمبای ئەتۆمی لەگەڵ دەوڵەتی دەمامك کراوی خودایی بەراورد بکەین، ئەو کاتە زۆر بە روون و ئاشکرایی دەبینین تۆقێنەرترین شێوەی دەوڵەتە. ئەوەی ئەوروپا ئەنجامی داوە، مارەییەکی مەشروعی لەگەڵ سۆزانیەکەی خۆی بڕیوەتەوە. هەروەکو چۆن ئەو ئەنجامانەی رێگای لەپێش کردۆتەوە (دوو شەڕی جیهانی، ژمارەیەکی زۆری شەڕی هەرێمی و ناوچەییەکان) ئەوا نیشان دەدات تا چ رادەیەك سەرکەوتوو بووە، ئەوەش جێگای گفتوگۆیە ئاخۆ لە داهاتوودا رێگا لەپێش کامە مەترسی دەکاتەوە.

هەر لەبەر ئەوەی دەوڵەتی پشت ئەستوور بە دۆگما ئایینیەکان بەرهەمی رۆژهەڵاتی ناوینە، بۆیە علمانییەت یەکێکە لەو کێشانەی لە نێو کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناویندا رێگا لەپێش مشتومڕ و کێشمەکێشی مەزن بکاتەوە. تاوەکو بە شێوەیەکی ریشەیی دژی دەوڵەتی دۆگماتیکییانە نەبێتەوە، ناشێ باس لە تێکۆشانێکی راستەقینەی علمانییەت بکرێت. ئەگەر رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین ناچارییەك بێت، ئەوا دەبێت بەر لە هەموو شتێك زەمینە و هەموو لایەنە دۆگماتیکەکانی دەوڵەت لە سەردەمی لە دایك بوونیەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان، بە شێوەیەکی رەخنەگرانە تاوتوێ بکرێت و شیبکرێتەوە و ئەو تایبەتمەندییانەی دەستنیشان بکرێت کە پێویستییان بە بەلاوەنان هەیە و ئەو رێکخستنانە بەرنامەڕێژ بکرێت کە لە جێگای دادەنرێن. هەربۆیە پێویست دەکات بەر لە هەموو شتێك لەپێناو ئازادی هزر بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەم شەڕە پیادە بکرێت و بەها و بایەخی بزانرێت. هەروەها هەرچەندە سنوورداریش بێت، ئینجا لەسەر بنەمای ئایینی یاخود علمانی بێت، دەبێ بەهای ئەو هەوڵ و کۆششانە بزانرێت کە لەپێناو دیموکراتیزە بوون پێش خراوە و جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانی بۆ گەیاندنی بە سەرکەوتن، گرنگییەکی مەزنی هەیە. رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین و لە رێگای ئەویشەوە لێگەڕینە نوێیەکانی شارستانییەت، تا رادەیەك گرێدراوی ئەنجامی ئەم تێکۆشانانەن.

٦ ـ دەزگایەکی دیکەی گرنگ کە سەرمایەداری پێشیخستووە، دیموکراسییە. سیستەمی دیموکراسی کە هەڵبژاردنی بەڕێوەبەرایەتی لەلایەنی تەواوی هاووڵاتییان بە بنەما دەگرێت، رەگەکەی بۆ سەردەمی لێك جیابوونەوەی تیرە و هۆزەکان دەگەڕێتەوە. دەربازکردنی بەڕێوەبەرایەتی بە ژێر ئەرێکردن و دەنگدانی تەواوی تیرە، داب و نەریتێکی دیموکراسییە. لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی دیموکراسی لە رێگای ئەنجوومەنێکی نوێنەرایەتییەوە گوزارشت دەکرێت کە زیاتر لە پیاو ماقووڵەکانی چینی باڵادەست پێك دێت. لە هەموو کۆمەڵگاکانی چینایەتیدا بە دەزگا بوونێك دەبینرێ کە بە گوێرەی هێزی خۆی رۆڵی دەستنیشان کردن و چۆنێتی بەڕێوە چوون و ئۆرگانی راوێژکاری دەبینن. بەڵام رۆڵی پادشایەتی کە ماوەیەکی کورت دوای ئەمە پێشدەکەوێ داب و نەریتی دیموکراسی لە بەین دەبات. لەگەڵ ئەوەی نموونەی یەکەمین لە لای سۆمەریەکان دەبینرێ، بەڵام لە سەردەمی دەوڵەتی شاری ئەتینا دیموکراسی پێشکەوتنێکی راستەقینەی بەخۆیەوە بینی. دیموکراسی ئەتینا کە لەسەر بنەمای پیاو ماقووڵانی چینی باڵادەستی کۆیلەدارە، یەکەمین شێوەی کلاسیکی خۆی وەردەگرێت. ئەو کارەکتەرەی کە گفتوگۆی بەرفراوان بە بنەما دەگرێت ئەوە دەسەلمێنێ کە هەم کاریگەری هزری فەلسەفی لەسەر هەبووە، هەم بۆ پێشکەوتن خاوەنی لەبارترین زەمینە بووە. لە شوێنێکدا چەندە دیموکراسی هەبێت، بەو رادەیەش پێشکەوتنی هزر و گفتوگۆی جیاوازیش دەبێت.

لەگەڵ ئەوەی کۆماریش ئۆرگانی کارگێڕی بەمجۆرەی هەیە کە لەسەر بنەمای هەڵبژاردن دەستنیشان دەکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنێك نییە تەواوی هاووڵاتییان بەشداری تێدا بکەن، بۆیە زیاتر بۆ ئەوە کراوەیە لەلایەن ئەو کاربەدەستانەوە ئەرێ بکرێت کە پێشتر دەستنیشان کراون، ئەمەش کارەکتەری دیموکراسییانەی تەسك و سنووردار دەکات. هەروەکو چۆن هەر کۆمارێك دیموکراسی نییە، ئەوا هەر دیموکراسییەتێکیش ناچار نییە کۆماری بێت. تەنانەت دەشێ میرنشینی دیموکراسییانەش هەبێت. لێرەدا ئەوەی رۆڵێکی دیاریکراو لە دیموکراسیدا دەبینێ شێوازێکی دینامیکی سیاسەتە، کە بەرژەوەندی تەواوی هاووڵاتییان رەچاو دەکات و دەرفەت بە دەستنیشان کردنی سیاسەت دەدات، هەروەها ئەوانە چاودێری دەکات کە بۆ دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردراون و کارەکتەرێکی بەمجۆرەی هەیە کە ناوە بە ناوە لەمیانەی هەڵبژاردنەوە سیستەم سەر راست و ئەرێ دەکات. ئەم شێوازەش وەکو باشترین شێوازی

کارگێڕی دەناسرێ و هەڵدەسەنگێنرێ؛ هەروەکو دەبینرێ تاوەکو باشترین شێواز دەدۆزرێتەوە، ئەم سیفەت و خەسڵەتەی دەمێنێ. لەگەڵ ئەوەی پێناسەکەی بەمجۆرەیە، کێشەکانی زیاتر لە چۆنێتی پراکتیزەکردندا سەرچاوە دەگرێت.

سەرباری ئەوەی بۆرژوازی چاوی خۆی بڕیوەتە کۆماری، وەلێ بە هەمان خێرایی بایەخی بە پێشخستنی دیموکراسی نەداوە. چونکە زۆر باش دەزانێ کە دیموکراسی لە ئاستێکی بەرزدا دەسەڵاتی چینایەتی، تەسک و سنووردار دەکات. کاتێك ڤازانجێکی زۆر بۆتە جێگای باس، دەزگا دیموکراسییەکان بە تەواوی کپ و بێ دەنگ دەکرێن. بەڵام کاتێك قەیرانی گران و رووخان ببێتە جێگای باس، ئەو دەم بۆ ئەوەی بە تەواوی نەڕووخێت زیاتر نزیکی چارەسەرییە دیموکراسییەکان دەبێتەوە. ئەو چینەی کە دیموکراسییەتی خۆی پێش بخات، چینێکە باوەڕی بە خۆی هەیە، تایبەتمەندێتی بەمجۆرەی هەیە دەزانێ ببێتە خاوەنی ئەزموون و ئاسۆیەکی سیاسی. چینی بۆرژوای ئەورووپا لەمیانەی نیشان دانی ئەم تواناکاریە، توانیویەتی هێز بە بەرفراوانترین پرۆژە و دەزگای دیموکراسی بدات. بە ئەندازەی ئەوەی دژی پاشماوەکانی کۆمەڵگای کۆن بووە، ئەوا لە ئاکامی ئەزموونی درێژ خایەنی نوێنەرایەتی کردنی ئەو توێژانەی کۆمەڵگا کە بانگەشەی نوژەنییان کردووە، هەروها لە ئەنجامی شیکردنەوەیەکی راست سەبارەت پەیوەندی نێوان سیاسەت ـ هێز و ئەزموونە هەمە رەنگ و دەوڵەمەندەکانی شۆڕش، باڵابوون و پایەداری خۆی سەلماندووە. کاتێك لە رێگای شارستانییەتی ئەورووپاوە ئاشکرا بووە رژێمێکە تایبەتمەندێتی پێشخستنی دیموکراسییەتی هەیە، پێبەپێ دەبێتە هاوچەرخترین دەزگای شارستانییەت کە کراوە بە ئامانج. لەم چوارچێوەیەشدا کاتێك ئەم سەردەمە بە چاخی شارستانییەتی دیموکراسی ناودەبرێت، ئەمە گوزارشت لە راستییەك دەکات.

لە شێوازی پێکهاتەی بەڕێوەبەرایەتی زیاتر، شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا گرنگترین و سەرەکیترین لایەنی دیموکراسییە. تەواوی رژێمە فەرمانڕەواکان تاوەکو لە ئەنجامی دەرکەوتنی هێزێکی بەرامبەر رەوشەکە هاوسەنگ کراوە، یان کێشەکانی لە رێگای توند و تیژیەوە بڵاوە پێکردووە، یاخود چارەسەرکردنی، لەرێگای خۆ بەدەستەوەدان و ملکەچ کردنیان کردۆتە یاسایەکی سەرەکی. تەنانەت دەتوانین بڵێین لۆژیکی کلاسیکی مێژوو بەردەوام بەم شێوەیە بووە. گەرچی شێوازی چارەسەری دیموکراسییانە لە چوارچێوەیەکدا هەڵوێست و نزیك بوونی نوێ پێش دەخات، کە ماف و ژیانی لاوازترین لایەنیش دەخاتە ژێر گەرەنتییەوە، دەرفەت بەوە دەدات ئازادی هزر و پێشکەوتن و هەبوونی کولتووری خۆی بپارێزێ و چەندین کێشە و گیروگرفت چارەسەر بکات کە جێگای کێشمەکێش و مشتومڕ بوون. باڵابوونی ئەورووپا بە شێوەیەکی سەرەکی لە نزیکەوە پابەندی ئەم شێوازەی چارەسەرییە. لە کام لایەنەوە تەماشا بکرێ، لەبەر ئەوەی مرۆڤانەترە و مۆدێلێکە کە زانستییە و بەرژەوەندی تەواوی هاووڵاتییان رەچاو دەکرێت، راستینەیەکی حاشاهەڵنەگرە سیستەمێکە چارەسەری دەخوڵقێنێ و بە بەرهەمە. ئەو ئاستە زانستییەی کە مرۆڤایەتی پێیگەیشتووە و هێزە تەکنۆلۆژییەکەی، ئەوە نیشان دەدات بەبێ پەنا بردن بۆ شۆڕشە خوێناویەکان، دەتوانرێ هەموو کێشەکان لە رێگای پێوانە دیموکراسییەکانەوە چارەسەر بکرێت. بۆ یەکەمین جار ئاستی پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا گەیشتۆتە ئەو ئاستە خوازراوەی بۆ پراکتیزەکردنی دیموکراسی لەبار و گونجاوە. بە گوزارەیەکیتر، ئەگەر ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیا لەگەڵ سیستەمی دیموکراسی راست و تەواو یەکانگیر بکرێت، ئەوا ئەو زەمینە و هەلومەرجە بابەتییە بەدیهاتووە کە چارەسەری بۆ هەموو کێشەیەك دەدۆزێتەوە. لەوانەیە بەمجۆرەش هەلومەرج و زەمینەی بابەتی بۆ ئەو سۆسیالیزمە برەخسێت کە سەردەمێك گفتوگۆیەکی زۆری دەرهەق دەکرا. بەڵام ئەمە راستییەکی بەڵگەنەویستە کە شارستانییەتی هاوچەرخ زەمینەیەکی لەباری بۆ دیموکراسی ئامادە کردووە. ئەم راستینەیەش ئەوە دەسەلمێنێ هەموو جۆرە گۆڕانکارییەك تەنانەت وەرچەرخانەکانی دیموکراسییەتیش، دەشێ لە ناو زەمینەی رژێمێکی دیموکراسییانەدا ئەنجام بدرێت.

٧ ـ بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت کە پشت بە باڵابوونی یاسا ببەستێت، بە دەزگا بوونێکی گرنگە کە لەم قۆناخەدا پێشکەوت. لە هەموو قۆناخەکانی بە دەوڵەت بووندا سیستەمێك هەیە پشت بە یاسا و رێسای جێبەجێ کردن دەبەستێ. بێگومان دەوڵەت بۆخۆی رێکخستنێکە سیستەمی یاسایی هێزە دەسەڵاتدارەکان بەڕێوەی دەبات. لە هەموو رێکخستنەکانی دیکەی کۆمەڵگا جیاوازترە و هەموویان لەخۆوە دەگرێت و رێنومایی دەکات. لە واتایەکی سنووردارادا یاسا و رێساکانی رێکخستنی ناوخۆی دەوڵەتە؛ تەواوی ئەو یاسایانە لەخۆوە دەگرێت کە بۆ هاووڵاتییان دانراوە و لە نێوان خۆی و هاووڵاتییان و لە نێوان خودی هاووڵاتییان پەیڕەو دەکرێت. تەواوی ئەم رێسا و پەیڕەوانە بە یاسا ناو دەبرێت. کاتێك هێزەکانی دەوڵەت تەنیا ئەو رێسایانەی لە قۆناخی خۆیان و بە گوێرەی بەرژەوەندیەکانیان ئافرێنراون، بە دەستوور ناودەبن، ئەمە دەبێتە پێناسەیەکی ناتەواو و پڕ لە کەم و کوڕی. چاوگی دەستوور زۆر فراوانترە. بنەما ئایینیەکانی رابرِدوو واتا داب و نەریتەکان، کۆششی پراکتیکی و دەزگاکانی زانایان لە بواری یاسا و هەموو بابەتەکانی رابردووی سەبارەت بە یاسا، سەرچاوە سەرەکییەکانی پێکهاتنی دەستوورن. ئەم سەرچاوانەش گەوهەرێکی ئەوتۆیان هەیە کە لە سەرووی دەوڵەتن.

بابەتێکی دیکەی سەرەکی سەبارەت بە دەستوور پەیوەندیەتی لەگەڵ داد. کاتێك رێساکانی دەوڵەت پەیوەندییان لەگەڵ داد نەبێت، بە دەستوور ناو نابرێن. هەرچی "داد"ە، لە گەوهەری خۆیدا بە واتای دەربڕینی ئیرادەی هاووڵاتییانە بە شێوەیەکی ئازادانە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا کاتێك دەستوور لەسەر بنەمای ئیرادەی ئازادی هاووڵاتییان بێت، جیاوازی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی یاسا نیشان دەدات و دەتوانرێ باس لە رژێمێکی دەستووری راستەقینە بکرێت. دەوڵەتێك کە ئیرادەی ئازادی هاووڵاتییەکانی ژێرپێ بخات کە گوزارشت لە بەرژەوەندیە گشتی و سەرەکییەکانیان دەکەن، بە دەوڵەتی دەستووری (حقوقی) ناو نابرێت. چەندین دەوڵەت لە مێژوودا بەمجۆرەن. شێوەی ئەو دەوڵەتانە زۆرینەن، کە دان بە هەموو جۆرە ئازادییەکی هاووڵاتییانیدا نانێت و بە پێچەوانەوە سەرکوتیان دەکات. ماف زیاتر لە ئەنجامی ئەو تێکۆشانانە بەدیدێت کە توێژەکانی کۆمەڵگا بەرامبەر بەمجۆرە دەوڵەتانە بەڕێوەی دەبەن؛ ماف لەمیانەی تێکۆشانەوە بەدەست دەهێنرێ. تەنانەت شێوەی (کۆ)ی، واتا کاتێك بۆ هەموو کەسێك دانی پێدا بنرێت وەکو (حقوق) مافداری شێوە دەگرێت. گەلێك پێشکەوتنی لەم جۆرە، مافداری تێر دەکات.

پێکهاتەی ئالۆزی کۆمەڵگای سەرمایەداری، هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان پشتی پێدەبەستێ، بازرگانی، تێکۆشانی زەحمەتکێشان و توێژە کۆمەڵایەتیەکانیتر لەپێناو بەدەست هێنانی مافەکانیان؛ زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان و کەمی سەرچاوەکان، سیستەمێکی زۆر پێشکەوتوی مافداری دەکاتە پێویستییەك. ئەم رەوشە لەهەمانکاتدا سەرلەنوێ رێکخستنەوەی پێکهاتەی ئالۆزی دەوڵەتیش دەکاتە پێویستییەك. هەربۆیە گفتوگۆیەکی دەست لێبەرنەدراو لە سیستەمی سەرمایەداریدا دەرهەق بە مافداری پێشدەکەوێت. ئەم قۆناخەش لەمیانەی شێوەبەندی یاسا سەرەکییەکانی مافداری و سیستەمە دەستوورییەکان، رۆڵی مێژوویی خۆی دەبینێ. دەستوور سیستەمی ململانێی ناوخۆ و دەرەوە تا بەرزترین ئاست نەرم دەکاتەوە، بە شێوەیەك بەرژەوەندی هەر توێژێك رێك دەخات کە رێ لەپێش توندوتیژی نەکاتەوە، دان بە مافە سەرەکییەکانی هاووڵاتییاندا دەنێت و هەوڵ دەدات لە نێو هەلومەرج و زەمینەی ئاشتیدا کۆمەڵگایەکی خاوەن یاسا و دەستوور ئاوا بکات. دەوڵەت و کارگێڕانی دەوڵەتیش لە نێو پەیڕەوکردنی ئەم یاسایانەدا جێگای خۆیان دەگرن.

شتێکی ئاشکرایە چەرخی شارستانییەتی رۆژگاری ئەمڕۆمان بە رادەیەکی هەرە زێدە ئەم شێوازەی سیستەمی دەستووری (مافداری) پێش خستووە. بواری مافداری ئەو شارستانییەتەی کە ئەورووپا پێشەنگایەتی دەکات، پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆوە بینیوە و کاریگەری کردۆتە سەر تەواوی جیهان. بێگومان بەردەوام لەم پێشکەوتنەدا بەرژەوەندییەکانی چینی دەسەڵاتدار و ئەو وڵات و نەتەوە بەهێزەی جێگای خۆی تێدا دەگرێت و تەنانەت بەرژەوەندی جەمسەرەکەش، رەچاو کراوە. شێوازەکانی زۆرداری چەوساندنەوەی قەبە دەستی لێبەردەدرێت، زیاتر لەسەر بنەمای باڵابوونی بوارەکانی زانست، تەکنۆلۆژیا، بەرهەمهێنان و سیاسییەوە، یاسای نێونەتەوەیی دەرهەق بە بازرگانی ئازاد و بونیادنان دادەهێنێ و هەوڵ دەدات ئەم سیستەمە دەستوورییە بکات بە سیستەمێکی گەردوونی. یاسای نێودەوڵەتی (نێونەتەوەیی) بە واتای رەنگدانەوە و تەواوکاری یاسای ناوخۆ دێت.

کاتێك دیموکراسی لەگەڵ ئەم مافدارییەی باسمان کرد، بوون بە یەك، ئەوا ئەو راستینەیەی دێتە ئاراوە، دەوڵەتی دەستووری دیموکراسی هاوچەرخە. ئیتر پێشکەوتوترین شێوەبەندی سیستەمێکی بنچینەیی شارستانییەتی هاوچەرخ هاتۆتە ئاراوە، کە لەلایەنێکەوە پشت بە سەرمایەداری دەبەستێ، بەڵام لە گەلێك لایەنەوە تێپەڕی کردووە. ئەو کۆمەڵگایەی لەلایەن

سیستەمێکی دەستووری دیموکراسییانە بەڕێوە دەبردرێت، شایستەی نازناوی شارستانیترین کۆمەڵگایە. هەرچەندە کێشە و گیروگرفتی هەبێت، بەڵام باوەڕی بەوە دەکرێت لەنێو زەمینەیەکی ئاشتی و ئارامیدا مەکانیزمەکانی سیاسەتی دیموکراسییانە دەخرێنە گەڕ و یاسا و ماف ڕەچاو دەکرێت، بەمجۆرە بە پێشکەوتوترین و پتەوترین چارەسەری دەگەن.

٨ ـ یاسای مافەکانی مرۆڤ، کە بە واتای پەیڕەوکردنی دەستووری مافداری دێت بەسەر تاك و ئەو گروپە تەسکانەی خاوەنی ناسنامەی کۆمەڵایەتین، دەزگایەکی دیکەی سەرەکی شارستانییەتی هاوچەرخە کە تازە گەشەیسەندووە، بەڵام زۆر گرنگ و بایەخدارە. مافەکانی مرۆڤ گوزارشت لەو بەهایانە دەکات کە لەگەڵ پێکهاتەی سەرمایەداری هەڵکشان، واتا گوزارشت لە ئازادی بیروڕا و سیستەمی مافداری (حقوقی) دەکات کە داننان بە ئیرادەی ژیان و بیروباوەڕی، بە بنەما دەگرێت. بەها هەڵکشاوەکانی تاکە کەسی، وەکو ماف و مافداری، بە شێوەیەکی بەرجەستە و ئاشکرا دەستنیشان دەکرێت و لەمیانەی دەستوورەوە گەرەنتی دەکرێت، بەمجۆرەش شایستەی تاکێکی بەهێز و بەتوانا دەبینرێت.

کاتێك باس لە مافەکانی مرۆڤ دەکرێت؛ ئەو گەرەنتییانە بە ئەقڵی مرۆڤدا دێت کە بە بێ جیاوازی چینایەتی، نەتەوەیی، ئایینی، ڕەگەزی و نەژادی بکرێت، دان بە ئازادییە پێویستەکانی مرۆڤدا دەنرێت. ئەم مافانە بناخەی پێشکەوتنی ئازادانەی تاك پێکدێنن. ئەمانەش مافە سەرەکییەکانی تاکە کەسی لە جۆری ئازادی هزر و باوەڕی بیروڕا دەربڕین، ڕێکخستن، مافی کۆبوونەوە و خۆ پیشاندان و پەروەردە بە زمانی زگماکی بە مافەکانی نەوەی یەکەم ناو دەبرێت، ئەوانەی ناوەڕۆکی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەخۆوە دەگرن بە مافەکانی نەوەی دووەم ناو دەبرێن و پێشخستنی ئازادانەی هەبوونی کولتووری گەلان و شێوەی ژیانیان بە سێیەمین ناو دەبرێت، بەمجۆرە بۆ سێ بەش جیا دەکرێتەوە. ئەو مافانەی پێویستە لە ئاستی گەردوونیدا دانی پیا بنرێت، ناتوانرێ لە ژێر هیچ بیانویەکەوە ڕێگای لێبگیردرێت. مافی ژیان لە سەرووی تەواوی ئەو مافانەوە دێت. جگە لەو ڕەوشانەی کە تێیدا دەوڵەت لەنێو شەڕ دایە، ئەوا بە مەرجێك دادەنێت کە کەس دەسەڵاتی کوشتن و لە سێدارەدانی نییە.

مافەکانی مرۆڤ کە بەردەوام پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێ، بە ئامانجی پاراستنی تاکە بەرامبەر بەو هێزەی دەوڵەت کە بۆتە ئەختەبووت. لە قۆناخێکدا هێندەی بڵێی کۆنترۆڵ و چاودێری دەوڵەت زیاد بووە، بەرامبەر بەمەش پاراستنی تاك گرنگە کە پێبەپێ ڕووبەڕووی تەنیاییەکی زیاتر دەبێتەوە. ئەو تاکانەی لە قۆناخەکانی بەر لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا لەژێر سایەی دەزگاکانی وەقف، ئایین و خێڵ لە نێو گەرەنتیدا بوون، لەگەڵ لاواز بوونی ئەم دەزگایانە، ئەوانیش بێ هێز بوون. سەختی و تەنگەتاوی ژیانی تەنیایی و نەبوونی گەرەنتی لە بوارەکانی کار و تەندروستی و پەروەردە تاوەکو دوایی هەڕەشە لە تاك دەکات. ناتوانێ خێزان ئاوا بکات، ئەگەر ئاواشی بکات ناتوانێ درێژەی پێبدات، لەژێر باری کێشەکانی پەروەردە و تەندروستی منداڵان دەرناکەوێت. لە راستیدا لە ئەنجامی هەڵوەشانەوەی شێوەکانی کۆمەڵگای کۆن بەرامبەر بە سەرمایەداری و هەرس نەکردنی کۆمەڵگای نوێ، تەواوی ئەم بابەتانە دەبن بە کێشە و گیروگرفت. ئەو پەیوەندییانەی هەڵوەشاونەتەوە تاك لە بەرامبەر سەرمایەداری دڕندە دەخاتە نێو ڕەوشێکی سەخت و تەنگەتاوییەوە. لە نێوان کۆن و نوێدا تاك مەحکوومی بێچارەیی کراوە. یاساکانی مافەکانی مرۆڤیش وەکو بەرهەمێکی ئەم بۆشاییە پێش دەکەوێت. ناتوانرێ بگوترێ کە بە پێی پێویست تاك هەم لەلایەن یاسای دەوڵەتییەوە هەم یاسای نێودەوڵەتییەوە خراوەتە ژێر گەرەنتییەوە.

هەندێ زاراوەی کە هەرە دوایی وەکو پارچەیەکی مافەکانی مرۆڤ پێشکەوتن، پەیوەندی بە مافەکانی ژن و منداڵ و ژینگەوە هەیە.

ژن وەکو کۆنترین و نزمترین چین، فشار و چەوسانەوەیەکی بێ سنووری لەسەر پیادە دەکرێت. کێشەی ژن کە تازە بە تازە ڕێگای لەپێش دەکرێتەوە، بابەتێکی هێندە گشتگیر و بەرفراوانە لە چوارچێوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا جێگای نابێتەوە. ئازادی ژن وەکو پێوانەی گشتی تەواوی ئازادییەکان، هێشتا ئامادەکاری هەنگاونانی یەکەم دەکات. دەربازبوون لە چاخی ژنەوە (دایکسالاری) بۆ چاخی پیاو (باوکسالاری)، ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە زیانی مەزن بە ژن بکەوێت. مێژووی ٥٠٠٠ ساڵەی کۆمەڵگای چینایەتی بۆتە هۆی ئەوەی بە ڕادەی هەرە زێدە ژن زیان ببینێ و بدۆڕێنێ. فشاری هەمە لایەنە و سووکایەتی پێکردن، جیاوازی ڕەگەزی و هەموو جۆرێکی چەوسانەوە، شایستەی ژن بینراوە. ئەو ژنەی کە سووتاوە و سووتێنراوە، تازە بە تازە لە ژێر خۆڵەمێشەوە دەردەهێنرێت و هەوڵی پاك کردنەوەی دەدرێ. لە کاتێکدا پێویست بوو بەر لە هەموو شتێك و بە بێ هیچ مەرجێك دان بە تەواوی مافەکانی تاکە کەسی ژندا بنرێت، بەڵام لەدوای هەموو مەسەلەکان و بە شێوەیەکی سنووردار کردنی بە ڕۆژەڤ، پەیوەندی بە ڕەهەندە مێژوویی و قووڵەکانی ستەمکارییەوە هەیە. بابەتەکە هێندە بەرفراوان و گشتگیرە دەشێ ببێتە لقێکی زانستی کۆمەڵناسی، هێندە گرنگە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژ و نەخشە بۆ کێشراو و ڕێکخراوەیی پێویستی بە تێکۆشانێکی سیاسی دیموکراسییانە و یاسایی درێژخایەن هەیە. هەم لەلایەنی گەوهەر هەم شێوە لە تێکۆشانی نەتەوەیی و چینایەتی جیاوازترە و تێکۆشانێکی ژیانییە.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەنیا ناوی کێشەکە دەستنیشان کراوە و هێشتا ناوەڕۆکەکەی دیاری نەکراوە. هێشتا دوورە لەوەی کە بەرنامە و ستراتیژ و ڕێکخستن و شێوازی چالاکییەکانی تەواو لە نێو ڕۆژەڤدا جێگیر بێت. هەروەکو چۆن لەسەر بنەمای کۆیلایەتی ڕەگەزی ژن مێژووی شارستانییەتی چینایەتی وەکو مێژووی ستەمکاری؛ شەڕ، چەوسانەوە و تەڵەکەبازی و چەواشەکاری دەستپێکرد، ئەوا لەمیانەی تێکۆشانی ئازادی ژن و گەیشتنی بە سەرکەوتن، سەرلەنوێ مێژووی ئازادی، ئاشتی، یەکسانی و ڕاستی دەئافرێنرێ و دەنووسرێتەوە. تەواوی پێشهاتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئازادی ژن ڕۆڵێکی بەرچاو لە بەرەبەیانی شارستانییەتی نوێدا دەبینێ و دووبارە و لە ئاستێکی بەرزتردا چاخی ژنی ئازاد دێتە ئاراوە.

ڕۆژ بە ڕۆژ ئەمە روون بۆتەوە مافەکانی منداڵ بابەتێکی هێندە گرنگە ناتوانرێ بۆ دایك و باوك و دەوڵەت بە جێ بهێڵدرێ. ڕۆڵەی مرۆڤ کە لە ناو تەواوی بێچووی ئاژەڵاندا، لە هەموویان بە زەحمەتتر گەشە دەسێنێت، نزیك بوون و هەڵوێستێکی تایبەتی پشت ئەستوور بە زانست دەکات بە ناچارییەك. سیستەمێك کە پشت بە باڵادەستی پیاوی هۆڤ دەبەستێ؛ لە دوای کۆیلە و ژن و زەحمەتکێشانەوە، بە ڕادەی هەرە زیادە منداڵی پەرێشان کردووە. سیستەمی پیاو هێندە کوێر و بێ ویژدان و زۆردارە هەرگیز منداڵ ناناسێ. لە قۆناخەکانی سەرەتایی کۆمەڵگای چینایەتیدا بەردەوام منداڵانیان وەکو قوربانی پێشکەش بە خوداوەندەکان دەکرد. لەوانەیە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەلایەنی جەستەیی نەکرێت بە قوربانی، بەڵام قوربانی مەعنەوی هیچ شتێکی لە خێرایییەکەی خۆی کەم نەکردۆتەوە و بەردەوام دەکات. ژن بە بەراورد کردن لەگەڵ پیاو باشتر لە سایکۆلۆژیای منداڵ تێدەگات و بەویژدانترە، بە هۆی بێ پەروەردەیی و بێ دەرفەتییەوە لە ڕەوشێکی وەها دایە کە ناتوانێ وەکو دایك ڕۆڵی خۆی ببینێ. شێواز و ڕێچکەکانی دەوڵەتیش کە لە سەرەوە ڕێنومایی دەکات بە تەواوەتی لە جیهانی منداڵان نامۆیە. تەنانەت ئەم چوارچێوە گشتییەش پێویستی ڕێکخستنێکی بەرفراوان و گشتگیری مافەکانی منداڵان مسۆگەر دەکات. ڕاگەیاندنی جاڕی مافی منداڵان بۆ بەدیهێنانی مافەکانی پەروەردە و تەندروستی و یاری لەسەر بنەمای میهرەبانی دایك و ئاشتی، ئەرکێکی دوانەخراوە.

مافی ژینگە، ئەو تەگبیرە یاساییانە لەخۆوە دەگرێت بەرامبەر بەو ڕەوشەی کە هزری قازانجی زێدەیی سەرمایەداری و لەسەر بنەمای زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان و پاشماوەکانی تەکنۆلۆژیا و ژینگە بە ژێر زەوی و سەر زەوی و بۆشایی ئاسمان و ئاووهەواکەی، ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو ڕەوشێك دەچن دەرفەتی ژیانیان تێدا نەمێنێ و مەترسییەکی مەزن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئیتر ناکۆکی تەنیا بەوە ناوەستێ کۆمەڵگا بۆ چەوسانەوەی چینێکی مشەخۆر بەجێ بێڵێ، بەڵکو بۆ ناکۆکییەکی مەزنی نێوان کۆمەڵگا ـ سروشت گۆڕاوە کە گێتی کردۆتە ئامانج. لە چوارچێوەیەکی گەردوونیدا هەنگاونانی تەواوی کۆمەڵگا بۆ تێکۆشانی پاراستنی ژینگە بۆتە ناچارییەك. ئەوە دەکات بە پێویستییەکی ژیانی کە لە سەرووی هەموو شتێکەوە مانیفێستۆی پاراستنی (مافەکانی) ژینگە پێش بخرێت و لەسەر ئەو بنەمایەش ڕێکخستنێکی ئەنتەرناسیۆنالیستی ژینگە سەفەربەر بکرێت، وەك پارچەیەکی لێك جیا نەکراوەی مافە گشتییەکانی مرۆڤ و تێکۆشانی بەدەست هێنانی ماف و سیاسەتی دیموکراسییانە بە یەکەوە و لە ناو یەکتردا بەڕێوە دەبردرێت.

زاراوەی مافەکانی مرۆڤ چوارچێوەی تەسکی مافی تێپەڕ کردووە، وەکو بەدەزگابوون و دیاردەیەکی سەرەکی سیاسی و ئەخلاقی کە پێویست بوو، فەلسەفە و بە سیاسەت بوون تاوتوێی بکات، سەرلەنوێ ئەنجامدانی هەڵسەنگاندن دەکاتە ناچارییەك. هەروەکو سەرەتا جەختمان لەسەر کردەوە تاوەکو سەرلەنوێ لە ئاستێکی بەرزدا ناکۆکی نێوان بە کۆمەڵگا بوون و

تاکڕەوێتی شینەکرێتەوە و بە دەزگا بوونیان ئاوا نەکرێت، ئەو قەیرانە قووڵەی شارستانییەت تێپەڕ ناکرێت. هەروەکو چۆن قەیرانی چاخی نئۆلیتیك لە ڕێگای سەنتێزی کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەریەکان تێپەڕ کرا، واتا بە دەربازبوون بۆ چاخی شارستانییەت و دەوڵەت بەلاوە نرا، ئەوا دەشێ قەیران و کێشە مەزنەکانی چەرخی شارستانییەتیش کە گوزارشتێکی سیستەماتیکی دەزگاکانی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخانی دەوڵەت و کۆمەڵگای چینایەتییە، لەمیانەی هەنگاوێکی نوێی مرۆڤایەتی بەلاوە بنرێت کە هاوسەنگی تاك و کۆمەڵگا و ئازادی و یەکسانی لە ئاستێکی بەرزدا بگەیەنێت، بە سەنتێزێك و لەلایەن تەواوی مرۆڤایەتییەوە پەسند بکرێت. لە کاتێکدا هەندێ کەس ئەم هەنگاوە بە پۆست مۆدێرنیزم (شارستانییەتی هاوچەرخ، دوای مۆدێرنیزم) هەڵدەسەنگێنن، بەشێکی دیکەش بە کۆتایی مێژوو هەڵیدەسەنگێنن. هەردوو زاراوەش لەلایەنی ناوەڕۆکەوە تێر ناکەن. زیاتر تێڕوانینی چینی بۆرژوا بە بناخە دەگرێت، بنبەست بوون و لە کار کەوتنی شارستانییەتی سەرمایەداری، وەکو کۆتایی و لەناوچوونی تەواوی مرۆڤایەتی پیشان دەدات. بە پێچەوانەوە لیبرالیزم و فاشیزم وەکو سیستەمی ئەبەدی نیشان دەدات.

ئاشکرا بوو ئەو چارەسەری و بە دەزگا بوونانەی پشت بە شیکردنەوە سنووردارەکانی چینایەتی و نەتەوەیی دەبەستێ، ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری تێپەڕ ناکات. ئەوە ئاشکرا بووە و دەرکی پێکراوە، تەواوی ئەو کۆمەڵگا چینایەتیانەی خاوەن دەوڵەتن، لە ئاکامی ئەو کێشە و قەیرانە قووڵانەی بە دەوڵەت بوون تێیدا دەژی، کە گوزارشتی سیستەمی دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانە، توانستی چارەسەر کردنی ئەم کێشانەیان نییە. ئەو ڕەوشەی کە هەیە نە "پۆست مۆدێرنیزم" نە "کۆتایی مێژووە". قۆناخێکی ئەوتۆی مێژووی هاتۆتە پێش کە کێشەکان لەمیانەی لۆژیکی شارستانییەتی کۆن، واتا لە ڕێگای خولڵقاندنی سیستەمی دەوڵەت، چینی نوێ تێپەڕ ناکرێت. هەروەکو تەواوی قۆناخەکانی مێژوو، ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیا ڕۆڵێکی دیاریکراو دەبینێ. تەکنۆلۆژیا و زانست لۆژیکی کلاسیکی چین و دەوڵەتی بێ کاریگەر کردووە و لەکار خستووە. چەرخی زانیاری و گەیاندن ئاماژە بە بوارێکی گرنگی مێژوویی دەکات. هەروەکو چۆن تەنیا ناوبردنی چاخ بە چاخی وشیاری ژینگە و مافەکانی گەیاندن و زانیاری تێر ناکات، هاوکات پێویستی بە قەڵەمبازی مێژوویی وەهایە کە تەواوی ئەم دیاردانە ڕەچاو بکات. پێشخستنی هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانەی ڕاست سەبارەت بەو هەنگاوانەی لەم ڕاستە ڕێیەوە دەهاوێشترێ، ئاواکردنی ناسنامەی ئەو ئایدیۆلۆژیایەیە کە پێشدەخرێت، لەگەڵ ئەم کۆششەدا لەمیانەی یەك بوونێکی پراکتیکییانەوە، ئەوا دەستنیشان کردنی پرۆگرام و ستراتیژ و تەکتیکەکانی کە بە ئامانجی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی سیستەمی ئابووری و ڕای گشتی ئامادە دەکرێت، قەڵەمبازێکی نوێی مرۆڤایەتی دەستنیشان دەکات.

بەرگرینامەکەم لە بەشی دەرئەنجامی تایبەت بە شارستانییەت، چارەسەری ئەم بابەتە دیاری دەکات. ئەو سەرەتا و پێشینە کورتانەی لە تەواوی هەڵسەنگاندنەکانماندا لەم بوارە هەوڵی پێشخستنماندا، بۆ ئەوە بوو بەناو یەکداچوونی بابەتەکان لەبەر چاو وون نەبێت و ئەوە ببینرێ کە پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ یەکتردا هەیە.

## ج ـ چاخی پەلهاوێشتن و لوتکەی شارستانییەتی سەرمایەداری

تایبەتمەندێتیەکی سەرەکی چاخەکانی مرۆڤایەتی، پێبەپێ خێرا بوونی پێشکەوتنەکانە. پێشکەوتنی ئاستی تەکنۆلۆژیا و زانستی کۆمەڵگا ڕۆڵێکی دیاریکراو لەمەدا دەبینێ. چاخی پالیۆلیتیك کە دەرهەق بە سروشت خاوەن زانیارییەکی منداڵانەیە و لە بواری ئامرازیشەوە پشت بە دار و بەرد دەبەستێ، پەرەسەندنێکی زۆر هێواش و لە سەرخۆی بەخۆوە بینیوە. لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنێکی یەکجار درێژی هەبووە، نزیکەی لە سەدا نەوەد و هەشتی تەواوی کات و ماوەی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. چاخی مەزۆلیتیك کە قۆناخێکی پەڕینەوەیە نزیکەی ماوەی نێوان ساڵانی ٢٠٠٠٠ تاوەکو ١٠٠٠٠ پ.ز دەگرێتەوە. لەبەر ئەوەی چاخی نئۆلیتیك خاوەنی زانیاری پێشکەوتوتر و تەواوی ئەو توانستانە بوو کە شارستانییەت بخوڵقێنێ، قۆناخێکە بە خێراییەکی زیاتر پێشکەوتوە. هەر لەبەر ئەوەی زانیاری و ئامرازەکان لە نزیکەوە یەکتریان تەواو کردووە ئەوا لە بوارەکانی بەرهەمهێنان و ژیانی کۆمەڵایەتی و هێزی بەڕێوەبەرایەتیدا ڕێگایان لەبەردەم پێشکەوتنی خێرا و چڕوپڕ کردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەی تەنیا ماوەی نێوان ١٠٠٠٠ تاوەکو ٣٠٠٠ پ.ز دەگرێتەوە، بەڵام بە گوێرەی چاخی پالیۆلیتیك کە بە سەدان هەزار ساڵ بەردەوام بووە، خاوەن پێشکەوتنی زۆر مەزن و باڵاترە. بە تایبەتیش لە قۆناخی ساڵانی نێوان ٦٠٠٠ تاوەکو ٤٠٠٠ پ.ز، لە کەوانی بەپیت (الهلال الخصیب) بۆتە خاوەنی هێزی ئەو زانیاری و ئامرازانەی لە ڕەگ و ریشەوە چارەنووسی مرۆڤایەتی دەگۆڕێت. تەواوی ئەو تیۆری و ئامرازانەی کە سۆمەریەکان بەکاریان دەهێنا، لەم ماوەیە و لەم جوگرافیایەدا ئەنجام درا. جگە لەوەی ئیتر تەمەنی چاخەکان کورتتر دەبێتەوە، ئەو پێشکەوتنانەی لەخۆیانەوە دەگرن زۆر مەزنن.

قۆناخی پەرەسەندنی کۆمەڵگای چینایەتی کۆیلەداری تەمەنی ماوەی نێوان ٣٠٠٠ پ.ز تاوەکو ساڵانی ٥٠٠ ی زایینی خایاندووە. سەرەڕای ئەوەی ماوەیەکی کەم و کورت خایەنتر بووە، بەڵام لە بوارەکانی پێشخستنی شار، دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، میتۆلۆژیا، ئایین و فەلسەفە ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەیە. هەروەها دەبینرێ چاخی دەرەبەگایەتی تەمەنی کورتتر بووە و ساڵانی ٥٠٠ تاوەکو ١٥٠٠ ی زایینی دەگرێتەوە. هەروەکو بڵێی وەکو هێڵکارییەك، کات (ماوە) کورت دەبێتەوە، بوارەکانی دیکەی ماددی و ڕۆشنگەری بە شێوەیەکی پێچەوانە و بە شێوەیەکی خێراتر گەشە دەکەن.

تایبەتمەندێتیەکی دی سەرەکی چاخەکانی مرۆڤایەتی ئەوەیە کە پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوەی گەردوونییان ئەنجام داوە.

هەموو کیشوەرەکان ژیانی کۆمەڵگای پالیۆلیتیك (چەرخی بەردینی دێرین)یان بەخۆیانەوە بینیوە. خاوەن تایبەتمەندێتی بەربڵاوترین و درێژ خایەنترین کۆمەڵگایە. کۆمەڵگای نئۆلیتیکیش لەو شوێنەی لە دایك بووە، بە شێوەیەکی زۆر خێرا لە کەوانی بە پیتەوە بۆ تەواوی ئەو شوێنانە بڵاوبۆوە، کە دەرفەت و تواناکاری ژیانیان تێدا هەبووە. لەمەشدا تەکنیك (ئامراز) ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەبووە. بە شێوەیەکی بەرجەستە لە مێژوودا دەستنیشان کراوە کە کۆمەڵگای کۆیلەداری سۆمەر کە لەسەر بنەمای شوێن پەنجەی نئۆلیتیك زۆر بە خێرایی پێشکەوتوە. چاخی دەرەبەگایەتی کە بە شێوەیەکی بەرفراوانتر ئەسپ و ئامرازە ئاسنینەکانی بەکار هێنا، بە تایبەتیش لەسەر بنەمای ئیسلامییەت و مەسیحییەت، پەلهاوێشتنەکانیان هەمیشەیی و بەردەوام بووە.

کاتێك چاخەکان هەڵدەسەنگێنن کێشەیەکی دی کە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە، ڕەوشی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزمە. هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کە لە گەوهەری خۆیدا لێهاتوو و پێشکەوتوخواز بێت، تەنانەت ئەگەر نیازیشی نەبێت، دیسان تایبەتمەندێتی پەلهاوێشتن لەخۆوە دەگرێت. چونکە زانیاری و تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو خاوەنی تواناکاری باڵای بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتنە. تەنانەت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا تۆوی کۆمەڵگای نئۆلیتیکی یەکسانیخوازی ئاریان، لە هەموو لایەکی دونیادا دەژی. ئاشکرایە کە ناتوانرێ بە ئیمپریالیزم ناو ببرێت. لەهەمانکاتدا کاتێك جڤاتی نئۆلیتیك لە شوێنێکی دیکەی قۆناخی پالیۆلیتیك جێگیر دەبێ، دەشێ باس لە دەستەیەکی کۆلۆنیالیزم بکرێت. بەڵام بۆ تەواوی چاخەکان نابێ ئەوەش لە بیر بکەین، بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتنی کۆلۆنیالی سنووردارە. ژمارەیەکی زۆر کەمی دانیشتوان دەکەونە نێو جموجۆڵ و گەڕ. ئەوەی بڵاو دەبێتەوە بە شێوەیەکی زیاتر زانیاری و ئامرازی نوێ و شێوەی بەرهەمهێنانە؛ گرێدراوی ئەمەش پێکهاتەی ئایینی و میتۆلۆژییە. ڕوون کردنەوەی مێژوویی لە شێوەی کۆچی مەزن، بۆچوونێکی زێدەڕۆییە و ڕاست و بەجێ نییە. هەر چاخێکی باڵا، نەك لە بواری جەستەیی بڵاو دەبێتەوە، بەڵکو زیاتر لە سایەی زانیاری، تەکنۆلۆژیا، ئایدیۆلۆژیا و هێزی دەزگاکانی تایبەتمەندێتی بڵاوبوونەوەی هەیە.

ئەوەی زیاتر لەلایەنی کۆلۆنیالیزم ڕۆڵ دەبینێ و پیادە دەکرێت، پەلهاوێشتنی بازرگانی و بەکارهێنانی هێزە، بە گوێرەی پێویستی و ئاستی ئەم پەلهاوێشتنە. کۆنترۆڵ و چاودێری ناوەندی دەسەڵات لە ئامرازی توندوتیژی زیاتر، پشت بە باڵابوونی تەکنیك و بەرهەمهێنان دەبەستێ. هەرچی ئیمپریالیزمە ڕژێمێکی باڵادەستی و داگیرکارییە کە پشت بە دەست بەسەر داگرتن و

زەوت کردنی زۆردارانە دەبەستێ. بە لایەنی کەم لە سەرەتادا زەبر بۆ رژێمی ئیمپریالیستی بە بناخە دەگیردرێت. لەلایەنی مێژووەوە دەستنیشان کراوە لە سەردەمی سەرجۆنی دامەزرێنەری خانەدانی ئەکەدی یەکەمین کرداری ئیمپریالیستیانە پێشخراوە. بەڵام قۆناخەکانی بەر لە ئەویش بینراوە کە گوندێك بە تەواوەتی داگیر کراوە. کاتێك دەوڵەمەندێتی ماددی کەڵەکەی سەر یەك دەبن، ئیدی یان لەلایەن کۆمەڵە دراوسێ هەژارەکان یاخود لەلایەن ناوەندە دەوڵەمەند و بەهێزەکانەوە دەبێتە جێگای داگیرکاری و تاڵان. لە قۆناخەکانی کۆیلەداری و دەرەبەگایەتیدا ئیمپریالیزم دیاردەیەکی زۆر بەهێزە. ئەم چاخانە لەمیانەی خوداکانیان، ئایدیۆلۆژیا و ئەدەبیات و ئامراز و سوپاکانیان، لەهەمانکاتدا چاخی تاڵان و پەلهاوێشتنی ئیمپریالیستی سەرسوورهێنەرانەیە.

لێرەشدا ئەگەر تەنیا پەلهاوێشتن بە زەبرەوە گرێ بدرێ، واقیعی نییە. ئەگەر بێت و چاخەکان بە گوێرەی سیستەمەکانی کۆمەڵگای پێشووی خۆیان دەزگاکانی سیاسی و بەرهەمهێنان بەهێزتر نەبێت، هیچ کاتێك ناتوانن تەنیا لە رێگای بەکارهێنانی زەبرەوە هێز و توانای پەلهاوێشتن نیشان بدەن. ئەگەر بێتو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان باڵاتر بێت، ئەو کاتە زەبر بڵاو دەبێتەوە و دەچەسپێ. باڵابوونی بە دەزگا بوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بناخەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا کە بەرهەمهێنان پشتی پێدەبەستێ، کاتێك لەلایەنی ئەو کۆمەڵگایەی کە بە زەبر چەسپاندوویەتی، بە گوێرەی بەرژەوەندی درێژ خایەنی خۆی خوڵقێنرا، ئەو کات بەبێ ئەوەی پەنا ببردرێتە بەر توند و تیژی، بڵاوبوونەوە هەرس دەکرێت و جێگیر دەکرێ. لە راستیدا چاخی نوێ پەسند دەکرێ. مەترسیدارترین ئیمپریالیزم بۆ کۆمەڵگاکان، ئەو جموجۆڵانەی دەست بەسەر داگرتن و داگیرکارییەکە سیستەمێکی پێشکەوتووخوازی لە پشتەوە نییە و تەنیا پشت بە تاڵانکاری دەبەستێ. گەلێك نموونەی بەمجۆرە لە مێژوودا بینراوە کە رۆڵێکی چەندە تێکدەرانەیان بینیوە. دەشێ لەم بوارەدا مەغۆلەکان وەکو نموونە نیشان بدرێت. بە لانی کەم هێندەی ئەو پەلهاوێشتنانەی کە رۆڵێکی پێشکەوتوخوازانەیان بینیوە، مێژوو پڕە لەو نموونانەی پشتیان بە تاڵانکاری و داگیرکاری بەستووە و رۆڵێکی کۆنەپەرستانەیان بینیوە. هەروەها دیسان بە ئەندازەی ئەو بڵاو بوونەوانەی لەمیانەی توند و تیژییەوە پیادە کراون، مێژوو پڕە لەو داگیرکارییانەی رۆڵێکی پاشڤەڕۆیانەیان بینیوە. دیسان بە ئەندازەی بڵاو بوونەوانەی لەمیانەی زەبرەوە بڵاوبوونەتەوە، لەمەش زیاتر، مێژوو پڕە لەو نموونانەی لە سایەی ئەو بەها باڵایانەی نوێنەرایەتی دەکات، لەسەر بنەمایەکی دڵخوازی و پەسند کردنەوە ئەنجام دراوە.

بابەتێکی دیکە کە لە بڵاوبوونەوەی سیستەمەکانی کۆمەڵگادا بەرچاو دەکەوێ، سەبارەت بە جێنشینی و تایبەت بوونە. هێزەکانی بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتن کاتێك تەنیا رووبەڕووی زەوی چۆل و جڤات و گروپی لاواز ببنەوە، هەم لە بواری جەستەیی، هەم لە بواری کولتووری جێنشین دەبن و دەبنە هێزی خۆجێیی ئەو شوێنە. ئەگەر بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتن بۆ ناوچەیەك بووبێت کە هاوشێوەی خۆی بێت و بناخەیەکی مێژوویی و کولتووری بەهێزی هەبێت، ئەوا لە ماوەیەکی درێژ خایەندا هێزی بڵاوبوونەوە لەلایەن کۆمەڵگا خۆجێیەکەدا دەتوێتەوە. ئەوەی دێتە ئاراوە سەنتێزێکی ئاستی باڵایە، کاریگەری و مۆرکی کولتووری کۆن و خۆجێییەکەی پێوە دەبێت. بە پێچەوانەوە، کاتێك هێزە داگیرکارییەکان دەست بەسەر ناوەندەکانی شارستانییەت دادەگرن، ئەوا لە ماوەیەکی کورتتردا لەلایەن کولتوورە باڵاکەدا قووت دەدرێ. ئەوەی بە رادەیەکی زیاتر ئەنجامی دیاری دەکات، ئەوەیە ئاخۆ ئەو سیستەمەی لە پشت بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتنە، بەرامبەر بە کۆمەڵگای خۆجێیی باڵاترە یان نزمترە. ئەگەر کەسێتی و چینەکانیش خۆ بەدەستەوە بدەن، ئەوا راستینەیەکی کە مێژوو بەخۆیەوە بینیوە ئەوەیە کە کولتوورەکان لەمیانەی بەردەوامی و توانستی هەرسکردنەوە رۆڵێکی دیاریکراو دەبینن لە خوڵقاندنی نوێدا.

لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم باڵابوونی کۆمەڵگای سەرمایەداری سەلمێنراوە. کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی ئەورووپا هەستیان بەوە دەکرد ئامادەن دونیا فەتح بکەن. هەر سیستەمێکی نوێ دەبێتە خاوەن دەزگا، لەمیانەی متمانە بەخۆ بوونی بێکۆتایی و گرتنەبەری رێڕەوی شوێن پەنجەی شارستانییەتەکانی پێشوو، هێواش هێواش لە ناوەندەکانیان سەرهەڵدەدەن. ئەمە لەپادشا سەرجۆنەوە تاوەکو دارا و ئەسکەندەر و قەیسەر؛ ئەو نەریتەی تاوەکو ڤەبوونەکانی ئیسلامییەت بەردەوامی کردووە، ئەم جارە لە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسییەوە بە لێگەڕ (کشف) و ڤەبوونەکانی پورتوگال و ئیسپانیا و ئینگلیز و هۆڵەندا بەردەوام دەکات. سەرمایەداری بیانووی بەهێزتری ڤەبوونی هەیە. لە سەرووی هەموو شتێکەوە تەکنۆلۆژیا و زانستی نوێ لەگەڵ سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی و ئایدیۆلۆژیاکەی بۆ تەواوی دونیا دەگوازێتەوە. سەدەکانی پانزدەهەم و شانزدەهەم زیاتر بە لێگەڕین و دۆزینەوەی دونیا لە رێگای دەرياییەوە بەردەوام دەبێت. ئەمریکا و ئۆستڕالیا وەکو دوو کیشوەری نوێ دەدۆزرێنەوە. لە رێگای دەرياییەوە تاوەکو هیندستان و هیندی چینی دەچن. لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا لە هەموو شوێنێکی جیهاندا کۆلۆنییەکانی بازرگانی جێگیر دەکرێ. کۆمپانیا بەهێزەکانی سەرمایە لە پشتیانەوەیە. ئەو بۆرژوازییەی لەمیانەی پەرەسەندن و شۆڕشەوە لە وڵاتەکانی خۆیدا بە دەزگای بەهێز و بە توانا گەیشتووە، ئیتر تەنیا کەل و پەلەکانی ناباتە دەرەوە، ئیتر گەیشتۆتە ئەو ئاستەی شێوازی ژیان و دەزگا سیاسییەکانیشی بگوازێتەوە دەرەوە. لەگەڵ گۆڕەپانەکانی شارستانییەتی کۆن، تەواوی ئەو ناوچانەی دونیا فەتح دەکرێت کە تاوەکو ئەو کاتە نەدۆزرابۆوە و دەستی لێنەدرابوو. ئەورووپا نزیکەی ١٥٠٠٠ ساڵ لەلایەن دونیا لە سەرووی هەمووشیانەوە لەلایەن شارستانیەتی رۆژهەڵاتی ناوین تێر کرا، ئیتر بۆ ئەنجامدانی دژە هەڵمەتێك هەموو شتێکی ئامادەیە. هەروەکو چۆن لەمیانەی هاوردنی زانست و ئایینی، تەواوی جیهان فێر بوو، ئەوا شۆڕشێکی مەزنی زانستی و تەکنۆلۆژی ئەنجامدا و بەرامبەر بە ناوچەکانی دیکەی جیهان بە جیاوازییەکی مەزن گەیشتووە. بە گوێرەی هەلومەرجەکانی قۆناخ ناشێ هیچ گۆشەیەکی دونیا بە ئاستی ئەو بگات.

ئەو راستینەیەی کە لەمیانەی ئەزموونی ئەورووپاشدا سەلمێنرا ئەوەیە کە شارستانییەتەکان لە ناوەندی ئاوا بوونیانەوە بەرەو ناوچەکانی دی بڵاودەبنەوە. لە پێشکەوتنێکی هاوسەنگی هەموو لایەنێك زیاتر، چەند ناوەندێك دەردەکەون، سیستەمە نوێیەکە لەم ناوەندانە تاقی دەکرێتەوە، دوای ئەوەی باڵابوون توانای خۆی دەسەلمێنێ، ئیدی یان لە رێگای زەبرەوە یاخود لەخۆیەوە لە رێگای بازرگانییەوە بڵاو دەبێتەوە. لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە، بەڵکو بەر لەوانیشەوە، بازرگانی لە ڤەبوونی سەربازی زیاتر، بە شێوەیەکی بەرفراوانتر خاوەنی کارەکتەری ڤەبوونە. لە شێوازی ڤەبوونەکانی ئەورووپاش ئەم راستینەیە دەرکەوتۆتە مەیدان. لە سەدەی هەژدەهەمدا بڵاوبوونەوە لەمیانەی بازرگانی گەیشتۆتە خاڵی هەرە لوتکە و سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم قۆناخێکە جگە لە بازرگانی، هەنگاو بۆ سووڕان و هەناردنی سەرمایە هاوێشتراوە. گواستنەوە و هەناردنی سەرمایە لە گەوهەری خۆیدا گواستنەوە و هەناردنی سیستەمە؛ قۆناخی ڤەبوونی تەواوی دونیایە بە رووی شارستانییەتی سەرمایەداریدا. وەکو تامەزرۆییەك بۆ پیاو ماقووڵە نوێیەکان، لە هەموو وڵاتێکدا بۆرژوازییەکی بەکرێ گیراو دێتە ئاراوە.

لەوانەیە یەکەمین بەکرێ گیراوەکانی مێژوو ئەوانە بن کە بۆ یەکەمین جار کولتووری کشتوکاڵی ئاریانیەکانیان پەیڕەو کرد. دەتوانرێ بە شێوەیەکی بەرچاوتر بەکرێگیراوەکانی سۆمەریەکان ببینرێ. لە بەڵگە نووسراوەکاندا، زۆر بە باشی دەبینرێ و روون دەبێتەوە، بەکرێ گیراوە خۆجێیەکان لە بوارەکانی ئایین و کولتوور و تا دەگاتە شێوازی ژیان، لاسایی سۆمەریەکانیان کردۆتەوە. لە سەرەتای شارستانیەتدا ئەنادۆل و یۆنان و ئیتالیا و هیندستان پڕن لەوانەی لاسایی سۆمەری و میسرییەکانیان کردۆتەوە. بە بێ ئەوەی بە پەروەردەی راهیبەکانی سۆمەر و میسر دا دەرباز بن و رێگاکانی بازرگانی ببڕن و شێوازی ژیانیان بناسن، ئەوا نەك هەر ناتوانن ناوەندی نوێی شارستانییەت بکەنەوە، تەنانەت ناشێ لە ژێر کاریگەری کۆمەڵگای بەربەریش رزگاریان بێت. کاتێك لێتوێژینەوە سەبارەت بە بڵاوبوونەوەکانی شارستانییەت دەکرێ، پێویست دەکات هیچ کاتێك ئەم راستینەیە لە بیر نەکرێت. سەرەتا پارسەکان و دواتریش هێلینیەکان کە لەسەر رێباز و شوێن پێی میسر و سۆمەریەکان، بە گوێرەی خۆیان شێوەیان بە شارستانییەتدا، ئەمانە پێشکەوتنێکن بە رادەیەکی هەرە زۆر مۆرکی خۆیان لە مێژوو داوە. شوێن پەنجەکانیان هێشتا لە خانەکانی بۆهێڵە(جین)کانماندا دەژی. لە سەردەمی شارستانییەتی رۆما بە تایبەتی لە قۆناخی PAX ROMA، بوون بە دار و دەستەی رۆما، پێکهێنانی مۆدێلێکی بچووکی رۆما، مەزنترین ئامانج بوو کە لە سەرووی هەموو شتێکەوە دەهات. یەکێك لەو رێبازە چەسپاو و هەمیشەییەی خوڵقاندنی ستاتۆی بەکرێ گیراوە دەسەڵاتدارە خۆجێییەکان، بەکرێ گیراوێتی رۆمایە. شارستانییەتی ئیسلامی و مەسیحییەتی بێزەنتیەکانیش لە کاتی بڵاوبوونەوەدا، سەبارەت بە خوڵقاندنی سیستەمە بەکرێ

گیراوییەکانی بە گوێرەی مۆدێلی خۆیان شوێن پەنجەی هەمیشەیی و جێگیریان لە سەرتاسەری دونیادا بەجێهێشتووە. لە ئەنجامدا ئەو پێشکەوتنەی بەکرێ گیراوییەی کە لە سەردەمی نئۆلیتیکەوە لەسەر بنەمای بڵاوبوونەوە دەستیپێکرد، لەگەڵ هەناردن و گواستنەوەی بازرگانی و سەرمایەی سیستەمی سەرمایەداری گەیشتۆتە لوتکەی خۆی.

جیهانەکەمان گەورەترین هەنگاوەکانی بە جیهان بوونی خۆی لەدوا چارەگی سەدەی بیستەمدا هاوێشتووە، کە لەگەڵ هەر سیستەمێکی مەزنی پەلهاوێشتن هاوێشتوویەتی. ئیتر هەروەکو بڵێی سنوورەکان هەڵگیراوە و جیهان بە تەواوی بۆتە گۆڕەپانی پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوە. هیچ پێویستی بەوە نەماوە بۆ راکێشانەوەی سەرمایە، توند و تیژی بەکار بهێنرێت. هەروەکو بڵێی سەرمایە دەپارێتەوە ناخوازێ بیکێشنە دواوە. دەشێ بگوترێ جیهان بۆ سەرمایە بۆتە یەك وڵات. ڤەبوونی سەرمایە تەواو بووە. ئەوەی دواتر مەزن بوونی لایەنی چەندایەتی و گەمەی ئەم دەست و ئەو دەست کردنە.

کاتێك تەماشای لایەنی جوگرافی (شوێنی) بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتن بکەین، هەندێ پێشکەوتنی سەرنج راکێش بەرچاو دەکەوێت. ئەوروپا لە دەرئەنجامی هەر دوو شەڕی مەزنی جیهانی و چەندین شەڕی ناوخۆ و شەڕەکانی داگیرکاری کە لە دەرەوە بەڕێوەی برد، ماندوو بووە. لە راستیدا کاتێك سیستەمی خۆی بۆ جیهان گواستەوە، پەرێشانی و ماندوو بوونێك جیگای باسە کە سەرکەوتنی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە نوێنەری شارستانییەتی سەرمایەداری، ئەمریکا بووە کە وەکو قۆناخەکانی هەرزەکاری و سووکەڵەیی ئەوروپا بوو. تەواوی ئەمریکای باکووری کردە ناوەندی خۆی (دەبێ کەنەدا وەکو هەرێمێکی ئامریکایی ببینرێ)، ئیتر هەم قووڵ کردنەوەی بڵاوبوونەوە و هەم کارگێڕی، بووە ئەرکی مێژوویی ئەمریکا. ئەمریکا شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی قووڵتر کردەوە و بە توانایەك گەیشتووە ئەورووپاش تێپەڕ دەکات. لەمیانەی تەکنۆلۆژیای ئەتۆم و خۆزا (فچاو) و ئەنتەرنێت باڵا بووە. رێچکە و رێبازی بڵاوبوونەوەی شێوازی داگیرکاری نوێیە. بە گوێرەی گەوهەرەکەی گەورەکردنی بەشی سەرمایەی سیستەمە سەرمایەدارییە خۆجێییەکان، لەم پێناوەشدا تا دوایی ئاواڵاکردنی دەرگاکانی لەپێش هەڵسووڕانی سەرمایە، بڵاوکردنەوەی کولتووری سەرمایەداری تاوەکو گۆشەکانی دوایی و کەنار و لەم پێناوەشدا بەکارهێنانی ئامرازەکانی راگەیاندن و گەیاندن و کاریگەرییەکانیان، لە سەرووی ئەم رێچکەوە دێت کە پەیڕەوی دەکات. ئەمجارە ئەمریکا هەوڵدەدات سەرلەنوێ جیهان فەتح بکات، تا رادەیەکیش سەرکەوتووە. هەوڵ دەدات دەوڵەتی نەتەوەیی تێپەڕ بکات کە تا ئێستاکە کۆسپە، بەمرەنگە قۆناخ لە تەواوی جیهان بچەسپێنێ ئیتر نەتەوە ـ دەوڵەت لە رۆڵی ئەو کۆسپانە دەچوێنرێ کە نەتەوەیی تێپەڕبکات کە تا ئێستاکە کۆسپە و قۆناخ لە تەواوی جیهان بچەسپێنێ. هەوڵدەدات دەوڵەتی سەردەمێك پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی دروستیان دەکرد، بۆیە بۆ ئەوەی جیهانگیری بە بێ گرفت بەڕێوەبچێت پێویست دەکات بێکاریگەر بکرێت. لەم چوارچێوەیەشدا ئەمریکا وەکو دواترین هێزی ئیمپریالیستییانەی مێژووی شارستانییەت، تەواوی دونیا بە رووی سەرمایەداری پێگەیشتو دەکاتەوە و سەرکەوتووانە رۆڵی مێژوویی خۆی دەبینێ.

ژێرکەوتنی قۆناخی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، کورت خایاندنی ئەو سەردەمەی کردۆتە ناچارییەك. لە راستیدا ئەو قۆناخەی ئەوروپا تەواوی کرد بە جۆرێك بە گۆڕانکاری تێدەپەڕێنێ و سەرلەنوێ ئاوای دەکاتەوە. بە تایبەتیش بە بێ ئەوەی وەکو پێشوو جیاوازی نێوان رژێمەکان بکات، ئەو یارمەتییەی بە بەکرێگیراوەکانی دەدا، هەوڵدەدات زیاتر بە مافەکانی مرۆڤ و پێشکەوتنە دیموکراسییەکانەوە پابەند بکات. بێگومان دوورکەوتنەوەی سەرمایەداری لە کارەکتەری تاڵانکاری گرێدراوی ئەمەیە. بەکارهێنانی وڵات وەکو کۆلۆنییەك کردارێکی سەدەی نۆزدەهەمە و دەخوازرێ بەلاوەبنرێت. نەتەوە ـ دەوڵەت وەکو ئامرازێك کە لەم سەدەیەدا ماوەتەوە، هەوڵدەدرێت بخرێتە نێو رەوشێك بۆ سیستەم لەبار و گونجاوتربێت. گەورەترین گۆڕانکاری لە بواری جیهانیبوونی سەرمایەداری لە سەرتاسەری دونیا لەم چوارچێوەیەدایە. ئەم شەپۆلەی بە جیهانیبوون کە دواترین و گەورەترینیانە، لە "چین"ەوە تا بەرازیل، لە ئەرژەنتینەوە تا تورکیا، لە روسیا تاوەکو ئەندەنوسیا، بە گوێرەی خۆی دەوڵەتی ئازاد و کولتوورەکانیان لەخۆوە دەگرێت و لە ماوەیەکی کورتدا دەگاتە لوتکە و تەواو دەبێت.

گەلێك بەڵگە هەیە، ئەوە نیشان دەدەن رەوشێکی هاوشێوەی ئەوە لە ئارادایە کە هەر شارستانییەتێکی مەزنی مێژوو لە خاڵی لوتکەدا دووچاری هاتووە. هەم لەمیانەی بەراوردکردنی لەگەڵ نموونە مێژووییەکان، هەم پێکهاتەی ناو خۆی سیستەم، ئەوە نیشان دەدەن لەمە بەدواوە قەیران و سەرلەنوێ لە دایك بوونە. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر دەرك بە قۆناخی تەنگژەی سیستەم بکرێت، پێویست دەکات بە شێوەیەکی وردکارانەتر قۆناخی بڵاوبوونەوە و پێگەیشتن چاوی پێدا بخشێنرێ.

لەگەڵ ئەوەی بڵاوبوونەوە لە ناوەندەوە بۆ دەرەوە لە لایەکەوە بەڵگەی پێگەیشتنی سیستەمە، لە لایەکی دیکەوە هەروەکو زۆر جار لە مێژووشدا بینراوە، رێچکەی بەلاوەنانی ئەو قەیران و ناکۆکیانەیە کە رێگای لەپێشدا کردوونەتەوە. لەمیانەی گواستنەوەی ئەو بە پیتییەی رێگای لەپێش کردۆتەوە، ئەوا بەها و بەروبوومێکی زیاتر بەدەست دەهێنێ. ئەمە ئەو لۆژیکەیە کە بناخەی کۆلۆنیالیزم پێکدێنێ. بەڵام گرنگتر ئەوەیە ئەو تێکۆشانە کۆمەڵایەتیەی کە لەسەر بنەمای ئەم بەهایانە پێش دەکەوێت کە هاتوونەتە ئاراوە، بۆ دەرەوە ئاراستە بکرێت و نەرم بکرێتەوە.

لە ناو هەموو سیستەمەکانی شارستانییەتدا، سەبارەت بە قووڵایی پراکتیزەکردنی ئەم رێچکەیە، کۆمەڵگای سەرمایەداری لە هەموویان بە تواناترە. سەرمایەداری لە بواری دەرخستنی تواناکارییەکانی ناوخۆ و دەرەوەی چەوسانەوە بە باشترین شێوە و چەسپاندن و پەسند کردنی لەمیانەی پڕوپاگەندە و نمایشەوە، لە هەموویان باڵاترە. بڵاوبوونەوەی بە بەرفراوانی، بە شێوەیەکی مێژوویی تەواو بووە. هەروەکو دیارە جگە لە بۆشاییەکانی ئاسمان شوێنێکی دی نەماوە فەتح نەکرابێت و قازانجەکەشی زیاتر بێت. تەکنۆلۆژیا کە رێگای لەپێش باڵابوونی سەربازی سیستەمی شارستانییەتی سەرمایەداری کردۆتەوە، ئیتر کاریگەرییەکی بە پێچەوانە نیشان دەدات. بە تایبەتیش ناتۆ کە بەرامبەر بە یەکێتی سۆڤییەت ئاوا کرا، ئیتر دەتوانرێ بگوترێ کە رۆڵی مێژوویی خۆی بینی. ئەو هاوسەنگییە سامناکەی لەمیانەی بۆمبا ناوکییەکان ئاوا کراوە، گوزارشت لە بنبەستبوونێك دەکات. سیستەمی قەڵغانی دژە مووشەکی، کە کاری بۆ دەکرێت، لە قووڵ کردنەوەی بنبەست بوون زیاتر بەولاوە، هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێ. رێکخستن و تەکنۆلۆژیای سەربازی گرانییەکی مەزن و مەسرەفێکە لەسەر سیستەم. هەروەکو بڵێی خۆی لە رەوشێکی پووچەڵ بوونەوەدا دەبینێ. هەنگاوی ئاواکردنی سوپایەکی ئەورووپی گوزارشت لە نیازی رزگار بوون لەم بنبەست بوونە دەکات. ئەم هەنگاوەش، وەکو هێزێکی موداخەلە کردنی ناکۆکییە بچووك و خۆجێییەکان بیری لێدەکرێتەوە. دەشێ ئەمە بە هێزی کێومالّی چەسپاندنی ئاشتیش ناوزەد بکرێت.

هەروەکو ئاماژەی پێکرا، ئەم پێشکەوتنە سەربازییانە لەپێناو نوێ بوونەوە و تەواو بوونی قۆناخی ڤەبوون و دابەشکردنی دونیا و لەمیانەی هاوسەنگی ناوکی سامناك گەیاندنیەتی بە ئارامی و تەبایی. قۆناخەکانی دوای ئەوە، ئامانج ئەوەیە لەمیانەی خۆ پڕچەك کردنێکی کەمتر و خەرجییەکی کەم و هەرزانتر درێژە بە ئاشتی و ئارامی بدرێت. پێڕەوی گشتی جیهانیش بە گوێرەی ئەمەیە و لەبارە. ئیتر تا ئاستێکی مەزن قۆناخی سیستەمی جەمسەری جەمسەری دژ بە یەك تێپەڕ کرا، کە رێگایان لەپێش سوپای مەزن و تەکنۆلۆژیای گران بەها دەکردەوە. ئیتر پێکدادان و کێشمەکێشی جەمسەرگەری لە شێوەی سەرمایەداری ـ سۆسیالیستی سەردەمی بەسەر چووە. ئیتر شەڕە کلاسیکییەکانی رزگاری نیشتمانی بە شێوەیەکی سەرەکی، بە ئامانجی خۆیان گەیشتن و رۆڵیان تەواو بوو. شەڕە چینایەتییەکانی ناوخۆ بۆ ئاستێك دابەزیوە کە دەتوانرێ لەمیانەی دیموکراسی و ئامراز و رێبازە ئاشتیخوازییەکان درێژەی پێبدرێ.

ئەم پێشکەوتنە مێژووییانە وەکو ئاماری سەدەی بیستەم دەتوانرێ زیاتر وەها هەڵسەنگێنرێ کە لە تەواوی چاخەکانی مێژوو خوێناویترە. نەبینراوە کە هیچ چاخێك هێندەی ئەو ماوەیەی سەدەی بیستەم رێگای لەپێش کوشتار و تێکدان کردبێتەوە. بە واتایەکی دیکە مرۆڤایەتی مەحشەری خۆی بینی. وەکو پێویستییەکی رێزگرتن بەرامبەر بە مرۆڤایەتی دەبێ ئەم راستینە بەمجۆرە هەڵسەنگێنرێ. لە قۆناخی ئاواکردنی یەکەمین شارستانییەتدا، مەعشەرەکانی پادشا ـ خوداوەندەکانی سۆمەری و میسرییەکان سنووردار بوون کە تەنیا پشتیان بە میتۆلۆژیا و هەردوو جیهانی بەهەشت و دۆزەخ دەبەست، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا ئەم مەعشەرە لە تەواوی دونیا و لە رێگای ئاستی دێوەزمەی کە هێزی تەکنۆلۆژیا و زانست پێی

گەیشتووە، بەدەستی چەندین مرۆڤی گرگنی بێ شومار خولقێنراوە و بەڕێوەبراوە کە خۆیان کردووە بە خوداوەند. کاتێك مرۆڤ میتۆلۆژیا و زانست بەراورد دەکات، ناتوانێ پرس نەکات ئاخۆ کامەیان مەترسیدارترە؟ مەزن بوونی ئاماری سامناك کە زانست ڕێگای لەپێش کردۆتەوە، وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەبێ پێشی لێبگیرێت.

سەدەی بیستەم گوزارشت لە بە هەلواسراوەیی مانەوەی سەرمایەداری دەکات. ئیتر مسۆگەرە شەڕە مەزنەکان پێویست نین و ناتوانن ببن بە ئامرازێکی چارەسەری. کاتێك بەکار بهێنرێت ئەوا بە واتای خۆکوشتنی خودی ئەو سیستەمە دێت کە بەکاری دەهێنێت. ئیتر سەرلەنوێ شەڕەکانی دابەشکردن، هەم ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیا، هەم ئەو ئازادییە بێسنوورەی کە سەرمایە بەدەستی هێناوە، بێواتایە و بێبەرهەمە و تەنانەت کەوتۆتە ئاستێك گەلێك زیان لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەگەرنا ئەمە سەرچاوەی بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە سەرمایەداری مرۆڤپەروەرە. دیسان یاسای قازانج ڕۆڵی دیاریکراو دەبینێ. کاتێك قازانج جێگای باس بووە لە بەڕێوەبردنی دژوارترین شەڕدا دوودڵ نەبووە. بەڵام کاتێك مەترسی هەڕەشەکردنە سەر قازانج زیادبوو، ئەوا وەکو پێویستییەکی هەمان یاسای قازانج ئەمجارە ئاشتی دەکاتە ناچارییەك. ئەم هاوسەنگییە لە نێوان قازانج و تەکنۆلۆژیا ئاوا کراوە. بە شێوەیەکی بابەتییانە، سەرلەنوێ هەلگیرسانی شەڕی مەزنی دابەشکردنی بێواتا کردووە. بەڵام دیسان کاتێك باوەڕی بەوە کرد شەڕ ڕێگا لەپێش قازانجێکی مەزن دەکاتەوە، ئەوا پەنا دەباتە بەر شەڕ و ئەمەش بە گوێرەی یاسای قازانج کردنە. ئەو سەرمایەدارییەی لە قۆناخی لوتکە دایە، ئەم ڕاستینەیە ناچاری قۆناخێکی پەڕینەوەی دەکات.

ئەوە بەرچاو دەکەوێ کە تەواوی سیستەمەکانی شارستانییەت بە سێ قۆناخی مێژووییدا دەربازبوون: دامەزراندن، بە دەزگا بوون و لوتکە. قۆناخی دامەزراندن زیاتر بە واتای لەدایکبوون و پێشکەوتن دێت، بە واتایەکی دیکە منداڵێتی و هەرزەکارییە؛ بە دەزگا بوون، بە واتای لاوی و گەیشتن بە کەسایەتی و ناسنامە دێ؛ هەرچی گەیشتنە لوتکەیە، گوزارشت لە قۆناخی پیر بوون دەکات. لە مێژوودا دەبینرێ سۆمەریەکان، میسرییەکان، ڕۆما، فارسەکان، چینییەکان، هیندییەکان و ئیسلامییەکان ئەم قۆناخەیان بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشانە تێپەڕ کردووە. تەواوی سیستەمە گرنگەکانی شارستانییەت لە قۆناخەکانی کۆتاییاندا ڕووبەڕووی دووڕیانێك دەبنەوە. ئەو خراپییانەی کۆن بوون لەگەڵ خۆیاندا دێن، یان ئەوەتا لە ڕێگای سەرلەنوێ ئاواکردنەوە یاخود ریفۆرم هەوڵی تێپەڕ کردنی دەدرێت. بەرامبەر بەو هێزانەی دەخوازن بیرووخێنن هەردوو ڕێچکەش بەکار دەهێنرێ. ڕستۆراسیۆن (سەرلەنوێ ئاواکردنەوە) گوزارشت لە شێواز و تەرزی پاشڤەڕۆ دەکات. کاتێك دژە شۆڕش بەرامبەر بەو هێزانە سەردەکەوێت کە ڕۆڵی شۆڕش دەبینن، ئەوا ئەو قۆناخەی ڕژێمە دامەزراوەکان تێیدا دەژیت بە سەرلەنوێ ئاواکردن ناو دەبرێت. دەتوانرێ سێیەمین خانەدانی ئووری سۆمەریەکان و قۆناخی نوێی پادشایەتی ٢٠٠ ساڵی دوایی تەمەنی ڕۆما، وەکو نموونە نیشان بدرێت. لەم قۆناخەدا شکۆدارێتی جاران سەرلەنوێ زیندوو دەکرێتەوە، هەوڵ دەدرێ لەسەر هەمان بنچینە پتەوتر بکرێت. دەوڵەتگەرایی پێش دەخرێت، بە شێوەیەکی توند یاساکان پەیڕەو دەکرێت، هەروەکو بڵێی بەرەو سیستەمی قۆرخ کردن هەنگاو نراوە. لەمیانەی زاراوەیەکی گشتی ترەوە، ئەو ڕژێمانەی کە لەپێناو لەسەر پێمانەوە و هەڵنەوەشانەوەی سیستەم پێشخران، لە جێگای خۆیدا دەبێت ئەگەر بە فاشیزم ناوزەد بکرێن. جیاوازی نێوانیان لە تایبەتمەندێتی سیستەمەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێت.

ریفۆرم قۆناخێکی جیاوازترە. لەجیاتی ڕووخان لە ئەنجامی توند و تیژییەوە، ڕێککەوتن لەگەڵ هێزە بەرامبەرەکان و پێبەپێ گۆڕانکاری سیستەم و سەرلەنوێ شێوەگرتن بە بنەما دەگرێت. لە مێژوودا دەبینرێ ئەو نموونەیەش بە شێوەیەکی بەربڵاو پەیڕەو کراوە. لە ڕەوشێکدا کە هێزەکانی شۆڕش ـ دژە شۆڕش بەسەر یەکتردا سەرنەکەون یاخود کاتێك بخوازرێ ڕێگا لەپێش قۆناخی خوێناوی و تێکدەرانە بگیردرێ، ئەوا ڕێچکەی ریفۆرم دەبێتە ناچارییەك. ئەگەر ڕەوشێکی هەرە کۆتاییش بێت، واتای سەرکەوتنی شۆڕشە. لەجیاتی ڕژێمە کۆن و ڕووخێنراوەکە، لەمیانەی تەگبیری خێرا و ریشەییانە، هەنگاو بە هەنگاو پرۆگرامی هێزە کۆمەڵایەتیە شۆڕشگێڕەکان پراکتیزە دەکرێت. بە شێوەیەکی چڕ و بەرفراوان دەبینرێ کە چەندین گۆڕانکارییە مەزنەکانی مێژوو، لە ڕێگای شۆڕشەوە بەدیهاتووە. هەڵبەتە ژیان ڕەش و سپی نییە و قۆناخ و ڕێچکەی جیاواز لە ناو یەکتردا دەژین، بە خێرایی لە قۆناخێکەوە بۆ قۆناخێکی دیکە دەگوازرێنەوە و ڕەوشی تێکەڵاو و ئاڵۆزیش دەبینرێ. زۆر بە باشی جیاکردنەوەی قۆناخەکانی پەڕینەوە (الانتقال)ی سیستەمەکان، بۆ گەیشتن بە هەڵسەنگاندنێکی ڕاست، جێگای گرنگی و بایەخ پێدانە.

کاتێك سیستەمی شارستانییەتی سەرمایەداری بۆ چەند قۆناخێك جیا بکەینەوە، دەتوانرێ سەدەکانی ١٢ تاوەکو ١٦ ئاوا بوون و پێشکەوتن، سەدەکانی ١٧ ـ ١٩ بە دەزگا بوون و بڵاوبوونەوە، سەدەی بیستەمیش وەکو قۆناخی لوتکە و سەرلەنوێ دابەش کردنی جیهان لەمیانەی شەڕ لە قەڵەم بدرێت. ئاستی بە پرەنسیپ بوون و دەزگا بوون لە دوو قۆناخەکەی یەکەمدا ئەنجام دەدرێت. قۆناخی لوتکەی هەر دیاردەیەك زەمینە بۆ قەوارەکانی دواتر ئاوا دەکات. لە قۆناخی لوتکەی سەرمایەداریش پێشکەوتنی هاوشێوە لە ئارادایە. ناکۆکییە سەرەکییەکانی سیستەم بە باشی کامڵ بووە و سەنتێزی نوێی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە. گۆڕینی ناکۆکییەکان بۆ پێکدادان، پەیوەندی بە ئاوا بوونی نوێوە هەیە. لە کاتێکدا گۆشەکان نوێ و لە ناو یەکتردا پێویستییان بە یەکتر هەیە. تویکڵی ڕژێمە کۆنەکە بە تەواوەتی فڕێ نەدراوە. ئەو پێکدادانانەی لە نێوانیاندا هەیە دەشێ ڕێگا لەپێش خنکانی هەردووکیان بکاتەوە. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا کاتێك هەر دووکیان بە یەکەوە دژی سیستەمە کۆنە رووکەشیەکە دەربکەون و دوای ئەوەی تێکی بشکێنن، دەرفەتی پێشکەوتنی ئازادانەیان دەست دەکەوێت. تاوەکو قۆناخی شۆڕشی بۆرژوا دژی دەرەبەگایەتییە، دوو چینی سەرەکی، بۆرژوازی و پرۆلیتاریا بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە. دوای سەرکەوتنی شۆڕش کە بۆرژوا بە پێشەنگایەتی خۆی سەرلەنوێ دەزگاکانی کۆمەڵگا ئاوا دەکات، ئەم بەیەکەوە بوونە کۆتایی پێدێت.

شۆڕشی بۆرژوازی فەرەنسا و پەلامار و سەفەرە مەزنەکانی بڵاوبوونەوەی بە ڕێبەرایەتی ناپلیۆن ئەنجام دەدرێت، نموونەی هەرە بەرچاوی قۆناخی بە دەزگا بوون و پەلهاوێشتنە. سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ساڵانی ١٨١٥ ـ ١٨٣٠ پاشماوەکانی سیستەمی کۆن، دواترین هەڵمەتی سیستەمی دەرەبەگایەتییە. سەرباری تەواوی تەگبیرەکانیان، ناتوانن کۆسپ بخەنە پێش بە دەزگا بوون و بڵاوبوونەوەی شۆڕش لە سەرتاسەری جیهاندا. ئیتر قۆناخی بۆرژوازییەتی کۆمەڵگای چینایەتی لەسەر شانۆی مێژوو بەڕێوە دەچێت. لە شێوە گرتنی هزرییەوە تاوەکو شێوە گرتنی ڕۆحی، لە ئابوورییەوە تاوەکو سیاسەت و سەربازییەوە لە هەموو بوارێکدا بە گوێرەی چینی نوێی دەسەڵاتدار، سەرلەنوێ شێوە دەگرێت. ئەمە ئەو قۆناخەیە چینی دەسەڵاتدار لە کەسایەتی خۆیدا تەمەنێکی بێ سنوور و کۆتایی بۆ سیستەم دادەنێت. هیچ شوێنێك نەماوە دەستی بۆ درێژ نەکردبێت و لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خۆی نەدیبێت. هەر هەمووی بە گوێرەی تێڕوانینی خۆی هەڵێدەسەنگێنێ، لەمیانەی یاساکانی خۆیەوە دادگایی دەکات و بە گوێرەی شێوازی ژیانی خۆی دەزگاکانی ئاوا دەکات. تەنیا ئەوە نییە کە بیر بکاتەوە و قسە بکات، لەهەمانکاتدا ڕەواترین ئیرادەی بەڕێوەبردنە. ئیتر بە یەکەوە بوونی بۆرژوازی لەگەڵ چینی زەحمەتکێش نەماوە کە وەکو دژێکی خۆی بەخێوی دەکات، ئیتر قۆناخی پێکدادان لە نێوانیان دەستپێکردووە. لەمیانەی پراکتیکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ڕۆژ بە ڕۆژ جیاوازی ئایدیۆلۆژی سەرهەڵدەدات.

بەم واتایە سەدەی نۆزدەهەم سەدەی جیابوونەوە و یەکلابوونەوەی ناسنامە چینایەتییەکانە. ڤەبوونی خێرای لیبرالیزم بە ناوی بۆرژوازییەت و سۆسیالیزم دەبینرێ کە بە ناوی چینی زەحمەتکێشەکانە و یەکسانی بە بناخە دەگرێت. ئیتر ململانێی ئایدیۆلۆژی وەکو جاران لە نێو ئایدیۆلۆژیای چینی دەرەبەگایەتی کە شێوەیەکی ئایینی هەیە، لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای بۆرژوازی نییە کە لەسەر بناخەیەکی زانستییە و علمانییە. لیبرالیزمی بۆرژوازی و سۆسیالیزمی زەحمەتکێشان، ناسنامەی نوێی ململانێی ئایدیۆلۆژین. بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا تێکۆشانی زەحمەتکێشان لەسەر بنەمایەکی زانستی دەبێتە خاوەن چوارچێوەیەکی ئایدیۆلۆژی. ئەوەی عیسا لەمیانەی "ئینجیل"ەوە ئەنجامیدا، کارل مارکس دەخوازێ لە ڕێگای کتێبی "سەرمایە"وە ئەنجامی بدات. لەمیانەی تێکۆشانی زەحمەتکێشانەوە لە ناوەندەکانی شارستانییەت سەد ساڵ، چڕوپڕ دەرباز دەبێت. یەکەمین و دووەمین ئەنتەرناسیۆنال دەبەسترێ. جوڵانەوەی نوێی جیهانی چەوساوەکان ئومێدێکی مەزن بە مرۆڤایەتی دەبەخشێ.

لە گۆڕەپانەکانی بڵاوبوونەوەی بەدەر لە ناوەند، هەروەکو سەرهەڵدانەکانی سەردەمێکی تیرەکان، ڕەوتەکانی ڕزگاری نەتەوەیی کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان سەرهەڵدەدات. دەوروبەر لەمیانەی ئەو چەکانەی شارستانییەت، هەوڵی خۆ پاراستن و ڕزگار بوون دەدات کە لە ناوەندەوە بەدەستی کەوتووە. لە بواری ئایدیۆلۆژیدا نەتەوەپەرستی، لە واری تەکنۆلۆژیشدا چەکی ئاگرین، بە پێی پێویست بەدەست هێنراوە. سەدەی بیستەم بە شێوەیەکی بەرفراوان دەبێتە شایەدی جوڵانەوەکانی ڕزگاری نیشتمانی و دەوروبەر. ئەو ڕێککەوتنەی جوڵانەوەی زەحمەتکێشان و جوڵانەوەی نەتەوەیی لە لاوازترین خاڵ واتە لە ڕوسیا ئەنجامیدا، بۆ یەکەمین جار لە نێو هەلومەرجی شارستانییەتدا هەنگاوێکی سەرکەوتووانەی ئەوتۆ دەهاوێژرێ کە ئازادی و یەکسانی بە هەر کەسێك دەکەوێت. بەڵام دوای بەسەرچوونی ٧٠ ساڵ، ئەو شارستانییەتەی کە پشت بە پێکهاتەی هەزاران ساڵەی کۆمەڵگای چینایەتی دەبەستێ، دەتوانی ئەم ئەزموونە وەکو خۆی لێبکات و لە ناوەوە هەڵیوەشێنێتەوە. هەرچەندە ئەزموونەکەی سەرکەوتووش نەبووبێت، ئەوا لەمیانەی ئەو پەند و وانانەی سەبارەت بە ڕێچکەی سەرکەوتنەوە پێشکەشی کردووین، سەردەکەوێ لەوەی ببێتە بەردی گۆشەی بناخەی مێژوو. شارستانییەتی سەرمایەداری لەم گۆڕانکارییە دەترسێ و یەکەمین و گرنگترین هەنگاو بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوە دەهاوێژێ. ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی کە هیتلەر ڕێبەرایەتی کرد، لە ڕاستیدا وەڵامێکی گشتی سەرمایەدارییە بەرامبەر بە سۆسیالیزم، کە لە بەرامبەریدا کەوتبوونە نێو ترسێکی مەزنەوە؛ گوزارشت لە سەرلەنوێ ئاواکردنێك دەکات کە لە نێو زەمینەی دژە شۆڕشدا ئەنجامدرا. ئەم هەنگاوەش، ئەنجامی ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە ئەوروپا پێشەنگایەتی سەرمایەداری لەدەست بدات و بکەوێتە دەست ئەمریکا. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا ناوەندی هەرە لەپێشینەی سەرمایەداری ئەمریکای باکوور و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. دەوڵەتە نەتەوەییەکان نەخشەیەکی نوێیان لە سەرتاسەری جیهان پێك هێناوە. سەرباری ئەو لاوازییانەی لە بناخەکەیدا هەبوو، سۆسیالیزمی بونیادنراو توانیویەتی هەندێ سەرکەوتنی مێژوویی بەدەست بێنێ. دوای قۆناخی فاشیزم لە ئەمریکا و ئەوروپا دا هەنگاوی مەزن بۆ پێشخستنی دیموکراسی دەهاوێژرێ. دەست لە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی فاشیزم بەردراوە و بەرەو ڕیفۆرمی دیموکراسییانە هەنگاو هاوێشتراوە.

سەدەی بیستەم لەمیانەی شێواز و ڕێچکەکانی ئیمپریالیستی و ڕزگاری نەتەوەیی، سۆسیالیستی و دیموکراتی و شۆڕش و شۆڕشی چەواشە، سەرلەنوێ ئاواکردن و ڕیفۆرم، کودەتا و دژە ـ کودەتا بە خوێناوترین شێوە جێگای خۆی لە مێژوو گرتەوە. دەشێ ئەم قۆناخە بە قۆناخی شێت بوونی مرۆڤایەتیش ناو ببرێت. لەم قۆناخەدا ترسناکترین چەك بەکار هێنراون. تەواوی باوەڕی و بەها ئەخلاقییەکان ژێر پێ خران. نەك تەنیا ناوەوەی کۆمەڵگا، بەڵکو ئەو ژینگە و سروشتەی تێیدا نیشتەجێ بووە، ڕووبەڕووی قۆناخێکی لە ناو چوون بووە. چاوچنۆکی سەرمایەداری بۆ قازانج وەکو ئیرادەیەکی نوێی ئیلاهی ڕۆڵ دەبینێ و بناخەی ئەم پێشکەوتنانە پێکدێنێ. ئەو زێدە بەرهەمە نادیارەی لە دەستپێکی ئاواکردنی سیستەمی کۆیلەداری هەبوو و پادشا خوداوەندەکانی خوڵقاند. هەرچی زێدە بەها نادیارەکەی سەرمایەیە، ئەم پەرەسەندنەی گەیاندۆتە لوتکە، پادشا ـ بێ خوداکانی بە شێوەی هەرەس ئاسا و مەترسیدارتر لەسەر سەری مرۆڤایەتی کردۆتە بەڵا.

لەبەر ئەوەی تازە سەدەی بیستەم تەواوبووە، لەوانەیە هێشتا بۆ هەڵسەنگاندنێکی گشتی زووبێت. بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئەم سەدەیە بووە سەدەی هێرشی تەواوی هێزەکانی شارستانییەتی چینایەتی بە تایبەتیش هێرشی شارستانییەتی سەرمایەداری بە شێوەیەکی دڕندانە بۆ سەر ئەو خەیاڵە سنووردارەی یەکسانی و ئازادی کە زەحمەتکێشە چەوساوەکان دەیانخواست بۆ خۆیانی بونیاد بنێن. هێرشێکی هاوشێوەی ئەمەش لەو سەردەمەدا ئەنجامدرا کە شارستانییەتی ڕۆما لە لوتکەدا بوو. لە ساڵانی ٧٠ ی پ.ز یاخیبوونی سوپای کۆیلەکان "گلادیاتۆر"ی سپارتاکۆس بەرامبەر بە کۆیلەدارەکان بە شێوەیەکی دڕندانە سەرکوتکرا، ٥٠٠٠ کەس ڕیز کران و یەك لە دوای یەك لە خاچ دران. کاتێك سیستەمەکان لە جەرگەوە هەڕەشەیان لێبکرێت، دوودڵ نابێ لەوەی هاریتییەکی بەمجۆرە پراکتیزە بکات.

ڕاستە کە قۆناخی جوڵانەوە شۆڕشگێڕی و نەتەوەییەکانی سۆسیالیزم بەرەو دواوە چوو، یاخود ئەم قۆناخە بەسەر چوو. بەڵام ئەمەش ڕاستە کە ئەو سەرمایەدارییەی لە ئارادایە وەکو سەرمایەداری کۆن درێژە بە هەبوونی خۆی نادات. نە سەرکەوتنی شۆڕش بە تەواوی بەدیهاتووە نە هی شۆڕشی چەواشە؛ سەرکەوتنی تەواوەتی ئیمپریالیزم و سەرکەوتنی جوڵانەوەکانی ڕزگاری نیشتمانی بەدی نەهاتوون. سەرلەنوێ ئاواکردن و ڕیفۆرم هەردووکیان لە سەرکەوتن دوورن. ئەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم هاتۆتە ئاراوە، لە هەموو بوارێکەوە ڕەوشێکی نوێیە.

ڕاستە کە سەرمایەداری لە هەموو شوێنێکدا؛ وڵاتە سۆسیالیستەکانیش لە ناودا، هەوڵ دەدات پێشکەوێت، وەلێ ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت ئەو چینەی کە بانگەشەی لەسەر پێ مانەوە دەکات، سەرمایەدارییە، کە لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت پێش دەخرێت. هەروەها ئاشکرایە کە لە تەواوی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمریکای باشوور و لە هەموو وڵاتە ورد و درشتەکاندا، سەرمایەداری هەوڵ دەدات وەکو سیستەم بە دەزگا ببێت. بە شێوەیەکی قووڵ گونجاندنی سیستەم بەڕێوە دەچێت. بەڵام دیسان ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت ئەوەی ڕوودەدات لە مێژووی شارستانییەتدا ڕەوشێکە لە چاخی سەرمایەداری جیاوازترە. بێگومان چەندین دەرئەنجام هەن کە ئەم قۆناخە دیاری دەکەن. شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لەسەرەوە دێت. هەروەکو دەبینرێ لە وەرچەرخانەکانی شارستانییەتدا هەموو کاتێك زانست و تەکنۆلۆژیا ڕۆڵی پێشەنگایەتییان بینیوە. ئەو ئاستە نوێیەی کە زانست و تەکنۆلۆژیا پێی گەیشتووە، ڕەوشی جیاوازی بۆ بەدەست هێنانی قازانج خوڵقاندووە. تەکنۆلۆژیای ڕاگەیاندن و گەیاندن زەقترین نموونەیەتی. هەروەها ئەمەش پێشکەوتنێکی جیاوازتری مێژووییە کە سەرمایە بەبێ هیچ ئاستەمێك و کۆسپێك لە هەموو لایەکدا بۆتە خاوەنی هێزی پاشەکەوت و بەکار بردن. کات ژمێرەکانی کات بە شێوەیەکی جددی کەم بۆتەوە. ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت کۆلۆنیالیە کۆنەکان خراونەتە ڕێڕەوی گەشەکردنی سەرمایەداری. هەر هەمووی بە سەرمایەی دارایی گرێ دراوە. سەرمایەی دارایی لە ڕێگای بازاڕەوە (بۆرسە) لە سەرتاسەری دونیادا زاڵ بووە. ئەو حکوومەتانەی ملکەچیان بۆ نەکردووە هێندە کەمن، دەتوانین بڵێین نین. لە کاتێکدا لە ڕابردوودا شەڕ ئامرازێکی بەدەست هێنانی قازانج بوو، وەلێ لەم ڕەوشە نوێیەدا بۆتە کۆسپ. ئەوەی زیاتر بۆ بەدەست هێنانی قازانج پێویستە، ئەو سەرمایەدارییەیە کە بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بچێت.

بێگومان زانست و تەکنۆلۆژیا ڕۆڵێکی دیاریکراو لە تەواوی ئەم پێشکەوتنانە دەبینێ و لە جێگای خۆیدا نابێت ئەگەر بگوترێ ئەم پێشکەوتنانە لە ئەنجامی ئیرادەی یەکلایەنەی سەرمایەداری بەدیهاتووە. لە سەرووی هەموویانەوە سۆسیالیزمی بونیادنراو، تێکۆشانەکانی ڕزگاری نیشتمانی و دەسکەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی کە بەرهەمی تێکۆشانی زەحمەتکێشانی ناوەندە بەهێزەکانی شارستانییەتە و لەمیانەی دەستوورەوە گەرەنتییان کردووە، بە لایەنی کەم هێندەی زانست و تەکنۆلۆژیا ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبووە، لەمیانەی ئیرادەی خۆیانەوە هاوسەنگییەکیان لەگەڵ ئیرادەی سەرمایەداری ئاوا کردووە. لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لەجیاتی سەرکەوتنی ڕەهای لایەنێك، مێژوو شایەدی دەرکەوتنی ڕەوشێکە بۆ ڕێککەوتنی هەردوولا گونجاوە. بۆ یەکەمین جارە هێزەکانی کۆمەڵگای چینایەتی لە مێژووی شارستانییەتدا، هەرچەندە لە نێو زەمینە و هەلومەرجێکی یەکسانیش نەبێت، لە ژێر سایەی ڕژێمێکی دیموکراسییانەی بەرفراوان و لە نێو زەمینەی ئاشتیدا لەسەر بنەمای دیاری کردنی چارەنووسیان بە شێوەیەکی ئازادانە ڕێککەوتوون. شارستانییەتی دیموکراسییانە خەیاڵ نییە، ڕاستییەکە.

## د ـ قەیرانی گشتی شارستانییەت و چاخی شارستانییەتی دیموکراسی

هەرچەندە دەستەواژەی ـ "کۆتایی مێژوو" راستیش نەبێ، ئەوا ئاماژەکردن بەوەی کە تایبەتمەندێتی شارستانییەتی پشت بەستوو بە کارەکتەری چینایەتی کۆتایی پێهاتووە، نزیك بوونەوەیەکی واقیعییە. ئەگەر مێژوو تەنیا بریتی بێ لە تێکۆشان و ململانێی چینایەتی، لەم چوارچێوەیەدا واژەی، کۆتایی بە مێژوو هات، واتایەکی خۆی دەبێ. ئەو بناخە سەرەکییەی کە شارستانییەتی ئاوا کرد، هێزی تەکنیك (ئامرازە) کە کۆمەڵگای نئۆلیتیك خوڵقاندوویەتی. ئەم هێزەی ئامرازەکان و لە خاکە بە پیتەکانی ئەم جوگرافیایەی بۆ ئاودێری گونجاوە، لەمیانەی رێ کردنەوەی بۆ زێدە بەرهەمێك کە ئێجگار زۆر لە ئاستی بەکاربردن زیاتر بوو، زەمینە و ئامادەکاری بۆ لەدایکبوونی کۆمەڵگای چینایەتی کردووە و رەخساندووە. بە شێوەیەکی سروشتی جیابوونەوە لە جۆری بەڕێوەبەر ـ بەڕێوەبراو، دەرفەتی بە دەرکەوتنی دەوڵەت داوە. ئەم دیاردەیەی کۆمەڵگا کە بۆ یەکەم جار لە میزۆپۆتامیای خوارووا ئەنجامدرا، گوزارشت لە شارستانی بوون دەکا. ئاشکرایە کە ئامراز ـ تەکنۆلۆژیا ـ لە گەوهەری شارستانییەتدا شاراوەیە. کاتێك ئامراز دەکەوێتە نێو تواناکارییەکانی پێشکەوتن، ئەوە بە واتای ئەوەش دێت کە لەمیانەی ئامرازەوە پێش دەکەوێ.

تەکنیك (ئامراز) کە لەسەر بنەمای چینایەتی کۆمەڵگا ناچاری پارچەبوون دەکا، رێگا لەپێش کارتێکردن و کاریگەرییەکی دوو لایەنە دەکاتەوە. لە قۆناخی یەکەمدا بناخە لاوازەکەی ئامرازەکان، جیابوونەوەی چینایەتی لە بنەوانەوە دەکاتە ناچارییەك. تەنانەت خودی مرۆڤیش وەکو ئامرازێکی تەکنیکی (الە) بەکار دەهێنرێ. خودی کۆیلە وەکو لێهاتووترین ئامراز دەبێتە بابەتی بە موڵك کردن، ئەمەش ریشەدارترین پارچەبوونی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دێنێ کە بە شێوەی کۆیلە و خاوەن کۆیلەکانە. کۆیلایەتی مرۆڤ، ئەنجامێکی لاوازی بناخەکانی ئامرازە (تەکنیکە). بە ئەندازەی ئەوەی تەکنیك (ئامرازەکان) پێش دەکەون جیاوازی نێوان ئاستی چینەکان کەم دەبێتەوە.

تەنانەت لە قۆناخەکانی دوای کۆیلایەتیش، بە تایبەتیش کاتێك ئامراز و ئامێرە لە ئاسن دروست کراوەکان پەرەدەسێنێ، ئەو جیاوازییە قووڵەی چینایەتی کەم دەبێتەوە. بەڵام لێرەدا بابەتی هەرە گرنگ، پەیوەندی نێوان ئاستی تەکنیك (تەکنۆلۆژی) و جیابوونەوەی چینایەتییە. تەنانەت زانینی ئەوەی کە ئامراز لە کامە ئاستدا رێگای لەپێش جیابوونەوەی چینایەتی کردەوە، سەبارەت بە تێکۆشانی ئازادی کۆمەڵگا گرنگ و بایەخدارە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا پێشخستنی تەکنیك، دەبێتە زەمینە و هەلومەرجی بابەتی، پێشخستنی ئازادی. لە قۆناخی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا جێگرتنەوەی لایەنی بەرهەمی کارگەکان لەجیاتی بەرهەمی مانیفاکتۆرا، لە پەیوەندییەکانی چینایەتیشدا رێگای لەپێش گۆڕانکارییەکی ریشەیی کردۆتەوە. ئامێرە پێشکەوتووەکانی کارگە، ئاواکردنی شێوازێکی پەیوەندی کۆیلەداری لەسەر چینی کارکەر بێ واتا کردووە. تەنانەت شێواز و تەرزێکی بەمجۆرەی پەیوەندی لەگەڵ گەوهەری شێوازی بەرهەمهێنانی کارگە، ناکۆك و پێچەوانەیە. شێوازی بەرهەمهێنانی پێشکەوتووانە، ئەگەر بە شێوەیەکی سنووردداریش بێت، پێویستی بەوە هەیە چینی کارکەر ئازادانە رەنجی خۆی بەکار بێنێ. مامەڵەکردن و هەراجکردنی رەنج بە شێوەیەکی سەربەست، یەکێکە لە پرەنسیپەکانی سیستەم. بەڵام ئەو زەمینە ماددییەی دەرفەتی ئەمە دەدات خودی کارگەیە.

لە مێژووی ئامێر (تەکنۆلۆژیا)دا قۆناخی سەرمایەداری پێشکەوتنی مەزنی بەخۆیەوە بینیوە. بۆ یەکەمین جار دابڕانی نێوان زانست و تەکنۆلۆژیا لە ئارادا نامێنێ، دەبن بە دوو فاکتەر کە یەکتری تەواو دەکەن. بە تایبەتیش لە سەدەی بیستەمدا شۆڕشێکی مەزنی زانستی تەکنۆلۆژی بەدیدێت. لەم سەدەیەدا جگە لە تەکنۆلۆژیای میکانیکی، بۆ یەکەمین جار تەکنۆلۆژیای ئەلەکترۆنی و ناوەکی پەرەی پێدراوە. پێشکەشکردنی هەر دوو تەکنۆلۆژیا و بەکارهێنانیان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی، تەواوی داب و نەریتە باوەکانی سەراوبن کرد. بە تایبەتیش ئەم لە بوارەکانی سیاسەت و دەوڵەت و سەربازیدا ئەنجام دانی وەرچەرخانی مەزنی کردۆتە ناچارییەك.

دەوڵەت کە سیاسەتێکی چڕکراوەیە و بەدەزگابووە، داهێنان و ئامرازێکی چاخی کۆیلەدارییە. کاتێك کۆمەڵناسی مارکسیزم زیاتر لەسەر بنەمای ئابووری، سەرمایەداری شیکردۆتەوە، رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کەم و کوڕی مەزن لەم بوارەدا روو بدات. ئەوانەی یەکەمین پرەنسیپ و شێوەی دەوڵەتیان دیاریکردووە، راهیبەکانی سۆمەرن، هیچ بنەمایەکی زانستی نییە. دەوڵەت ئامرازێکە قەبەترین چەوسانەوەی چینایەتی بەڕێوە دەبات، پشت بە هزری میتۆلۆژی (ئەفسانەیی) دەبەستێ کە زۆر لە هزری ئایینیش دواکەوتوترە. بە گوێرەی تێڕوانینی راهیبەکان، دەوڵەت نموونەی سیستەمە نەگۆڕەکەی ئاسمانە لەسەر زەوی. هەروەکو چۆن خوداوەندەکان، ئاسمان بەڕێوە دەبەن، دەبێ دەوڵەتیش بەمجۆرە، سەر زەوی بەڕێوە ببات. بەڕێوەبەرایەتی خوداوەندەکان لەگەڵ پیرۆزی دەکرێن بە یەك، ئەوا هەمان شت بۆ بەڕێوەبەرێتی دەوڵەتیش پەیڕەو دەکرێت. بۆچوونی پیرۆز بینینی دەوڵەت، بیروباوەڕی ئەفسانەیی راهیبەکانی سۆمەرە کە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام بووە، بۆچوونێکی هەرە مەترسیدارە کە گەندەڵترین چەوسانەوە و فشاری کۆن رەچاو دەکات.

دەتوانرێ بگوترێ بە درێژایی مێژووی کۆمەڵگای چینایەتی لە بواری بابەتی دەوڵەتدا، ئەم تێڕوانینەی سۆمەریەکان بەهێزکراوە و درێژەی پێدراوە. هەر چینێکی نوێی سەردەست، ئەمەی کەمێکیتر پتەو کردووە. لەوانەیە دەوڵەت لە سەرووی ئەو ئامرازە کۆنانەوە بێت کە نەگۆڕدراون. تاوەکو ئێستاش دەوڵەت لە سەرووی ئەم بابەتانەوە دێت کە لە نێو راستینەکانی کۆمەڵگا بە نەناسراوی ماونەتەوە. تەنانەت سەرباری ئەوەی ئایینەکانیش دووچاری گۆڕانکارییەکی مەزن هاتوون، بەردەوام دەوڵەت دەخرێتە نێو بۆتەیەکی پیرۆز و هەوڵی پاراستنی دەدرێ. بە هۆی گرنگی و بایەخەکەی بۆ چینی چەوسێنەر و سەردەست، ئەم شێوەیەی پێدەدرێت و بەمجۆرە هەڵدەسەنگێنرێت. لەبەر ئەوەی نزیکبوون و هەڵوێستەکانی سەبارەت بە سیاسەت و سەربازی، پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەیە، بۆیە هاوشێوەی نزیك بوونەوەیە لە دەوڵەت. دەوڵەت لەمیانەی کاروباری سیاسی و سەربازی و بە پشت بەستن بە بنەما تەکنۆلۆژیەکان، سیستەمی چەوسانەوە و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی بەڕێوە دەبات. ئەگەر پێویست بێ، زەبر بەکار دێنێ و بەردەوام ئەم پەیڕەوە پتەو دەکات.

ئەو دەوڵەتەی سەرمایەداری وەریگرتووە، تەواو داهێنانێکی بەمجۆرەی راهیبە سۆمەریەکانە. لەبەرئەوەی هەر چینێکی سەردەستی چەوسێنەر، باش دەزانێ کە ناتوانێ یەك رۆژ بە بێ دەوڵەت بژی و بەردەوام بەدوای گەرەنتی دەوڵەتدا دەگەڕێ، بۆیە لە ئاستی پەرستن بەو ئامرازەی دەوڵەتەوە گرێ دەدرێت کە پێشتر لەبەر دەستی دایە و ئامادەیە. ناخوازێ لێپرسینەوە و شیکردنەوە دەرهەق بە دەوڵەت بکرێت. زیاتر بە گوێرەی ناسنامەی خۆی ئۆرگانی نوێ و پۆشاکی نوێ لەبەر دەکات. ئەمە نەریتێکی هێندە بەهێزە، تەنانەت کاتێك شۆڕشی سۆڤییەت ئەنجام درا و گەلێك هێز بانگەشەی ئاواکردنی دەوڵەتی زەحمەتکێشانیان دەکرد، لەوە رزگاریان نەبووە تەسلیم بە هەمان دەوڵەتی راهیب نەبن. شتێکی رێککەوت نییە ئەو دەوڵەتانەی لەسەر شێواز و تەرزی یەکێتی سۆڤییەتن، شێوازێکن بە رادەی هەرە زێدە، لە شێوازی راهیبەکانی میسر و سۆمەر دەچێت. ئەوەی بە رادەیەکی هەرە زێدە شۆڕشگێڕەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەنجامیاندا، تێکشکاندن و دڕاندنی ئەو پۆشاك و دەمامك و ئۆرگانە زیادانە بوو کە لە سەردەمی سۆمەریەکان بەدواوە بۆ دەوڵەت دروست کرابوون. بەڵام پێشکەشکردنی هزری دەوڵەتی پیرۆز و گەوهەرە سەرەکییەکەی کارکردن لەژێر فشار و گوشار، لەژێر ناوی "دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا"، هەرچەندە درەنگیش بێت، بەڵام دواتر روونبۆوە کە لەخۆ خەڵەتاندن بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. دڕاندنی جل و بەرگەکەی وەکو پارچەبوونی دەوڵەت لە قەڵەم دراوە و دەرکی پێکراوە.

لەوانەیە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا وەکو زاراوە پەیوەندی بە زەحمەتکێشانەوە هەبێت. تەواوی دیکتاتۆرییەتەکان پەیوەندییەکیان لەگەڵ چەوسانەوە هەیە. تەنانەت پیادەکردنی دیکتاتۆرییەت بۆ یەك رۆژ، بە واتای، بوون بە ئامرازی چەوسانەوە دێت. ئەوەی سۆسیالیزمی سۆڤییەتی رووخاند، ئەو بە هەڵەدا چوونە مەزنە بوو سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت و دیکتاتۆرییەت. هیچ کاتێك چینە زەحمەتکێشە چەوساوەکان و کۆمەڵگاکان پێویستییان بە ئامرازی دەوڵەت نابێت. چونکە ئەوە ئامرازێکە جیاوازی چینایەتی بەڕێوەدەبات و هۆکاری هەبوونی کۆمەڵگای چینایەتییە.

کاتێك ئەم هەڵسەنگاندنە پێش دەخەین و دەوڵەتی کلاسیك بەبناخە دەگرین، دەخوازین ئەوە روون بکەینەوە ئەم ئامرازە، شێوەکانی یەکێتی سۆڤیەتیشی لە ناودا، نەگۆڕدراوە. کاتێك دەڵێین دەوڵەت نەگۆڕدراوە، مەبەستمان پرەنسیپی پێکهاتن و پەیڕەوە بنەڕەتییەکەیەتی. ئەگەرنا بە درێژایی مێژوو گفتوگۆ لەسەر شێوەی جیاجیای بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت دەکرێت. بەفیڕۆچوونی هەوڵەکانی چەندین مرۆڤی شۆڕشگێڕ کە لە مێژووی جیهاندا بە دڵسۆزی لەپێناو بەدیهاتنی ژیانێکی ئازاد و یەکسان تێکۆشانیان کرد، بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە،

دیسان سەرچاوەی خۆی لەو هزر و کردارە چەوتانەیان دەگرێت کە سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت هەیانە. چەندین سیستەمیان ئاواکردووە، وەلێ گەورەترین بەڵای بەسەردا هێناون. چونکە بە شێوەیەکی راست لە پیرۆزترین قەوارەی راهیبە سۆمەریەکان نەگەیشتوون. ئەمە ئامرازێکی بەمجۆرەیە، تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی هەیە، لەمیانەی رەمزێکی زەبری خودایی وەهاوە رێکخراوە، کە پاشماوەکانی کۆمەلگا بە شێوەیەکی توندڕەوی و نەزانییەوە بشێوێنێ و چەواشە بکات. سەرەڕای ئەوەی بە ساڵاچووترین پێکهاتەیە، بەڵام لەمیانەی نوێترین ئارایشتەوە خۆی بە گەنج و جوانکەلە و سەرنج راکێش نیشان دەدات، هەبوونێکی موعجیزەیی و سەیرە کە بە هۆی ئەزموونە مەزن و هێزە سیحراوییەکەیەوە، کەم کەس هەن بتوانن لێی رزگار ببن. هەروەها لەبەر ئەوەی زۆر بە کاریگەر و دووڕەگەزییە (نێرەمووکە)، بۆیە ئاستەمە پارچە بکرێت. کاتێك ئاماژە بەوە دەکەین، ئامانجمان ئەوە نییە بە خراپە نیشانی بدەین. بەڵکو دەبێ ئەوەش بزانرێت تاوەکو راستینەی پارچەبوونی چینایەتی بەردەوام بکات، بە هۆی هەندێ هۆکاری تەکنیکی، بە بێ دەوڵەت ژیان نابێت. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا داواکردنی ژیانێکی بێ دەوڵەت، یان لەمیانەی گەڕانەوە بۆ چاخی بەردین، یاخود لەمیانەی ئانارشیزمەوە دەبێت. بە گوێرەی ئەوەی هەردووکیشیان لە نێو هەلومەرجی کۆمەلگای رۆژگاری ئەمڕۆماندا ناشێ، بۆیە ژیان لەگەڵ دەوڵەت دەبێ.

بە گوێرەی ئەوەی هەم تەکنیك، هەم کۆمەلگای چینایەتی و دەوڵەت کە وەکو بەرهەمێکی لاوازی ئامرازن و لەسەر ئەو بنەمایەش شارستانییەت پێکهاتووە، ئەو پرسیارەی پێویستە بکرێت و گرێدراوی ئەم قۆناخەیە ئەوەیە: لە کامە قۆناخی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیدا جیابوونەوەی چینایەتی و گرێدراو بەمەش دەوڵەت و ئەو سیستەمەی شارستانییەت پێویست نامێنێ کە پشت بە دەوڵەت دەبەستێ؟ ئەمەیە ئەو پرسیارە سەرەکییەی پێویستی بە وەڵام دانەوە هەیە.

لەگەڵ ئەوەی تەکنیك (ئامراز) جیاوازی چینایەتی خوڵقاندووە، وەلێ دیسان ئەوەی دوای ئاستێکی دیاریکراوی پێشکەوتن بەلاوەی دەنێت، تەکنۆلۆژیایە. بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا مێژوو ئەوەی سەلماندووە هەر پێشکەوتنێکی ئامێرەکان و تەکنۆلۆژیا جیاوازی چینایەتی تەسك کردۆتەوە و دەرفەت و تواناکارییەکانی ئازادی زیادی کردووە. هیچ کەسێك ناتوانێ نکۆڵی لەوە بکات ئەو ئامرازانەی لە ئاسن دروست کران، تواناکاری و دەرفەتێکی مەزن بوو بۆ ئازادی مرۆڤایەتی. بۆ نموونە ئەو گەلانەی بە سانایی شمشێریان دەسکەوت، ئەو جووتیارانەی ئاسنیان لە گاسنەکانی خۆیان گرێدا و بۆ ئەو پیشەکارانەی کە دەزگاکانی خۆیان لە ئاسن دروست کرد، کانزایەکی دیکە ناتوانن وەکو ئاسن ئەوە نیشان بدەن کە چۆن دەرفەتی ئازادی خوڵقاندووە. مێژوو پڕە لە نموونەی بەمجۆرە.

گرفتێکی دیکەی سەبارەت بەم بابەتە کە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە، ئەوەیە کە نابێت رەوشەکانی پیشەکاری کە لەسەر بنەمای پێشکەوتنی ئامێر (تەکنۆلۆژیا) پێشکەوتون و خشتەکردنی کار وەکو پێشکەوتنی دەوڵەت و جیابوونەوەی چینایەتی هەڵسەنگێنرێت. لە راستیدا زیادبوونی پیشەکان و پێویستی خشتەکردنی (تنسیق) کارەکان، بە دەوڵەت بوون و جیابوونەوەی چینایەتی کلاسیکی بێ واتا دەکات. بەڕێوەبەرایەتی خشتەکاری و پیشەکان پێویستی بەلاوەنانی دەوڵەت دێننە ئاراوە.

لەوانەیە گرنگترین ئەنجامی مێژوویی کە شۆڕشە زانستی ـ تەکنۆلۆژیاکانی سەدەی بیستەم لەگەڵ خۆیاندا هێنابێ، ئەوەیە زەمینە ماددییەکانی جیاوازی چینایەتییان لە ئارادا نەهێشتووە. دەبێ ئەمە وەکو گرنگترین دیاردە و رەوشی مێژوویی هەڵسەنگێنرێت. بە بێ ئەوەی کاریگەرییەکانی لەسەر پێشکەوتنەکانی کۆمەڵگا ببینرێ، درێژەدان بە هەمان هەڵوێستە تیۆرییەکانی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی نێوان ئەو چینانەی بە گوێرەی تەکنۆلۆژیای سەدەکانی هەژدەهەم و نۆزدەهەم جێگایان گرتووە، رێگا لەپێش بە هەڵەداچوونی مەزن دەکاتەوە. ئەوەی سەرمایەداری لە دەرەبەگایەتی جیاکردۆتەوە، پێشکەوتنە زانستی ـ تەکنۆلۆژیەکانە. هەروەکو دەزانرێ ئەمەش چەندین بەدەزگابوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆیدا خوڵقاند، لە سەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەتی نەتەوەی، کۆمار و عیلمانییەتن. ئەنجامێکی دیکەی ئەم پێشکەوتنەش رێکردنەوەی بوو لەپێش تێکۆشانە نەتەوەیی و چینایەتییەکان.

دەتوانرێ پێشبینی ئەوە بکرێت کە دووەمین شۆڕشی مەزنی زانستی ـ تەکنۆلۆژی، ئەنجامە کۆمەڵایەتی، سیاسی و سەربازییەکانی زۆر گەورەتر و هەمیشەیی دەبێت. ئەوەی توانای بەدیهێنانی هەیە، مەزنایەتی شۆڕشی زانستی، تەکنۆلۆژییە. تازە بە تازە ئەنجامەکانی دەردەکەوێت. یەکەمیان هەڵوەشانەوەی جەمسەرەکانە. هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت یەکەمین ئەنجامی گرنگی ئەم شۆڕشەیە. هەرچەندە هۆکاری دیکەشی هەیە، بەڵام ئەو تێڕوانینە گشتییەی پەسند دەکرێت ئەوەیە کە گرنگترین هۆکار ئەم شۆڕشەیە. دووەمین ئەنجامی گرنگ، لە دەستدانی گرنگی و بایەخی جارانی دەوڵەتی نەتەوەییە. بێگومان تا رادەیەکی مەزن سنوورەکان واتای خۆیان لە دەستداوە. ئاشکرایە کە تەکنۆلۆژیای گەیاندن رۆڵێکی شۆڕشگێڕی نائاسایی لەمەدا بینیوە. هەنگاونان و ئاراستەکردن بەرەو کۆمەڵگای زانیاری هێندە خێرا بووە کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکدا بەراورد ناکرێت. ئەنتەرنێت، بە تەنیا دیاردەیەکی مەزنی شۆڕشگێڕانەیە. هەر شیکردنەوەیەکی تیۆری ئەگەر ئەنجامە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازی و شۆڕشی تەکنۆلۆژی ناوەکی و ئەلەکترۆنی و میکانیکی رەچاونەکات، ناتوانێ ئەم قۆناخانە بە شێوەیەکی راست هەڵسەنگێنێ کە بەڕێوەچوون. تاوەکو ئەم هەڵسەنگاندنە راستەش پێشنەخرێت، ناتوانرێ پرۆگرامێکی سیاسی راست و ستراتیژی و تەکتیك پێشبخرێت. ئاشکرایە سەبارەت بەم بابەتە پێویستی بە وتووێژێکی قووڵ و رەخنە و رەخنەگرتن هەیە. گرنگترین هۆکاری ئەو قەیرانە ئایدیۆلۆژیەی لە ئارادایە، لاوازبوونی ئاستی ئەمجۆرە هەڵسەنگاندنانەیە. کاتێك شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی وەکو راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو کۆمەڵگای چینایەتی ناچاری گۆڕانکارییەکی مەزن دەکات، ئەو کاتە چۆنێتی پێشخستنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ و بەرنامەی سیاسی، گرنگی و بایەخێکی مەزنی دەبێت. لە هەموو قۆناخە مێژووییەکانی بەمجۆرەدا لێگەڕینی مەزن و وتووێژ زیادیانکردووە.

ـ ئیتر سەرمایەداری وەکو سیستەمێکی شارستانییەت نەماوە و هەڵوەشاوەتەوە. ائەوەی هەڵوەشاوەتەوە تەنیا سۆسیالیزمی بونیادنراو نییە. ژێرکەوتنی فاشیزم لە راستیدا ژێرکەوتنی سەرمایەدارییە. ئەو شکستەی لە وڵاتە کۆلۆنییەکاندا دووچاری هات پارچەکەی دیکەی ئەم شکستەیە. شکستی ئەمریکا لە ڤیتنام، شکستی داگیرکاری نوێشە. ئەوەی لە دووەمین شەڕی جیهانیدا شکستی هێنا، لە راستیدا پێکهاتەی هەر دوو سیستەمە، کە پشتیان بە زانست ـ تەکنۆلۆژیا و فەلسەفەی کۆن دەبەست. ئەم پێکهاتانە زیاتر پشت بە میکانیکی زانست ـ تەکنۆلۆژیا و شرۆڤەکانی هزری فەلسەفی دەبەست. پراکتیزەکردنی یاسا میکانیکییەکانی ناو کارگە، ئاستی تەکنۆلۆژیایە. تا رادەیەکی مەزن پێویستی بە هێزی بازووی کارکەران هەیە. ئاستی زانستیش لە ئاستێکدایە کە هزر و بۆچوونی ئەرێیی لەخۆوە دەگرێت. پێشتر ئاماژە بەوە کرا سیاسەت لەمیانەی دەزگا کۆنەکان تەنانەت لە رێگای نزیکبوونە ئەفسانەییەکان، بەها و نرخی پێدەدرێت. لە کاتێکدا لیبرالیزمی بۆرژوازییەت بە فاشیزم و نەتەوەپەرستی شۆڤێنی ئەنجامگیردەبێ، ئەوا ئاستی سەرەڕۆیی و تۆتالیتاری سۆسیالیزم بە دەوڵەتگەرایییەکی بە توانا و نەتەوەپەرستییەکی ـ سۆسیال ئەنجامگیربوو. دووەمین شەڕی جیهانی شەڕێکی ئاسایی و لەخۆوە نەبوو، بەڵکو بۆ ئامانجی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی شارستانییەتی سەرمایەداری دەگەڕێتەوە کە کەوتبووە نێو قۆناخی قەیرانێکی قووڵەوە. ئەو شێوازە کۆمەڵکارییەی کە هەر سیستەمێکی کۆمەڵگای چینایەتی لە قۆناخی هەڵوەشانەوە بە ئامانجی لەسەرپێمانەوە پێشیدەخات، هەمان شێوەی زێدەڕۆیی دەوڵەتگەرایی پێکدێنێت. لە لایەکی دیکەوە سێیەمین ئەنتەرناسیۆنالیستی سۆسیالیستی کە بە ئامانجی رووخاندنی سیستەمی سەرمایەداری لە رێگای شۆڕشەوە بەسترا، سەرەڕای ئەوەی لە شەڕدا ژێرنەکەوت و تەنانەت لە دوای شەڕ لە چەندین گۆڕەپاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بە هۆی بنبەستبوونی ئایدیۆلۆژی لە هەڵوەشانەوە رزگاری نەبووە.

ئەگەر سەرنج بدرێ، دەبینرێت کە هەر دوو سیستەم نەك لە ئەنجامی سەرکەوتن، بەڵکو لەمیانەی رەوشی هاوسەنگییەوە جارێکی دیکە قەڵەمبازیان هاوێشتووە. ئەو چەمکەی سەلمێنراوە ئەوەیە کە سەرمایەداری ناتوانێ لە ئاکامی شەڕەوە خۆی بەهێزبکات، ئەمە راستە قۆناخی سەردەستی بێسنوور لەدواوە بەجێماوە. هەروەها پێشکەوتنێکی گرنگتر ئەوەیە چەوتی چەمکی دوو جەمسەری ئاشکرابووە؛ راستتر ئەوەیە، هەڵە و کەموکوڕییەکانی رێبازی ململانێ و تێکۆشانی نێوان چین و نەتەوە چەوساوەکان و ئیمپریالیزمی سەرمایەداری ئاشکرابووە. ئەنجام نە "کۆتایی مێژوو" و نە چاخی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریایە؛ بەڵکو ئەو قەیرانە قووڵەیە کە سیستەمی شارستانییەتی کۆمەڵگای شارستانییەت لەدوا قۆناخی خۆی، لە گەوهەری

سەرمایەداریدا تێیکەوتووە. بەڵگەیەکی دیکەی گرنگ و سەلمێنەری ئەم قەیرانە ئەوەیە کە ئەنجامەکانی شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی، کە دەیتوانی دوای شەڕ تەواوی مرۆڤایەتی بە تێربوونێکی ماددی و مەعنەوی بگەیەنێ و دەرفەت بە هەموو جۆرە دەوڵەمەندی و بە پیتیەك بدات، نەخرایە خزمەتی مرۆڤایەتییەوە. ئەگەر ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی سەردەست نەبوایە، ئەوا ناکۆکییە چینایەتی و نەتەوەییەکان بە بێشەڕ چارەسەردەکران و ئەو بناخە تەکنۆلۆژییەش ئامادەبوو کە بە هۆیەوە دەوڵەمەندی و زێدەبەرهەمی بێتەئاراوە. بەڵام دەزگاکانی پێکهاتەی سەرخانی سیستەم و پەیوەندییەکانی موڵکایەتی، دەرکەوتنی سیستەمێکی نوێ ئاستەنگ دەکەن.

بەرچاوترین سیستەمی قازانجی سەرمایە، بازاڕی (بۆرسە)ی نێودەوڵەتییە. قۆناخی قازانجکردن لە رێی بۆرسە، کە سەرمایەداری پشتی پێدەبەستێ، گوزارشت لەوە دەکات کە بەبێ کارکردن پارەیەکی زۆر و زەوەند قازانج بکەی. ئەمەش هەروەکو ئەوە وایە سیستەم پشت بە یاری قومار ببەستێ. هیچ ئامرازێك وەکو ئەمە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بەسەرچوونی سیستەم و کەوتنە نێو رەوشی هیچ و پووچی، نیشاننادات. ئەم رەوشە، واتا پەیوەندییە کەوتووەکانی موڵکایەتی، شێوازی قوماری پەیوەندییە باوەکانی موڵکایەتی کە لە ئارادایە، تەنیا رێگای لەپێش ئەو کاریگەرییە زیانبەخشانە نەکردۆتەوە کە دزەی کردۆتە ناو تەواوی کۆمەڵگا؛ بەڵکو خراپتر ئەوەیە کە بەردەوام شانس و دەرفەتی دەرکەوتنی سیستەمی نوێ دوا دەخات. کۆمەڵگا فێری سیستەمی قازانجی سانا و هەرزان دەکات، بەمجۆرە ئەخلاقەکەی تێکدەدات و دەیکات بە موحافەزەکار. دژی پێشکەوتنە خوڵقکار و نوژەنەکان دەوەستێ. گەیشتنی سیستەم بەرەو شتێکی بەمجۆرە سەنگەرگرتن نییە، بەڵکو رەوشێکە بە گشتی لە ئارادایە. ئەگەر بناخەی ئەو تەکنۆلۆژی و سەرمایەیەی کە لە ئارادایە؛ لە بوارەکانی پێداویستییەکانی، ژینگە، تەندروستی، پەروەردە و دەستەبەرکردنی کار بە شێوەیەکی راست بەکاربهێنرێت و بخەوێنرێ، ئەوا هەم جیاوازی چینایەتی دەکەوێتە نزمترین ئاست، هەم دەشێ هەموو ئەو ناکۆکیانەی کە دەردەکەون بە بێ توند و تیژی چارەسەربکرێت.

لێرەدا گرنگترین بابەت کە پێویستە جیابکرێتەوە، ئەوەیە کە هەروەکو چۆن دامەزراندنی سیستەمی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی وەکو ئەنجامێکی پێشکەوتنی تەکنیك (ئامراز)بووە، ئەوا کۆتایی پێهاتنیشی وەکو ئەنجامێکی ئاستی نوێی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا بووە بە رۆژەڤ. هەروەکو چۆن (ئامراز) تەکنیك هێزێکی بانگەوازی شارستانییەتی کۆیلەداری بوو، ئێستاکەش بۆتە هێزی بانگەوازی بێ واتابوونی کۆمەڵگای چینایەتی. بە بێئەوەی پەنابېرێتە بەر شیکردنەوەیەکی تیۆری قووڵ، ئەوا هەر کەسێکی خاوەنی زانیارییەکی ئاسایی بێت، دەبینێ کە ئەم رەوشە راستینەیەکە لە ئارادایە و بەڕێوەدەچێت.

٢ ـ لە رەوشێکی بەمجۆرەدا هەڵوێستەکردن و تاوتوێ کردنی هێڵە گشتییەکانی ئەو ئەلتەرناتیفەی پێویستە بکەوێتە رۆژەڤەوە، دووەمین بابەتە کە جێگای گرنگی و بایەخ پێدانە. ئەوەی پێویست بێت شۆڕشە خوێناوییەکان نییە، راستتر ئەوەیە کە بناخەی تەکنۆلۆژیا ئەم رێچەکەیەشی بێ واتاکردووە. لە نێو هەلومەرجێکدا کە تەکنۆلۆژیای گەیاندن و راگەیاندن گەیشتۆتە ئاستێك لەمیانەی تەلەفۆنی گیرفانەوە شوانێکی سەری چیا سات بە سات بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵ هەموو لایەنێکی جیهان کراوەیە، هەروەها هەموو قەدەخەنامەکان بێ واتابوون و لەکارکەوتوون، ئاشکرایە جگە لە خۆپاراستنی ناچاری، لەمیانەی شێواز و رێچکەکانی توند و تیژی و خوێنڕشتن گەیشتن بە ئەنجام بێواتابووە. لەمیانەی نموونە جۆربەجۆرەکانی هەموو لایەنێکی جیهان، روون بۆتەوە توند و تیژترین بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتەکانیش ناتوانن ئەم هێزەی تەکنۆلۆژیا تێکبشکێنن. تەکنۆلۆژیا تەنیا تواناکاری بێسنوور بۆ بەرهەمهێنانێکی زۆر و بەپیت ناهێنێتە ئاراوە، بۆ ئەوەی کۆسپە سیاسییەکانی پێشی بەلاوەبنرێت، تواناکاری مەزن سەبارەت بە وشیاری پێویست و رێکخستن پێشکەش دەکات. لەم بوارەشدا بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگای چینایەتی بێچارە و بێواتادەکات.

لەبەرئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، پێشتریش، بە درێژایی تەمەنی مێژوو، توانستێکی تەکنۆلۆژی بەمجۆرە نەبوو، ئەوا رێکخستنی نهێنی و سەرهەڵدان و شەڕە درێژخایەنەکان وەکو رێچکە و شێوازی ناچاری رۆڵیان دەبینی. لە دووەمین نیوەی سەدەی بیستەمدا ئەو شۆڕشە ریشەییانەی بۆ یەکەمین جار لە مێژوو روویاندا کۆتایی بەم رەوشە هێناوە. هەندێك لە زانایان سێ قۆناخی سەرەکی مێژوو دەژمێرن. یەکەمیان، قۆناخی شۆڕشی کشتوکاڵ و کۆمەڵگای گوندە کە بە بەرفراوانی باسمان کرد. لە ساڵانی ١٠٠٠٠ ی پ.ز لە سەردەمی ئاواکردنی یەکەمین دەوڵەتی شار تاوەکو ٣٠٠ ی پ.ز بەردەوام دەبێت. سەردەمی کۆمەڵگای شار کە پیشەکاری شار، مانیفاکتۆر دەرکەوتنەپێش، دووەمین قۆناخە؛ کە بۆ ماوەی نێوان ٣٠٠ ی پ.ز تاوەکو ١٩٥٠ ی زایینی دەگەڕێتەوە. هەرچی قۆناخی مێژووی نوێیە، ئەو پێشکەوتنانە دەگرێتەوە کە گەورەترین شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی مێژوو لە دوای ساڵانی ١٩٥٠ رێگای لەپێش کردەوە. هەرچەندە ئەم دابەشکردنە کەموکوڕی جددیش لەخۆوە بگرێت، وەلێ لەبەر ئەوەی بەرهەمهێنانی لەمیانەی تەکنۆلۆژیا و پەیوەندییەکەی لەگەڵ کۆمەڵگا بە سەرەکیترین فاکتەرەکانەوە گرێداوە، بۆیە رێبازێك دیاری دەکات کە پێویستە بەهەند وەربگیرێت.

ئاشکرایە پێکهاتەکانی ئەم قۆناخە نوێیەی کە پشت بە ئاستی تەکنۆلۆژیا و زانست دەبەستن، کارەکتەری چینایەتییان بەرچاو و لەپێش نابێت. زیاتر لێهاتوویی پیشەکاری شێوەی ئەو کۆمەڵگایە دیاری دەکات کە پێك دێت. گەوهەری سیاسیش وەکو جاران هێندە دیاریکراو نابێت. زیاتر دەزگاکانی لەجۆری کۆردیناسیۆن (التنسیق)ی گشتی و ئەندازیاری بەکاربردن بە بناخە دەگیردرێت. ئیتر کێشە بەڕێوەبردن و کارکردنی بە زۆرنییە، بەڵکو بە گوێرەی توانستی خۆی، دەبێ کێشەیەکی راست هەڵبژێرێ و بە شێوەیەکی بە بەرهەم بەڕێوەی ببات. راستترە بڵێین، قۆناخێکە کە ناچاربوون و ناڕازی بوونی بەلاوەناوە. کاری کردووە بە ئەشق و دڵخوازی و کردوویەتی بە نەریتێکی جیانەکراوەی ژیان و بە خۆبەختی (گوعی) تەڤلی بەڕێوەبەرێتی دەبێت. بە واتای راستەقینە ئەو پێڕەوەی کار هاتۆتە ئاراوە کە بۆ سیستەمی سۆسیالیستی پێشبینی دەکرێت. بۆ یەکەمین جارە مرۆڤایەتی بەو ئاستەی زانست و تەکنۆلۆژیا گەیشتووە کە دەرفەت بە پێڕەوێکی بەمجۆرەی کار دەدات.

٣ ـ ئەو رەوشە مێژووییەی لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی هاتە ئاراوە، ئەوەی ئاشکراکرد کە سیستەمی شارستانییەت لەمیانەی شێوە کلاسیکییەکانی دەوڵەت و سیاسەت بەڕێوە نابردرێت. رۆڵی دیاریکراوی شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی لەوەدا ئاماژەی پێکرا. ئەو ئاستەی تەکنۆلۆژیای سەربازی پێیگەیشتووە جگە لەوەی رێگا لەپێش پێشکەوتنی نوێ ناکاتەوە، گەیشتنی بە ئاستێك مرۆڤایەتی لەنێوببات، هۆکارێکی دی گرنگە. لە کاتێکدا چەمکی کلاسیکی دەوڵەت و سیاسەت لەمیانەی ئەو شەڕانەی لە سەرتاسەری جیهاندا رێگایان لەپێش کردەوە، ئەوەی سەلماندووە کە تواناکاری بەڕێوە بردنیان لەدەستداوە. پێویستی بەلاوەنانی ئەو دەزگا سیاسییانەی لە ئارادان ئاشکرابووە. بە واتایەکی دیکە ئیفلاس بوونی هێزی چارەسەری و سیاسەتی شارستانییەتی کۆن جێگای باسە. ئیدی ئاشکرابووە، دەزگاکان و ئەو چەمکانەی لە پەیوەندییە باڵاکانی بەرهەمهێناندا پشتی پێ دەبەستن، بەڕێوەناچێ. لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سیستەمی سۆڤییەت ئەوە زیاتر یەکلابووەوە کە ئەو رەوشەی هاوسەنگی لەسەر بنەمای هێزی ناوکی سامناك ئاواکراوە، هەمیشەیی نییە. هاوکات ئەوەش واقیعی نییە ئەنجامێکی بەمجۆرە هەڵهێنجرێ کە جەمسەری بەرامبەر سەرکەوتووە. تەنیا ئەوە سەلمێنراوە کە پێداگرتن لەسەر بنبەستبوون چارەسەری نییە و قەیران کارەکتەرێکی ریشەیی هەیە. ئیفلاس بوون و لەکارکەوتنی مۆدێلەکانی چارەسەری دوای شەڕی دووەمی جیهانی ئاشکرابووە. هەروەها ئەوەش دەزانرێ کە تاقیکردنەوەی ئەورووپا سەبارەت بە سوپایەکی بچووك و لێگەڕینەکانی ئەمریکا سەبارەت بە قەڵغانی دژە مووشەکی، لە چارەسەری ریشەیی زیاتر، ئامانجی بەسەربردنی رۆژانە و گەرەنتی کردنی هەندێ بەرژەوەندی کاتی لەخۆوە دەگرێت.

ئەو راستینەیەی ئەم هەڵسەنگاندنە کورتە دەستنیشانی دەکات ئەوەیە قۆناخێکی پەڕینەوەی مێژوویی ناچارییە. ئەنجامی ئەم (قۆناخە) ناچارییە لەمیانەی پاشماوەکانی سیستەمی کۆنی شارستانییەت کە کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە، بۆ ئەوە سەرچاوە دەگرێت تاوەکو ئێستا هەڵمەتی نوێی مرۆڤایەتی شێوەی نەگرتووە. ئەو قۆناخانەی پەڕینەوە لە مێژوودا درێژخایەن بوون. تەنانەت هەندێ سیستەم لە رەوشی ئیمپراتۆرییەتدا، نوێنەرایەتی ئەم قۆناخە دەکات. لە ماوەی نێوان یەکەمین بە دەزگابوونەکانی شارستانییەتی کۆیلەداری و بە دەزگابوونەکانی قۆناخی گەیشتنە لوتکە و رووخان، نموونەی زەقی دەربازبوون هەیە. هیتیتیەکان و هۆری ـ میتانییەکان، فینقییەکان و فریگاییەکان کە لە ماوەی قۆناخی دامەزراندنی یەکەمین

ئیمپراتۆرییەتی میسری و سۆمەری تاوەکو گەیشتنە لوتکەی ئیمپیراتۆرییەتی رۆما ـ گریك، هەروەکو قۆناخی دەربازبوون، لە هەموو بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، میتۆلۆژی، تەکنیکی (ئامرازەکان) و زانستیدا، رۆڵی گواستنەوە دەبینن. ئامرازی گواستنەوەی دەسکەوتە مەزنەکانی شارستانییەتن، رۆژهەڵات بەرەو رۆژئاوا و ناوچەکانی خۆیان، زیاتر لەم لایەنەوە کارەکتەری پەڕینەوەیان هەیە.

نموونەیەکی گرنگی دیکە ئەوەیە هەر دوو ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و بیزەنتی رۆڵی پەڕینەوەیان لە شارستانییەتی کۆیلەدارییەوە بۆ شارستانییەتی دەرەبەگایەتی بینی. هەر دووکیشیان رۆڵی پرد دەبینن لە نێوان چاخی سەرەتایی و چاخەکانی ناوین و ئەڵقەی نێوان شارستانییەتی کۆیلەداری و شارستانییەتی دەرەبەگایەتی دەبینێ. نموونەیەکی دیکەی گرنگ، ئەو رۆڵەیە مۆنارشییەکانی ئەورووپای رۆژئاوا بینیان لە نێوان دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری لە هەمان چوارچێوەدایە. مۆنارشییەکان قۆناخەکانی نێوان دەرەبەگایەتی و سەرمایەدارییە، شێوەی پەڕینەوەیە. ئیمپراتۆرییەتەکانی عوسمانی و روسیای قەیسەریش هەرچەندە هەندێ جیاوازیشیان هەبێت، نموونەی سەبارەت بە قۆناخەکانی پەڕینەوەن. قۆناخی پەڕینەوەی بەمجۆرە کە لەمیانەی دەزگاکانەوە گوزارشتیان لێدەکرێ، رۆڵی پرد دەبینن لە نێوان شارستانییەتی کۆن و نوێدا، جەمسەرەکانی هەر دووکییان لە ناواخنی خۆیاندا دەگەن بە یەك. بێگومان پێویستییەکی فەلسەفەی زانستیش ئەوەیە، یەکێتی کاتی نێوان لایەنەکانی کۆن و نوێ قۆناخێکی ناچارییە. ناچارییە دەبێ تەواوی پێشکەوتنەکانی سروشت بە قۆناخێکی یەکێتییەکانی بەمجۆرەدا دەربازببن. پەیڕەوکردنی ئەم دیالەکتیکەی پەرەسەندن لەسەر کۆمەڵگاش کە بەردەوامی سروشتە، ناچارییە.

٤ ـ ئەو قۆناخەی کە قەیرانی سیستەمی شارستانییەتی کۆن تێیدا قووڵ بۆتەوە و هەمیشەییە و هێشتا شێوەی قەڵەمبازی شارستانییەتی نوێی ئاشکرا نەبووە، دەشێ بە چاخی شارستانییەتی دیموکراسی ناوببرێت. لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، باوبوون و جێگیربوونی کارگێڕییە دیموکراسییەکان وەکو رژێمێکی تەبایی و رێککەوتن، بژارێکی بە گوێرەی ئارەزوو نییە، بەڵکو ئەنجامێکی ئەو هەلومەرجانە بوو کە لە ئارادابوون. رۆڵێکی دیاریکراوی، ئیفلاسکردنی بژاری فاشیزمی سەرمایەداری و تۆتالیتاریزمی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لە گەیشتن بەم رەوشەدا هەبوو.

ناتوانرێ بژاری فاشیزمی سەرمایەداری لەمیانەی شێوە هیتلەرییەکەوە هەڵسەنگێنرێ. ئەمە قۆناخێکە راستینەی رژێمی خوێناوی و پاشڤەڕۆی تەواوی سەرمایەداری و باڵادەستی سەرمایەی فینانس لە بواری سەرمایەدا، پشت راست دەکاتەوە. ئەمە تەنیا لە ناوەندەکانی سەرمایەداریدا نییە، هەروەکو دەزانرێ هەوڵ دەدات لە پەیوەندییەکانی دەوروبەر و وڵاتانی کەناریشدا بڵاوی بکاتەوە. رەوشی توندڕەوترین رژێم کە مێژوو بەخۆیەوە دیوە؛ بۆ مەترسییەکانی هەلومەرجی رووخان و کارەکتەری شۆڤێنی نەتەوەپەرستی کە دەمارگیری ئایینی تێپەڕکردووە، هەروەها بۆ بەهێزبوونی ئەو ئەگەرە دەگەڕێتەوە کە سۆسیالیزم ببێتە سیستەمێك. هەرچی سەرکەوتنی شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی و بە گشتیش، ئەو ئاستەی ئازادییە کە مرۆڤایەتی بەدەستی هێناوە، هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی ئەو رژێمانەیە. ئەم رەوشەش سەرمایەداری ناچاری بژارێکی نوێ کردووە. بە گوێرەی ئەوەی ئەگەری سەرکەوتنی سەرتاسەری فاشیزم دەرفەتی نییە و رووخانیش پەسند ناکات، ئەوا سیستەمێکی رێککەوتن و تەبایی درێژخایەن دەبێتە ناچارییەك. کاتێك ئەم رژێمەی تەبایی بە دیموکراسی ناودەبرێت، ئەوا هێندە لێی نامۆ نییە. بە تایبەتی کاتێك سەرکەوتنە مەزنەکانی شۆڕشی تەکنۆلۆژی ئەوە دەسەلمێنێ، دیموکراسی تەنیا کۆڵەکەیەکی لەسەرپێمانەوە نییە بەڵکو رژێمێکە بە رادەیەکی هەرە زێدە پێشکەوتن بەدیدێنی، ئەمە رێگا لەپێش متمانە و باوەڕی زیاتری سەرمایەداری دەکاتەوە. دیموکراسی، سەرەڕای ئەوەی لە سەرەتادا بە شێوەیەکی سنووردار پەیڕەودەکرا، لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم وەکو گونجاوترین شێوەی ژیان و بەڕێوەبردن پەسند دەکرێ کە بەرەو سیستەمێکی گەردوونی ئاراستەدەکرێ و پێبەپێ بڵاودەبێتەوە.

ئاراستەکردنی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەرەو تۆتالیتاریزم لەگەڵ پرەنسیپی ئازادی سۆسیالیزم ناکۆکە کە پێویست بوو زیاتر بەرەو پێشەوەی ببات. هەرچەندە توانەوەی تاك لە ناو کۆمەڵگادا ئامانجی یەکسانی لەخۆوە بگرێت، بەڵام کاتێك ئاشکرابوو بە ئەندازەی لیبرالیزمی سەرمایەداری تاك ناتوانێ خوڵقکاربێت، ئەوا ژێرکەوتنی دەبێتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو. یەکسانییەکی چوارچوار لە ناو کۆیلەکاندا هەیە. بەڵام ئەوەی لە کۆیلایەتیدا بوونی نییە ئازادییە. لەم قۆناخە بەدواوە زیاترین چالاکی و کردارە گرنگەکانی مرۆڤ تا رادەیەك لەپێناو ئازادی بووە. سۆسیالیزمی بونیادنراو وەکو رژێمەکانی راهیبی سۆمەرە کە بە گوێرەی رۆژگار گونجێنراوە. یەکەمین هەرەوەزی و هاوبەشێتی کۆیلایەتی راهیبە سۆمەرییەکان ئاوایان کردووە. جۆرێکی کۆیلەداری دەوڵەت لە ئارادایە کە زۆر لە دەوڵەتگەرایی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەچێ. ئیتر ئەمە چ لە ژێرناوی چەپڕەوەکان یاخود راستڕەوکان ئەنجام بدرێت، لەوانەیە ئەو سیستەمانەی لەسەر بناخەی دەوڵەت ئاواکران خزمەتێکیان بۆ یەکسانی هەبێت، بەڵام بێڕای بڕ ئەمە لەمیانەی بە قوربانی کردنی ئازادییەکانی تاك بەدیدێت. لە نێو زەمینە و هەلومەرجی کۆمەڵگای چینایەتی، دەوڵەت بە واتای نکۆڵیکردن لە ئازادی دێت. دەوڵەتگەرایی سۆسیالیزمی بونیادنراو کە کردارێکی چڕتر و بەرفراوانتربوو، بە بەراوردکردن لەگەڵ سەرمایەداری، ئازادی تاکی زۆر دواتر خستووە.

ئەو رژێمانەی دەرفەتی ئازادییان نەداوە، بەرامبەر بەو رژێمانەی دەرفەتی ئازادیان داوە، لە بەکارهێنانی زەبر بەولاوە هیچ رێبازێکی دیکەیان نییە. بە شێوەیەکی سەرەکی سیستەمی یەکێتی سۆڤییەت لەم خاڵەدا دۆڕاندی و ونیکرد. بێگومان هەڵەکانی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی لە ژێر ئەم راستینەیەدا شاراوەیە. ئەگەر نزیکبوون و هەڵوێستێکی فەلسەفی ئەوتۆ نیشان نەدرێت کە هێندەی سەرمایەداری ناسنامەی تاك ئازاد بکات، هاوکات ئەمەش لەگەڵ چەمکێکی واقیعی یەکسانی نەکرێتە یەك، ئەوا باسکردنی شارستانییەتێکی نوێ بە هەڵەداچوون و خەڵەتاندنێکی مەزنە. کاتێك فەلسەفەیەکی ماتریالیستی قەبە وەکو چوارچێوەیەکی ژیان بە بنەما بگیردرێت، ئەوا رووبەڕووبوونەوە بەرامبەر بە سیستەمێکی نوێی کۆیلایەتی دەبێتە ناچارییەك. کاتێك دیاردەیەکی هێندە ئاڵۆزی وەکو ژیانی مرۆڤ دەخەیتە نێو چەند کلێشەیەکی ماتریالیستی قەبە، ئەمە تاوەکو دوایی دەرگای خوڵقاندنی مرۆڤێك ئاواڵادەکات کە مەحکوومی ئارەزوو و غەریزەکانی بێت. ئەزموونی سۆڤییەتیش تا رادەیەك ئەم راستینەیە دەسەلمێنێ. هەموو جۆرەکانی نەتەوەپەرستی کە سەدەی بیستەمی درەوشاندەوە، لە گەوهەری تیرەگەرێتی هاوچەرخ بەولاوە هیچ ناوەڕۆکێکی دیکەی نییە. وەکو تیرەگەرێتیەك لە بواری چەندایەتی و چۆنایەتییەوە مەزن بووە. چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت نەتەوەپەرستی لە شارستانییەتێکی نوێدا رۆڵ ببینێ. کاتێك دیموکراسی هاوچەرخ شیدەکرێتەوە، پێویستە لەمیانەی ئەم راستینە سەرەکییانەوە تەماشابکرێت. لە نێو هاوسەنگی سامناکی ناوکی و دەوڵەت گەرایی تۆتالیتاریدا، تەواوی خەڵك دەبن بە سەرباز و کارکەر. ئەو پێشکەوتنانەی تەواوی پێوانەکانی کۆمەڵگای چینایەتی تێپەڕکردووە، ئیتر دەبێتە هۆکاری ئەوەی پێکهاتە بنبەست بووەکانی شۆڕش و شۆڕشی چەواشە نەتوانن رۆڵی ئاسایی رژێم ببینن. هیچ شۆڕش و شۆڕشێکی چەواشە ناتوانێ لەمیانەی ئەم پێکهاتانە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەسەرپێ بمێنێتەوە. ئەمە لەمیانەی گەلێك نموونەی بەهێز و بەرچاو سەلمێنراوە.

دەشێ چەندین پێناسە دەرهەق بە دیموکراسییەت پێشبخرێت. دەشێ بە درێژی هەڵوێستە سەبارەت بە کارەکتەری چینایەتی و تەبایی و ئاشتیخوازییەکەی بکرێت. دەکرێ پێشکەوتنی تیۆری و پراکتیکی بە قووڵایی روون بکرێتەوە. دەتوانرێ ئاماژە بەوە بکرێ کە بە تەنیا سیستەمێکی شارستانییەت نییە. بەڵام هەرچەندە سنوورداریش بێت دەتوانرێ بگوترێ بۆ یەکەمین جارە تەواوی گەل و کولتوورەکان بەو دەرفەتە گەیشتوون لە نێو بەرفراوانترین زەمینەی ئاشتیدا لە ژێر ناوی بژاری ئایدیۆلۆژی و ئابووری و سیاسی جیاواز پێش بکەون و پێشبڕکێیەك بکەن. ئاماژەکردن بەو دیموکراسییەتەی کە لە کۆتایی سەدەی بیستەم سەرکەوتنەکەی مسۆگەربوو و کارەکتەری تەسکی چینایەتی تێپەڕکردووە، بایەخێکی مەزنی هەیە. تەواوی ئەو دیموکراسییەتەی تا ئەو سەردەمە پراکتیزە دەکران، مۆرکی چینێکی سنووردار لەخۆیەوە دەگرێت. ئەو دیموکراسییەتە رووکەشییەی هەیە، هاووڵاتییە فەرمییەکانی لەخۆوە نەگرتووە، لە شێوەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵێك هاووڵاتی دەوڵەمەند بەولاوە تێپەڕی نەکردووە. هەروەکو یەکەمین دیموکراسییەتی ئەتینا راستینەی چینایەتی بە بنەما دادەنرێت. بەڵام ئەو سیستەمە دیموکراسییەی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم مسۆگەربوو، تا ئاستێکی مەزن ئەو سنوورانەی تێپەڕاندووە. تەنیا بە فراوان کردنی بۆتەی چینایەتی ناوەستێ؛ لەهەمانکات

له بواره سەرەکییەکانی وەکو هزر، باوەڕی، ژیانی کولتووری، جیاوازی ئابووری و بە پارتیبوونی سیاسی، دەرفەتی ئازادی بیروڕا و ڕێکخستن دابین دەکات. تەواوی ڕکابەرەکان بە بێ ئەوەی پەنا ببەنە بەر توند و تیژی، کەم یاخود زێدە، خاوەنی شانس و دەرفەتی پێشکەوتن و گۆڕانکارین. لێرەدا لە بوارەکانی چینایەتی و نەتەوایەتی، هزری و باوەڕی ئابووری و کولتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی، تێکۆشان و هاوکاری، کۆتایی پێ نایەت. پەیوەندی و ناکۆکییەکان هەڵناواسرێ و بەربەست ناکرێن. قۆناخێکی بەڕێوەبردن سەرهەڵدەدات کە تەنیا گرێدراوی یاسا پەسندکراوەکان و شێوە ئاشتیخوازەکانە.

ئەوە مسۆگەرە دیموکراسی گەوهەرێکی مرۆڤانەتر لەخۆوە دەگرێت. بەکارهێنانی ئاستی خوێناوی و خوێنڕشتن وەکو پێوانەیەکی جوامێری و مەزن بوون، داب و نەریتێکی هەرە دڕندانەی کۆمەڵگای چینایەتییە. لە ڕاستیدا هێندە مەزنکردن و پیرۆزکردنی، لەپێناو شاردنەوە و دەمامك کردنی، نەفرەت لێکراوترین ڕاستینەیە. هیچ سەرکەوتنێك پیرۆزنییە کە لە ئەنجامی کوشتارێکی تێرۆریستانەی تۆقێنەر ئەنجام درابێت. ئەگەر هەر باس لە پیرۆزی بکرێت، ئەوا جگە لە ژانی منداڵ بوون کە ناچارییەکە، ئەوا ئەو پێشکەوتنانەی لەمیانەی کەمترین ئازارەوە لە خزمەتی تەواوی مرۆڤایەتی بە دیهاتووە، دەشێ شایستەی ئەم خەسڵەتە  بێت. دیموکراسی هاوچەرخ شێوازی بەڕێوەبەرایەتی خوێناوی درێژخایەنی مێژوویی کۆمەڵگای چینایەتی تێپەڕدەکات و ڕژێمێکە هەموو کەسێك، هەر نەژادێك، ئایینێك، ڕەگەزێك و گروپی سیاسی و ئابووری دەتوانێ ئازادانە گوزارشت لە خۆی بکات، شێوەیەکی ژیان و بەڕێوەبەرایەتییە نزیکی سیفەتی پیرۆزییە. ئەگەر بڵێین بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا، بەم ئاست و لەم چوارچێوەیەدا بە دیدێت، لە جێگای خۆیدا دەبێت.

گەشەکردنی دیموکراسی هاوچەرخ لە ناوەوەیە و پەرسەندنەکەی پلەبەپلەیە. لەمیانەی دەرئەنجامی زەق و سەرنج ڕاکێشەوە خۆی نمایش ناکات. بەڵام ئەگەر بخوازێ هزر و ڕۆحی خۆی لەمیانەی پێشکەوتنە خوڵقکارەکان پڕبکات، ئەوا بە سانایی دەتوانرێ بگوترێ مرۆڤایەتی ڕژێمێکی لەوە باشتری نەدۆزیوەتەوە. لەگەڵ ئەوەی وەڵامی پێویست دراوەتەوە وەڵێ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، کە بۆچی یەکەمین جارە بەم بەرفراوانی و گشتگیرییە بە دیدێت، ئەوا دەبێ بە بێ قەڵس بوون وەڵامی بدەینەوە و دووبارە بڵێین بەهۆی شۆڕشە زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکانە، کە توناکاری ماددی بەلاوەنانی ئەو قەیرانە قووڵ و درێژخایەن و هەمیشەییەی ڕەخساند کە لە ئارادابوو.

ڕاستینەیەکی گرنگ کە شیکردنەوەکانمان سەبارەت بە شارستانییەت هەوڵی سەلماندنی دەدات، ئەوەیە کە دەخوازێ ئەمە ڕوون بکاتەوە کە پێکهاتنی چینەکان و کۆتایی هاتنیان لەمیانەی توند و تیژییەوە بەدینایەت. توانستی تەکنۆلۆژی ڕۆڵێکی دیاریکراو دەبینێ. کاتێك لەمیانەی تەکنیك (ئامراز) توناکاری پێشکەوتنی کۆمەڵێك سەلمێنرا، ئەوا پێکهاتنی چین ناچارییە. چونکە هەموو کەسێك سوود لەم پێشکەوتنە دەبینێت. لە سەرەتادا کاتێك سیستەمی کۆیلایەتی ئاواکرا، بە گوێرەی ڕابردوو، بۆ زۆربەی کۆیلەکان، هەلومەرجەکانی ژیان لە نێو ئاسایشدایە و زگیان تێرترە. ئەم توانا ماددییەیە کە جیاوازی چینایەتی خوڵقاندووە. دیالەکتیکی پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی بە درێژایی مێژوو ئەم ڕاستینەیەی پشت ڕاست کردۆتەوە.

لە ئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە ڕوون دەبێتەوە و دەرکی پێدەکرێت، هەرچەندە لە قۆناخی شارستانییەتی سەرمایەداریدا بتوانرێ لە ڕێگای زەبرەوە چینەکان بڕووخێنرێن و لە بواری جەستەییەوە لەنێوببردرێن، بەڵام وەکو دەزگا لەنێوناچن، هەرکاتێك زەمینە و دەرفەتیان بۆ برەخسێ سەرلەنوێ سەرهەڵدەدەنەوە. لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا لە ڕێگای زەبرەوە هەندێ چین لەنێوبران. بەڵام نەتوانرا ڕێگا لەوە بگیردرێت چینی نوێ و زۆڵتر دەربکەوێ. دیسان هۆکارەکەی ئاستی تەکنۆلۆژیایە. هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی کە ئاستی تەکنۆلۆژیا دەرفەتی پێداوە و ڕێگای لەپێش پێشکەوتنەکەی کردۆتەوە، تەنیا ئەگەر لەمیانەی ئاستێکی تەکنۆلۆژیدا بێ واتابێت و پێویستی پێنەمێنێ ئەوە لەنێودەچێت. دەشێ لە ڕێگای شۆڕش و زەبر و شۆڕشی چەواشە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ئاستەنگ بکرێت، بەڵام لەنێو نابردرێت. هەربۆیە ئەو کۆمەڵگایانەی کە پێکهێنراون، هەم پێکهاتەکانی سەرخان هەم هی ژێرخان، تەنیا کاتێك پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەکان بیکات بە ناچارییەك، لەنێودەچن، یاخود بۆ شێوەیەکی دیکەی کۆمەڵگا دەگۆڕێن. ئەو شێتایەتییانەی بەر لە دیموکراسییەتی هاوچەرخ ئەنجام دراوە سەرچاوەکەی بۆ پێشێل کردنی ئەم یاسایە دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە تۆتالیتاریزمی فاشیزم و ڕژێمەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، بەڵام چەندین پێشکەوتن کە ئەوان خواستیان بەدیبێنن و تێیدا سەرنەکەوتن، تەکنۆلۆژیا توناکاری بەدیهێنانی ڕەخساندووە.لە حاڵەتێکدا چەکە ناوکییەکان وەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەبەر دەستی هیتلەر کەڵەکە ببوایە، ئەوا هەموو ئەوانەی لەنێودەبرد کە ڕقی لێیان بوو. چونکە بنگەیەکی تەکنۆلۆژی هەیە. ئیتر پێویستی بە چینی جووتیار و کارکەری زۆر و زەوەند نییە، چونکە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا هەبوونی ئەم چینانەی بە شێوەیەکی بەربڵاو بێ واتا کردووە. لە ئەنجامدا ئاشکرا دەبێت ئەوەی ڕۆڵی دیاریکراو دەبینێ، زەبرنییە، بەڵکو تەکنۆلۆژیایە.

لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا دیموکراسی هاوچەرخ واقعبینترین ڕێبازە کە هەم دەرفەت بە بژاری تەکنۆلۆژی و لە ڕێگایەوە دەرفەت بە پێشکەوتن دەدات، هەم بە بێ پەنابردنە بەر زەبر، دەرفەت و زەمینەی ئەوە دەرەخسێنێ کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگای بژاری کۆمەڵایەتییەوە لە ئارادا نەمێنن، یاخود وەرچەرخان ئەنجام بدەن. هێزی سەرەکی دیموکراسییەت لەو کەسانەوە نایەت کە بە دڵسۆزی پێیەوە گرێدراون، بەڵکو سەرچاوەی خۆی لەم ڕێگاچارە ڕاستەدا وەردەگرێ. ئەو کار و خەباتە زانستییانەی ئەنجام دراوە، ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە هاوکارییەکی پتەو لە نێوان دیموکراسی و پێشکەوتنی ئابووریدا هەیە. بێگومان سەرەکیترین هۆکار کە بناخەکەی پێکدێنێ، ئەوەیە کە پێکهاتەکەی نوێنەرایەتی هەڵوەستەی کۆمەڵگایەك دەکات، زۆر لە سیستەمی سروشتی خۆی نزیکە. لێرەدا باس لەپێشکەوتنێکی سروشتی ناکەین کە لەسەر بنەمای شێوازی ڕاهیبی یاخود شرۆڤەی ماتریالیزمی قەبە بێت. هەروەکو چۆن دەبێ یاسا تایبەتییەکانی خۆی ڕەچاوبکرێت، ئەوا یاساکانی وەرچەرخانی کۆمەڵگا تەنیا دەشێ لە نێو چوارچێوەی یاساکانی پەرەسەندندا بێت. کارامەیی دیاردەی کۆمەڵایەتی کە لە دەرەوەی ئەمە بێت یاخود تێپەڕی بکات، ئەوا لە دەست نەزانی مرۆڤەوە دەشێ تەنیا ڕێگا لەپێش هاربوون بکاتەوە.

لە نزیکەوە بینینی هەندێ تایبەتمەندێتی چاخی دیموکراسی جێگای بایەخە.

ا ـ دیموکراسی هاوچەرخ بەرهەمی ئەو قەیرانەیە کە سیستەمی شارستانییەت لە قۆناخی کۆیلەداری بەدواوە تێی کەوتووە و لەمیانەی کۆمەڵگای چینایەتییەوە قووڵ و بەردەوام بووە. تەواوی سیستەمی دەزگا و پرەنسیپەکانی کۆمەڵگا بەرامبەر بە شۆڕشی مەزنی زانستی ـ تەکنۆلۆژی تێرناکات و نابێتە وەڵام. ئەم ڕەوشەش لە بواری ئابوورییەوە تا دەگاتە بواری ئایدیۆلۆژی، گوزارشت لە پەرتەوازەبوون و سەراوبن بوونێکی گشتی دەکات. گومان لە تەواوی پرەنسیپەکان دەکرێت، دەزگاکان لەکارکەوتوون. بەرامبەر بەمەش هێشتا سیستەمی کۆمەڵگای نوێ دیارنییە. هێشتا نازانرێ ناسنامەی ئایدیۆلۆژی و دەزگا سەرەکییەکانی، چ شێوەیەك وەردەگرێت. ئەوەیان سەلماندووە سەرلەنوێ ئاواکردنی فاشیزمی کۆن و پێکهاتە شۆڕشگێڕییە نوێیەکانی سۆڤییەت، هێزی چارەسەری نییە. دیموکراسی هاوچەرخ شێوەی بەڕێوەبردن و ژیانی ئەم قۆناخە مێژووییەیە.

ب ـ شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکان، ئەمەیان وەکو ناچارییەك نەهێشتووە کە ژیان بە شێوەی کۆمەڵگای چینایەتی بێت و شارستانی بوونیش بەمەوە گرێ بدرێت. بنگەی تەکنۆلۆژی نەك جیاوازی چینایەتی، بەڵکو نەبوونی چینایەتی دێنێتەئاراوە. هەروەکو چۆن شارستانییەتی چینایەتی لەسەر بنەمای ئاستی تەکنیك ـ ئامراز پێشکەوت، ئیتر ئەو ئاستە تەکنۆلۆژیەی لە ئارادایە. ئەم شێوازە بە سەرەکیترین کۆسپی پێش کۆمەڵگا دەبینێ. تەکنۆلۆژیا نکۆڵی لە کۆمەڵگای چینایەتی دەکات؛ لە کۆمەڵگای چینایەتییەوە بەرەو کۆمەڵگای پیشەکاری، بەرەو بۆتەی کۆمەڵگایەکی نوێی ناچاردەکات. بنگەی تەکنۆلۆژی پێکهاتەی ژێرخانی دیموکراسی هاوچەرخ پشت بەوە دەبەستێ کۆمەڵگای چینایەتی لە ڕەوشێکی ناچاری دەربخات. بە گوزارەیەکی دیکە، شۆڕشی تەکنۆلۆژی بەهێزترین بنەمای دیموکراسی هاوچەرخە. پەیوەندییەکی یەکلاکەرەوە و چارەنووس ساز لە نێوان دیموکراسی هاوچەرخ و شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی بەدیهاتووە. لە هیچ قۆناخێکی مێژوویی پێشووتردا، پێشکەوتنێکی بەمجۆرە نەهاتۆتە ئاراوە. هەربۆیە دیموکراسی هاوچەرخ بژارەیەکی ئارەزوومەندانە نییە، بەڵکو بۆ ئەو

هێزە ماددییەی تەکنۆلۆژیایە دەگەڕێتەوە کە قۆناخی نوێی مێژوویی دەستنیشان کرد و دەرفەتی بە پێکهاتنی کۆمەڵگای وشیار و ڕێکخراو داوە. هەردووکیشیان بەو ئاستە گەیشتوون کە بە باشترین شێوە یەکتری تەواو بکەن. پێویستییان بە یەکترە و یەکتری پێش دەخەن.

ج ـ لەناوبردن یاخود وەرچەرخاندنی هەموو جۆرە دیاردەیەکی کۆمەڵگا و چینەکان نەك لە ڕێگای توند و تیژی، بەڵکو تەنیا لەمیانەی گۆڕانی ئاستی تەکنۆلۆژیا و زانست بەدیدێت. هەروەکو چۆن لەمیانەی بەکارهێنانی زەبر، دیاردەی کۆمەڵگا ناخوڵقێنرێ، بە هەمان ڕێباز لەناویش ناچێ. ئەوەی لە وەرچەرخانیشدا ڕۆڵی یەکلاکەرەوە دەبینێ، بنگەی زانستی ـ تەکنۆلۆژییە، نەك زەبر. ئەگەری ئەوە هەیە هەندێ دیاردەی چینایەتی و کۆمەڵایەتی لە بواری جەستەیی لەنێوبچێ یاخود پێك بهێنرێ. بەڵام لەبەرئەوەی لەسەر بنەمای زەبر پێکهات، ئەمانە لەوە ڕزگاریان نابێت لە بەرامبەر توند و تیژی دیکە لەناو نەچن. نەزانی ڕۆڵێکی دیاریکراو دەبینێ لە پێکهاتنی بناخەی زەبر. هەرچەندە کردار و زانست، نەزانی بەلاوەبنێ، ئەوا بەو ئەندازەیە بێ واتابوونی زەبر ئاشکرا دەبێت. بە ڕادەیەکی مەزن زەبر بەرهەمێکی پێشنەکەوتنی زانست و کردارە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئەم تیۆرییە باش دەرکی پێدەکرێت کە دەڵێ زەبر مامانێتی ئەو کۆمەڵگا نوێیەیە کە تازە لە دایك دەبێت. ئەرکی مامانێك لە کاتی ژان و منداڵ بوون ئەوەیە کە یارمەتی بدات بۆ ئەوەی منداڵ بوونەکە ئێشی کەمتر و بە دروستی بێت. بەڵام ئەو توند و تیژیەی لە مێژوودا پەیڕەوکراوە گەوهەرێکی بەمجۆرەی هەیە، کە ئەو منداڵە خاوەن تەندروستییانەی لە دایك بوون، واتە مرۆڤەکان بچووکتر دەکاتەوە، لەپێشکەوتنی ئازادانەی بێبەش دەکات، تەنانەت وەکو ناسنامەی مێگەلی ئاژەڵ هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات و هەندێ جاریش قڕی دەکات. هێندە پەیوەندی بە مامانێتیەوە نییە، بەڵکو زیاتر پەیوەندی بە جەللاد و بەندکردنەوە هەیە. لە مێژوودا بەکارهێنانی زەبر بە شێوەیەکی بێئامان و زێدەڕۆییانە، پەرەسەندنی سروشتی کۆمەڵگا تێپەڕ دەکات و تەنگەتاوی دەکات. دواکەوتوویی (سەرەتایی) تەکنیك و پێشنەکەوتنی زانست (زانیاری) سەرەکیترین هۆکاری ئەم ڕەوشەیە. ئەو زەبرەی لە ژێر فەرمانی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی دایە لە سەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەت، تەنیا کاتێك ئەم بنگەیە بەلاوەنرا واتای خۆی لەدەست دەدات.

ئەم قۆناخە مێژووییە بۆتە ڕاستینەیەك. هەربۆیە تیۆرییەکانی وەرچەرخان و لەناوبردنی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای زەبری دژە شۆڕش و پاشڤەڕۆیی و موحافەزەکاری و زەبری شۆڕشگێڕی واتای خۆیان لەدەستداوە. دیموکراسی هاوچەرخ ئەو وەرچەرخانەی کۆمەڵگا بە بنەمادەگرێت کە بە گوێرەی پەرەسەندنی سروشتییە. ئەمەش پشت بەو وشیارییە دەبەستێ کە دەرك بەوە دەکات بنگە زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکەی بە شێوەیەکی بەهێز هەیە. نابێ ئەنجامێکی بەمجۆرە هەڵهێنجێ کە دیموکراسی ڕێککەوتن یا سازشکارییەکی نێوان زەبری شۆڕشگێڕی و زەبری دژە شۆڕشە. بێگومان هەڵوێست و نزیکبوونەوەی بەمجۆرە هەڵەیە. لە گەوهەری دیموکراسیدا ڕێککەوتن و تەبایی لە ڕێگای زەبرەوە نابێت. بە پێچەوانەوە دیموکراسی دەرکەوتنی زەبر لە ڕۆژەڤی کۆمەڵگا بە بنەما دادەنێت. ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە ملکەچ کردنیشەوە نییە. بە پێچەوانەوە باوەڕی بەوە دەکرێت کە ڕاستترین پێشکەوتنی ئازادی لە نێو زەمینەیەکدا پەرەدەسێنێ کە سەردەمی زەبر تێیدا بەسەرچووبێ و بێ واتابێت. لەم لایەنەشدا دیموکراسی هاوچەرخ ڕەخنەدانی هەموو هەبوونێکی شارستانییەتی کە بە پشت بەستن بە زەبر هاتوونەتە ئاراوە، دەکات بە پێویستییەك. دیموکراسی ڕژێمێکی ریشەیی ڕەخنەدانە. هەڵوێست بەرامبەر بە زەبر تاکتیکی و تەنانەت ستراتیژیش نییە، بەڵکو پرەنسیپییە. سەرەکیترن پرەنسیپی دیموکراسی، باوەڕی کردن بە هەبوونی قۆناخێکی مێژووییە کە زەبری بەدەرناوە و لەمیانەی هێزی زانست و تەکنۆلۆژیاوە پێی دەگات. ئەم پرەنسیپە گوزارشت لە بناخەیەکی فەلسەفی قووڵ دەکات. ستراتیژ و تاکتیکەکانی سیاسەت و بەڕێوەبەرایەتی بە بناخە ناگرێت، ئەمانە زیاتر وەکو پێویستییەکانی پراکتیزەکردن هەڵدەسەنگێنن. ئەم نزیك بوونەوەیەی سەبارەت بە زەبر، کارەکتەری ئاشتیخوازانەی دیموکراسی هاوچەرخ دەردەخاتە پێش. ئاشتی کۆمەڵایەتی وەکو شێوەی پەرەسەندنی سروشتی دەرکی پێدەکرێت، باوەڕی پێدەهێنرێت. نابێ بەمجۆرە هەڵسەنگاندن بکرێ کە ئاشتی واتای ملکەچ کردنە بەرامبەر بە زەبر، بە پێچەوانەوە بەڵکو واتای لەکارکەوتنی زەبری هەیە. باوەڕی بە جیهانی شارستانی و کۆمەڵگایەکی بێ شەڕ دەکات، ئەمە بە بناخە دەگرێت.

پاراستنی ڕەوا، پرەنسیپێکی دیکەی گرنگی دیموکراسی هاوچەرخە. لە نێو کۆمەڵگایەکدا پەیوەندییەکانی دیموکراسی هاوچەرخ نەبێت، یاخود دیموکراسی دووچاری هێرش بێت، ئەوا خۆپاراستن لەسەر بنەمای پاراستنی ڕەوا مافێکە، تەنانەت سەرەکیترین مافی دەستوورییە. ملکەچ کردن بۆ ئەو یاسا و دەوڵەتانەی کە دیموکراسییانە نین، ناشێ بە هەڵوێستێکی دیموکراسییانە دابنرێت. ئەم هەڵوێستە (پاراستنی ڕەوا) ئەوە لەخۆوە ناگرێت لەمیانەی دژە هێرشێك هێزە دژە دیموکراسییەکان لەناو ببرێت. زیاتر ئەوە دەکات بە مەرجێك لە ڕێگای وشیاری و ڕێکخستنی تەواوی کۆمەڵگا و هەمیشەیی کردنی مافی نارەزایی و خۆپیشاندان، بێدادی بەلاوەبنرێت. ئەو بەرخودانەی پراکتیزە دەکرێت، دەکەوێتە ناو چوارچێوەی پیرۆزی پاراستنی ڕەوا و گەوهەری یاساش پێك دێنێت. پاراستنی ڕەوا، پاراستنی چەکداریشی لەناودا، سەرچاوەی خۆی لە پرەنسیپەکانی دیموکراسی هاوچەرخ وەردەگرێت. هەر چالاکیەکی ئەمە تێپەڕ بکات ناکەوێتە نێو چوارچێوەی پاراستنی ڕەوا.

د ـ لە بۆتەی دیموکراسیدا، نەك چینێك، دەستەیەك یان نەتەوەیەکی سەردەست بەڵکو تەواوی کۆمەڵگا بە بناخە دەگیردرێت. بە درێژایی مێژوو چەندین دەزگای دیموکراسی؛ بنگەی چینایەتی، دەستە و نەژادیان تێپەڕ نەکردووە. ناوزەد کردنی ئەوانە بە دیموکراسییەتی چینە کلاسیکییەکان لە جێی خۆی دایە. هەرچی دیموکراسی هاوچەرخە، بە پێچەوانەوە تەواوی ئەو ناسنامانە ڕەوا دەبینێ کە پەیوەندییان بە کۆمەڵگاوە هەیە و هیچ یەکێکیان قەدەخە ناکات، بەرگری لە مافەکانی ئازادی و یەکسانی دەکات. جیاوازی نێوان ناسنامە کۆمەڵایەتییەکان وەکو کێشە نابینێ و وەکو دەوڵەمەندییەك پەسندی دەکات، تەنانەت پەرەیان پێدەدات و بۆ پێشکەوتن هانیان دەدات. بەمجۆرە لەبەرئەوەی پەنا نابەتە بەر توندوتیژی، بۆیە پشت بەو چالاکی و ڕێکخستنانە دەبەستێ کە لەسەر بنەمای ڕەگەز، نەژاد، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و تەواوی ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکان پێشدەخرێ، دیموکراسی هاوچەرخ سیستەمێکی دینامیکی بەهادارە. زەمینەکەی، موزائیکێکی کۆمەڵگا بە بناخە دەگرێت کە لەمیانەی ئەم شێوازە ڕێکخراوە. هەڵوێست و مەیلەکانی کە بەردەوام مەسەلەکان بە سپی و ڕەش دەچوێنێ، وەکو مەیلێك هەڵدەسەنگێنرێن کە هەڕەشە لە دیموکراسی دەکەن؛ ئاراستە کردن و تێکەوتنە ڕەوشی ئەمجۆرەی ڕژێمە سەرەڕۆ و تۆتالیتەرانە وەکو مەترسییەك دەبینێ. بەرامبەر بەمجۆرە خۆسەپاندنە، سیستەمی دیموکراسی مافی پاراستنی خۆی بە بنەما دەگرێت.

ئەم تەرزەی (نمگ) نزیك بوون سەبارەت بە کۆمەڵگا، هێزی ڕاستەقینەی دیموکراسی هاوچەرخ پێکدێنێ. تەواوی ئەو توێژانەی کۆمەڵگا دەخوازن بژین و پێش بکەون و باوەڕیان بەوە هەیە کە لەمیانەی هاوکاریکردنی یەکتری دەوڵەمەندێتی بەدیدێ، پارێزەرە هەرە بە بڕیارەکانی دیموکراسی و هێزەکەیەتی. لەم چوارچێوەیەدا دیموکراسی هاوچەرخ کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك بە بناخە دەگرێت. کۆمەڵگای دیموکراتیك گوزارشت لە ئازادی وشیاربوونەوە و ڕێکخستن و چالاکی یاسایی هەموو جۆرە هزر و باوەڕ و کولتوورەکان دەکات. لە ڕەوشێکدا کۆمەڵگا سەرکوت کرابێت و بە بێ ڕێکخستن و وشیاری مابێتەوە و لە ترسان ناوێرێ ئیرادەی خۆی دیاری بکات، ناتوانرێ باس لە کۆمەڵگایەکی دیموکراسی بکرێت. ئەگەر کۆمەڵگایەك دیموکراسییانە نەبێت، ناتوانرێ باس لە دیموکراسی هاوچەرخ بکرێت.

ه ـ دیموکراسی هاوچەرخ پێویستی بە دەوڵەتی دیموکراسییانە هەیە. دەوڵەتی دیموکراسییانە، لە ئەرك وەرگرتندا هەڵبژاردنی ئۆرگانە سەرەکییەکانی بڕیاردان و جێبەجێ کردن لەلایەن گەلەوە بە بناخە دەگرێت. لە حاڵەتێکدا هێزێکی بنەماڵەیی و سەرەڕۆ خۆی بسەپێنێ، ئەوا ئەو ئەرك سپاردنانەی کە پەیوەندییان بە هەڵبژاردنەکانی گەلەوە نییە، کارەکتەری دەنگدانی دیموکراسییانەی دەوڵەت دیاری دەکات. هەرچی تیۆری و کرداری دەوڵەتە کلاسیکییەکانە، بێ چەندوچوون خۆیان لە سەرەوەی گەل دەبینن و خۆیان بە نوێنەری ئیرادەی ئیلاهی دادەنێن، لەمیانەی ئەو دەمامکە پیرۆزانەوە خۆیان دەناسێنن کە لە باب و باپیرانەوە یاخود لە دەسەڵاتە جیاوازەکانەوە بۆیان ماوەتەوە. لەم لایەنەوە مێژووی شارستانییەت وەکو مێژووی دژە دیموکراسی بوونی دەوڵەت، بەرامبەر بە کۆمەڵگا دەبینرێ. باڵابوون بەسەر کۆمەڵگا، گۆڕانی کۆمەڵگا، خۆ شاردنەوە و چەسپاندنی ئەوەی لە سەرچاوەیەکی ئیلاهییەوە دێت، دەکرێت بە

هونەرێکی دەوڵەت. باشترین کۆمەڵگای دەوڵەت ئەوەیە کە لە بەرزترین ئاستدا لەلایەن دەوڵەتەوە کۆنترۆڵ بکرێت و چۆنی بخوازێ بەڕێوەی ببات، بیچەوسێنێتەوە و بیخاتە نێو شەڕەوە. شارستانییەت پێشکەوتنی خۆی لەم جۆرە چالاکیانەی دەوڵەت دەبینێتەوە.

هەرچی دیموکراسی هاوچەرخە ئەو گەوهەرانەی دەوڵەت پێچەوانە دەکاتەوە. چاوگەکەی خۆی بە پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگا دەبەستێتەوە، بایەخ بە ئاشکرابوون و ئەو دیو دیاری (شفافیە) دەدات، لەجیاتی ترس ئەوە زامن دەکات وەکو ئامرازێکی باوەڕی و متمانە ببینرێت، دەخوازێ وەکو گەرەنتی دابەشکردنێکی دادپەروەرانە ببینرێ نەك هی چەوسانەوە. بە واتا کلاسیکییەکەی لە چوارچێوەی دەوڵەت دەردەکەوێت. زیاتر هەوڵ دەدات بگات بە رەوشێك لەگەڵ پێناسەی لە ئاستی بەرزترین خشتەکردنی (تنسیق) سیستەمی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگا گونجاو بێت. لە بوارەکانی ئاسایشی گشتی، پەروەردە، تەندروستی، گەیاندن و دیپلۆماسی لە هەق تاکە تاکەی توێژە کۆمەڵایەتییەکان نایەت، وەکو هێزی بڕیار و بەڕێوەبردن، سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەو کارانە بە بنەما دەگرێت کە بە تایبەت بوون (الخصخصە) ناکرێن.

لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا تێکۆشانێکی چڕی گۆڕانکاری و وەرچەرخان لە چەمکی دەوڵەتی کلاسیکەوە بەرەو چەمکی دەوڵەتی دیموکراسی هاوچەرخ بەڕێوە دەچێت. ئەو دەزگایەی زۆر بە ئاستەم بەرەو دیموکراسی هاوچەرخ دەگۆڕێت، دەوڵەت بۆ خۆیەتی. بێگومان رۆڵی کاریگەری ئەم رەوشەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە دەوڵەت هێندەی مێژووی شارستانییەت کۆنە و داب و نەریت و دەزگاکانی ریشەی خۆیان داکوتاوە. بەڵام کاتێك دەبینێ ناتوانێ بەرامبەر بە شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی هێندە بەرگە بگرێت، ئەوا لە وەرچەرخان بەولاوە چارەیەکی دیکە نابینێ، رۆژ لە دوای رۆژ پێشکەوتنی بەمجۆرە لە سەرتاسەری جیهان خێراتر دەبێت.

و ـ لە دیموکراسی هاوچەرخدا، لە ئاکامی دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگا و دەوڵەت دەزگای سیاسیش دەگۆڕێت، لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا، رۆڵی پرد دەبینێ. دیموکراتیزەبوونی سیاسەت؛ واتای زیادبوونی گرنگی و بایەخی جۆگەلەکانی لێشاوی دەوڵەت بۆ کۆمەڵگا، کۆمەڵگا بەرەو دەوڵەت دێت. ئەم رەوشەش رێگا لەپێش زاراوەی سیاسەتی دینامیکی و پراکتیزەکردنی دەکاتەوە. پێشتر لە دەرەوەی کۆمەڵگا، رۆڵ و ئۆرگانەکانی سیاسەت دیاریکراو بوو، گەوهەری دەزگایەکی تەزیو و بەستەڵەکی هەبوو کە یاساکانی ببوو بە داب و نەریت. ئەم راستینەیەی سیاسەتیش؛ ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە رێگای زەبر و کودەتاوە دەکرد بە ناچارییەك. هەربۆیە گۆڕانکارییەکان لە رێگای خوێناوی و توند و تیژیەوە ئەنجام دەدرێن. هەرچی سیاسەتی دیموکراسییە لەمیانەی هەڵبژاردنە رێکخراوەکان و چەمکی فرە حیزبی و لە ژێر سایەی هزر و بەرنامەی پێویستدا شانس بە هەموو گروپ و کولتوورێك دەدەن تاوەکو رەنگدانەوەیان لەسەر دەوڵەتی دیموکراسییانە هەبێت، سیستەمێکی گونجاو بە گوێرەی بە خێرایی ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە نێو زەمینە و هەلومەرجی ئاشتیدا. شانس و رێچکەی گۆڕانکاری بۆ هەر کەسێك ئاواڵا دەکرێت. ئەم رەوشەش رێگەی کارتێکردنە سەر پارتیبوونی دیموکراسییانە و لۆبییەکان و دامەزراوە هەمە جۆرە مەدەنی و دیموکراسییە جەماوەرییەکان دەکاتەوە. هەر وەکو بڵێی گۆڕەپانی سێیەم دێتە ئاراوە.

ئەم گۆڕەپانە تازە پێشدەکەوێت کە دەشێ بە ئامرازەکانی سیاسەتی دیموکراسییانەش ناوببرێت. ئەم ئامرازانەی بە هۆی قەدەخە نامەکانی چاخەکانی پێشوو ناچاربوون بە نهێنی خەبات بکەن، لە دیموکراسییەتی هاوچەرخ دەبن بە ئامرازی ژیانی و دەست لێبەرنەدراو. تەواوی ئەم بە دەزگابوونانەی لە بوارەکانی ئابووری، کولتووری، هونەری، کۆمەڵایەتی، وەرزشی، زانستی، ژینگە و تەکنۆلۆژیا و لە سەرووی هەمووشیانەوە لە بواری بە پارتیبوونی سیاسی پێشدەکەوێت بە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ناو دەبرێن. رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەکو پێشکەوتووترین و گرنگترین ئامرازەکانی مێژووی پێشکەوتنی دیموکراسی هاوچەرخ لە نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەتی کلاسیکی، ئامرازی ژیانی و دەست لێبەرنەدراوی ژیانی دیموکراسییانەیە. ناو بردنی ئەمە بە گۆڕەپانی سێیەم گرنگە. بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا گۆڕەپانی سێیەم بەم شێوەیە دێتە ئاراوە. بەخشینی گەوهەری دیموکراسییانەش بەم چاخە بۆ ئەو نوژەنی و بایەخەی دەگەڕێتەوە.

ز ـ ئەو بابەتانەی کە لە سەرووی بابەتەکانی پێشکەوتنی دیموکراسی هاوچەرخ دێت مافەکانی مرۆڤ و ئازادی ژنە. لە قەڵەمدانی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی ژن بە دەزگای کۆمەڵگای سەرمایەداری، هەڵسەنگاندنێکی ناتەواوە. بە پێچەوانەوە ئەمانە لە قۆناخی بەلاوەنانی شارستانییەتی سەرمایەداری و سەردەمی ئاشکرابوونی ناتەواوی و لاوازی راستینەی بەڕێوەبەرایەتی و ژیانی باوی سەرمایەداری، پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینی. مافەکانی مرۆڤ و ئازادی ژن دوو پارچەی سەرەکی دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگان. دوو دیاردەی سەرەکین کە چەندە بتوانرێ چوارچێوەی شارستانییەتی کلاسیك تێپەڕ بکرێت، دەرفەتی پێشکەوتنیان زیاتر دەبێ و لە رێچکەی ئاراستەکردن بەرەو پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ رۆڵێکی دیاریکراو دەبینن. ئەمانە بەرهەمێکی هەلومەرج و زەمینەی کۆمەڵگای سەرمایەداری نین، بەڵکو بەرهەمی ئەو پێشکەوتنانەی کۆمەڵگان کە کۆمەڵگای سەرمایەدارییان تێپەڕ کردووە. لەم بوارەدا گەوهەرێکی بەمجۆرەی هەیە کە دەبێتە وەڵام بۆ پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ. پێشکەوتنی دیموکراسی هاوچەرخ لە ئاستێکی هەرە لەپێشدا لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادی ژندا دیاری دەبێت. لەوە دەچێ هەر دوو بابەت رۆڵی دەستپێکردن لە دەرچوونێکی نوێی شارستانییەت ببینن. مافەکانی مرۆڤ و ئازادی ژن کە بە درێژایی مێژوو لە پەڕاوی کۆمەڵگای چینایەتی سڕابۆوە، ئیتر بۆ ئەوە پاڵێوراو و بەر ئەندامن وەکو بوارە سەرەکییەکانی نوێ بوونەوە پێشکەوتنێکی مەزن بەدیبێنن. لە کاتێکدا مافەکانی مرۆڤ بناخەکانی چوارچێوەی یاسای شارستانییەتی نوێ دیار دەکات، ئەوا بە شێوەیەکی سەرەکی ئازادی ژن، زەمینە کۆمەڵایەتیەکەی پێکدێنێ. ئەو پێشکەوتنانەی لەم دوو بوارەدا بەدیدێت، پەرەسەندن و قووڵایی دیموکراسی هاوچەرخ دیاری دەکات.

خ ـ بنەما فەلسەفییەکانی شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ، سەبارەت بە ئاشکرایی و باوەڕ پێهێنان و تەفلی بوونێکی زانستییانە جێگای گرنگی و بایەخ پێدانە. دیموکراسی سیستەمێکی بێ پرەنسیپی وەها نییە کە هەر توێژێك بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی شرۆڤەی بکات. لەسەر بنەمای زانست خاوەن هێزێکی فەلسەفی و چاوگی هزرێکی سیستەماتیکی جیهانی ئەوتۆیە کە چەمکێکی چالاکی و بەرنامە و پرەنسیپی خۆی هەیە. یاسای هەبوونی وەرچەرخانی یەکێتی دژەکانی ماتریالیزمی دیالەکتیکی بەهێزترین کۆڵەکەی دیموکراسی هاوچەرخە. سەرەکیترین دژایەتی دیموکراسی هاوچەرخ ئەو دژایەتییەیە کە لە نێوان راستینەی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی کۆن و راستینەی پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ دێتە ئاراوە. واتا ئەگەر شارستانییەتی کۆن بە تێز و دیاردە نوێیەکانی شارستانییەت بە دژە تێزی هەڵسەنگێنین، ئەوا ئەو سەنتێزەی دێتە ئاراوە دەبێتە دوا هەنگاوەکانی ئەم قۆناخە. لەبەرئەوەی دیموکراسی هاوچەرخ لە قۆناخی دەستپێکی پێشکەوتندایە، بۆیە دیاردەکانی شارستانییەتی کۆن زیاترن، بەڵام لەبەرئەوەی لە نێو قەیراندا لە پەلوپۆ کەوتوون و لە رەوشێکی بێ هێزیدان، بۆیە بەرامبەر بەمە، ئەو دیاردانە کەمترن کە پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ دەکەنە ناچارییەك، بەڵام لەبەرئەوەی نوێنەرایەتی ئایندە دەکەن، لەو زیندووتر و بەهێزترن. لە سایەی هەبوونی هەلومەرجەکانی تەکنۆلۆژیا و پێوانە دیموکراسییەکان، ئەم هێزانەی لە رەوشی رکابەرێتی یەکتردان بە بێ ئەوەی پەنا ببنە بەر زەبر، زیاتر لەمیانەی ئێشێك کە لە ئازاری لە دایك بوون دەچێت، ئەوا لە رێگای سەنتێزێکی باڵا کە دەتوانین بە نوێیی دابنێین، ئەنجامگیری دەکات.

لە راستیدا ئەم پرەنسیپە سەرەکییەی فەلسەفە، لەگەڵ ئەو واتایانەی بە دیاردە و پەیوەندی و زاراوەکانی وەرچەرخانی دیموکراسی هاوچەرخ دەبەخشێ رێکە. ماتریالیزمی دیالەکتیکی مێژوویی، لەمیانەی دیموکراسی هاوچەرخ بە کۆمەڵگایەکی کراوە و سیاسەت و سیستەمێکی دەوڵەت دەگەیەنرێ. ئەو سیستەمانەی پشت بە زەبری قەبە دەبەستن، ماندوو بوون و بێ بەرهەمن و بەرامبەر گۆڕانکاری داخراون، ئەمەش سەرچاوەی خۆی لە تێڕوانینە ئایدیالیستی و قەبە ماتریالیستییەکان دێت سەبارەت بە دونیا و لەمیانەی هاژووتنی کۆمەڵگا و سیاسەت و دەوڵەت بۆ نێو بێچارەیی، دووچاری تێکچوون و شێواندنێکی مەزنیان دەکات و لە ئەنجامدا هەڵدەوەشێتەوە و دیسان ناتوانێت خۆی لە پەیڕەوکردنی یاسای دیالەکتیکی مێژوو بدزێتەوە.

وەکو ئەنجام، چاخی شارستانییەتی هاوچەرخ؛ گوزارشت لەو قۆناخە مێژووییە درێژ خایەنە دەکات کە هێشتا لەمیانەی پەرەسەندنی زانستی ـ تەکنۆلۆژی چاخەکانی شارستانییەتی چینایەتی بە تەواوی تێپەڕ نەکراوە، هێشتا نوێیەکەش بە تەواوی شێوەی نەگرتووە و یەکلا نەبۆتەوە. کۆن و نوێ لە ناو یەکتردایە. بەڵام بە شێوازی ئاشتیخوازانە وەرچەرخان بەڕێوە

دەچێت. پشت بە بۆچوونێکی بەمجۆرە دەبەستێ کە ئاستی تەکنۆلۆژی بەدیهاتووە، بە بێ پەنا بردنەبەر زەبر، زەمینەی ماددی هەموو جۆرە وەرچەرخانێك بەدیهاتووە. ئەمەش ئەو بۆچوونە دەردەخاتە پێش کە دەوڵەتی کلاسیکی و کۆمەڵگای داخراو تێپەڕ کراوە و کۆمەڵگای مەدەنی وەکو گۆڕەپانی سێیەم بە کاریگەر بووە. دەرکەوتنە پێشی کۆمەڵگای مەدەنی وەکو گۆڕەپانی سێیەم لە نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەت کە گۆڕەپانی یەکەم و دووەمن، دەرخستنە پێشی شێوازی ژیان و بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵییە. جیاوازییەکانی ئایدیۆلۆژی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، نەژادی، رەگەزی، ئەتنیکی و سیاسی وەکو دەوڵەمەندی کۆمەڵگا دەبینرێ، هەروەها پشت بەوە دەبەستێ لەسەر بنەمای مافی رادەربڕینی ئازادانەی هەر گروپێك، لەمیانەی ئەو وشیاری و رێکخستنەی دەیخوازێت، بە شێوەیەکی ئاکتیفانە تەڤلی ژیانی سیاسی و کولتووری بێت. راستترین گوزارەی ئەم شێوازەی بەڕێوەبردن و ژیان، ئەوەیە دەوڵەت و کۆمەڵگا لەسەر بنەمای فیدراتیف ـ فیدراڵ بە هەموو جۆرە دەزگایەکی پێویست بگات. هێندەی شێوازی ژیان و بەڕێوەبەرایەتی دیکتاتۆری و سەرەڕۆ و تۆتالیتاری پێچەوانەی بەهاکانی دیموکراسی هاوچەرخە، ئەوا شێوازی ژیان و بەڕێوەبەرایەتی فیدراتیف کە پشت بە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەبەستێ بەو ئەندازەیە بە گوێرەی دیموکراسی هاوچەرخە و گونجاوە. کاتێك لەسەر ئەم بنەمایە بخوازین زاراوە و ناوێکی گشتی بۆ ئەم چاخە دابنێین، ئەوا ناوبردنی بە "چاخی فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی جیهان" لە جێگای خۆیدا دەبێت.

٥ ـ دواترین بچم کە مێژووی شارستانییەت لەسەر بنەمای کۆمەڵگای چینایەتی بەخۆیەوە گرت، چاخی شارستانییەتی سەرمایەدارییە. گرنگترین دیاردە کە لە سەردەمی رووخانی ئەم چاخە دەرکەوتە مەیدان، ئەوەیە شۆڕشە زانستی ـ تەکنۆلۆژیا مەزنەکان جگە لە هەلومەرجەکانی مافی پاراستنی رەوا، رۆڵی زەبری نەهێشتووە و بێ واتای کردووە. هەروەکو دەزانرێ لە مێژوودا زەبر لە خزمەتی سیاسەتی چەوساندنەوە و باڵادەستیدا تا ئاستێکی مەزن رێگای لەپێش خراپەکاری و داڕووخان کردۆتەوە و لەمە بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نەبووە. لە ئەنجامی ئەو ترسەی کارەکتەری راوڕووتی موڵکایەتی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، توێژی بەڕێوەبەر زەبر وەکو گەورەترین گەرەنتی دەبینێ، بەمەرەنگە پیرۆزی کردووە و لە رێگای چیرۆکە مەزن کراوەکانی ڤارەمانێتی بەردەوام پێویستی مەزنکردنی بینیوە. تەنانەت ئەو خوداوەندانەی میتۆلۆژیا کە نازانن زەبر چییە، لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی بە تایبەتیش لە چاخی دەرەبەگایەتیدا، بە رادەی هەرە زێدە سیفەتی سزادان و قەهری پێبەخشراوە.

رۆڵی زەبر لە وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگادا زۆر لەوە کەمترە کە مەزەندە دەکرێ. لە سەردەمی تەشەنەکردن و بەرفراوان بوونی قۆناخەکانی کۆمەڵگا، سەبارەت بە بەلاوەنانی کۆسپە موحافەزەکارانەکان، زەبر رۆڵی وەرچەرخان دەبینێ. لە کاتێکدا چالاکییەکانی بەمجۆرەی توند و تیژی تەشەنە کردنێکی چۆنایەتی و کورت خایەن ئەنجام دەدەن، دواتر تێپەڕ دەکرێن. هەروەکو دەزانرێ بەشی زۆری توند و تیژی کە بە درێژایی مێژوو بە بەردەوامی لە شێوەی فەتح، داگیرکاری و تاڵان پراکتیزە کراوە، زۆرداری لەخۆوە گرتووە و رێگای لەپێش خراپەکاری و داڕووخان کردۆتەوە. بۆ ئەوەی ئەمە پەردەپۆش بکات، بانگەشەی ئەوە دەکات پێویستییەکی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودایە؛ ئەگەر بکوژرێ بە شەهید، ئەگەر بمێنێتەوە وەکو ڤارەمان پیرۆز دەکرێت. ئەگەر ئەمەش تێر نەکات بەشێکی زۆری دەسکەوتەکانی تاڵانی پێدەبەخشرێت، لە راستیدا بەمجۆرە مێژووی نەفرین لێکراو دەنووسرێ. لەم چوارچێوەیەشدا کاتێك مێژووی، ئەوانەی نووسراون، بە مێژووی نەفرین لێکراو هەڵدەسەنگێنین، ئەوا بەرزکردنەوەی ستەم لێکراوەکانی وەکو ڤارەمانە راستەقینەکانی رەنج و ویژدانی مرۆڤایەتی، بە واتای نووسینی مێژوویەکی راست دێت. لە کاتێکدا پاراستن و بڵاوبوونەوەی سیستەمە پێشکەوتووخوازەکان لەگەڵ گەوهەری راستەقینەی خۆیدا دڵسۆز بێت، خاوەنی هەمان شکۆمەندییە.

مێژووی شارستانییەت شیکردنەوەیەکی راستی سەبارەت بە زەبر پێشنەخستووە. ئەوەی مۆرکی خۆی لە مێژوو داوە، کاریگەری گرانی هزری میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفی پێوەیە کە گوزارشت لە بەرزکردنەوەی چینی چەوسێنەر و سەردەست دەکات و دەیانکات بە دەسەڵات و بەڕێوەبەرایەتی. بەمجۆرە ئەو مێژووەی لە ژێر ئەم کاریگەرییانەدا نووسراوە پڕە لە ناهەقی و خاوەنی رۆڵە سەرەکییەکانی بەرەواژوو کردۆتەوە و ئەو دیاردانەی پشت گوێ خستووە کە دەشێ ببن بە مێژوو، لە مەتنی خەیاڵی ئەدەبی بەدواوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. بەر لە هەموو شتێك پێویست دەکات مێژووی ئەم مێژووە بە راستی بنووسرێت. تەنیا کاتێك ئەم ئەرکە بە سەرکەوتووانە جێبەجێ بکرێت، دەرفەتی ئەوە دەرەخسێ مێژوویەکی چارەسەر ئامێز بنووسرێ. لەوانەیە گەورەترین زۆرداری کە لە مێژوو کراوە، بەهۆی ئەم جۆرە نووسینەوەیەی مێژوو بووە. لایەنی هەرە نەرێتی (سلبی) ئەوەیە کە چالاکی ئەو دیاردە و دەزگا و کەسایەتیانەی بە مێژوو ناو دەبرێن و کاریگەری ئەمەیان لەسەر کراوە، بەردەوامی لێشاوی ناخۆشی چالاکیەکانیانە. ئەو مێژووەی بە چەوتی نووسراوە، بەردەوام ئەنجامدانی کرداری چەوت دەچەسپێنێ. هەربۆیە مەرجێکی لەپێشینەی پراکتیکی راست، چەمکێکی راستە بۆ مێژوو. چەمکێکی راستیش بۆ مێژوو، یەکەمین هەنگاوی شیکردنەوەی راستە بۆ شارستانییەت.

ئەوەی لەمیانەی ئەم بەرگرینامەیەش هەوڵی بۆ دەدەین، ئەوەیە کە هەرچەندە لە ژێر بێ ئامانترین رەوش و قۆناخ و لە ئاستی چوارچێوەیەکیشدا بێت، رۆڵی خۆمان بۆ چارەسەرییەك سەبارەت بە مێژووی شارستانییەت ببینین. لەبەرئەوەی پیلانگێڕی و زۆردارییەکی مەزن لە ئارادایە، یەکەمین کاری پێویستە ئەنجام بدرێت، روونکردنەوە و ئاشکراکردنی بناخەی شارستانی و مێژووی ئەم ستەمکاریانە و پچڕاندنی دەمامکە درێوەکانی ئەو پیلانگێڕە ساختەکارانەیەی کە خۆیان بە خولقێنەر و نووسەری مێژوو دادەنێن. ئاشکراکردنی ژیانی گەندەڵی تەواوی ئەو کەسایەتیانەی لە ناوەندەکانی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتدا خاوەنی هەڵوێستی پیلانگێڕین و ئەو تێڕوانینانەی سەبارەت بە جیهان پشتی پێدەبەستن، بە واتای پاراستنێکی مەزنی مرۆڤایەتی دێت.

ئەو قۆناخەی هەرە دوایی کە چاخی شارستانییەتی سەرمایەداری تێیدا دەژی، بۆتە بابەتی چەندین هەڵسەنگاندن. لە کاتێکدا ئەوانەی سەبارەت بە مێژوو خاوەنی دیدگایەکی موحافەزەکارانەن، ئەم قۆناخە وەکو"کۆتایی مێژوو"هەڵدەسەنگێنن، ئەوانەی لە روانگەیەکی شۆڕشگێڕییەوە تەماشای دەکەن خواستوویانە وەکو "چاخی سۆسیالیزم" هەڵیسەنگێنن. ئەو فەلسەفەیەی لە پشت ئەم هەڵوێستانەوەیە، هی یەکەمیان ئایدیالیزمێکی چەقبەستووە، هی دووەمیان ماتریالیزمی قەبەیە. ئەمانە دوورن لە بینینی تەواوی ئاڵۆزی و ئاژاوەکانی چاخ و چارەسەر کردنیان. هەڵوێستەکانی سەبارەت بە شارستانییەتی پۆست مۆدێرنیزم، بۆچوونی بێ سیستەمی ئەوتۆن کە پراگماتیکییە و لە نێو ژیانی رۆژانەدا خنکاوە.

ئەمە هەڵوێست و نزیك بوونەوەیەکی راستە کە شۆڕشە زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکان بە قووڵایی قۆناخ یەکلایی دەکەنەوە. ئاستی تەکنۆلۆژی بناخەی ماددی ئەو پێشکەوتنانەیە کە وەرچەرخانی تەواوی سیستەمەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکات. بەڵام ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێ کە بە تەنیا تەکنۆلۆژیا وەرچەرخان ئەنجام دەدات. لێرەدا ئەوەی پێویستە بکەوێتە گەڕ، قۆناخی ناسنامەی ئایدیۆلۆژییە. تاوەکو لە دایك بوونێکی ئایدیۆلۆژی بە دی نەیەت، هەرگیز سیستەمی کۆن تێپەڕ ناکرێت و سیستەمی نوێ سەرهەڵنادات. دەتوانین بەوەی بچوێنین: کێڵگە نەبێت تۆو ناژێت. ئەگەر کێڵگەیەکی نوێ بە تەکنۆلۆژیا دابنێین، ئەو تۆوەش بە واتای ئایدیۆلۆژیا دێت.

ناسنامەی ئایدیۆلۆژی چاخی سەرمایەداری لەمیانەی رێنسانسی سەدەکانی پانزدەهەم و شانزدەهەم شێوەی گرت. لەبەر ئەوەی بە پێی پێویست باس کرا، دووبارەی ناکەمەوە. سەرمایەداری لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدە و نۆزدەدا گەورەترین پێشکەوتن و دەزگابوون و پەلهاوێشتنی ئەنجامدا و کۆتایی پێهێنا. خاڵە گشتییەکانی ئەم بابەتانەش ئاماژەی پێکرا. هەرچی سەدەی بیستەمە بە ڤەیران و ئەو شەڕانەی دابەشکردن کارەکتەریزە دەکرێ کە لەپێناو رزگاربوون لە ڤەیران ئەنجام دران. لەمیانەی هەر دوو شەڕی جیهانی و چەندین شەڕی هەرێمی، ئاشکرا بوو و سەلمێنرا کە سیستەمی سەرمایەداری ناتوانێ لە رێگای شێواز و رێچکە کلاسیکییەکان بەردەوام بێت. شێوازی کۆنی مۆڵکداری رەنج و کردارەکانی داگیرکاری کۆن و نوێ، نەیانتوانی خۆیان لە بەلاوەنان و تێپەڕکردن رزگار بکەن. بەڵام ئەم رەوشە بە واتای شارستانییەتێکی نوێ نایەت، بە تایبەتیش هەروەکو سەردەمێك بە شێوەیەکی بەربڵاو بانگەشەی بۆ دەکرا بە واتای دەستپێکردن و ئاواکردنی چاخی شارستانییەت نایەت؛ زیاتر واتای وەرچەرخانی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و بەڕێوەبەرایەتی لەخۆوە دەگرێت. ئەم راستینەیەش کە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەوە زیاتر یەکلا بۆوە، وەکو شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ پێناسە دەکرێت.

له سەردەمی دیموکراسی هاوچەرخ هێشتا سیستەمی سەرمایەداری لەناو نەچووە، بەڵام قۆناخی باڵادەستی بێ سنووری رابردووی له دوای خۆی به جێ هێشتووه. باڵادەستی و چەوساندنەوە و شێوازی ژیانی تا ئاستێکی بەرز، سنووردار و تەسك کراوەتەوە. پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ، به واتای راستەڕێ کردنی سەرمایەداری خستنه ژێر زەبت و رەبتەوە دێت؛ ناچار دەکرێت گەلان و زەحمەتکێشان بکات به هاوبەشی هێزی بەڕێوەبردن و وەکو دەخوازێت نەیانچەوسێنێتەوە.

بێگومان لەگەڵ ئەوەی تێکۆشانی گەلان و زەحمەتکێشان رۆڵێکی دیاریکراو دەبینن، ئەمەش تەنیا ئەو کاتە بەدیهاتووە که پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا گەیشتە ئاستێکی زۆر بەرز. به درێژایی مێژوو، گەلان و زەحمەتکێشان تێکۆشانێکی مەزنیان بەڕێوە برد. بەڵام نەیانتوانی ببنه کۆسپ لەپێش ئاستی زێدەڕۆیی پراکتیزەکردنی سەرەڕۆیی و چەوساندنەوە لەلایەن رژێمە دەسەڵاتدارەکان، گرنگترین فاکتەری شکست هێنانیان نییە، زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئاستی تەکنۆلۆژیا دەرفەتی تەفلیبوون و هاوبەشێتییەك نادات که بەلایاندا بشکێتەوە. تەنیا کاتێك شۆڕشه مەزنه زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەگاتە ئاستێك که دەرفەت به سەرلەنوێ تەفلیبوون و دابەشکردنی زێده بەها و دەسەڵاتی سیاسی دەدات، ئەوا ئەو کاتە هەلومەرجە بابەتییەکانی سنووردارکردنی دەسەڵات و چەوسانەوە، به شێوەیەکی بەهێز دێته ئاراوە. له دوای ئەم هەلومەرجە بابەتییانەوە دیموکراسی هاوچەرخ قەڵەمبازێکی مەزن ئەنجام دەدات. به سیستەم کردنی خۆی وەکو ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی و به دەزگابوونی سیاسی، له نزیکەوە پابەندی ئەم هەلومەرجە بابەتیانەیە.

لەم حاڵەتەدا له روانگەیەکی دیکەوە دیموکراسی هاوچەرخ به واتای سەرلەنوێ رێکخستن و بەڕێوەبردنی تەواوی دەزگا و مەکانیزمەکانی بەڕێوەبەرێتی سیستەمی شارستانییەتی سەرمایەداری دێت، که لەبار بێت بۆ سەرلەنوێ تەفلیبوون و هاوبەشێتی و بەشداری گەلان و زەحمەتکێشان. لەم سیستەمەدا وەکو جاران ئەوە جێگای باس نییە سەرمایەداری یەك لایەنە چەوسانەوە و دەسەڵات دیاری بکات، یاخود زەحمەتکێشان و گەلان لەمیانەی زەبرەوە به تەواوەتی سیستەمی سەرمایەداری برووخێنن و به شێوازێکی شۆڕشگێڕانە سیستەمی خۆیان ئاوا بکەن. به پێچەوانەوە هەردوو لایەنیش سنووردارکردنی ئۆتۆپیا و بەرژەوەندییەکانی خۆیان پەسند کردووە. له نێو ئاشتیدا شێوازێکی ژیانی به گوێرەی یاساکانی دەوڵەتی دەستووری دیموکراسییانه به بناخه دادەنرێت. ئەو بەرهەمەی تەکنۆلۆژیا رێگای لەپێش کردەوە و زێده ـ بەها و تەواوی بەروبووم و بەهاکانی بوارەکانی دیکە، لەمیانەی بەکارهێنانی مەکانیزمەکانی سیاسەتی دیموکراسییانە، سەرلەنوێ دابەش دەکرێتەوە. هەر بۆیە مافی تەفلیبوونی دەسەڵاتی سیاسی به هەموو توێژێك دەدرێت. هەرچەنده هەندێ جار تەنگەتاوی و تیژبوون بێته ئاراوە، لەجیاتی ون بوون و لەناوچوون له نێو پێکدادان، رێککەوتن لەسەر ئەم سیستەمه دەبژێرن. راستتر ئەوەیە که لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، هەر شەڕێکی فەبوون و هێرشکاری لەسەر بنەمای ئەو چەکە تەکنۆلۆژییە پێشکەوتووانە پێش بخرێت، تەواوی مرۆڤایەتی لەنێو دەبات و هەموو کەسێك بزر دەکات.

شتێکی ئاشکرایە له ناو قۆناخێکی بەم شێوەیە که بۆته خاوەنی بنەمایەکی بابەتی بەمجۆرە، سەرمایەداری شێوەی کلاسیکی خۆی ناسەپێنێ. ئاستی ئازادی که له ئاکامی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی و تێکۆشانی زەحمەتکێشان و گەلان بەدەست هاتووە، گەیشتۆته ئەو ئاسته وشیاری و رێکخستنەی که مۆڵەت بەوە نەدات. ئەمە بژارەیەکی ئارەزوومەندی نییە، بەڵکو قۆناخێکی نوێ جێگای باسە که هەلومەرجەکان دیاریان کردووە. دەشێ ئەم پێشکەوتنە وەکو رازیبوونی سەرمایەداری به وەرچەرخانی دیموکراسییانەش ناوببرێت. لەجیاتی سەرکەوتنی سەرمایەداری لەمیانەی موغامەرە خوێناوییەکانی لەنێوچوون؛ له نێو قۆناخێکی پەرەسەندندا به پێی دەربازبوونی کات بەدەست هێنانی دەسکەوت و دابەشکردنێکی به پێی پێویستیش به پێویستیەکی سیستەم له قەڵەم دەدات. له ئاکامی ئەم رەوشە، نە گەڕانەوەی سەرمایەداری کلاسیکی بۆ رۆژگاری رابردوو جێگای باسە، نه لەمیانەی شۆڕشیشەوە لەنێو دەچێت.

هێنده هێواش هێواش به پێی دەربازبوونی رۆژگار شێوەبەندییەکانی شارستانییەتی نوێ پێشبکەوێت و تواناکاری توانەوەی دەبینرێ، باوەڕ به هەبوونی وەرچەرخانێك دەکرێت. دیسان بناخەی ئەمەش لەپێشکەوتنە زانستی و تەکنۆلۆژیاکاندا دەبینرێ. کاریگەربوونی هێندەی دیموکراسی هاوچەرخ له کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم بناخەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە که واقیعیترین وەڵامی داوەته ئەم قۆناخە. ئەو تواناکاریه مەزنەی که تەکنۆلۆژیای گەیاندن و راگەیاندن بۆ کۆمەڵگای بەدەست هێناوە، کۆمەڵگای مەدەنی لەمیانەی ئەم سیاسەت و هێزەی وەکو گۆڕەپانی سێیەم بەدەستی هێناوە، ئەو هێز و توانایەی هەیە دەوڵەت ناچار بکات که بۆ کەناڵە دیموکراسییەکان کراوە بێت، دەرفەت به باڵادەستی چینێك نادات. کۆمەڵگایەکی دیموکراتیزە بووبێت، هێنده فره رەنگه که دوالیزمی رەش و سپی پەسند ناکات. ئەگەر بێتو دامەزراوەی هەمەڕەنگی پیشەکاری تەکنۆلۆژی نەبێت، کاروباری کۆمەڵگا له رەوشێك دایه تەنیا لەمیانەی بەڕێوەبەرایەتی سیاسییەوە ناتوانرێ بۆ تاکه رۆژێکیش بەڕێوە ببردرێت. خاڵی سەرەکیتر ئەوەیە، بەهۆی هۆکارە تەکنۆلۆژییەکان مەحاڵه ئەو تاکەی ئازاد بووە لەمیانەی چەمکی کلاسیکی سەرەڕۆیی و تۆتالیتاری بەڕێوە ببردرێت.

وەکو ئەنجام، شارستانییەتی سەرمایەداری له نێو پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ سەرلەنوێ پێناسەی خۆی دەکات و هەوڵ دەدات ناسنامەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژی بەدەست بێنێ، سەبارەت به ئاواکردنی تەواوی دەزگا ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، لەگەڵ توێژه پەیوەندیدارەکان رێك دەکەوێ و لەمیانەی تەبایی شێوازێکی ژیان و بەڕێوە بردن، پەسند دەکرێت. له کاتێکدا ئەم رەوشە بەسەر چوونی چاخەکانی باڵادەستی و چەوساندنەوەی بێ سنوور دەسەلمێنێ، هاوکات ئەوەش دەخاته روو که پێشکەوتنی نوێی شارستانییەت کەوتۆته رۆژەڤی مێژووەوە. بێگومان پێشکەوتنی زانستی ـ تەکنۆلۆژی بناخەی هەلومەرجی بابەتی دیاریکردنی دیارده نوێیەکانی شارستانییەت و پەیوەندییەکانی پێك دێنێت. پێکهاته داهێنەرەکانی ناسنامه ئایدیۆلۆژییەکان لەم زەمینەیەوە سەرچاوە دەگرن، ئەو دیارده رێکخراو و به دەزگا کراوانه بڵاو دەکەنەوە و گەشه دەکەن که دەتوانێ کارەکتەری قەیرانی سەرەکی ئەم چاخه تێپەڕ بکات.

٦ ـ ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی بەرامبەر به سیستەمی سەرمایەداری پێشکەوت و رێگای لەپێش سیستەمی سۆسیالیستی کردەوە، نەیتوانی ببێت به شارستانییەتێکی جیاواز. ئیتر چ بۆ ناسنامەی ئایدیۆلۆژییەکەی بگەڕێتەوە، یان له دایك بوونێکی پێش وەخت بێت، یاخود له ئاکامی هەڵەکانی بێت، نەیتوانیوە داخوازییەکانی زەحمەتکێشان و گەلان بۆ ئازادی و یەکسانی بکات به پێشکەوتنی شارستانییەتێکی نوێ. سەرەڕای ئەو بانگەشانەی لەم بوارەوە دەیکرد، بەڵام له ئەنجامدا له سەرمایەداری دەوڵەت بەولاوە تێپەڕی نەکرد. چەندین لێشاوی ئایدیۆلۆژی و جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی بەمجۆرە له مێژووودا هاتۆته ئاراوە. هەرچەنده لەسەر بنەمایەکی ئایینی و بناخەیەکی تیرەگەرێتی بن، پێهەڵگرتنی نوێی حەزرەتی ئیبراهیم و مووسا له رەوشی دەستپێکدا، سۆسیالیزمی تیره پێك دێنن. له رۆژهەڵاتی ناوینی چاخەکانی سەرەتاییدا به تایبەتیش ئەو جڤاتانەی که دەسەڵاتی ئاشوورییەکان سەراوبنی کردوون و ناچاری راگواستنەوەی کردوون و له نێو مەترسیدا خنکاندبوویان، تەنیا له رێگای پەیڕەوی ژیانی کۆمەڵکاری شێوەی تەریقەتی سۆفیگەرایی توانیویانه درێژە به هەبوونی خۆیان بدەن. تەنانەت سیستەمی یەکەمین راهیبەکانی میسر و سۆمەر یەکەمین نموونەی پیرۆزی سۆسیالیزمی دەوڵەتە. لەمیانەی ئابووری دەوڵەتی هاوشێوەی سیستەمی سۆفییەت رێگای شارستانییەتیان کردۆتەوە. له کۆمەڵگای نئۆلیتیکی پێشووتردا له دەوروبەری دایك ـ ژن سیستەمێکی تەواوی کۆمەڵگای کۆمۆنه پێك هاتووە. ئەم سیستەمەی کۆمەڵگا که دەتوانین سۆسیالیزمی سەرەتایی پێبڵێین، لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتی نەناسیوە، به هەزاران ساڵ بەردەوام بووە. مرۆڤایەتی هەوێن کردنی سەرەکی خۆی لەم سیستەمەدا ئەنجام داوە، بەردەوام خواستوویەتی لەمیانەی زاراوەی بەهەشت یادی بکاتەوە که بەردەوام خەیاڵی یەکسانی و ئازادی لەخۆوە دەگرێت.

عیسا و جوڵانەوەی مەسیحییەت له ٣٠٠ ساڵی دەستپێکدا، لەمیانەی درێژ خایەنی و بەرفراوانییەوە، پرشنگدارترین نموونەی سۆسیالیزمیان پێشکەش کردووە. خوێندکارەکانی ئەم قۆناخه به شێوەیەك له کەسایەتی خۆیاندا نوێنەرایەتی ئایدیۆلۆژیا و پراکتیزەکردنیان کردووە که تا ئەو سەردەمه زۆر به دەگمەن هاوتاکانیان بینراوە.

دەرکەوتنی ئیسلامییەتیش، نموونەیەکی دیکەی بژاردەی شێوازی کۆمۆنییە. یەکسانی و رێز گرتنی نێوان ئەندامەکانی له شێوەی خێزانێکی (بنەماڵەیەکی) پیرۆزە. ئوممەت لەمیانەی رەوشی سادەیی خۆیەوە وەکو سۆسیالیزمی سەردەمی دەرەبەگایەتی وایە. دوای ئەوەی مەسیحییەت و ئیسلامییەت گەیشتن به قۆناخی به دەوڵەت بوون و رۆڵی کەسێتی و بنەماڵەکان زیاد

بوو، ئوممەتیان لە سۆسیالیزمەکەی خۆی دوور خستەوە. ئەو موڵکایەتییە تایبەتییەی پێشکەوتووە کارەکتەری سۆسیالیستانەی سەرەتایی گەندەڵ کردووە، کردوویەتی بە توێکڵێکی ئایدیۆلۆژی پووچ و بێ ناوەڕۆك. وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەم موڵکایەتی بوونە تایبەتییە، بۆ ماوەیەکی درێژ چەندین ئایینزا و تەریقەت ئایدیۆلۆژی و سیستەمی ژیانی هاوبەشیان بەردەوام کردووە. لە راستیدا ئەوەی لە چەندین جوڵانەوەی چاخەکانی ناوینی بە رووخساری ئایینی بینراوە، بەرامبەر بە سیستەمی سەردەست و چەوسانەوە نوێنەرایەتی سیستەمی کۆمەڵکاری دەکات. لاوازی بنەما تەکنیکییەکان (تەکنۆلۆژیاکان) رێگا بەوە نادات ببن بە سیستەمێکی یەکسانی و ئازادی ئەلتەرناتیف. سەرەڕای ئەوەی هەندێکیان سەدان ساڵ بەردەوام بوونە تەنانەت لە ئاستی دەوڵەت بوون بە دەسەڵاتێکی سیاسی، بەڵام نەبوون بە مۆدێلێکی شارستانییەت، ئەمەش گرێدراوی لاوازی بنگەی زانستی ـ تەکنۆلۆژیایە. هەروەها جگە لەمەش گەوهەری ناسنامە ئایدیۆلۆژییەکانیان سیستەمی کۆمەڵگای چینایەتی لەخۆوە دەگرێت. هەربۆیە تەنیا لە خەیاڵەکانی خۆیاندا داخوازی یەکسانی و ئازادییان زیندوو راگرتووە. لەسەر ئەم بنەمایەش روویان لە ئەشقی خودایی و بەشەری کردووە، خەیاڵەکانی بەهەشتیان گەورە کردووە، ئومێدەکانی برایەتییان زیندوو راگرتووە. کردوویانن بە داب و نەریتێکی بەهێزی ئەدەبی و ئەخلاقی. پێویستە فێرگەی فەیلەسوفەکانیش بخرێتە سەر ئەم مەیدانە. ئەو فێرگانەی لەسەر بنەمای فەلسەفی بوون، خۆیان لەوە دوور نەگرتووە نوێنەرایەتی هەڵوێستە بەهێزەکانی سۆسیالیستی بکەن. پارتی فەلسەفی وەهایان پێك هێناوە کە بە سەدان ساڵ بەردەوام بووە و چەندێك لەمانە بەرامبەر بە هێرشە دژوارەکاندا بە شێوەیەکی قارەمانانە بەرخودانیان کردووە. واقیعی و لە جێگای خۆیدا دەبێت کاتێك ئەم رەوتانەی لەپێناوی پاراستنی باوەڕی و زانست بەرخودانیان کرد و جەنگاون، وەکو جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی خاوەنی گەوهەری یەکسانی و ئازادی و مێژوویی پێناسە بکەین.

"ئۆتۆپیا" و "وڵاتی رۆژ"ی سەردەمی لە دایك بوونی سەرمایەداری خەیاڵێکی نموونەیی سۆسیالیزم زیندوو دەکاتەوە. لەپێناو خەیاڵەکانی ئازادی کە سەرمایەداری خوڵقاند، چەندین کەس و گروپی لە ژمار نەهاتوو، بە شێوەیەکی قارەمانانە بەرامبەر بە دۆگماتیزمی ئایینی جەنگاون. ئەوان کاتێك دەجەنگان، هەرگیز گومانیان لەوە نەبوو کە لەپێناو خزمەت کردنی ئارەزووی تاکڕەوێتی هەر کەس نییە، بەڵکو لەپێناو یەکسانی و ئازادی و برایەتییەوە کەوتوونەتە نێو جموجۆڵەوە. تەنانەت دروشمە سەرەکییەکانی شۆڕشی بۆرژوازیش "یەکسانی، ئازادی و برایەتی"یە.

تەنانەت دامەزرێنەرەکانی سۆسیالیزمی زانستی کارل مارکس و فرێدریك ئەنگلس بە بێ هیچ دوو دڵییەك دان بەوەدا دەنێن کە لە ئاواکردنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی فەلسەفەی ئەڵمانی و سۆسیالیزمی فەرەنسی و کارەکتەری چینی کارکەری بەریتانیایان بە بناخە گرتووە. تەنانەت ئەم باسە کورتەش ئەوە نیشان دەدات لە سیستەمی کۆمۆنەی سەرەتایی سەردەمی نئۆلیتیك تاوەکو قۆناخی سۆسیالیزمی زانستی، زەحمەتکێشان و گەلانی ژێردەست لەسەر بنەمای برایەتی و لە رێگای ئایدیۆلۆژیایەك کە یەکسانی و ئازادی لە گەوهەری خۆیەوە دەگرێت لەپێناو ژیانێکی هاوبەشانە، بەردەوام تێکۆشانیان کردووە و ئێش و ئازاری مەزنیان چێشتووە و بە شێوەیەکی قارەمانانە بەرخودانیان کردووە. ئەگەر ئەمانە نەیانتوانیوە ئەو سیستەمە ئاوا بکەن کە شیاو و مافی خۆیان بوو، هۆکارەکەی نە لاوازی باوەڕی و نە کەمی تێکۆشانە؛ بەڵکو هێشتا نەبوونەتە خاوەنی ئەو هەلومەرجە (تەکنۆلۆژیە) کە ئەم ئامانجە پیرۆزەیان بەدیدێنێ؛ هەروەها لەبەر ئەوەیە کە رەوشی دواکەوتووی (سەرەتایی) تەکنۆلۆژی مەحکوومی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی دەکات.

ئەم جوڵانەوەیەی چینی کارکەر کە لە ژێر رێبەرایەتی مانیفێستۆی کۆمۆنیست بەرێوە دەچێ، دوا جوڵانەوەی یەکسانی و ئازادی ئەم زنجیرە مێژووییەیە. نووسەرانی مانیفێستۆ کە هەستیان بە کارەکتەری ئۆتۆپیای جوڵانەوەکانی پێش خۆیان کردووە. هەربۆیە زۆر گرنگی و بایەخی بە زانستی بوون دەدەن، بەڵام ئەم زانستی بوونە لەگەڵ چاخەکەی خۆیان سنووردارە. سەرمایەداری لە نێو قۆناخی هەرە پێشکەوتوودا دەژی، تازە بە تازە رووبەڕووی قەیران دەبێتەوە. باوەڕی بێ سنووری بەخۆی هەیە. مێژوو بەخۆی دەستپێدەکات و بێ کۆتایی دەکات. هەرچەندە زانستی بوون لەخۆیەوە بگرێت، بەڵام ئەم سۆسیالیزمە هێشتا بە دروستی پێی خۆی لەسەر زەوی دانەناوە. جوڵانەوەی چینی کارکەر هێشتا لە قۆناخی منداڵێتی دایە. دەنگی جوڵانەوەی رزگاری چەوساوەکان لە ئارادا نییە. سەرباری ئەمەش، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەداوە لەمیانەی ئاواکردنی یەکەمین و دووەم ئەنتەرناسیۆنال، لە بواری ئایدیۆلۆژی و کردارییەوە بە شێوەیەکی بوێرانە هەڵوێستی چینایەتییان راگەیاندووە. هەڵوەستەی زانستییانە و لە ژێر هەموو هەلومەرجێکدا، بە دوادا چوونی مافی رەنج و پاراستنی ئەو لایەنانەن کە جێگای رێز گرتنن. لایەنی پێغەمبەرایەتی ئەم کارە، لێرە دایە. گفتوگۆی لە جۆری ستراتیژی گونجاوە یاخود نا، ناشێ ببێتە زمانی قۆناخی بەمجۆرە. لە کاتێکدا عیسا لە باوەڕی بە (رەب)ی خۆی بەولاوە هیچ چەکێکی دیکەی نییە، لە کاتێکدا دژی سیستەمی جیهانی رۆما دەوەستێ، لە رەوشێکی وەهادا نییە بیر لە ستراتیژی و تاکیتك بکاتەوە. بەڵام لە هاوێشتنی ئەو هەنگاوە بەهێزە، کە لە ئاراستە کردن بەرەو مرۆڤایەتی و چاخی ئازادی بێ کۆتایی هەوڵێکی مێژوویی قۆناخی گۆڕینە ناکەوێتە بچووکترین دوودڵییەوە. بەمجۆرەش ئەو هەنگاوانەی هاوێشتراون پیرۆز دەکرێن. لەم چوارچێوەیەدا دامەزرێنەرە قارەمانەکانی سۆسیالیزم و یەکەمین جوڵانەوەی بنگە کۆمەڵایەتییەکان جێگای پیرۆزین. سەرکەوتنی سیاسی یاخود زیانی پڕ لە ئێش و ئازار، لە تەك گەوهەری مەسەلەکە، کێشەیەکن بە پلەی دووەم دێن. سەرنەکەوتنی کۆمۆنەی پاریس یاخود هەرەس هێنانی دووەمین ئەنتەرناسیۆنال، ناتوانێ رێگا لەوە بگرێت کە سۆسیالیزمی زانستی زیاتر بە ئامانجەکانی خۆیەوە گرێ بدرێت؛ لەمیانەی قۆناخی لینینیستی، بە هێزێکی سیاسی مەزن و هێزی دەوڵەت دەگات. بە گوێرەی پێناسەی کلاسیکی، ئەوا رادەگەیەنرێ کە سێ یەکی جیهان، دەربازی قۆناخی شارستانییەتی سۆسیالیستی پرۆلیتاریا و گەلە چەوساوەکان بووە. بانگەشەی ئەوە دەکرێت لە هەموو بوارێکدا پێشبڕکێیەکی سەرکەوتووانە لەگەڵ سەرمایەداری دەکرێت. لە راستیدا بۆ یەکەمین جار، لە مێژوودا کۆماری یەکسانی و ئازادی چەوساوەکان هێزی ئەوە نیشان دەدات کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر پێی خۆی بمێنێتەوە و بژی. بەڵام بەر لەوەی یەکەمین سەدەی تەمەنی خۆی پڕ بکاتەوە، بەر لەوەی بە کۆتایی سەدەی بیستەم بگات، ئەم کۆمارانە هەڵدەوەشێنەوە و بایەخی مێژوویی خۆیان لە دەست دەدەن. زاناکانی بۆرژوازییەت بە ئامانجی پڕوپاگەندە، ئەو گۆڕانکارییە وەکو ئیفلاسکردنی سۆسیالیزم رادەگەیەنن، مارکسیستەکانیش لە ژێر شێوەی جیاجیادا بە تاوانی خیانەت دادگایی دەکەن، لەلایەنی ئەو کەسانەی کە بە دڵسۆزی و مۆئمینانە گرێدراوی سۆسیالیزمن، بە داڕووخانی خەیاڵە پیرۆزەکانیان هەڵیدەسەنگێنن. بەڵام بۆ ئەوانەی ئارامترن و هەوڵ دەدەن بە گوێرەی هەڵوێستێکی زانستییانە نزیك ببنەوە، لێرەدا بە شێوەیەکی سۆبژەکتیڤانە (ژاتی) و وەکو تێك شکاندنێکی مەزنی خەیاڵەکان و لەمیانەی لە قەڵەمدانی رەوشەکە بە خیانەت کاری، بەرەو چارەسەرییەکی سانایی ئاراستە ناکرێن. ئەوەی روویداوە، لەبەرئەوەی پێویست بوو روویدا. لەبەرئەوەی لە گەوهەری خۆیدا شایستەی ئامانج و خەیاڵەکان نەبوو، بۆیە نوێنەرایەتی نەکرد و هەڵوەشایەوە. لەجیاتی شادبوون و خەمگینی بەرامبەر بەم، لەمیانەی لێپرسینەوەی ئەوەی راستی لە کوێی ئەمە دایە، بە دوادا چوون هەموو کاتێك بۆتە رێبازی زانست و لەم رێگایەشەوە سەرکەوتن بەدیهاتووە.

ئەزموونی سۆڤییەت هەڵسەنگاندنی قووڵی دەرهەق نەکراوە؛ گرنگتریش ئەوەیە، تاوەکو ئێستاش تەواوی دەرئەنجامەکانی هەڵوەشانەوە سەریهەڵنەداوە. وادیارە چەندین بابەت لە تاریکیدا ماونەتەوە یاخود چاوەڕوانی قۆناخی نوێیە. سەرباری ئەمەش، کاتێك سەیری ئەو دیاردانە بکرێت کە لە ئارادان، فەلسەفە و کردارە سەرنەکەوتووەکانی بەرچاوە. تازە بە تازە لێپرسینەوەی بەمجۆرە پێشدەکەوێت کە ئەوەی پەیڕەو کراوە، سۆسیالیزم یان نەتەوەپەرستی، ئازادی یان تۆتالیتاریزم، یەکسانی یان سەرمایەداری دەوڵەت، بووە. هەرگیز ئەم پرسیارانە گرنگی مێژوویی ئەو تێکۆشانە پیرۆز و مێژووییە کەم ناکاتەوە کە بە ملیۆنان مرۆڤی زەحمەتکێش و قارەمانی لە ژمار نەهاتووی خاوەن بیروباوەڕ و وشیاری سۆسیالیزمی زانستی بەرێوەیان بردووە؛ بانگەشەی بە فیڕۆچوونی ئەم تێکۆشانە ناکات. بە پێچەوانەوە، یەکەمین رێگای خاوەن دەرکەوتن لەم بەهایانە، ئەوەیە ئەم پراکتیکە بە پارزنگێکی زانستییانە دەرباز بکرێت و شیکردنەوەیەکی راست دەکات بە ئەرکێکی گرنگ و ژیانی. باوەڕی بەوە دەکات تاوەکو ئەم ئەرکە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە جێبەجێ نەکرێت، ئەوا کاروانی سەرکەوتوو بەرەو ئامانجە پیرۆزەکانی ئازادی و یەکسانی بەدینایەت.

زۆر جار لە مێژوودا ئەوە دەبینرێ لەمیانەی بە هەڵە چوونی ترسناك و ئەو شەڕانەی لەپێناویدا ئەنجام دەدرێت، ئەنجامێکی زۆر بە پێچەوانەی ئامانجەکانی لێکەوتۆتەوە. نموونەی دیکەش دەبینرێ. بەڵام تاوەکو ژیانی مرۆڤایەتی هەبێت، ئەم بانگەشە شکۆدارانەی یەکسانی و ئازادی دەتوانێ گوزارشتێکی زانستییانەی نزیك بە راستی بەدیبێنێ، لەمیانەی ئەو رێگا راستەی کراوەتەوە و لە نزیك هەنگاوی بە بڕیارەوە بەڕێوە دەچێت و سەرکەوتن بەدەست دێنی.

پێناسە کردنێکی وردەکارتری شوێنگەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە مێژوودا کە راستینەیەکی گرنگی چاخە، رۆڵێکی رۆشنگەرانە دەبینێ.

ا ـ سۆسیالیزمی زانستی وەکو ناسنامەی ئایدیۆلۆژی، لە بوارەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئاستی تەکنۆلۆژی، کەم و کوڕی جددی لەخۆوە دەگرێت. دامەزرێنەرەکانی خاوەنی توانستێکی زانیاری (زانستی) ئەوتۆ نەبوون کە شیکردنەوەیەکی گشتی سەبارەت بە شارستانییەت بکەن. لێکۆڵینەوە دەرهەق بە زانیاری پێویست، سنووردار بوو. تاکە تواناکارییەکی سنوورداری زانیاری دەرهەق بە سۆمەریەکان دەرنەکەوتبووە مەیدان. تەنانەت چاخی دێرینیش لە هەڵسەنگاندنێکی راست دوور بوون. سەبارەت بە کۆمەڵگای نئۆلیتیك، نە تێکۆشانێکی ئەوتۆی شوێنەوارناسی و نە هەڵسەنگاندنێکی تیۆری لە ئارادا نەبوو. لەگەڵ ئەوەی "کۆمەڵگای کۆن"ی مۆرگان پەسند دەکرێ، بەڵام زۆر ناتەواوە. ئەو کۆمەڵگایەی سەرمایەداری کە هەڵسەنگاندنی سەبارەت ئەنجام درابوو، لە قۆناخی پێگەیشتندا بوو. بە رادەیەکی زیاتر پێکهاتەی بەرهەمهێنانی شیکرابۆوە. هەڵسەنگاندنەکانی سەبارەت بە دەوڵەت و ناسنامەی ئایدیۆلۆژی، زۆر سنووردار بوو و هەڵەی مەزنی لەخۆوە دەگرت. نەیانتوانیوە لە نزیکبوونەوە سەبارەت بەم دوو دیاردە گرنگە خۆیان لە فەلسەفەی ماتریالیستی قەبە رزگار بکەن؛ وەکو رەنگدانەوەی بچووك و ئاسایی ئابووری هەڵسەنگێنراون. لە ئاواکردن و هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا کاریگەری ئەم هەڵوێستە فەلسەفییە، یەکلا کەرەوەیە.

بەبێ ئەوەی شارستانییەت بە شێوەیەکی سەرتاسەری شیبکرێتەوە، شیکردنەوەی قۆناخێکی سنوورداری شارستانییەتی سەرمایەداری کە بە تایبەتیش لایەنی ئابووری لەپێشە، تەنیا بەهاکەی بە ئەندازەی شیکردنەوەی ئەلف و بێ یە. ئاشکرایە کە لەمیانەی ئەم شیکردنەوەیە تەواوی کۆمەڵگا رۆشن ناکرێتەوە، بە تایبەتیش بۆ رێبازی بەرنامە و چالاکی وەرچەرخانێکی شۆڕشگێڕی کورت دێنێ و تێر ناکات. ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنانەی دواتر هاتنە ئاراوە، رۆڵی ئەم کەم و کوڕیانەی لەم تێك شکانەدا نیشاندا، کە هەڵە و چەوتییەکان رێگایان لەپێش کردەوە.

ئەو بەرنامانەی تەنیا لەسەر بنەمای چینی کارکەرە هەر لە سەرەتاوە بەرەو گۆشەگیری دەچێت. هەروەها پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا و راستینەی چین بە شێوەیەکی قووڵ شینەکراوەتەوە. چەمکێکی وەها زاڵ بووە کە کارکەر و بۆرژواکان تاکە راستینەی جیهانن و دوو چینی داڕنراو (مجرد)ن. هەروەکو دەزانرێ دیاردەی کۆمەڵگا وەکو پێشکەوتنێکی مێژوویی هەزاران ساڵە شێوەی گرتووە. دیاردەی چینایەتی قۆناخێك و بەشێکی سنوورداری ئەمە پێك دێنێت. ئەمانە وەکو دوو ئۆرگانی کۆنی لاشە وان کە نوژەن بوونەتەوە و هێزیان بە دەست هێناوە. نە بە تەواوی گۆڕانکاری و نە لەناوبردنی ئەم دوو ئۆرگانە، دوورە لەوەی بە تەنیا و سەربەخۆ، هەبوون و گۆڕانکاری تەواوی کۆمەڵگا ئەنجام بدات. ئیتر چ هەڵوێستی تەسکی چینی بۆرژوا بێت یاخود هەڵوێستی تەسکی چینی کارکەر، پێکهاتەی فاشیزم و سۆسیالیزمی بونیادنراوی کە لە رێگای شۆڕش و دژە شۆڕش ئاوایان کرد، رزگار نەبوونیان لە هەڵوەشانەوە، بە هۆی ئەو زەبر و فشارەوە نییە کە لە دەرەوە دەهات، بەڵکو بەهۆی ئەوەیە کە لەگەڵ راستینە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا ناکۆك و پێچەوانە بوونەوە. هێزی مێژوویی بەکۆمەڵگابوون ئەم جۆرە کردارە ئەندازیارییانەی بێ واتا بینیوە و لەمیانەی هێزی خۆییەوە شیکردۆتەوە. تەواوی هەوڵ و کۆششەکانی ئەندازیاری کە پشت بە شیکردنەوەی قووڵ و بەرفراوانی راستینەی بە کۆمەڵگا بوون نابەستێ، لە بینای کورت خایەن بەدواوە گوزارشت لە بەهایەکی دیکە ناکات.

سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی فاشیزمی سەرمایەداری و بیناسازی کۆمەڵگای سۆسیالیستی سۆسیالیزمی بونیادنراو و هەڵوەشانەوەی چاوەڕوان نەکراویان، نموونەی زەق و بەرچاوی سەر ڕاست کردن و ئەرێ کردنی ئەم هەڵسەنگاندنانەیە. ئەو پێکهاتە مێژووییانەی کە گەوهەری تەریقەتگەرایی لە خۆوە دەگرێت و لەم شێوە بیناسازییانە دەچێ، لە پێکهاتەیەکی مارژینال رزگاریان نەبووە. ئەو وەرچەرخانانەی کۆمەڵگا کە بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن بەردەوام بوون، ئەوانە بوون کە خاوەنی دەزگای سیاسی و ئایدیۆلۆژی وەهان کە بە گوێرەی ئاستی تەکنۆلۆژیای کۆمەڵگا لەبار و رەخساوە. ئیتر چ سەبارەت بە کارەکتەری چینی سەردەست و چەوسێنەر بێت یاخود چینە ستەم لێکراو و چەوساوەکان، ئەم رێسایە بۆ تەواوی هێزەکانی کۆمەڵگا پەیرەو دەکرێت و لە جێگای خۆی دایە. هێشتا ئاستی تەکنۆلۆژی سەدەی نۆزدەهەم بەو پێگەیشتنە نەگەیشتووە تێری پێکهێنانی پرۆگرامێکی سۆسیالیستی زانستی بکات. دووری ئاستی تەکنۆلۆژی لەوەی کە بتوانێ زەمینەی ماددی پێویست بۆ کۆمەڵگایەکی بێ چین پێشکەش بکات، لەمیانەی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراویش ئەمە سەلمێنراوە. دەتوانرێ بگوترێ لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەدواوە سۆسیالیزم هەنگاوی بۆ ئەوە هاوێشت بە شێوەیەکی بەهێز بەم ئاستەی تەکنۆلۆژیایە بگات. شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی رۆڵێکی دیاریکراوی لە بەدیهێنانی ئەمەدا بینی. هیچ ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی ئەو هێز و توانایەی نییە بە تەنیا پێشکەوتنێکی لە سەرووی ئاستی تەکنۆلۆژیاوە بەدیبێنێ. چەندە بانگەشەی خودایی و زانستی مەزنی هەبێت، بەڵام ئەم یاسایە بەڕێوە دەچێت.

ب ـ ئەوەش بەرچاو دەکەوێ کە سۆسیالیزم لە نزیك بوونەوەی سەبارەت بە زەبر، بە تایبەتیش زەبری شۆڕشگێڕی زۆر سنووردار و تەنگە. لە رۆڵی "مامانی لە دایك بوونی کۆمەڵگای نوێ" دەرك بەوە دەکرێت بە شێوەیەکی زێدەڕۆیی زەبر هەڵسەنگێنراوە. ئەو زەبرەی لە شۆڕشە سۆسیالیستییەکان و سۆسیالیزمی بونیادنراودا پەیڕەو کراوە، تا رادەیەکی زۆر رۆڵی یارمەتیدەری مامانێتی دەرباز کردووە. هەروەکو بەردەوامی رێبازی سەرجۆن، حامورابی، ئەسکەندەر، قەیسەر (سزار) و ناپلیۆن دەبینرێت. بە تایبەتیش ئەو دیوارانەی بەرزکراونەتەوە و تەلبەندەکانی بۆ پاراستنی دانراون، ئەوە نیشان دەدەن سیستەم لە تەوقی سەر تاوەکو نینۆکەکانی پێی، لە نێو قڵفی زەبردا ژیاوە. لە نێو ئەو هەلومەرجانەدا، ئەوە لەولاوە بمێنێت کە بەرئەندامێکی دایکێتی منداڵی ببێت، لە توند و تیژی زیادە و هەناسە بڕین بەدواوە شتێکی دیکە جێگای باس نییە. لە کردەوەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراودا ئەم راستینەیە بە رادەی هەرە زێدە پراکتیزە کراوە. نابێ هێندە دیوار و تەلبەند چوارچێوەی سیستەمێکی پێ دابخرێت کە هێندە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بێت. تەنیا ئەو سیستەمانەی بڕوایان بەخۆیان نییە تەگبیری بەمجۆرە دەسێنن کە زەبر لەخۆوە دەگرن. بە پێچەوانەوە ئەگەر بڕوای بە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی هەبێت، پێویست دەکات هەموو ئاسانکارییەك بۆ راکشانی جیهان بۆ ناوخۆی و بڵاوکردنەوەی مرۆڤایەتی بە هەموو لایەکدا، بڕەخسێنێ. ئەوە ئاشکرا بووە کە ئەو هەوڵ و خەباتانەی لە ژێر ناوی پێشبڕکێی چەکسازی و خۆپڕچەککردن کراوە، لە ئامادە کردنی هەڵوەشانەوەی خۆی زیاتر هیچ رۆڵ و واتایەکی دیکەی نەبووە. واتا ئەوە سەلمێنراوە کە هەڵسەنگاندنی سەبارەت بە زەبر و ئەو کردەوانەی لەسەر ئەو بنەمایە پراکتیزە کراون، سیستەمی هەڵوەشاندۆتەوە و سەرەکیترین هەڵەن کە ئەنجام دراون. هەموو لایەك کۆکن لەسەر ئەو بۆچوونەی سیاسەتی خۆپڕچەککردن رۆڵێکی سەرەکی هەبوو لە هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو.

مەزنکردنی رۆڵی زەبری شۆڕشگێڕیش تا بڵێی زێدەڕۆییە و پڕە لە کەم و کوڕی. لێرەشدا لە رۆڵی مامانی زیاتر، لەوە دوا نەکەوتبوو کە رێگای سزاریان ـ نەشتەرگەری (سزاریان، بۆیە بە سزارایان ناو دەبرێت چونکە ئیمپراتۆرییەتی روسیا بەمجۆرە لە دایك بووە و لەهەمانکاتدا توند و تیژی پەیڕەو کردووە) و لەبەرچوون لە دایك بوون ئەنجام بدات. پیادەکردنی زەبرێکی بێ سنوور و زێدەڕۆ، بە گشتی کارەکتەری چینە سەردەست و چەوسێنەرەکانە. ئەم زەبرەش دەرئەنجامێکی ئەو ترس و راو و رووت و تەڵەکەبازییەیە کە ئەنجامیان داوە. بۆ ئەوەی ئەم ترسەیان بڕەوێننەوە بەردەوام چەکی نوێ بەدەست دێنن، بەردەوام تاوان و کوشتاری بە کۆمەڵ ئەنجام دەدەن. لە راستیدا ئەو شەڕانەی کە هەر یەکە و کردەوەیەکی کوشتاری بە کۆمەڵن، بۆ ئەوەی ئەم کارەکتەرەی بشارنەوە و پەردەپۆشی بکەن، بەردەوام پێویستی دەبینن لەمیانەی سیفەت و ناوی لە جۆری خودا و ئارامی و سەلامەتی کۆمەڵگا بەرز بکەنەوە. بەڵام لە راستیدا تاڵانی و دزەیەکی رێکخراوە، لەم پێناوەشدا هەموو جۆرە تاوانێك ئەنجام دەدرێت. ئەو زەبرەی لەپێناو وەرچەرخانی کۆمەڵگا و بەختەوەری بپارێزرێت، تەنیا ئەو زەبرە پاراستنی

ڕەوایە کە لەسەر بنەمای پێناسەی یاسای گەردوونییە. لێرەدا بۆ ئەوەی زەبر ڕۆڵێکی پێشکەوتووخوازی لە وەرچەرخانی کۆمەڵگادا ببینێ، دەبێ بە ئامانجی خۆپاراستن بێت بەرامبەر بەو فڕکردنانەی لە دەرەوە یان لە ناوەوە دەسەپێنرێن و دەخوازن لەمیانەی زەبرەوە بیتوێننەوە و بیگۆڕن. تەواوی ئەو توند و تیژییانەی ئەم ئامانجە تێپەڕ دەکەن و بە ئامانجی داگیرکردنی پێکهاتەی کۆمەڵگای دیکە، یان دەست بەسەر داگرتنی بەها ماددی و مەعنەوییەکانیان بێت و بە زەبر دووچاری گۆڕان بکرێن و بتوێنرێنەوە، ئەمانە هەموویان زەبرێکن گەوهەری پاشڤەڕۆیەتییان هەیە و پێویستە لێی دوور بێت. ئەو کردارە توند و تیژییانەی لە ژێر ناوی خودا و وڵاتی پیرۆز و ڕزگاری نەتەوەیی پەیڕەو دەکرێن، هەرگیز بە واتای مامانێتی نایەت و لە گەوهەری تاڵانکاری و جینۆسایدی سەرەڕۆیەتی بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە.

سۆسیالیزمی بونیادنراو چەندین جوڵانەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کە لەسەر هەمان ڕێباز بەڕێوە چوون، دەربارەی مەسەلەی زەبر زێدەڕۆییان کردووە، بەڵام دیسان لە مەحکووم بوون بە سیستەمێکی پاراستنی لەسەر بنەمای زەبر ڕزگاریان نەبووە. مسۆگەر ئەم هەڵوێستە کارەکتەری توێژە سەردەست و چەوسێنەرەکان نیشان دەدات. لەبەرئەوەی بەکارهێنانی زەبر لە ژێر ناوی سۆسیالیزم و پێشکەوتووخوازی ئەنجام دراوە، ئەوا جگە لەمە، گەندەڵ بوونێکی ڕادەبەدەر لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بۆ جارێکی دیکە مێژوو لەمیانەی نموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەلماندوویەتی کە هەڵوێستی توندوتیژی نابێتە تەرز و شێوازی زەحمەتکێشان و ژێردەستەکان. لە هەرکات و ئاستێکدا هێرش بۆ سەر بەها ژیانییەکانی کۆمەڵگا بکرێت، ئەو هەلومەرجەی کە هەیە هەر چییەك بێت، مافی پاراستنی ڕەوا چالاکی و کرداری پیرۆزی هەبوون و بەدیهێنانی چاخی  ئازادییە و پێویستە پەیڕەو بکرێت.

مافی بەکارهێنانی زەبر لە مافی پاراستنی ڕەوادا ئەو کاتە دێتە ئاراوە، کاتێ هێرش بکرێتە سەر ئۆرگان و هەبوونە ئایدیۆلۆژی و ماددییەکانی کۆمەڵگا و لە قۆناخی پێشکەوتنی ئازاد، بە تایبەتیش لە کاتی وەرچەرخانە گەوهەرییەکاندا، واتە بەرامبەر ئەو هێزانەی دەخوازن لە قۆناخی لە دایك بوونی شۆڕشگێڕیدا لەمیانەی بەکارهێنانی زەبر، ڕێگا لە پێشکەوتنەکان بگرن؛ لەم چوارچێوەیەدا بەکارهێنانی زەبر ڕەوایە و ناچارییە. بەکارهێنانی هەر توند و تیژییەکی ئەم چوارچێوەیە دەرباز بکات، ڕێگا لەپێش دەسکەوتی ناعادیلانە و زیانی لەخۆڕا و گەندەڵ بوونی بە کاریگەر دەکاتەوە. هەروەکو چۆن لە چەندین پێشکەوتن و گۆڕانکاری گرێدراو بە سۆسیالیزمی بونیادنراو لە بەکارهێنانی زەبردا زێدەڕۆیی لە پراکتیزەکردنندا هەبووە، لەمیانەی چەندین نموونەشەوە سەلمێنراوە هاریکاری پێویست بە گەلێك هێز نەدراوە کە لەپێناو پاراستنی هەبوونی خۆی و بەدیهێنانی پێشکەوتنی ئازادانە جەنگاوە. تیۆری زەبر لە سەرووی ئەو بابەتانەوە دێت کە سۆسیالیزمی بونیادنراو لە بارەیانەوە بە هەڵەدا چووبوون. ئەم بە هەڵەدا چوونانەش لە سەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێت کە لە هەڵوەشاندنەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا ڕۆڵێکی دیاریکراویان هەبووە.

ج ـ دەزگاکانی دەوڵەت و سیاسەتی سەردەمی سۆسیالیستی تایبەت بوونی خۆیان نیشان نەداوە. لە شێوازێکی ژیانی شێوەبەندی سۆڤییەت زیاتر، لە ئامرازێکی پڕوپاگەندەی دەوڵەت بەدواوە ڕۆڵێکی دیکەیان نەبووە. لە ڕاستیدا ئەم ئامرازەی پێویست بوو لە ڕووی دەوڵەتەوە خاوەن قورساییەك بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی بۆتە ئامرازی دەربازبوون بەرەو دەوڵەتی تۆتالیتاری، بووە بە ئامرازێکی سەرەکی گەندڵ بوون. پێکهاتەی سیاسی تاك حیزبی، بووە بە ئامرازێکی دوالیزمی سپی و ڕەش کە تەنیا لە کردەوەکانی فاشیزمدا دەبینرێ. چەندین لایەن و لقی کە گرێدراوی ئەم ئامرازانەن، کەوتوونەتە ناو هەمان ڕەوشەوە. لە ئەنجامدا لەوە زیاتر کە ببن بە ئامرازی گەیاندنی داخوازییە دیموکراسییەکانی کۆمەڵگا بە دەوڵەت، بوونەتە ئامرازی ئابلۆقەدانی کۆمەڵگا لەلایەن دەوڵەتەوە. لە کاتێکدا پێویستە خودی دەوڵەت ببێتە ئامرازێکی خشتەکاری (التنسیق) گشتی، بە دەسەڵاتێك گەیشتووە کە لە سەرەوەی چەمکی دەوڵەتی ئیلاهییە و بووە بە ئامرازێك بە شێوازێکی زۆر دژوار چەمکی بەڕێوەبەرایەتی تۆتالیتاری پراکتیزە دەکات. لەوە ڕزگاری نەبووە کە بە تەواوی پەیوەندی خۆی لەگەڵ زاراوەکانی دیموکراسی و کۆماری ببڕێت.

گەرچی پێویست بوو لە هەموو لایەنێك زیاتر سۆسیالیزمی بونیادنراو جیاوازبوونی خۆی بەرامبەر بە سیستەمی سەرمایەدار لەم دوو بوارەدا نیشان بدات. بە پێچەوانەوە لە کاتێکدا پێوانە دیموکراسییەکان لە وڵاتە سەرمایەدارییەکان دەرکەوتنە پێش، لە وڵاتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراودا ئاراستە بەرەو وشك بوون و دەوڵەتێکی سەرەڕۆ و تۆتالیتار بووە. سیستەمی دەوڵەتێك و پارتێك کە خۆیان بە موڵکی گەل دادەنا، تەنیا دەیانتوانی ئەمە لە ڕێگای ڕۆڵ و دەسکەوتەکانیان بۆ سیستەمێکی دیموکراسی فرە لایەنی بسەلمێنن کە سیستەمی سەرمایەداری تێپەڕ کردبێت. لەجیاتی پێشکەوتنێکی بەمجۆرە، زاڵ بوونی کردەوەی پێچەوانەی ئەمە، هۆکارێکی دیکەی گرنگی هەڵوەشانەوەی سیستەمە. ئەو تێکۆشانە تیۆریانەی لە ژێر ناوی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا و "دەوڵەتی گەل" ئەنجام دراوە زۆر لە زانستی بوون دوور بووە، لە ئامانجی پڕوپاگەندە بەدواوە تێپەڕی نەکردووە. تەنانەت لەم بوارەدا زۆر لە دواوەی مارکس و ئەنگلس ماونەتەوە. دەوڵەت لە بوون بە ئامرازی خۆ پاراستنی هێزێکی بیرۆکراتی سەرمایەداری و لێدان و خۆ ژیاندن، ڕزگاری نەبووە. ئەوە لەولاوە بمێنێت کە لە بواری بەدەزگابوونی سیاسی و دەوڵەت، باڵابوونی بەسەر سیستەمی سەرمایەداری بەدەست نەهێنا، بەڵکو زۆر لە دوای ئەو مایەوە و لە هاوشێوە بوونی شێوازی پادشای ـ ڕاهیبی سۆمەر و میسر ڕزگارییان نەبووە. ناشێ ئەم چەمکە بە کۆمەڵگای سەدەی بیستەم ببەسترێتەوە و بەمجۆرە شیبکرێتەوە.

تائێستا سۆسیالیزمی بونیادنراو بە شێوەیەکی مێژووییانە ئەوەی شینەکردۆتەوە و بە چارەسەری نەگەیشتووە، کە چۆن لە بواری دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەت و پراکتیزەکردنیان لەوەدا سەرکەوت هاوشێوەی پاشکەوتووترین شێوەی کۆیلایەتی بێت. ئەم کردار و پراکتیکانە کاتێك تێپەڕ دەکرێت کە شیکردنەوەیەکی قووڵ سەبارەت بەو شارستانییەتە بکرێ کە سیاسەت و دەوڵەت ڕۆڵێکی ناوەندی تێدا دەبینێ و بە شێوەی زانستی و سەرکەوتووانە ئەنجام بدرێت کە تەواوی قۆناخەکانی مێژوو و کۆمەڵگا لەخۆوە بگرێت. تەنیا لە ڕێگای ئەم بەلاوەنانەوە دەشێ شێوەی تیۆری و پراکتیزەکردنی شارستانییەتی نوێ پێش بکەوێت، ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ و دامەزراوە سیاسییەکان واتادار دەبن.

د ـ لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا کۆمەڵگای دیموکراسییانە و ڕێکخراوە مەدەنییەکان ئاوا نەکراون. لە کاتێکدا سیستەمی سەرمایەداری لەو قۆناخە لە ڕێگای ڕێکخراوە جەماوەری و دیموکراتییەکان هەوڵی ڕزگاربوون لە کردەوەکانی فاشیستی دەدا، لە وڵاتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراودا پێشکەوتنێکی پێچەوانەی ئەمە دەرکەوتە پێش و گرانی پێدرا. تەنانەت ئەو پاشماوە سروشتییانەی دیموکراسیش کە هەبوون کۆتاییان پێهێنراوە، ڕێکخراوە جەماوەرییەکان بە تەواوی کراونەتە دەزگای سیخوڕی دەوڵەت. لە ڕاستیدا لەگەڵ گەیشتنی کۆمەڵگا بە قووڵترین و بەرفراوانترین وشیاری و ڕێکخستن و شێوازی ژیانی دیموکراسییانە، هێزی سۆسیالیزم دەردەکەوێتە مەیدان. بەمجۆرە ئەوەی پێویستە بەهێز بکرێ دەوڵەت نییە بەڵکو کۆمەڵگایە. ڕێگا و ناوی ئەمەش کۆمەڵگای دیموکراسی و بە شارستانی بوونە. تێکدانی هەر دوو دیاردە، تەنیا دەشێ لەگەڵ چەمکی دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرەوە بەراورد بکرێت کە لەلوتکەدایە. سەرمایەداری دەوڵەت وەك دەرئەنجامێکی هەلومەرجی دواکەوتووترین وڵاتە و ئەو سیستەمە سیاسییەی پیادەی دەکات، دەبێتە دواکەوتووترین پێکهاتەی دەوڵەتی سەرمایەداری. ئەم شێوە پێکهاتەش لە پراکتیزەکردنی چەمکی سەرەڕۆیی و تۆتالیتاری بەدواوە، ڕێگا بە هیچیتر نادات. هەرچی ئاکامی ئەم کردەوەشە، دەرفەت بە پێشکەوتنی کۆمەڵگای دیموکراسییانە نادات. دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەکات بە چەرخی پڕوپاگەندەی دەوڵەت. ئەمەش دیاردەیەکی دیکەی گرنگی سەلماندنی ئەوەیە کە سۆسیالیزمی بونیادنراو سۆسیالیزم نەبووە.

بە گوێرەی گەوهەری سۆسیالیزمی، پێویست بوو سیستەمێك بێت بە ڕادەی هەرە زێدە کۆمەڵگای دیموکراسی پێش بخات. وەکو پێشبینی و مەرجێکی تیۆری خودی سۆسیالیزم تەنیا لە ئەنجامی دیموکراتیزەبوون بەدیدێت. لەو کۆمەڵگایانەی دیموکراسییەت تێیاندا پێشنەکەوتووە، ناشێ بیر لە بونیادنانی سۆسیالیزم بکرێتەوە. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کە ئامرازی بە کاریگەری دیموکراسین نابێ گرێدراوی دەوڵەت بن؛ بە پێچەوانەوە وەکو گروپە شارەزا و پسپۆڕەکانی چاودێری کردنی دەوڵەت ڕۆڵ دەبینن. تاوەکو ئەم ڕۆڵە نەبینرێ، ناشێ پەیوەندی کۆمەڵگا ـ دەوڵەت کۆنترۆڵ بکرێت کە تاوەکو دوایی ئاڵۆز بووە. لە کاتی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا، ئەو کۆمەڵگایەی پێویست بوو لێی بە خاوەن دەربکەوێ، بە پێچەوانەوە

بۆ ئەوەی ساتێك زووتر لێی رزگار بێت لە بەرپاکردنی بەرفراوانترین جموجۆڵی کۆمەڵایەتییەوە هەنگاویان بەرەو دواوە نەهاوێشت. لە راستیدا ئەم جموجۆڵە گوزارشتی دەربازبوونە لە سەرمایەدارییەکی پاشڤەڕۆ و دوور لە دیموکراسی، بەرەو سەرمایەدارییەك کە بۆ میانڕەوی کراوەیە. لێرەدا خیانەت و خەڵەتاندنێکی جەماوەر لە ئارادا نییە. بە پێچەوانەوە درکاندنی داخوازی سەرمایەدارییەکی دیموکراسییە کە گەل لە ئەنجامی ئەزموونی ژیانی خۆی پێی گەیشتووە. لەمەش بەولاتر بە تەواوی رووتی خۆیەوە ئاشکرا بووە کە چۆن دەوڵەت بووە بە مافیا و دڕندە؛ ئەوە سەلمێنراوە کە توانستی سەرمایەدارییەکی پشت ئەستوور بە یاساشی نییە.

ئەوەی جارێکی دی لە ئەنجامی ئەو نموونەیە جەختی لەسەر دەکرێتەوە ئەوەیە، تاوەکو دیموکراسییەتێکی پێشکەوتوو نەبێت، ناتوانرێ بەرەو سۆسیالیزم هەنگاو بهاوێژرێ. تاوەکو پێشکەوتووترین دیموکراسییەتەکانی بۆرژوا تێپەڕ نەکرێت، دیموکراسی گەل پێشناکەوێت. تاوەکو دیموکراسییەکانی گەل لەمیانەی پێکهاتەی فرە لایەنییان، ئیرادەی راستەقینەیان، هێزی کۆنترۆڵ کردنی دەوڵەت، لە ناوەوە و دەرەوە لە رێگای هەڵوێستەکانی ئاشتی و تەبایی خۆیان نەسەلمێنن، ناتوانن بانگەشەی تێپەڕکردنی دیموکراسییەتی بۆرژوازی بکەن. یەکێك لەو نیشانە سەرەکییانەی جەخت لەسەر کارەکتەری سۆسیالیستییانەی رژێمێك دەکاتەوە، دیموکراسییەتی پراکتیزە کراوە. تەواوی نیشانەکانی دەرەوەی ئەمە بە پلەی دووەم دێ. لەبەر ئەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە تاقیکردنەوەی خۆی سەبارەت بە دیموکراسییەت دووچاری شکستێکی مەزن و نکۆڵی کردن لە دیموکراسییەت هات، بە تایبەتیش لەلایەن گەلەوە لەمیانەی ئەو رقەی کە دیار نەبوو ئەنجامەکەی بەرەو کوێ دەچێ، لە هەڵوەشانەوە رزگاری نەبووە.

هـ ـ سیستەمی ئابووری سۆسیالیزمی بونیادنراو، وەکو پارچەیەکی گشت بە هیچ جۆرێك سەرمایەداری دەوڵەتی دەرباز نەکردووە. ئەم سەرمایەدارییەی سەرەتا وەکو قۆناخێکی پەڕینەوە دەبینرا، پێبەپێ چوار دەوری سیستەمی ئابلۆقە داوە. سەرباری ئەوەی بە شێوەی کۆیلەداری هاوچەرخ رەنجی بەکار هێناوە، دیسان لە دواوەی پێشکەوتنەکانی سەرمایەداری کلاسیك ماوەتەوە و نەیتوانیوە لەم رەوشە رزگاری بێ. تێر نەکردنی تاك بە ئەندازەی سەرمایەداری (موڵکداری) تایبەتی، رۆڵی لەمەدا هەیە. ئەو تاکەی لە ئەنجامەکانی رەنج نامۆ بووە، تاوەکو دەچێ بەرهەمەکەی کەم دەبێتەوە. لە ئەنجامدا هەروەکو کۆیلایەتی چاخەکانی سەرەتا بێزار بوون لە کار و راکردن دەستپێکردووە. لە راستیدا کار و خەبات لە سۆسیالیزمدا وەکو پێویستییەك هەڵدەسەنگێنرێ و بە جۆشەوە جێبەجێ دەکرێت. ئەو رەوشەی پرەنسیپی کار و رەنگی سۆسیالیستی لە بواری پراکتیزەکردندا تێی کەوتبوو، ئەوەی بەڕێوەچووە شێوازێکی سوغرەکێشی بووە. رەوشێکی بەمجۆرەیە، کاتێك هەڵوەشانەوە روویدا، رەوشێکی هێندە بە ئێش هاتە ئاراوە کە لەهەر شوێنێکی دونیا کاری هەرە بچووك و سووکیان بە کەمترین کرێ بە نیعمەتێك دەبینی. لە ژێر هیچ بڕوبیانوویەك نابێ هاوولاتییەکی سۆسیالیستی بخرێتە رەوشێکی بەمجۆرە. کاتێك کەوتە رەوشێکی وەها، ئەمە روون بۆوە و سەلمێنرا، ئەوەی لەوێوە بەڕێوە چووە جگە لە سۆسیالیزم رژێمێکی گەندەڵ بووە کە دەتوانرێ هەموو ناوێکی لێبنرێ.

و ـ قۆناخەکانی رزگاری نیشتیمانی و دەوڵەتەکانیان کە ناوەندەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو وەکو دیاردەیەکی سیاسەتی دەرەکی تەماشایان دەکرد، لەوە رزگاریان نەبووە ببن بە نموونەیەکی لاسایی و گەندەڵترین سیستەمە سەرەکییەکان. تەنانەت کاتێك لە کۆلۆنیالی کلاسیکی رزگاریان دەبێت، ئەو رژێمانەی دەچەسپێنرێن جۆرێکن کە بەڕێوەبەرایەتی داگیرکاری کلاسیکییان تێپەڕ کردووە.

لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ولاتانە هەم لە بواری سەرمایەداری کلاسیکی و هەم سۆسیالیزمی بونیادنراو شێوەی دووەمین دەستن، بۆیە وەکو بەڵایەکی گران بەسەر گەلان و کۆمەڵگای خۆیاندا بڕاونەتەوە. دەتوانرێ بگوترێ، ئەو کۆمەڵگایانەی لە ژێر کۆنترۆڵی ئەم جۆرە رژێمانەدا لە مێژووی خۆیاندا رووبەڕووی نەفرینترین و کوێرانەترین راستینە بوونەتەوە. ئەم رژێمانە بەبێزەییانە و شێوازی بچووك خستنەوە لاسایی کردنەوەیان لەسەر گەلەکانیان پەیڕەو کردووە، ئەو تاریکاییەی لە سەردەمی دەرەبەگایەتییەوە تێی کەوتبوو فشارێکی لە شێوەی قاڵبی کۆنکریتی هاتە سەر؛ ئەو کۆمەڵگایانەی لە ژێر سایەی ئەم رژێمانەدا بوون، ئەو کۆمەڵگایانەن کە بە قووڵایی لە خۆیان نامۆ بوون. لەوانەیە لە هیچ قۆناخێکی مێژوودا تا ئەم رادەیە نامۆ بوون، بێ باوەڕی بە هێزی خۆی، بێ بەشی لە وشیاری مێژوویی، کەوتنی ئاستی ئەخلاقی و بێ ئاگایی دەرهەق بە بوونەوەرە کۆمەڵایەتییەکان نەهاتبێتە ئاراوە. ئەمانە لەم چەرخەماندا نوێنەرایەتی ڤەیراناویترین کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی دەکەن.

ز ـ هەبوونی تاك و مافەکانی کە بە درێژایی مێژوو پێویستە وەکو پێوانەیەکی ئازادی هەڵسەنگێنرێ، لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا وەکو کێشەیەك نەبینراوە. ئەگەر لە سەردەمی لە دایك بوونی سەرمایەداریدا بێت یاخود لە چاخی تەنگژەدا، ئەوا ئەو بابەتەی هەرە زێدە هەڵوەستەی سەبارەت کراوە، ئازادی تاکە کەسە. لە راستیدا ئەو تاکەی لەلایەنی رۆحی و هزری لە دەستی هەموو جۆرە دۆگماتیزمێك رزگاری بووە، گوزارشت لەپێشکەوتنێکی گرنگ دەکات. ئەم دیاردەیە تەنیا بە سەرمایەدارییەوە پەیوەندیدار نییە. پێوانەی هەر هەڵمەتێکی پێشکەوتووخواز، لەو پێشکەوتنە دیار دەبێت کە لە بواری ئاستی شەرفمەندێتی مرۆڤ هاتۆتە ئاراوە. نرخ و بەهای شۆڕشێکی مێژوویی، لەمیانەی ئەو پێشکەوتنەوە پێودانگ دەکرێت، کە لە بواری هەبوونی مرۆڤایەتی و شەرەفمەندێتی تاك رێگای لەپێش کردۆتەوە؛ لە وشیاری و پابەندبوونی ژیان و خولقکاری و بەرهەمی رەنجی ئەو تاکە دیار دەبێت کە خۆی خولقاندویەتی. دروستترین پێودانگی پێشکەوتن و دواکەوتن، ئەو پێشکەوتنانە دیاری دەکات کە سەبارەت بە تاکە و لە کوێوە گەیاندوویەتیە کوێ و کامە ئاست. لەهەمانکاتدا ئەم پێوانەیە بە باشترین شێوە ئاستی ئازادی کۆمەڵگا و بەڕێوەبەرایەتییەکەی دیاری دەکات کە ئەم تاکە جێگای خۆی تێدا دەگرێت.

ئەو پێشکەوتنانەی سەرمایەداری سەبارەت بە تاکە کەسێتی ورووژاندوویەتی، سەرنج راکێشە. بە لایەنە ئەرێتی و نەرێتیەکانییەوە ئەمە بابەتێکە پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی بەرفراوان هەیە. هەرچی سۆسیالیزمی بونیادنراوە، لە ئەنجامی ئەوەی لەمیانەی پڕوپاگەندەوە، تاکە کەسێتی وەکو بابەتێکی نەرێتی تایبەت بە سەرمایەداری نیشاندا، رێگای لەپێش ئەوە کردەوە دواتر دەرهەق بە مەسەلەی مافی تاکە کەس بکەوێتە نێو رەوشێکی زۆر دواکەوتووەوە. لە راستیدا پێویستە سۆسیالیزم لە سەرمایەداری زیاتر بەم کێشەیەوە پەیوەندیدار بێت. تاوەکو پێناسەیەکی راست دەرهەق بە کەسایەتی (تاکی) سۆسیالیستی پێشنەخرێت و ئاوا نەکرێت، ئەوا دەرك بەو کۆمەڵگا و پێوانانەی شارستانییەت ناکرێت کە پێك دەهێنرێن. چونکە بەهای راستەقینەی رژێمێك بە رادەی هەرە زێدە لە جۆری ئەو تاکە کارەکتەریزە دەکرێت کە خولقاندوویەتی یاخود وەکو بەهادارترین بوونەوەر پێویستە مرۆڤ بکرێت بە سەنتەر. هیچ پێوانەیەکی لەوە بەهادارتر نییە. بە تایبەتیش بۆ سیستەمێك کە سەبارەت بە بابەتی ئازادی بانگەشەی نوێنەرایەتی پێشکەوتوترین ئاست بکات، ناتوانرێ بگوترێ پێوانەیەکی لەمە پتەو و پیرۆزتر هەبێت.

شتێکی رێککەوت نییە ئەو بوارەی بە رادەی هەرە زێدە سۆسیالیزمی بونیادنراو شکستی تێدا خوارد، تاکە کەسێتی یە، چونکە گەورەترین خەفلەت، ئەگەر باسیش بکرێت زیاترین خیانەت و ستەمکاری سەبارەت بە تاك و مرۆڤ خۆی نیشانداوە. سەرباری هەموو کەم و کوڕییەکانی سەرمایەداری بە بەراورد لەگەڵ سۆسیالیزمی بونیادنراو، بەڵام راکردنی تاك بەرەو باوەشی سەرمایەداری و بژاردنی ئەو، بێگومان هەرچەندە ئەمە رەخنەی شیاوی دەرهەق پێشبخرێت، بەڵام بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بە هەستیاری و وردەکارییەوە هەڵوەستەی سەبارەت بە تاك و مافەکانی تاکە کەسێتی کردووە و هەندێ لە پێوانەکانی بەرجەستە کردووە. ئازادی تاك لە سەرووی ئەو کێشانەوە دێت کە پێویستە تەنیا بۆ سەرمایەداری بەجێ نەهێڵدرێ. هەروەکو دەزانرێ سەرمایەداری لە قەڵەمبازی سەردەمی چاخی ناوین واتە لە رێنسانس و سەرلەنوێ لە دایك بوونەوە لەمیانەی دەرخستنە پێشی ئەو تاکەی تازە خۆی دەناسێ، هێزی بەدەست هێنا.

یەکلابوونەوە دەرهەق بەم بابەتە بایەخێکی مەزنی هەیە. تاکە کەسێتی و تاکڕەوێتی دوو بابەتی لێك جیاوازن. چەندە تاکە کەسێتی بوون گرنگە، ئەوا تاکڕەوێتیش تایبەتمەندێتییەکە پێویستە هێندە بەرامبەری بە تەگبیر بیت و لێی بترسیت. سەرمایەداری تاکڕەوێتی لە تاکە کەسێتییەوە دەرخستووە. هەر دووکیان رێگا لەپێش ئەنجامی لێك جیاواز دەکەنەوە. تاوەکو

تاك بە كەسێتی خۆی نەگات، بە سۆسیالیستبوون بەدینایەت. لەمیانەی کەسایەتی دەرەبەگایەتی کە لە چاخەکانی ناوین ماوەتەوە یاخود تێکەڵ بەویش لەمیانەی کەسایەتی تاکڕەوێتی سەرمایەداری، نە کەسایەتییەکی دیموکراتیکی بە پرەنسیپ نە سۆسیالیست پێك نایەت. تاکەکەسێتی بابەتێکی زۆر بەرفراوانە. شارستانییەتی رۆژئاوا لە ئەنجامی ئەو مەودایەی لەم بوارەدا بڕیویەتی، پێشکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێناوە. تاکە کەسێتی بوون، بەر لە هەموو شتێك بە لێپرسینەوە سەبارەت بەو توانەوەیە دەست پێدەکات کە بە درێژایی سەدان هەزار ساڵ و لەمیانەی بەکارهێنانی هەموو شێواز و ڕێچکەیەك لە نێو کۆمەڵگابوونێك ڕوویدا کە سەروبنی نییە. گەڕان بەدوای وەڵامی پرسیارەکانی لە جۆری تاوەکو کوێ بە کۆمەڵگا بوون پێویست و سوودمەندە، لە کوێ بێ واتا و ترسناکە، جێگای گرنگی و بایەخ پێدانە. ئەو وەڵامانەی دەرهەق بە پرسیارەکانی تاوەکو دوایی بوون بە ئەندامی کۆمەڵگا، تیرە یان خێڵ و کۆمەڵگای ئایین یاخود عیلمانییەت چ سوود و قازانجێکی دەبێت، بە شێوەیەکی واقیعیتر گرنگی کەسێتی تاك دەردەخاتە پێش. ئەو وەڵامەی سیستەمی کۆیلەداری دایەوە، تاکێکە کۆتایی پێهێنراوە، موڵکی خۆی نییە، تەنانەت ناتوانێ خاوەن لە سێبەری خۆشی دەربکەوێت و کاتێك پادشا دەمرێت بە زیندوویی لەگەڵیدا دەخرێتە هەمان گۆڕەوە. بە کۆمەڵگا بوونی کۆیلەداری تا ڕادەیەك ئیرادەی تاك تێك دەشکێنێ، دەیکات بە ئامرازێکی بچووك و بابەتی موڵکداری و بوونێکی ماددی.

چاخی دەرەبەگایەتی و کۆمەڵگاکەی ئەم ئاستەی کۆیلایەتی نەرم کردۆتەوە. تاك بەو ڕادەیە بۆتە موڵکی خۆی دەتوانێ لە سێبەری خۆی بە خاوەن دەربکەوێ. لەوانەیە جێگای پێکەنین بێ، بەڵام پێشکەوتنێکی گرنگە. نابێ لە بیر بکرێت کە خەلیفەکانیش نازناوی "ظل الله" (سێبەری خودا)یان لە خۆیان دانا. باڵادەستی دۆگماتیزم زۆر بەهێزە. بەر لە دایك بوون چارەنووسی مرۆڤ دیاریکراوە. قەدەرگەراییەکی قووڵ، هزر و ڕۆحی ئیفلیج کردووە. هیچ پێویستی بە بیرکردنەوە و خوڵقکاری نییە هەرچۆنێك بێت ئیرادەی مەزن و پیرۆز پێشتر بڕیاری لەسەر هەموو شتێك داوە. لەخۆڕا پێویستی بە کۆشش ناکات. ئەوەی نووسراوە ڕوودەدات. خودا چی قسمەت کردبێت ئەوە بەدەست دەهێنرێ. بەڵێ بەمجۆرە قەدەرگەرایی دەرکەوت، کە بە تایبەتی لەو قۆناخەی کە شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەرەو موحافەزەکاری دەچێت ڕێگا لەپێش کاریگەرییەکی کوشندە دەکاتەوە. خۆی لە خۆیدا ئەم چەمکە کاتێك دەرکەوت کە فەلسەفەی ئەفلاتوون کرا بە تیۆلۆژی (خوداناسی). دواتر لە ژێرناوی ئیسلامییەت و مەسیحییەت، تیۆلۆژی وەکو پێویستییەکی ئیرادەی خودایی هەڵدەسەنگێنرێ، یەکەمین فکر، یەکەمین "ئیدیا"کان دەبن بە دۆگما و سەرهەڵدەدەن. بەڵام بە درێژایی هەزاران ساڵ بەستەڵەك کردنی هزری مرۆڤایەتی و ئامادەکردنی ڕۆحەکەی بۆ ئیفلیج بوون ڕێگای لەپێش کاریگەرییەکی کوشندە کردۆتەوە. گەوهەری دۆگماتیزم بەمجۆرەیە.

کاتێك تاکە کەسێتی بوونی رۆژئاوا سەریهەڵدا، کڵێسە لەمیانەی ئەم قاڵبەیەوە شەڕێکی بێ ئامانی کردووە. فەلسەفەی ئەرستۆ و ئەفلاتوون کە بە گوێرەی قۆناخی خۆیان ڕۆڵێکی پێشکەوتووخوازییان هەبووە، لەم سەردەمەدا لە ڕێگای مزگەوت و کڵێسەوە لەپێناو تەسلیم گرتنی مرۆڤ کراون بە دۆگمای کوێرانەی قاڵبی چاپکراو.

لە ئاکامی پێشکەوتنی ڕێچکەی زانستی و لە دایکبوونی ڕێنسانس ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت، ئەم دۆگماتیزمە تێپەڕ کراوە. هەروەکو بڵێی مرۆڤایەتی وەکو ئەم بەنداوە وایە کە بەندی خۆی پچڕاندووە، ئیتر کاریگەرێتی دۆگماکان دەپچڕێنێ و لە جیهان دەئاڵێ، دەست بە خوڵقکاری و خۆشەویستی و خاوەندارێتی کردن لە خۆی دەکات. سەرمایەداری لە ڕێگای هێزی ئەم تاکە کەسێتی بوونە بەرامبەر بە کۆمەڵگا چەکی تاکڕەوێتی بەکار دێنێ و فەبوونێکی مەزن ئەنجام دەدات. ئەم جارە تاکڕەوێتییەکی بەمجۆرە پێشکەوتووە، وەستاندنی ئەم تاکڕەوێتییە بۆتە کێشەیەك، لە کاتێکدا پادشای خوداوەند یەك بوو، بووە بە هەزار. بڵاوبوونەوە لەوبەر بۆ ئەوبەری دیکە بەدیهاتووە. بەڵام دیسان ئەوەی ئەنجام دراوە، یەکێکە لە گەورەترین شۆڕشەکانی مێژووی مرۆڤایەتی. ئەو تاکەی لە هەموو جۆرە دۆگما و سێبەری خوداوەندەکان ڕزگار بووە خێراییەکی ئەوتۆی بەدیهێناوە کە، ئەم جارە سنووردارکردنی ئەو تاکڕەوێتییە کە قازانجی سەرمایە هاری کردووە بووە بە کێشەیەکی مەزن. هاوسەنگی لەدەست دراوە. پێویستییەکی ئێجگار زۆر بە تەگبیرگرتن لە بەرامبەری هەیە. ئەگەرنا لە ڕێگای تاکڕەێتی سەرمایەدارییەوە ئەو بە کۆمەڵگا بوونە دەتەقێندرێتەوە کە گوزارشت لەو ڕەنجەی هەزاران ساڵە دەکات کە بووە بە ئەتۆم.

لە خاڵێکی بەمجۆرەدا بە کۆمەڵگا بوون دەبێت بە پێویستییەکی مێژوویی دەست لێبەرنەدراو. پێشکەوتنی هزری سۆسیالیستی و تیۆری سۆسیالیزمی زانستی، بەرهەمی ئەم پێویستیە مێژووییەیە. کاتێك هەڵوێستی تەسکی چینایەتی تێپەڕ بکرێت، لەم خاڵەدا بەرامبەر بە سەرمایەداری ڕۆڵی مێژوویی خۆی لە ژێر ناوی تەواوی کۆمەڵگا دەبینێت. گوزارشت لەو هێزە دەکات لەپێناو بەرژەوەندییە ژیانییەکانی مرۆڤایەتی، سنوور بۆ تاکڕەوێتی سەرمایەداری دادەنێت.

بەڵام ئەو کاردانەوە مافدارەی بەرامبەر بە تاکڕەوێتی و قازانج گەرایی نیشان دراوە، پشت گوێ خستنی گرنگی کەسێتی تاکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. بە تایبەتیش سۆسیالیزمی بونیادنراو بە کەسێتی گەیشتنی تاکی وەکو گەمەیەکی پڕوپاگەندەیی شارستانییەتی ڕۆژئاوا بینی. بابەتی کەسێتی تاك و مافەکانی مرۆڤی وەکو بابەتێکی هێرشی ئایدیۆلۆژی لە قەڵەمدا و پێویستی خۆ پاراستن و پێشخستنی تەگبیری بەرامبەر بەم زاراوانە بینی. ئەم هەڵوێستەش گرنگترین هۆکارە کە سۆسیالیزمی بونیادنراو لەسەر بنەمای کەسێتی تاك و مافی تاك هەڵوەشێتەوە. لەم بوارەدا دواترین لێدانی بەرکەوت و قۆناخی هەڵوەشانەوە خێراتر بوو.

دەتوانرێ لە گەلێك بواریتردا ڕەخنە سەبارەت بە سۆسیالیزمی بونیادنراو پێشبخرێت. ئامانجی ئەو ڕەخنانەی لە چوارچێوەی تاسلاقێکی هزری لە ئاستی پێناسەکردندا هەوڵماندا پێشی بخەین. بێگومان لەپێناو ڕوونکردنەوەی پێناسەی کۆمەڵگا و تاکی سۆسیالیستییە. هێندەی لایەنە نەرێتێکانی، وەرچەرخانی چاخی مێژووی لە چوارچێوەی یۆتۆپیایەك دەرخست و کردوویەتی بە کێشەیەکی کرداری. لە کاتێکدا قۆناخی هەڵوەشانەوە ئەوە دەردەخاتە مەیدان کە جێی هەڵە بووە، ئەوا ئەوەشی ڕۆشن کردۆتەوە کە پێویست بوو ڕاستییەکان چی بێت. ئەوەی ڕووخاوە، ئەو یۆتۆپیاگەرێتییە کە بناخەیەکی بەهێزی مێژوویی هەیە لەگەڵ برا جمکەکەی، فەلسەفەی ماتریالیستی قەبەیە. ئاشکرایە کە هەردوو هەڵوێستیش گوزارشت لە سۆسیالیزمی زانستی ناکەن. بە پێچەوانەوە، چەندەی سۆسیالیزمی زانستی هەموو جۆرە یۆتۆپیاگەرایی دۆگماتیکی تێپەڕ بکات و فەلسەفەی ماتریالیزمی دیالەکتیکی لە ماتریالیزمی قەبە پاك بکاتەوە، ئەوا وەکو چوارچێوەیەکی دەست لێبەرنەدراوی ژیان و کرداری ڕێزانی و پێڕەوی نوێی شارستانییەت بۆ مرۆڤایەتی، دەتوانێ بە شێوەیەکی لێهاتووتر "ناسنامەی ئایدیۆلۆژی" ئاوا بکات کە بۆ پراکتیزەکردن گونجاو بێت. لەسەر بنەمای ئەو توانستانەی تەکنۆلۆژیا ڕەخساندوویەتی لەمیانەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ تاکە کەسێتی و بە کۆمەڵگا بوون، ئازادی و یەکسانی بە هاوسەنگی دەگەن، ئەم جارە وەرچەرخانی کۆمەڵگای بە ئامانج کرا و لە قەڵەمبازی نوێی شارستانییەتدا ڕۆڵی هەمیشەیی خۆی دەبینێ. ئەم ڕۆڵە بە شێوەیەکی بەهێز لە ڕەوتی چەپی قۆناخی شارستانییەتی دیموکراسییەتی هاوچەرخ دەچەسپێنێ و بەدیدێنێ. لەمیانەی دەرك کردن بەوەی تاوەکو شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ نەیەتە ئاراوە، پێداویستییەکانی جێبەجێ ناکرێت، ئەوا دروشمی، "بە گوێرەی تواناکاری و هێندەی پێویست" بەدینایەت کە هەموو کاتێك مەبەستی پیرۆزی مرۆڤایەتییە، تاوەکو دوایی باوەڕی بە هەبوونی شارستانییەتی دیموکراسییانە دەکات، پێویستییەکانی جێبەجێ دەکات و سەرکەوتنی سۆسیالیزمی زانستی مسۆگەر دەکات.

## بەشی چوارەم

## شوێن و کات و هەلومەرجی گەشەکردنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی شارستانییەتی نوێ

**تاکو** ئێستاکەش هەڵوێستە و نزیکبوونەوەیەکی سەرتاپاگیری سەبارەت بە پێناسەکردنی ئەو چاخەی تێیدا دەژین بەدی نەهاتووە. چۆنایەتی چاخ ڕێگا بەوە نادات. بە گشتی سیستەمی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی، بە تایبەتیش سەرمایەداری کە دواترین بچمێتی، لەناو قۆناخێکی قەیرانی قووڵ و هەڵوەشانەوەدایە. بێگومان ئەم هەڵسەنگاندنە گشتییە، زیاتر شرۆڤەی جیاوازە سەبارەت بە بابەتی پێناسەکردنی ئەو شێوەگرتنە نوێیانەی کە دەرکەوتوون.

شۆڕشە زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکانی سەدەی بیستەم بە تایبەتیش کە لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا ئەنجامدران و بە خێرایی لە بواری کرداریدا پراکتیزە کران. ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە دیاریکردنی وەرچەرخان و ناوەڕۆکی چاخ. وەرچەرخانی هەرە گەوهەری چۆنایەتی لە مێژوودا، دوای ئەو نوێبوونەوە مەزنانەوە ئەنجام دەدرێت کە لە پێشکەوتنی هزر و تەکنۆلۆژیادا بەدیهاتووە. لەگەڵ دۆزینەوەی مس و ئاسن، ئافراندنی چەرخ و گاسن، دۆزینەوەی نووسین، بیرکاری و ئامێری لە جۆری چاپخانە و باروت، پێشکەوتنی ئایینی تاکخودایی و فەلسەفە و هزرە گرنگەکان، وەرچەرخانی مەزن لە کرۆکی چۆنایەتی چاخ دێتە ئاراوە.

هەروەکو دەزانین ئەو ئامێرانەی دەرفەتیان بە دەرکەوتنی سەرمایەداریدا، سەرەتا ئامێرەکانی هەڵمی و دواتریش ئەو ئامێرانەی کە بە هێزی پەترۆڵ کاردەکەن. ئامێر کە هێزی بازووی خستە پلەی دووەمەوە، ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی تەواوی سیستەم و بەهێزکردنی و بەردەوام بوونی. ناتوانرێ ڕۆڵی پێشکەوتنی زانست و فەلسەفە بچووک بکەینەوە کە گەوهەری دیالەکتیکی سروشتی ڕوون کردۆتەوە. ئەو نوێبوونەوە ڕیشەییەی لە پێکهاتەی تەکنۆلۆژی هاتە ئاراوە، ڕەنگدانەوەی خۆی لەسەر تەواوی بوارەکانی دەکات و سەرەکیترین زەمینە پێکدێنێت بۆ گەیشتن بە زەمینە و ڕەوشێکی هزری و بە دەزگا بوونی سیاسەت و شێوازێکی بەرهەمهێنان بەگوێرەی خۆی. ئەم تەکنیك و پێشکەوتنانەی ڕێگای لەپێش دەکاتەوە، بە شێوەیەکی سەرەکی سەرچاوەکەی بۆ بەشی میکانیکی زانستی فیزیا دەگەڕێتەوە. بە دەزگابوون و پراکتیزەکردنەکانی دەرهەق بە پێشکەوتنی میکانیکی، بناخەی شۆڕشی پیشەسازی شێوازی کارگەیە.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بە تایبەتیش شیکردنەوەکانی ئەلبرت ئەنیشتاین سەبارەت بە مادده و گۆڕانی بۆ وزە، ڕێگای لەپێش گەورەترین شۆڕشەکانی زانستی و تەکنۆلۆژی مێژوو کردەوە. کۆنترۆڵ کردنی وزەی ئەلکترۆنی و ناوەکی لە لایەن پرۆسە میکانیکییەکانەوە و بەکارهێنانی، لە ڕەگەوە گۆڕانکاری چاخی کردووە بە ناچارییەك. بەمرەنگە پێشکەوتنی وەها لە بوارەکانی پێکهاتەی هزر و ژیانی کرداری مرۆڤایەتی بەدیهاتووە، کە سەراوبن بوونی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. تەکنۆلۆژیاکانی گەیاندن و ڕاگەیاندن کە بەردەوامی ئەم شۆڕشەیە جیهانی کرد بە گوندێك و ئیتر شوانێکی سەری چیا و کارسازێکی نیویۆرك بە هەمان دەرفەتی زانیاری پەیداکردن گەیشتن، ئیتر چاخی جیهانگیری پێشکەوتووە کە بیست و چوار کاتژمێر لە کاردایە و بە بەرفراوانترین شێوە بەڕێوە دەچێت. لە ڕاستیدا تەکنۆلۆژیا پێهەڵگرتن و قەڵەمبازێکی ئەنجامداوە کە زۆر لە پێکهاتەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی و کۆمەڵایەتی پێشکەوتووترە. ئەو سیستەمانەی لە زۆربەی گۆشەکانی جیهان وەکو پاشماوەکانی چەرخەکانی ناوین و لە ناوەندە گرنگەکانی ئەم چەرخەدا بە پاشکەوتوویی ماونەتەوە، بە گوێرەی خێرایی و لە ماوەی پێویستدا ناتوانن وەڵامی ئەم قەڵەمبازە تەکنۆلۆژییە بدەنەوە. گۆڕانکارییەکی مەزن لە کرۆکی ناکۆکییەکاندا بەڕێوە دەچێت. ئەگەر ئەم ناکۆکییە بە شێوەیەکی ڕاست هەڵنەسەنگێنرێ و تەگبیری پێویست نەگیردرێت، ئەوا مەزنبوونی ئەو درزانەی هەیە دەبێتە ناچارییەك. مەبەست لە تەگبیر؛ وەرچەرخانی ڕیشەیی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییە. ئەو تەکنۆلۆژیایەی پەیڕەو دەکرێت ناکۆکە لەگەڵ ئەو سیستەمە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەی کە لە ئارادایە. هەروەکو چۆن ئەو تواناکارییە زۆرەی کە ڕێگای لەپێش کردۆتەوە بە شێوەیەکی ڕاست بەکارناهێنرێ، هاوکات لە میانەی شێوازەکانی بەڕێوەبەرایەتی و بەرهەمهێنان و دابەشکردنی سەرمایەداری کلاسیکی، بە شێوەیەك ئیستیسماردەکرێ کە ڕێگا لەپێش کارەسات دەکاتەوە. بۆ نموونە بەکارهێنانی بۆمبای ئەتۆمی، پیسکردنی ژینگە بە شێوەیەکی مەترسیدار، گۆڕانکاری کەش و هەوا، نەخۆشی ئایدز، تەقینەوەی ژمارەی دانیشتووان، ئەو کەلێنە مەزنانەی لە بواری پەروەردە و تەندروستییەوە هەیە، لە سەرووی ئەم بەکارهێنانە خراپ و ڕەوشە مەترسیدارانەوە دێت.

لە قۆناخی سەرمایەداری کلاسیکیدا، ناکۆکی زیاتر لە چوارچێوەی پێکهاتەی ناوەوەی کۆمەڵگا و بە گرانیش لە چوارچێوەی دابەشکردنێکی عادیلانەدا، ڕێگا لەپێش پێشکەوتن دەکاتەوە، هەرچی لە قۆناخی نوێیە، بووە بە کارەکتەری سروشت و ژینگە و تەواوی کارگێڕیە کۆمەڵایەتییەکان. هێزە دەسەڵاتدارە نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکان کە بەهۆی بەرژەوەندی چینایەتی و گروپ و کەسێتییەکانیان، پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا بە گوێرەی پێویستییەکانی کۆمەڵگا و سروشت ڕێکناخەن و بەکاری ناهێنن، ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە مەزنکردنی ئەم ناکۆکیانە. بە تایبەتیش ئەو هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی سیستەمی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی و سیستەمی نێودەوڵەتییە سست و لەکارکەوتووەکان، لە سەرووی ئەم هێزانەوە دێن کە هەڕەشە لە چاخ دەکەن. تاوەکو ئێستاکەش ئەو سیستەمانە دەتوانن بێنە سەر دەسەڵات، کە چارەسەری لە هاوسەنگی ناوکی و سیستەمی قەڵغانی مووشەکی دەبینن. لەپێناو پێشبڕکێی خۆ پڕچەککردن، ناکۆکییە هەرێمییەکان دەورووژێنرێن و گەرم دەکرێن. ئەمانە بەرامبەر بەو تەکنۆلۆژیایانەی کە تێکدانی سروشت و پیسکردنی ژینگە لەگەڵ خۆیان دێنن، بێدەنگن. سەرباری ئەوەی تەکنۆلۆژیا گونجاو و لەبارە، بەڵام بودجەی تایبەت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و نەخوێندەواری و بێ پەروەردەیی و ئەو نەخۆشیانەی ڕوو لە زیادبوونن، تەرخان نەکراوە. بێگومان بەرامبەر بە بەردەوام بوونی ئەم ڕەوشە، بە شێوەیەکی سەرەکی سیستەمی سیاسی و پێکهاتەی کۆنی بەرهەمهێنان بەرپرسیارە. لەم چوارچێوەیەشدا ناکۆکی بووە بە تێکۆشان و ململانێی نێوان تەواوی مرۆڤایەتی و ئەو هێزانەی کە پارەی کردووە بە دۆستی هەرە قێزەونی خۆی و سیاسەتی کۆنترۆڵ کردووە. چونکە ئیتر پێکهاتەی ئابووری لە میکانیزمی کۆنترۆڵی پێکهاتەی سیاسی جاران ڕزگاریبووە و بەرەوشێکی هەرە مەترسیدار گەیشتووە. هەروەکو لە قۆناخی قەیران و ڕووخانی تەواوی چاخەکاندا شێوەی بەڕێوەبەرایەتی ئۆلیگارشی و دیکتاتۆری دەبینرێ، ئەوا هیچ کاتێك لەم قۆناخەشدا بەڕێوەبەرایەتی دیکتاتۆری و ئۆلیگارشی هاوچەرخ کەم نەبۆتەوە کە لەژێر ناوی دیموکراسی خۆیان دەمامك کردووە. لە

لایەکەوە ئەو پێوانە دیموکراسییانەی کە لە راستیدا خۆیان دەسەپێنن، لە لایەکی دیکەشەوە سیستەمە ئۆلیگارشی و دەسپۆتیزمەکان کە نوێنەرایەتی دژبەر دەکەن، لەناویەکتردا دەژین و بەڕێوەدەچن. دەستەیەکی سمساری بۆرسەی پێکهاتەی ئابووری کە پەیوەندییەکی یەکجار کەمیان لەگەڵ بەرهەمهێنان هەیە، لە میانەی هەموو جۆرەکانی بێکاریگەرکردن و لەپێناو بەدەستهێنانی قازانج، هەموو سووکایەتی پێکردنێك پەیڕەودەکەن، گروپێکی بەرژەوەندیخواز لە رێگای هێزی راگەیاندن (میدیا) وە ئەو ئۆلیگارشییە دەکات بە دەسەڵاتی سیاسی کە خۆی رای لەسەرە.

ئاشکرایە خاوەنەکانی سیستەمەکانی ئۆلیگارشی کە بەمجۆرە پێشدەکەون، لەگەڵ تەواوی مرۆڤایەتیدا لەنێو بەرفراوانترین ناکۆکیدان. مەزنایەتی ئەو مەترسیانەی رێگای لەپێش کردۆتەوە راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. تەنیا کوشتار لە میانەی برسێتی و نەخۆشی و شەڕە هەرێمییەکان ناکەوێتەوە، تەنانەت لە رێگای ئەو ژینگە و کەش و هەوایەی بە خێرایی بەرەو رەوشێك دەچێت کە ژیانی تێدا نامێنێ، ئەو تاکڕەوێتیەی (الفردیە) کە زنجیری خۆی پچڕاندووە و بێ کۆنترۆڵە و بەرەو ئاژەڵێتی دەچێت، لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان، بەرەو قیامەتێکی راستەقینە پێی هەڵگرتووە. لە راستیدا رووبەڕووی "بەڕێوەبەرێتی شەیتانە" کە زۆر بە چاکی ئاشکرابووە و لە مێژوودا بە چڕی باسیکراوە و رۆڵی دژایەتی شایستەی بینراوە. هێندە فێڵبازبووە و دەمامکی ئەوتۆی لەخۆی پێچاوە، لە کاتێکدا تەواوی ئەو خراپەکاری و کەم و کوڕیانەی کە خەسڵەتی خۆیەتی، دەیکات بە موڵکی شەیتانێکی خەیاڵی، هاوکات لە سایەی هێزی ئاوارتەی هونەر و راگەیاندن دەتوانێ خۆی وەکو فریشتەیەك بناسێنێ. لە میانەی خراپترین دەمامك و بەهێزترین شۆردنەوەی هزر و رۆح ناکۆکی دەرخواردی تەواوی مرۆڤایەتی دەدرێت. لە رابردوودا تەنیا باس لە کاریگەرێتی سڕکەرانەی ئایین دەکرا. ئایین بەگوێرەی ئەم دەمکانە بووە بە نیعمەتێکی نوورانی. لە میانەی هێزی ئاوارتەی تەکنۆلۆژیاوە داڕووخان و تواندنەوەی رێکخراو بە مەترسیدارترین شێوە پیادە دەکرێت و زۆر لە کاریگەرییەکانی ئایین مەترسیدارترە و لەگەڵ چاخەکانی بەردینیش بەراورد ناکرێت. رۆح و هزری مرۆڤ لە لایەنی سیستەمەکەوە رۆژانە بە بێ وەستان بۆمباردومان دەکرێت و مەحکوومی شکست دەکرێت، تاوەکو ئێستا بە درێژایی مێژوو سیستەمی بەمجۆرەی نەدیوە کە پێکهاتە و شێوەیەکی دژی هزر و رۆحی مرۆڤی هەیە.

ئەو پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەی بۆ یەکەمجارە دەرفەت بە بەدیهێنانی خەیاڵی بەهەشتی مرۆڤایەتی دەدات، بۆ کەمایەتییەك بەجێ دەهێڵدرێ کە رۆحی بەرپرسیارێتییان نییە و لە بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی مرۆڤایەتی دابڕاون و ئەم تەکنۆلۆژیایە دەکەن بە دڕندەیەك کە ژیان بکات بە دۆزەخ و خوڵقێنەرەکانی خۆی قووت بدات.

لەم چوارچێوەیەدا ناکۆکی رۆژانە لە نێوان هەڵگرانی بیری دەوڵەتی نەتەوەیی کە بووە بە تیرەیەکی هاوچەرخ لەگەڵ نوێنەرە کۆسمەپۆلیتەکانی سەرمایەی دارایی پێشدەکەوێت کە لە سەرەوەی نەتەوەکانن؛ لە لایەکی دیکەشەوە لە نێوان تەواوی گەلان و ئەم دوو هێزەوە بەڕێوەدەچێت. لە کاتێکدا هێزەکانی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی کە لە ناوخۆدا داخراون، لە لایەکەوە رێگای کاریگەری دەوڵەمەندی دیموکراسی هاوچەرخ و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی لەسەر گەلەکانیان دادەخەن، لە لایەکی دیکەشەوە بەرامبەر بەو جیهانگیریە دەوەستێ کە لە میانەی سەرمایەی نێونەتەوەیی بەدیدێت. لەهەر دوو بواریشدا رۆڵێکی پاشڤەڕۆیانە دەبینێت. ئەگەرچی دروشمەکانی سەربەخۆیی نەتەوەیی بەرزبکاتەوە کە سەردەمێك بەرامبەر بە ئیمپریالیزم رۆڵێکی پێشکەوتووخوازانەی سنوورداری هەبوو، ئەوا لەبەر ئەوەی هەلومەرجی ئەو قۆناخە لە ئارادانەماوە ئەوا بە شێوەیەکی بابەتی رۆڵی ناوبژیوانی کۆلۆنی هەرە باڵای سیستەمەکانی نێونەتەوەیی پێکدێنێت. کاتێك تەنگەتاو بکرێت، بەرامبەر بە بەشێکی بچووك لە جاران مەترسیدارتر، بەدیاری پێشکەش دەکات. لەم چوارچێوەیەدا سەرلەنوێ بە دەزگابوونی سیستەمی نوێ لە لایەن ئیمپریالیزمی سەرمایەی دارایی نوێنەرە بەکرێگیراوەکانی هەڵگرانی هزری نەتەوەیی ئەنجام دەدرێت.

کاریگەرییەکانی چاخی راگەیاندن و گەیاندن کە رێگایان لەپێش بێ واتاکردنی سنووورە سیاسییەکان و رەخساندنی رەوشێکی وەها کردۆتەوە کە رۆژانە بیست و چوار کاتژمێر زانیاری بەدەستبهێنرێ، بە شێوەیەك گەلانی لە یەکتر نزیك کردۆتەوە و بۆ ئەنتەرناسیۆنالیزمی راکێشان، لە هیچ قۆناخێکی مێژوو نەبینراوە؛ دەرفەت و توناکاری هاوکاری ئەنتەرناسیۆنالیستی هێندە زیاد بووە کە تاکو ئێستاکە نەبووە. ئەم پێشکەوتنەی کە تەکنۆلۆژیا رۆڵی سەرەکی تێدا دەبینێ، بۆ بەلاوەنانی ناکۆکییەکانی ناوخۆ و دەرەوە، رەوش و توناکاری نوێی هێناوەتە ئاراوە. لە کاتێکدا ئەوە دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگا بەدیدێنێ و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەکاتە خاوەن هێز، ئەوا لە لایەکی دیشەوە لە میانەی پێشکەوتووترین ئامرازەوە هاوکاری نێونەتەوەیی دەستەبەردەکات. ئەم رەوشە زۆر لە شێوازەکانی ناکۆکی و چارەسەری سەدەکانی بیستەم و نۆزدەهەم جیاوازترە. فشار دەخاتە سەر دەسەڵاتە ئۆلیگارشییەکان، تاوەکو پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ پەیڕەوبکەن. گۆڕانکاری رەوشی ناکۆکییەکان رێگای چارەسەری جیاوازتر دەخاتە گەڕ. پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ وەکو ئامرازە گشتییەکانی چارەسەری چوارچێوەی نزمترین (أدنی) رێککەوتن پێکدێنێت. هەر بۆیە رێبازەکانی شۆڕش و دژە شۆڕش کە بەرهەمی ناکۆکییە کۆنەکانن تێپەڕکراون. هەروەها تا رادەیەکی مەزن رژێمە فاشیستەکان و سیستەمەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو تێپەڕکراون کە بەرهەمی ئەم رێچکە و رێبازانە بوون.

رۆژەڤی سەرەکی مرۆڤایەتی لە سەدەی بیست و یەکەمدا، لە لایەنی دەزگا سیاسیە نوێکان و لێگەڕینەکانی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی دیار دەکرێت، کە ئەم پەیوەندی و ناکۆکییە سەرەکیانە شێوەی دەدەنێ. بێگومان ئەوەی ئەو پەیوەندی و ناکۆکیانە دیاری دەکات، بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو ئاستەیە کە پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا پێیگەیشتووە. هەوڵدەدرێ لەسەر ئەم بنەما بابەتیانە سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنێك سەبارەت بە رەوشی گشتی پێشبخرێت. ئەو وتووێژانەی ئەنجام دەدرێت لە تەوقی سەر تاکو نینۆکەکانی پەنجەی پێ، هەموو بابەتێك لەخۆوە دەگرێت.

١ ـ ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ساڵانی ٢٠٠٠ لە میانەی تێپەڕکردنی ئەو فەلسەفەیەی کە بناخەی شارستانییەتی سەرمایەداری کلاسیك و پرۆسەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی پێکهێنابوو، بەمجۆرە شێوە دەگرێت. قەیرانی هەمیشەیی و بەردەوامی سیستەمی سەرمایەداری لە رەوشێکی ئەوتۆدا نییە لە رێگای مۆدێلەکانی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی فاشیزم و شێوەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەلاوە بنرێت. پرۆسەکانی شۆڕش و دژە شۆڕش و پێکدادانەکان، قەیرانەکەی قووڵتر کردۆتەوە. ئەمەش ئەوە دیار دەکات ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژییە، ئاستی تەکنۆلۆژی وەکو فاکتەرێکی بنەڕەتی بە بنەما نەگرتووە و لە دایك بوونەکەی خۆی بە شێوەیەکی واقیعی ئەنجام نەداوە. هەم شکستی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی فاشیزم و هەم شکستی ئەو بناخە ئایدیۆلۆژییەی کە رێگای لەپێش سۆسیالیزمی بونیادنراو کردەوە، دوو نموونەی گرنگی سەلمێنەری ئەم مەسەلەیەن. ئەو ئەنجامەی هاتۆتە ئاراوە، سەرلەنوێ لە دایك بوونی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کردۆتە ناچارییەك. کێشەکە پەیوەندی بە هەلومەرجی تەکنۆلۆژی، پێگەیشتن یان رزینی هەلومەرجە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە هەیە. لە هەموو بوارەکاندا پێگەیشتن و رزین لە رادەبەدەر لە ئارادایە. خاڵی بایەخدارتر ئەوەیە، بنەمای تەکنۆلۆژی و توانستە ئایدیۆلۆژییەکان بە ئەندازەیەك بۆ لە دایك بوونی نوێ لەبار و گونجاوە کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکدا بەراورد ناکرێت. بە گوزارەیەکی دیکە هەروەکو چۆن هەلومەرجە بابەتییەکان بۆ قەڵەمبازێکی نوێی مێژوویی لەبار و ئامادەیە، لەگەڵ رزیندا سەرەداوە گرنگەکانی دەرچوونێکی نوێش سەرهەڵدەدات. کێشە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە بە شێوەیەکی راست و بە کارامەیی، ناسنامەی ئایدیۆلۆژی دەستنیشان ناکرێت. پارچەبوونی پێکهاتەی هزری و رۆحی بۆ شکست و تەسلیمییەت و گەندەڵ بوون دەگەڕێتەوە. هەربۆیە یەکەمین کار کە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە، ئەنجامدانی لە دایك بوونێکی رەسەنی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پێکهاتەی هزری و رۆحییە کە گشتگیر بێت و بزانێ چۆن سەردەکەوێت و خۆڕاگرە. ئەگەر پوختتری بکەینەوە، پێویست دەکات لە چوارچێوەی ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی تیۆری، هەلومەرجەکانی بەرجەستە بە گوێرەی گشتگیری مێژوویی و کۆمەڵگا، بەرنامە و رێبازی ستراتیژی و تەکتیکی خۆی دابڕێژێت. لەم چوارچێوەیەشدا دەستەواژەی "تیۆری راست نەبێ، کرداری راست نابێ" لەباری و بەردەوامی خۆی دەپارێزێ.

تەواوی چاخە گرنگەکانی مێژوو پشت بە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی بەهێز دەبەستن، باوەڕی خوداوەندی دایکی کۆمەڵگای نئۆلیتیک، بنەڕەتیترین ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئەم چاخەیە. میتۆلۆژیای سۆمەریەکان یەکەمین ناسنامەی ئایدیۆلۆژی و بناخەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی تەواوی چاخەکانی کۆمەڵگای چینایەتی پێکدێنێت. ئەم میتۆلۆژییە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی کتێبە پیرۆزەکان و ئەدەبیات و پێشکەوتنی فەلسەفەیە.

فەلسەفەی یۆنانی و ئایینە تاکخوداییەکان مۆرکی خۆیان لە تەواوی ناسنامە ئایدیۆلۆژییەکانی چاخەکانی دێرین و ناوین داوە، سەردەمەکانی ڕێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری ئەو قۆناخە سەرەکیانەن کە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی شارستانییەتی سەرمایەداریان پێکهێناوە. ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی خواستی ببێتە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای بێ چین. کاتێك تەماشای تەواوی ئەم ناسنامە ئایدیۆلۆژیانە بکەین، دەبینین کێشمەکێشی دەستپێکی ئەو سیستەمانەی کۆمەڵگا نیشاندەدات کە دێنە ئاراوە و پێشدەکەون. بەرلە هەموو شتێك، چارەنووسی سیستەمەکان لە شەڕی ناسنامەی ئایدیۆلۆژیدا دیار دەکرێت. هیچ سیستەمێکی کۆمەڵگا نابینین بە شەڕی ئایدیۆلۆژیدا تێپەڕ نەبووبن. ناسنامەی ئایدیۆلۆژی لەوە دەچێت کە کۆرپەلەیەك بکەوێتە نێو منداڵدانی دایکی. لە دایك بوونێکی ڕێك و گەورەبوون بەرلە هەموو شتێك لەو شێوەگرتنە دیار دەبێ کە لە منداڵدانی دایکی پێی دەگات. ئەو کۆمەڵگا و شارستانییەتانەی ئەو پەرەسەندنە دیالەکتیکیانەیان بەخۆیانەوە نەدیوە، لە رەوشێکی پارچە پارچەیی و لاسایی کردنەوە و سەمەرە رزگاریان نابێت. هەروەکو چۆن لە کاتێکدا دەرکەوتن و لە دایکبوونێك لە منداڵدانی دایکدا ناتەواو بێت، بە درێژایی تەمەنی کاریگەرییەکەی دیار دەبێ، ئەوا ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیانەی ناسنامە ئایدیۆلۆژیەکەیان سەقەتە یان ناتەواوە، بە درێژایی ماوەی تەمەن و بەردەوامییان لە کاریگەرییەکانی رزگاریان نابێت. هێز و توانای سیستەمێکی کۆمەڵگا لە نزیکەوە پابەندی ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژیەیە کە وەکو کۆڵەکە پشتی پێ دەبەستێ.

لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا شیکردنەوە تیۆرییەکان، گرنگترین بەشی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پێکدێنن. لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا میتۆلۆژیا و ئایین و چەمکە فەلسەفییە جیاوازەکان جێگای تیۆرییان دەگرتەوە. پێشکەوتنی روونکردنەوەی زانستی پەیوەندییەکانی سروشت و کۆمەڵگا، لەسەر بنەمایەکی زانستی، رێگا لەپێش پەرەسەندنی تیۆری دەکاتەوە. تیۆری، هەڵسەنگاندنی شێوەی گشتی ئەو کۆمەڵگایە و دیاریکردنی ئاراستەکەی لەخۆوە دەگرێت، کە داخوازی گۆڕانکاری یاخود بەردەوامبوونی هەیە. تا چ رادەیەك بە راستی هەڵیسەنگێنێ و پێی بگات، ئەوا پێشکەوتنی پرۆسەکەی هێندە سەرکەوتوو و دروست دەبێت. کۆمەڵگای سۆمەری کە بۆ یەکەمجار شارستانییەتیان ئاوا کرد، راهیبەکانیان کە بە هەزاران ساڵ لە پەرستگا (کار)یان کرد، خەریکی کارەکانی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی سیستەم بوون. یەکەمین لە دایکبوون لە پەرستگا و دەوروبەرەکەی ئەنجامگیر بووە. راهیبە میسریەکان سەرنج راکێشتریان کردووە. ئەو فەیلەسوفانەی بۆ یەکەمین جار رێگایان لەپێش دەرکەوتنی فەلسەفە کردەوە، یەکەمین و گرنگترین پەروەردەی خۆیان لەم پەرستگایانەدا بینیوە؛ ئیلهامیان لە مۆدێلی ئەم پەرستگایانە وەرگرتووە و وەکو ئەکادیمیا و فێرگە، فۆرمی نوێیان پێداوە.

کڵێسە و مزگەوتەکانی چاخەکانی ناوین، بەردەوامی ئەم داب و نەریتەن. لەگەڵ دەستپێکردنی چاخی نوێ، ئەم داب و نەریتە ناوی لە شێوەی قوتابخانە و زانکۆی لێنراوە و گەوهەرەکەی لە میانەی پێشکەوتنە زانستییەکان ناوەڕۆکەکەی پڕ کرایەوە و درێژەی پێدراوە. ئاشکرایە ئەگەر هێز و توانای ئەم داب و نەریتە نەبوایە، نەدەتوانرا باس لە پێشکەوتنەکانی شارستانییەت بکرێت.

بەڵام پێویستە هەڵوێستە تیۆرییە هاوچەرخەکانی ئەم رۆژگارەمان بەر لە هەموو شتێك بە شێوەیەکی راست، ئەم تەوژمە باوەی ناسنامە شیبکاتەوە. بە گووتنی "ئایین ئەفیۆنە" ناتوانرێ لەژێر باری ئەم کارە دەربکەوێت. تاوەکو هێزی ئەو ناسنامە ئایینی و میتۆلۆژیانە لەسەر ژیانی کۆمەڵگا ئاشکرا نەکرێت کە بە هەزاران ساڵ بەردەوام بووە، تاوەکو روون نەکرێتەوە نوێنەرایەتی چییان کردووە و جێگای لە مێژووی هزردا دیار نەکرێ، ئەوا ئەو شیکردنەوانەی ئەنجام دەدرێ کەم و کوڕی مەزن لەخۆوە دەگرێت. هەڵەیەکی هاوشێوەی تێکەڵ کردنی پێشکەوتنی تاکەکەسێتی و تاکڕەوێتیە کە لە سەردەمی پێکهاتنی سەرمایەداری هاتە ئاراوە. بە لایەنی کەم هێندەی پەیوەندی ماددی، پەیوەندییە مەعنەوییەکانیش پێویستی بە شیکردنەوە هەیە. لە راستیدا پابەندبوونێکی مسۆگەر لە نێوان هەردووکیاندا هەیە. رۆڵی ئەم نزیکبوونەوەیە لە هەڵوەشانەوەی ئەو مارکسیزمە هەیە کە بە ئاستی سۆسیالیزمی بونیادنراو گەیشت و گرانی بە شیکردنەوەی ئابووری داوە. تیۆری نابێ تەنیا رەوشی لە ئارادا هەڵسەنگێنێ، کاتێك پێشکەوتنی کۆمەڵگا و مێژوو لە میانەی بوارەکانی ئایدیۆلۆژی و ئابووری و لەگەڵ دیاردەی سیاسی لەناو یەکتردا، بە بێ ئەوەی گرنگی هیچ یەکێکیان پشت گوێ بخات و زێدەڕۆیی تێدا بکات، وەکو خۆی نیشانی بدات، ئەوکاتە دەتوانرێ بگوترێ بە راستی رۆڵی ئایدیۆلۆژی خۆی بینیوە. لەژێر رۆشنایی ئەو رۆشنگەرییەی ئەنجامیدەدات بینینی راستیەکان و هەنگاو هاوێشتن بەرەو پێشەوە، سانایی دەبێت.

بۆ ئەوەی ئەو کێشە ئابووری، سیاسی و ئایدیۆلۆژیانە چارەسەر بکرێن کە کۆمەڵگاکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان رووبەڕووی بوونەتەوە و تەنانەت هەڵوێست و نزیکبوونە تیۆری و هزرییەکانیش پێناسەیەکی راستیان دەرهەق پێشنەخستووە؛ ئەوا پێویست دەکات گرێدراو بە قۆناخی پێکهاتنیان سەرلەنوێ دیسپلینی هزرە بە شان و شکۆکانی مرۆڤایەتی چاوێکیان پێدا بخشێنرێتەوە. هەڵوێستێکی وەها، بەرفراوانی شیکردنەوەی تیۆری و لێکۆڵینەوەیەکی ریشەیی سیاسی و ئابووری و هزری سیستەمی کۆمەڵگاکان وەکو مەرجێك دەسەپێنێ. ئەمەش تاوەکو تێروانینێکی نوێ و بەرفراوان تر سەبارەت بە مێژوو و رۆژگاری ئەمڕۆمان گەڵاڵە دەبێت، بە واتای مێژوویێکی نوێش دێت. ئەم ئاواکردنەی مێژوو و رێبازی شیکردنەوە، لە دوا شیکردنەوەکاندا هەموو کاتێك بۆ شارستانییەتی مرۆڤ و بنەچەکانی هزر دەگەڕێتەوە، واتە رۆژهەڵاتی ناوین بناخەکەی پێکدێنێ.

شارستانییەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، سەبارەت بە تەواوی مرۆڤایەتی، گوزارشت لە رەسەنایەتی دەکات، پشت بە کۆمەڵگای چینایەتی دەبەستێ و بە ئەندازەی دەسکەوتە ماددییەکانی سەرچاوە ئایدیۆلۆژییەکەشی لە کۆمەڵگای کشتوکاڵی (نئۆلیتیك)ی یەکسانیخواز دەگرێت. لە میانەی ئەمەشدا مەبەست بنەچەی لە دایك بوونی دایکە. لە هەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆ لێکۆڵەرەوەیەکی زانستی سەبارەت بە مێژوو ئاستەم نییە ئەم راستینەیە بسەلمێنێ. دراوە (معگیات) ئاسەوارناسی، ئەدەبی، سیاسی و ئابوورییەکانی کە لەبەر دەستدان بە زێدەییشەوە دەرفەتی ئەمە دەدەن.

لە شیکردنەوەکانی سەبارەت بە شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین هەوڵماندا چەند بابەتێکی گرنگ روون بکەینەوە. لەگەڵ ئەوەی تەواوی هەڵسەنگاندنەکانمان تێکەڵاون، وەلێ دیسان سەرنج راکێشانە سەر ئەم بابەتانە لە جێگای خۆیدا دەبێت.

١ ـ لە شارستانبیەتی یۆنان ـ رۆما گەڕان بەدوای سەرچاوەی مێژوویی شارستانییەتی ئەوروپا، رێگا لەپێش کەم و کوڕی و بەهەڵەداچوونی مەزن دەکاتەوە. چونکە پێشکەوتنی شارستانییەتی گریك و رۆما نوێنەرایەتی دوا شێوەی قۆناخی کۆیلایەتی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین دەکات. گەوهەرەکەی ناداتە دەست. چاوگی سەرەکی سۆمەرە و بە پلەی دووەمیش کۆمەڵگای چینایەتی میسرە. لەبەر ئەوەی سۆمەر نموونەی رەسەنە، هەربۆیە گرنگی و بایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت و مێژوو تەنیا بە سۆمەرەکانەوە دەست پێناکات. هەروەکو چۆن لە دوو پێڕەوی سەرەکیدا بۆتە بناخەی پێشکەوتن، کۆمەڵگا لە شێوەی چەوسێنەر و چەوساوە دابەش دەکات، ستەمکار و ستەملێکراوی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. مێژووی دواتر لەسەر بنەمای ئەم دوو ئاراستەیە پێشدەکەوێت: رۆژهەڵات و رۆژئاوا و چەوسێنەر و چەوساوە. چەوساندنەوەی کشتوکاڵ و شار رۆڵیان هەیە لە دانانی بناخەی جیابوونەوەی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا. لە کاتێکدا شار رێگا لەپێش فۆرمی پێشکەوتووتر دەکاتەوە، کشتوکاڵیش ناچار دەکات بە گوێرەی خۆی شێوە بگرێت. ئەو ناکۆکییەی بەمجۆرە دەستپێکردووە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. لە کاتێکدا ئەو شارستانییەتانەی ریشەیان بۆ رۆژئاوا دەگەڕێتەوە زیاتر لەسەر بنەمای مۆرکی شار، بازرگانی و پیشەکاری و ئایینی ـ دونیایی رۆڵی ناوەندی بەڕێوەبەرێتی پێشدەخست، دەبینرێت ئەو شارستانییەتانەی ریشەیان بۆ رۆژهەڵاتی دەگەڕێتەوە، لەسەر بنەمای گوند و شارۆچکە جووتیاری و رەوەندی و میرنشینی، زەوی بە بناخە دەگرێت.

ب ـ به شێوەیەکی ڕاست دەستنیشان کردنی ڕەنگدانەوەی ئەم شێوازەی پێشکەوتنی مێژوو لەسەر شێوەکانی گوزارەی ئایدیۆلۆژی، گرنگترین کێشەیە. ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژی سەرچاوەکانی سۆمەر، ئەو شێوانە لەخۆوە دەگرێت کە پێویستی هەڵوەستە و لەسەر وەستانێکی زیاد هەیە. تاوەکو پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی سۆمەریەکان شینەکرێتەوە، نە دەتوانرێ ئایینی تاکخودایی و ئایدیۆلۆژیا، نە شێوەی فەلسەفی ئایدیۆلۆژیا، تەنانەت ناشێ شێوازی هزری زانستیانە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست هەڵسەنگێنرێ. پێناسەی مسۆگەری ئایدیۆلۆژیا تەنیا لە بنچینە ڕەسەنەکەیدا بە شێوازێکی واقیعی ئەنجامدەدرێت. ئەگەر ئەمە بە بناخە دانەنرێت و پشت بە مێژووی ئایینەکان ببەسترێت، فەلسەفە بە نموونە ڕەسەنەکە لە قەڵەم بدرێت و لە دواییشدا بگوترێ "تەنیا دەشێ ڕاستییەکان لە چاخی هاوچەرخدا بدۆزرێتەوە" ئەمەش بە هەڵەداچوونی مەزن و دابڕان لەگەڵ خۆیدا دێنێ و لەم چوارچێوەیەشدا ئەم پێکهاتە هزرییانە لە جێگای ڕاستی دادەنرێن کە ئەم سەر و ئەو سەری مێژووی گرتۆتەوە. هەروەکو چۆن مێژوو بە گشتی هەڵگری ئەم نەقوسانییەیە، هاوکات پێشکەوتنی پراکتیکیشی لەژێر سایەی ئەم نامۆیی و چەواشەکاریە مەزنانە بووە. سەدەی بیستەم کە هەوڵدەدات دەرك بەم ڕاستینە بکات، لەوانەیە خوێناویترین سەدەی ئەم مێژووە بێت. ئەگەر دان پێدانانێك سەبارەت بە سەدەی بیستەم بکرێت ئەوا بەرلە هەموو شتێك لەو چوارچێوەیەدا دەبێت، کە چۆن ئەم تێروانینەی سەبارەت بە مێژووی لە میانەی زانستەوە بەهێز کردووە بەسەر مرۆڤایەتیدا ڕشایەوە، لەوانەیە تەواوی سەدەکانی پێشوو بەهۆی سنووررداری تواناکارییە زانستییەکان، لە ڕەوشێکی وەهادا نەبوون ڕەخنەدانی خۆیان بدەن ـ بەڵام سەدەی بیستەم بە زێدەییەوە تواناکاری پێویستی بۆ ڕەخنەدان هەبوو. لە جیاتی دان پێدانانێکی مەزن و ڕەخنەدان، ئاراستە کردنی بەرەو هێرشکاری و ڕێ کردنەوەی لەپێش خوێناویترین سەدە گەورەترین تاوانێتی. تاوەکو مرۆڤایەتی سەدەی بیستەم نەهۆنێنێتەوە و شینەکاتەوە و دان بە تاوانەکانی خۆیدا نەنێت و لە میانەی شۆڕشێکی ئاکاری مەزن، ڕەخنەی خۆی نەدات، ئەوا لە ڕەوشی نەفرین لێکراوترین سیستەمی کۆمەڵگا ڕزگاری نابێت. پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ تەنیا لە میانەی شیکردنەوەی ئەم کۆمەڵگا نەفرەت لێکراوە دەستەبەر دەبێت.

ج ـ چوار شێوەی مەزنی هزر لەنێو پەیوەندییەکی دیالەکتیکی دان و لە کرۆکی خۆیاندا مێژووی کۆمەڵگای چینایەتی نیشاندەدەن. ئەم ڕەنگدانەوەش بە شێوەیەکی سەرەکی دیدگای توێژی سەردەست و چەوسێنەر دەداتە دەست. بەرامبەر بەم ڕەوشەش توێژی ژێردەست و چەوساوە، هیچ کاتێك لەوە دوا ناکەوێت شێوازی تایبەت بەخۆی بخوڵقێنێ، کە فەرمی نییە و تاوەکو دوایی ناچارە نهێنی بێت. بەمجۆرە درێژەی پێدەدات.

ئەو شێوە ئایدیۆلۆژییەی یەکەمین چینی چەوسێنەر بەرزی کردەوە، میتۆلۆژیایەکە پشت بە ئاسمان و بەرزایی دەبەستێت. بە گوزارەیەکی ڕاستتر، لە کاتێکدا ئاسمان وەکو مەزنایەتی و باڵابوون و وەکو سیفەتی سەردەست پێشدەکەون، ئەوا بچووکی و ژێرخاك و دۆزەخ، شایەنی چینی چەوساوە دەبینرا.

ڕاهیبە سۆمەریەکان ڕۆڵێکی دیاریکراویان هەیە لەوەی چینی سەردەستی قۆناخی منداڵێتی مرۆڤایەتی شێوەی هزری میتۆلۆژی (ئەفسانە و چیرۆك) بە شێوەیەکی هەرە سادە بەلای خۆیدا بشکێنێتەوە. ئەوەی مۆرکی خۆی لە شێوە هزرییەکانی دواتر داوە شێوازی (تەرزی) ڕاهیبی سۆمەرە. ئەم تەرزە لە نزیکەوە پەیوەندی بە پێکهاتنی کۆمەڵگای چینایەتییەوە هەیە. سەرەڕای ئەوەی تەواوی کەسایەتی خوداوەندەکان و خاسییەتەکانی لە سەرەتادا نوێنەرایەتی سروشت دەکەن، پێ بە پێ دەکرێت بە تایبەتمەندێتی چینە چەوسێنەرەکان. خوداوەندە سۆمەریەکان لە ئاراستەگرتن بەرەو تاکخودایی، ڕۆڵێکی دیاریکراویان هەیە. بە ئەندازەی ئەوەی نیمچە دەوڵەتەکانی شار بەرەو ئیمپراتۆرییەت پەرەدەسێنن، ژمارەی خوداوەندەکانیش کەم دەبێتەوە و دادەکەوێتە تاکخودایی، لە تایبەتمەندێتی سروشتییەوە دەبنە خاوەن تایبەتمەندێتیەکانی کۆمەڵگا.

هێندەی کۆمەڵگای شار و گۆڕانکاری پێشبکەوێت تاکخوداییش پێشدەکەوێت، تاکخودایی زیاتر لەگەڵ کارەکتەری کۆمەڵگای بازرگانی کۆکە و گونجاوە. وەکو زاراوەی ناسنامە، وێستگەیەکی گرنگی پێشکەوتنی هزرە. کۆمەڵگای بازرگانی کە پێویستی بە دڵنیاییەکی مسۆگەر و ڕێساکانی گۆڕانکاری هەیە، هەوڵدەدات لە ڕێگەی گۆڕانی میتۆلۆژی بۆ ئایین، ئەم پێویستیەی خۆی دەستەبەر بکات. لەبەر ئەوەی میتۆلۆژی لەسەر بنەمای چیرۆکە، مسۆگەر نییە؛ بەهاکەی وەکو یاسا و حوکمێکی ئایینی نییە. زیاتر لەگەڵ کۆمەڵگای کشتوکاڵی کۆکە و گونجاوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەی ڕێژەکانی گۆڕانکاری گرنگی و بایەخ پەیدا دەکات، بازرگانەکان ناچاری ئایین یاخود باوەڕییەك دەکات کە حوکمەکەی مسۆگەر بێت . ڕێساکانی ئایینێك کە حوکمەکەی مسۆگەر بێت، یاسایەکن کە پەیڕەو کردن و باوەڕی پێهێنانی دەکات بە ناچارییەك. ئەم تایبەتمەندییەش تا دواڕادە ئیش و کارەکانی بازرگانی سانایی دەکات. پێشکەوتنی ئایینە تاکخوداییەکان بە پشتبەستن بە تیرە سامیەکان کە لە نێوان شارستانییەتی سۆمەر و میسر خەریکی بازرگانی بوون، ڕێککەوت نییە و لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم ڕاستیانەیە. فۆرمە فەرمییەکانی ئایین و میتۆلۆژیا زیاتر بە گوێرەی بەرژەوەندی چینە سەردەست و چەوسێنەرەکان ڕێکخراوە. ڕۆڵی چینە ژێردەست و چەوساوەکان لەم داهێنانەدا پاسیفە؛ ناچار کراوە کە هەر چۆنێك پێشکەشی بکرێت پەسندی بکات.

د ـ بەرامبەر بەم ڕەوشەی ئاماژەی پێ کرا، تەواوی ئەو توێژانەی خراونەتە ژێر سیستەمی چەوسانەوە بەردەوام بە گومانەوە پێشوازیان لە میتۆلۆژی و ئایینی فەرمی کردووە، سەرچاوەی ئایینی سەرەکی (دایك) خۆیان بە کۆمەڵگای نیئۆلیتیك سپاردووە. ئایینی خوداوەندی دایکی کۆمەڵگای نیئۆلیتیك بە قووڵایی کاریگەری کردۆتە سەر تەواوی شێوە هزرە نهێنی (میستیك = سۆفیگەرایی) کە دواتر دەرکەوتوون. ئەم شێوە ئایینیانە لە لایەك ڕەنگدانەوەی کاردانەوەی چینە ستەملێکراوەکان بوو، لە لایەکی دیکەشەوە تایبەتمەندێتییەکانی ژیان و ئایینی سروشت و دۆستایەتی مرۆڤ ـ خوداوەند و کارەکتەری ئاشتیخوازانەی ڕەگەزی ژن نیشاندەدات. خاوەنی هەڵوێستێکە زیاتر نزیك بە (عیلمانی) و دونیاییە. تەواوی تەریقەتەکان و ناوەندە نهێنییەکانی پەرستن بە درێژایی مێژوو هەوڵیانداوە زیاتر نزیکی چینی چەوساوە و ژن بن و بە یەکسانی هەڵوەستەیان بەرامبەر بکەن، بەڵام بە چڕی ئیستسمار کراون. ڕەوشی سەرەتایی و دواکەوتوویی (تەکنۆلۆژی) ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ. دەتوانرێ شێوە سادەکەی تەریقەتگەرایی وەکو هێزی ڕکابەری چینە ستەملێکراوەکانی چاخە سەرەتاییەکان و ناوین ببینرێ. سەربارى ئەوەی لە مێژوودا بڵاوبوونەوەیەکیان بەخۆوە دیوە، ئەوا لەبەر ئەوەی ڕێزانەکانیان، یان لەنێو بردراون یاخود کرێدراون، دووچاری گەندەڵی مەزن و ئێش و ڕق و کین هاتوون. بەڵام ئەوە ڕاستیەکە لە کۆمەڵگای نیئۆلیتیکەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تەریقەت و مەزهەبە ڕکابەرەکان، (المعارجە) باوەڕی و بەرخودان و شێوازی ژیانی توێژە چەوساوە و ژێردەستەکانی مرۆڤایەتی نیشانداوە.

هـ ـ شێوەی هزری فەلسەفی، هاوکاتی قۆناخێکی پێشکەوتووی زێدە ـ بەرهەم و کۆمەڵگای شارە. لە قۆناخێکدا پرۆسەی بە کۆمەڵگابوون بە باشی هێزەکانی سروشت و کۆمەڵگای پێناسە کردووە، ئەوا تێرکردنی هزری مرۆڤ لە میانەی میتۆلۆژیا و ئایین پێ بە پێ ئاستەم دەبێت. پێویستی بەو هزرانە دەبێت کە واقیعی ترن و مرۆڤ ئیقناع بکات. ئیتر چەندین حوکمی (یاسای) میتۆلۆژیا و ئایین جێگای پێکەنینە. کاتێك بە باشی شارەزای زەوی و ئاسمان بوو و ناسی، کاتێ بینی ئەم خواوەندانەی لێ نییە کە پێشتر وای لە قەڵەم دەدا، ئەوا پێویستی تێگەیشتنی یاساکانی سروشت دەردەکەوێتە پێش. شێواز و تەرزی لێپرسینەوەی بۆچی گەردوون خوڵقێنراوە؟ یەکەمین ماددە چییە؟ ئەم هەموو جیاوازی و هەمە ڕەنگییەی دەبینرێ چۆن پێکهاتووە؟ هزری فەلسەفی دێنێتە ئاراوە. هەروەها بەڕێوەبەرایەتی پادشای ـ خوداوەند لێپرسینەوەی سەبارەت دەکرێت. کاتێك بۆیان ڕوون دەبێتەوە پادشاکان نابن بە خواوەند و یاساکانیان گوزارشت لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکات، ئەوا ڕوون کردنەوەی فەلسەفیانەی کۆمەڵگا دەبێتە ناچارییەك.

هزری فەلسەفی لە میانەی ئەم تایبەتمەندێتیەوە، دوای میتۆلۆژیا و ئایین نوێنەرایەتی سێیەمین قۆناخی پێشکەوتنی مێژووی هزر دەکات و ڕۆڵی پرد دەبینێ لە دەربازبوون لە هزری ئایینی بۆ هزری زانستی. فەلسەفە لە لایەکەوە ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە شێوەی هزری ئایینی بگاتە ئاستێکی ئەقڵمەندانەتر، واتە ڕێگا بە تیۆلۆژیا دەدات، لە لاکەی دیکەشەوە لەسەر بنەمای ئەزموونگەراییەوە هێز بە زانستەکانی سروشت دەبەخشێ. بە خۆشی لەگەڵ پێشکەوتنی زانست هەوڵدەدات ئەو شێوازەی دەربڕین و یاسایانە پێشبخات کە زانست لەم لایەنەوە تەواوی نەکردووە. هەروەکو ئایین و میتۆلۆژیا فەلسەفەش لە بەرژەوەندی چینە سەردەستەکان بەکار دەهێنرێ. بەڵام هەڵوێستەی نزیکی لە ڕاستینەی خۆڕسك دەرفەت بەوە نادات

هێندەی ئایین و میتۆلۆژیا بەکار بهێنرێ. بەڵام شارستانییەتە پێشکەوتووەکان زەمینەیەکی زیاتر پێشکەش بە فەلسەفە دەکەن. هەروەکو چۆن ئاوێتەبوونی فەلسەفە لەگەڵ ئایینە فەرمییەکان ڕێگا لەپێش تیۆلۆژیا دەکاتەوە، ئەوا ئاوێتەبوونی لەگەڵ تەریقەتەکانیش زیاتر نزیکی ستەملێکراوەکانی دەکاتەوە. ئاوێتەبوونی فەلسەفە لەگەڵ تەریقەتەکان لە ئاوێتەبوون لەگەڵ ئایینە فەرمییەکان لەپێشترە. لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی بەرژەوەندی چەوساوەکان لەگەڵ ڕاستی دەبێتە یەک، ئەوا یەکبوونی لەگەڵ فەلسەفە سانایيترە. هەربۆیە تەریقەتەکانی چاخی ناوین بە تایبەتیش باتینی (باگنی) هزری فەلەسەفی وەکو چەکێکی بەهێز بەکار هێناوە. دەرکەوتنی هزری زانستی سەرچاوەکەی زیاتر بۆ هەبوونی ئەم جۆرە تەریقەت و ئایینزایانە دەگەڕێتەوە.

و ـ هزری زانستی؛ کاتێك پێناسەی سروشت و کۆمەڵگا هێندە یەکلادەبێتەوە کە پێویستی بە هێزێکی دەرەوە نییە بۆ موداخەلە کردن، هزر لە میانەی ئەزموونەوە پشتگیری لێدەکرێت و دەردەکەوێتە پێش. گرێدراوی پێشکەوتنی پرۆسەی بە کۆمەڵگابوونە. تا چ ڕادەیەك کۆمەڵگایەك ئاڵۆز بێت و پشت بە شار، بازرگانی و پیشەسازی ببەستێ، بەو ئەندازەیەش پێویستی بە هزری زانستی پێشدەکەوێت. پەیوەندییەکی هێندە پتەو لە نێوان زانست و کۆمەڵگا هەیە. لە کاتێکدا چینی چەوسێنەر و سەردەست سوود لە هێزی بەرهەمهێنانی زانست دەبینێ، ئەو خۆی لەو ڕۆشنگەریە بەدوور دەگرت کە لەگەڵ خۆیدا هێناوە. چونکە بەرژەوەندییەکانی تێکدەدات، هەربۆیە پەنا دەباتە بەر ئەو شێوە ئایدیۆلۆژیانەی مرۆڤایەتی لەنێو تاریکیدا هێشتۆتەوە. لەم بوارەدا شێوازی هزری زانستی بۆ توێژە ژێردەست و چەوساوەکانی مرۆڤایەتی وەکو سەرچاوەی مەترسی بەردەوام دەکات. تەنیا بەسەربەخۆ ناتوانێ ئازادیخواز بێت. بەرێوەبەرایەتی چینایەتی زانست ڕۆڵی دیاریکراوی هەیە. گرێدراو بە کارەکتەری بەڕێوەبەرێتی چینایەتی کاریگەری زانست لەسەر توێژەکانی کۆمەڵگا جیاوازە و دەگۆڕێت. هێندەی بەرژەوەندی چینایەتی و پاشڤەڕۆیەتی زیاد بێت، ئەوا زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگا و ژینگە و هەڵوەشانەوەیان زیاد دەبێت. بە پێچەوانەوە گرێدانی هێزە کۆمەڵایەتییە دەسەڵاتدارەکەیان بە بەرژەوەندی گشتی و کارەکتەری پێشکەوتووخوازی، دەرفەت بەوە دەدات هێزی فێرکردن و ئازادیخوازی و یەکسانیخوازی زانست، زیاتر ڕۆڵی خۆیان ببینن.

ز ـ سیستەمی هزری ڕۆژئاواش بەرهەمی ئەم شێوە هزرییە مێژوویيانەیە. لە میانەی پەرەسەندنێکی جیاوازەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ درێژەی بە پێشکەوتنی خۆی داوە. ئەو شێوە و وەرچەرخانەی ناسنامەی میتۆلۆژی سۆمەریەکان لە ئەنادۆل و گریك دووچاری هات، گەوهەرێکی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت کە بە تەواوەتی بەسەر ئیرادەی تاکدا زاڵ نییە و دەرفەت بە ئازادییەکی سنووردار دەدات. باوەڕی زیۆس کە لە ماوەی نێوان ١٥٠٠ تا ٥٠٠ پ.ز بەکاریگەر بوو، زۆر نزیکی شێوەی مرۆڤ بۆتەوە. ئەو ترس و ئومێدەی بە خواوەندەوە گرێدراوە، لە کاریگەرییەکی ئەخلاقی و مەعنەوی بەدواوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە؛ گوزارشت لەو ڕاستینەیەی چینایەتی دەکات کە هێشتا توند نەبووە. بە خێرایی سروشت لەژێر ئیرادەی خوداوەند دەردەکەوێ و سەربەخۆ دەبێت و ئەو چەمکە ڕەگی خۆی دادەکوتێ کە بانگەشەی ئەوە دەکات؛ یاساکانی کۆمەڵگا ئەنجامێکی ئیرادەی مرۆڤە. لە کاتێکدا چینە سەردەستەکان لە میانەی باوەڕی زیۆس نوێنەرایەتیان دەکرا، ئەوا (جەماوەرە) ئاسایيەکەش لە میانەی باوەڕی دیۆنیسۆس، نوێنەرایەتی جیاوازی ناو کۆمەڵگا دەکرا. ئەم ڕەوشە جیاوازی نێوان خواوەندەکان نیشاندەدات. بە شێوەیەکی گشتی لەساڵانی ٥٠٠ پ.ز بەدواوە میتۆلۆژیا جێگای خۆی بۆ هزری فەلسەفی بەجێ دێڵێ. لە ڕێگای فەلسەفەوە تاك زیاتر ڕۆشن دەبێتەوە و ئیرادە بەدەست دێنێ. لەگەڵ دەرکەوتنی کۆیلایەتی لە کولتووری ڕۆژهەڵات، ڕێڕەوێکی جیاواز و پێچەوانە دیاری دەکات. یەکەمین دابڕانی جددی لە نێوان کەسایەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە لای گریکەکان قووڵ دەبێتەوە. بەڵام ئەو شوێنەی دابڕانی سەرەکی تێدا ئەنجام درا میدیایە. ڕۆژئاوای باکووری ئێران و میزۆپۆتامیای سەروو ئەو شوێنەیە کە بۆ یەکەمین جار جیاوازی ڕێبازی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوای تێدا دەرکەوت. داب و نەریتی زەردەشت هەموو هێز و توانای خۆی لەوە دەگرێت کە توانیویەتی ئەم جیابوونەوەیە ئەنجامگیر بکات.

لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمادا ئیرادەی خودایی لاوازتر دەبێ، کارەکتەری (عیلمانی) دەردەکەوێتە پێش. فەلسەفەی خۆڕسکی ستۆوایی لە میانەی کارەکتەرە کۆسمۆپۆلیتەکەیەوە، ڕێگا لەپێش مەسیحییەت دەکاتەوە. هەروەها شرۆڤەکردنی مەتنە (پەراوی) پیرۆزەکانی یەهودیەکان لە میانەی فەلسەفەی گریك، بنەما فەلسەفییەکانی باوەڕی مەسیحی و ئیسلامی پێکدێنێ. لە ساڵانی ١٥٠٠ تا ٥٠٠ پ.ز ئەو کڵێسەیەی لافی ئەوە لێدەدات بەرامبەر بە دەسەڵاتی دونیایی نوێنەرایەتی دەسەڵاتی خودایی دەکات، لە ڕاستیدا لە جیهانی ڕۆژئاوا بناخەی ئایدیۆلۆژی دەرەبەگایەتی پێکدێنێت. ئەم دوا قۆناخەی باڵادەستی شێوازی هزری ڕۆژهەڵاتی، ڕێگا لەپێش وەرچەرخانێکی ڕیشەیی پێکهاتەی هزری و ئەخلاقی کۆمەڵگای ئەورووپا دەکاتەوە کە بە گرانی لە سەردەمی بەربەریەتدا دەژیان. بەڵام لێرەشدا لە میانەی ئەو تەریقەت و ئایینزایانەی لەسەر بنەمای ئەخلاقی بوون، دەکەونە نێو تێکۆشانێکی دژوار و بێ ڕەحمانە. لەم چوارچێوەیەشدا مەسیحییەت لە ڕەوشی بێگەردی سەرەتا دوور کەوتۆتەوە، لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینی سەردەست بۆتە یەك. لە چاخی زانستی کە لە ساڵانی ١٤٠٠ ی زایینی بەدواوە خێرا دەبێت، بە تەواوەتی دەست لە شێوازی هزری تیۆلۆژی بەردەدرێت و تەنیا دەکرێت بە نەریتی ئەخلاقی. لەم قۆناخەدا هزری ڕۆژئاوا بە تەواوەتی لە ئایین جیا دەبێتەوە و سەربەخۆ دەبێت، لە میانەی باوەڕهێنان بە هێزی خۆیەوە پێشدەکەوێت. ئەم پێشکەوتنە دەرچوونی لاسەنگی تاك لە ژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دێنێ. خۆپەرستی و ئاشق بوونی ڕادەبەدەری تاك بەخۆی، ڕێگا لەپێش نەخۆشییەك دەکاتەوە پێچەوانەی دۆگماتیزمە. تاکی سەرمایەدار بە لانی کەم هێندەی پادشا ـ خوداوەندەکانی سۆمەر خۆیان بە خاوەنی هێز دەبینن. لە ڕێگایەکی جیاوازتر خۆی دەگەیەنێتە ئاستی خودایی، واتە خۆی لە شوێنگەیەکی سەرووی کۆمەڵگا دەبینێ و دادەنێ. ئەمە سەرەکیترین مەترسی و نەخۆشی کولتووری ڕۆژئاوایە. تاوەکو ئێستاش چارەسەری بۆ ئەم نەخۆشیە نەدۆزراوەتەوە.

لەم قۆناخەدا توێژە چەوساوە و ستەملێکراوەکانی ڕۆژئاوا، ڕوو لە ئایدیۆلۆژیایەك دەکەن کە لایەنە زانستیەکەی لەپێشە، ئەویش سۆسیالیزمە. سۆسیالیزم ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێی زەحمەتکێشانە. بەڵام دەرکەوتنی لە ئامێزی کۆمەڵگای چینایەتی و بە تایبەتیش ڕزگارنەبوونی لەژێر کاریگەری سیاسی، بە دەزگا نەکردنی شێوازی بەڕێوەبەرێتی و کەسایەتییەکەی، بە پێچەوانەوە پێکهاتەی نزیك بە دەزگاکانی چینی سەردەست، لە ماوەیەکی کورتدا ڕێگای لەپێش نەزۆکی و گەندەڵ بوونی کردەوە. ئەوەی لە چاخەکانی سەرەتا و ناوین بەسەر چەندین پێکهاتەی هاوشێوە هاتن و لە لایەن شێوازی چینی سەردەست یان خنێکێنران یاخود توێنراونەتەوە و گۆڕاون، بۆ جارێکی دیکە لە پراکتیکی سۆسیالیزمی بونیادنراودا دووبارە بۆتەوە.

خ ـ ڕێبازی هزری ڕۆژهەڵات پێڕەوێکی جیاوازی دیار کردووە. یان خۆی کردووە بە هێزێکی خودایی، یان بەرەو هزری تاکخودایی پەرەی سەندووە کە زۆر بەهێز کراوە. قۆناخی ئایینی تاکخودایی هزری ڕۆژهەڵاتی ناوین، ڕەنگدانەوەیەکی بە سەنتەربوونی هێزی سیاسی و ئابوورییە. توندڕەوبوونی لە ڕادەبەدەری، ڕێکخستنی وەکو یاسای باوەڕی و فەرموودەی خودایی کە موتڵەق پێویستە پەیڕەو بکرێت، ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە دواکەوتنی ڕۆژهەڵاتی ناوین و تەواوی ڕۆژهەڵات. لە ڕاستیدا لە میانەی ئەم فۆرمەی پێکهاتەی کەسایەتییەك لەگەڵ خۆی دێنێ زۆر لەوەی سۆمەریەکانیش پاشکەوتووترە. خوداوەندەکانی سۆمەری هێندە وشك و خاوەن یاسا نین. باوەڕی پێنەهێنان، هیچ سزادانێك یاخود لاوازییەکی ئەخلاقی ـ مەعنەوی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. چەمکێکی ئایین ـ خوداوەندی ئەوتۆ جێگای باسە دەشێ لە هی گریکەکان نەرمتر و مرۆییانەتر بێت. وشکبوونی ڕاستەقینە لەگەڵ داگیرکردنی شارەکانی سۆمەر لە لایەن تیرە ئامۆریتە سامیەکانی بیابان دەستی پێکردووە. ڕێبازی ئەکاد ـ بابل ـ ئاشوور، لەگەڵ ئەوەی کە هێزی سیاسی و ئابووری لەسەر بنەمای توند و تیژییەکی زێدەڕۆیی بەدیدێت، ئەوا لە لایەنی چەمکی ئایین و خوداوەند، بەرەو چەمکی تاکخودایی دەبات کە لایەنی سزادانی لەپێشە. ئەو بازرگانییەی بایەخەکەی زیادبووە، پێویستی بە یاسای توند و وشك هەیە. یەکێتی تیرەش ڕۆڵێکی گرنگی لەم پێشکەوتنەدا هەیە. باوەڕی "ئەل" کە بە شێوەیەکی سەرەکی خواوەندی گشتی تیرە سامیەکانە، لە کۆتایی ئەم پێشکەوتنانە بە حەزرەتی ئیبراهیم دەستپێدەکات و بە حەزرەتی محەممەد کۆتایی پێدێت، پێشکەوتنەکەی بەردەوام دەبێت تاوەکو بە زاراوەی "ئەڵلا" دەگات، کە یەکجار بەهێز کراوە و نەوەدونۆ خاسییەتی دەژمێردرێ. لە ڕاستیدا "ئەڵلا" ڕەنگدانەوەی ١٠٠٠٠ ساڵی هزری سەنتەرگەرایی تیرەکانی نیمچە دورگەی عەرەبە. تاوەکو دەبێت بە سەمبۆڵی هێزی گشت تیرە سامیەکان بە چەندین قۆناخدا تێدەپەڕێ،

لەگەڵ حەزرەتی مەحەممەد دەگاتە لوتکە، وەکو ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای بازرگانی شێوەی مسۆگەری خۆی دەگرێت. خودایەکە لایەنی میللی لەپێشە. باڵاترین رەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژی هێزی کۆمەڵگای سامی و عەرەبە.

ئەڵڵا وەکو خوداوەند، لەگەڵ ئەوەی وەکو گوزارەی هێزی سروشت بەکار دەهێنرێ، بە شێوەیەکی سەرەکی لە بەرزترین ئاستدا نوێنەرایەتی ئایدیۆلۆژی هێزی کۆمەڵگا دەکات. تایبەتمەندێتی بە کۆیلەکردن و ئازادیخوازی ئەم زاراوەیە تێکەڵ بە یەکن. لە میانەی دابڕاندنی مرۆڤ لە پادشا ـ خوداوەندەکان دژی کۆیلایەتی چاخەکانی سەرەتا رادەپەڕێنێ. پابەندبوون بە بیری خودایەکی داڕنراو (مجرد). بە گوێرەی پەرستنی پادشای ـ خوداوەند، هەنگاوێکی لەپێشە و خزمەت بە ئازادی دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی هزری بەندایەتی (عبد) گشتی بەهێز کردووە، ئەوا شێوازی وابەستەیی هەلومەجەکانی دەرەبەگایەتی لە ئاستێکی نوێدا بە سیستەماتیکی گەیاندووە. دەبێتە ناسنامەی سەرەکی ئایدیۆلۆژی سیستەمی دەرەبەگایەتی کە لە چاخی ناوین بەهێز دەبێ؛ بە باشترین شێوە گوزارشت لە بەرژەوەندی هزری و ماددی بازرگانەکان دەکات کە لەنێو کۆمەڵگای عەرەبەکاندا بووە بە چینی سەردەست. حەزرەتی مەحەممەد لە پێشخستنی زاراوەی "ئەڵلا" کە بە مانای خودا دێت، هزری فەلسەفی گریك و هزری ئایینی یەهودی و مەسیحی وەکو میراس بە بنەما گرتووە، بەڵام نوێنەرایەتی هێزی ئەو وەرچەرخانانەش دەکات کە بە گوێرەی پێویستی هەلومەرجەکانی کۆمەڵگا ئەنجامی داوە. ئەڵڵا بە واتایەك مانیفێستۆی دەرەبەگایەتی چاخی ناوینە، یاسای سەرەکی و بەیاننامەکەیەتی.

راگەیاندنی ئیسلامییەت وەکو دوا ئایین لە لایەنی حەزرەتی مەحەممەد پێشبینییەکی گرنگە. لە راستیدا ئەوە رادەگەیەنێ کە چاخی ئایین و خواوەندەکانی کۆتایی پێهات. بە پێچەوانەی ئەوەی مەزەندە کراوە زاراوەی ئەڵڵا لای حەزرەتی مەحەممەد لە نزیکی ئایین زیاتر، زاراوەیەکە لە زانست و فەلسەفە نزیکترە. ئەڵڵا لە شادەمار زیاتر نزیکی مرۆڤە؛ ئەزەلی و ئەبەدییە؛ خالقە (خوڵقێنەرە) و نەخوڵقێنراوە؛ خاوەنی هەموو شتێکە و ئەوە نیشاندەدات کە زۆر نزیکی یاسا دیالەکتیکیەکان بۆتەوە. بە واتایەکی دی وەکو کۆی هەموو یاساکانی سروشت و کۆمەڵگا پێناسە دەکرێت. هەر لە زووەوە لە بەستەڵەکی و رەوشی خوداوەندەکانی سۆمەر و گریك رزگاری بووە کە بەردەوام ژنان ئیستسمار دەکەن و بە ناچاری مرۆڤ دەکات بە خزمەتکار. بووە بە هێزی یاسایی گشتگیری کۆمەڵگایەکی بەهێز و چەسپیوە. ئاشکرایە کە نوێنەرایەتی پێشکەوتنێکی گرنگ و بایەخداری کردووە.

گفتوگۆی "خودا هەیە، یاخود نییە" کە لە چاخەکانی ناوین تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان دەکرێت چەواشەکارییەکە. بەمجۆرە بەدەستەوەگرتنی کێشەکە هەڵەیە. شتی راست ئەوەیە گفتوگۆیەکی داهێنەرانەی بەمجۆرە پێشبخرێت، خودا رەنگدانەوەیەکی چۆنی کۆمەڵگایە؟ نوێنەرایەتی چی دەکات؟ چۆن پەرەی سەند و لە ئەنجامدا ناچار بوو بگۆڕێ و ببێت بە چی؟ ئەو وەڵامەی لە رۆژهەڵاتی دوور لە چین و هیند دراوەتەوە، هزری پادشای ـ خوداوەند و بتپەرستییە. هەرچی لە رۆژئاوایە دابەزێنراوەتە سەر زەوی و رێگای تەڤلیکردنی بۆ نێو ریزی مرۆڤەکان بە بناخە دانراوە و ئەم رێگایەش لە کۆتاییدا بە زانست و بەڕێوەبەرایەتی دیموکراسییانە گەیشتووە. هەرچی لە رۆژهەڵاتی ناوینە، لەبەر ئەوەی رەگ و ریشەکەی بەهێزە، بەردەوام وەکو شمشێری دیموکلیتس لەسەر سەری کۆمەڵگا راگیراوە؛ بە گوێرەی هەلومەرجەکانی دەرەبەگایەتی چاخەکانی ناوین بە گونجاوترین دۆخ گەیەنراوە و باڵادەستی ئایدیۆلۆژی چینی سەردەستی تۆکمە کردووە. شرۆڤەی مەزهەبی سوننی ئیسلامییەت گوزارشت لە تیۆلۆژی فەرمی دەکات و نوێنەرایەتی بازرگانی هەڵکشاو و ئەرۆستوکراتە خاوەن زەوییەکان دەکات. بەرامبەر بەمەش تەواوی ئەو تەریقەت و ئایینزایە باتینی و شیعی و عەلەوییەکانی کە پەنایان بردۆتە بەر دەمامکی ئەهلی بەیت، شرۆڤەی چەوساوە و ستەملێکراوەکان پێکدێنێت. ئەم رەوتە نیو ـ نهێنیانەی ریشەکەیان تاوەکو کۆمەڵگای نئۆلیتیك درێژ دەبێتەوە، شێوەی تێکۆشانی چینایەتی و ئەتنیکی چاخەکانی ناوین پێکدێنێ. تێکۆشانی چینایەتی و (قەومی) تایبەت بە چاخەکانی ناوین تەنیا دەشێ لەژێر ناو و دەمامکی ئەم تەریقەتانە بێت. سەرەڕای ئەوەی تێکۆشانێکی مەزنیان کردووە و بەکاریگەر بوونە، ئەوا جگە لەوەی جیاوازی چینایەتی سەردەمی خۆی پڕ نەکردبۆوە، جینۆساید و لە رێ لادانەکانیش رۆڵیان لەوەدا بینی کە هەمیشەیی و بەردەوام نەبن.

پێکهاتەی هزری رۆژهەڵاتی ناوین لە قۆناخی کامڵبوونی ئیسلامییەت واتە دوای سەدەکانی ٨ تا ١٢ هەمی زایینی کەوتۆتە ناو دواکەوتنێکی مەزنەوە. لە کاتێکدا لە رۆژئاوا بناخەکانی زانست و رێنسانس دادەڕێژرا، رۆژهەڵاتی ناوینیش لە بواری هزریدا دەکەوێتە ناو موحافەزەکارترین و دواکەوتوترین قۆناخ. لە هەموو بوارێکدا ژیانێك چەسپێنراوە کە بێ پرەنسیپە و پشت بە هێزی سەربازی دەبەستێت. پشت بە هیچ پرەنسیپێکی ئەخلاقی و فەلسەفی نابەستێت. ئیسلامییەتێکی لەگەڵ ئاغایەتی شەڕ بۆتە یەك تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەکاریگەرە.

ح ـ ئەم رەوشە گشتییە شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی دەکات بە ناچارییەك. بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکرێت، لەبەر ئەوەی تەواوی رەوتە راسترەو و چەپڕەوە هاوچەرخەکان لە کەسایەتی و ناسنامەی ئایدیۆلۆژی چاخەکانی ناوینیان تێپەڕ نەکرد و تێپەڕ کران، بۆیە لەوە رزگاریان نەبوو، ساختە و دروست کراو نەبن. شەڕی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی رۆژهەڵاتی ناوین هەروەکو خۆی ماوەتەوە. ناسنامەی هزری نەتەوەپەرستی و کۆمۆنیستی و تەنانەت هزری نوێی ئیسلامی کە پێیدا تێپەڕیون لەبەر ئەوەی پشتیان بە تێپەڕکردنی کەسایەتی چاخەکانی ناوین نەبەستووە، رێگای لەپێش هیچ نوێبوونەوەیەك نەکردۆتەوە. ئەوەی بەرلە هەموو شتێك پێویستە لە رۆژهەڵاتی ناوین ئەنجامبدرێ، دەستبەردانە لە کەسایەتی و ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پاشڤەرۆ. ئەگەر ئەمە ئەنجامنەدرێ، ئەوا بە واتای ئەوە دێت کە ژنێکی بۆرژوای خستۆتە پاڵ ژنەکەی چاخی دەرەبەگایەتی. ئەمەیە کە تا رادەیەك ئەنجامدراوە. ئاشکرایە دووسەد ساڵە ئەنجامەکانی شکست هێنانە.

ئەوەی لە شیکردنەوەی خۆمان سەبارەت بە شارستانییەت هەوڵماندا ئەنجامی بدەین، هەرچی نەبێ بە لانی کەم رۆڵی خۆمان ببینین لەوەی کێشەکە بە شێوەیەکی راست روون بکرێتەوە و دانرێتە مەیدان. ئەویش بە واتای هەوڵێك دێت لە ئاستی پێناسەکردن دایە. تاوەکو رۆژهەڵاتی ناوین بە پێی بەرفراوانی قۆناخی مێژوویی خۆی نەناسرێ، ئەوا هەر کێشەیەکی دەستی بۆ ببرێت، لە نانەوەی کێشەی مەزنتر بەدواوە هیچ ئەنجامێکی دیکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. بەهۆی پێکهاتەکەیەوە رەوش بەمجۆرەیە. شەڕی ئێراق ـ ئێران، عەرەب ـ ئیسرائیل، ناکۆکییەکانی نێوان خودی عەرەبەکان، تراژیدیای ئەرمەنیەکان و شەڕەکانی دژ بە کوردەکان کە تراژیدیای تێپەڕ کردووە و دەخوازێ کوردان مەحکومی بێ ئابرووییی بکات، راستینەیەك دەسەلمێنن: کێشەکانی ناوچەکە وەکو زنجیرە بەیەکەوە گرێدراون. بەیەکەوە لە میانەی شیکردنەوەیەکی دروست سەبارەت بە بنەما مێژووییەکانی دەشێ سەرەتایەکی نوێ دەست پێبکرێ. هەڵوێست و نزیکبوونە کلاسیکیە چەپڕەو و ئیسلامی نوێ و نەتەوەپەرستی، کێشەکەیان گەیاندۆتە رەوشێك رزگاربوون لێی ئاستەمە. تەنیا دەشێ بەلاوەنانی ئەم پلاتفۆرمانە رێگا لەپێش چارەسەری نوێ بکاتەوە.

ئەو ئەنجامانەی کە شیکردنەوەکەمان پێی گەیشتووە: بژاری گەلان کە رەوتێکی زیاتر نزیکی ئازادیخوازی و یەکسانیخوازی شارستانییەتی دیموکراسیانەیە و لە سەردەمی کۆمەڵگای نئۆلیتیکەوە بە هەڵواسراوی ماوەتەوە، لە خڵتە و پاشخانەکانی مێژووی چینایەتی پاك دەکاتەوە و بە واتا هاوچەرخەکەی سەرلەنوێ ئاوای دەکاتەوە، لەسەر بنەمای زانست و تەکنۆلۆژیا وەکو جوڵانەوەیەکی دیموکراسیانە بەرجەستە دەکرێت. جارێکی دیکە مێژوو بەرەو شارستانییەتێکی نوێ دەچێت، بەڵام شارستانییەتێك کە یەکسانی و ئازادی بە بنەما دەگرێت، لەم خاکەی خوڵقێنەری مێژوو و ئەو گەلە دەستپێدەکات کە لە سەری دەژی، وەکو ئومێدێکی مەزن جێگای خۆی لە نێو رۆژهەڵاتدا گرتووە. کارکردن لەپێناو ئەنجامدانی رێنسانسێکی بەرفراوان و سەرکەوتن تێیدا شایانی هەر قوربانییەکی مرۆڤە.

٢ ـ پرۆگرام ئەو ئامانجانەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی دەست نیشاندەکات کە گوزارە لە ئایندە دەکات. کاتێك لەژێر سایەی رۆشنگەری تیۆری ئاستی تەکنۆلۆژی پشت گوێ نەخرێت، ئەوا کاریگەری لەسەر پێشکەوتنێکی راست و پتەوی جوڵانەوەی وەرچەرخانی کۆمەڵگا دەبێت. بەڵێنی چۆنیەتی پێکهاتەکانی ئابووری و سیاسی کۆمەڵگا دەدات کە پێشبینیان دەکات. بەرامبەر بە رای گشتی ناوخۆ و دەرەوە خۆی پابەند دەکات.

لەسەر بناخەی ڕەخنەگرتن لە رابردووی نزیك پرۆگرامی پێهەڵگرتنێكی نوێ دادەڕێژرێ. بە تایبەتیش لە میانەی ڕەخنەكردنی سۆسیالیزمی بونیادنراو كە لافی دەستپێكردنی شارستانییەتی كۆمەڵگای بێ چینی لێدەدا و پرۆگرامی لیبرالی دواترین شێوەبەندی سەرمایەداری، ئەو ئامانجانە دەخاتە روو كە لەوانەی دیكەی جیادەكاتەوە. بە شێوەیەكی ئاشكرا پابەندبوونی خۆی بە دیموكراسی هاوچەرخ و ئەو ئاراستەیە ئاشكرا دەكات كە بەرەو پێشەوەی دەبات. پێوەرەكانی دیموكراسییەتی هاوچەرخ خۆی لەخۆیدا پرۆگرامێكە. قەڵەمبازە نوێكە ئەم پێوانانە وەكو نزمترین پرۆگرامی خۆی پەسند دەكات. بۆ نموونە پەیڕەوكردنی پێوەرە دیموكراسییەكان لەسەر دەزگا و ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگا و دەوڵەت و سیاسەت بە ئەركێكی سەرەكی خۆی دەبینێ.

بابەتەكانی كۆنترۆڵكردنی گەیشتنی تەكنۆلۆژیا بە ئاستی دڕندایەتی و پاراستنی ژینگە و ئازادی ژنان، وەكو گرنگترین ماددەكانی پرۆگرامی نوێ دەست نیشان دەكات، كە لە چوارچێوەی شارستانییەتی سەرمایەداری شینەكراوەتەوە و چارەسەرییان بۆ نەدۆزراوەتەوە.

ئازادی ژن لە شێوەگرتنی شارستانییەتی نوێدا، ڕۆڵی هاوسەنگی و یەكسانیخوازی دەبینێ. ئەو ژنەی لەدوای هەڵوەشانەوەی كۆمەڵگای نئۆلیتیك بەدواوە هەروەكو بڵێی لەناو كۆمەڵگا سڕاوەتەوە، دووبارە لەنێو هەلومەرج و زەمینەیەكی ئازادی و یەكسانی جێگای خۆی دەگرێت و ڕێزی لێدەگیرێت. لەم پێناوەشدا هەموو تێكۆشانێكی تیۆری، بەرنامە، ڕێكخستنی و كرداری ئەنجامدەدرێت. ڕاستینەی ژن زۆر لە زاراوەی چینی پرۆلیتار و نەتەوەی ژێردەست بەرجەستەترە، كە سەردەمێك لافی بۆ لێدەدرا. دەتوانرێ بگوترێ بنەڕەتیترین وەرچەرخانی كۆمەڵگا، لە میانەی ئەو وەرچەرخانەوە یەكلادەبێتەوە كە ژن ئەنجامیدەدات. ژن چەندە لەنێو ئازادی و یەكسانیدابێت، ئەوا تەواوی توێژەكانی كۆمەڵگاش بەو ئەندازەیە ئازادن و لەناو یەكسانیدا دەژین. دیموكراتیزەبوونی ژنان ڕۆڵێكی دیاریكراوی دەبێت لە جێگیركردنی عیلمانییەت و دیموكراسییەت بە شێوەیەكی هەمیشەیی. تەنانەت ئەم پێناسە بەرنامەڕێژییە كورتەی سەبارەت بە دیاردەی ژن ئەنجامدرا، ئەوە نیشاندەدات ژنان پێشەنگایەتی جوڵانەوەی كۆمەڵایەتی نوێ دەكەن و ڕەنگی ژن بەخۆیەوە دەگرێت.

دانانی كێشەی ژینگە وەكو ئامانجێكی پرۆگرام، بابەتێكی دیكەی بایەخداری قەڵەمبازی نوێیە. ئاشكرا بووە ئەو ناكۆكیانەی لەگەڵ سروشت لە ئارادایە، بە لایەنی كەم بە ئەندازەی ناكۆكییە ناوخۆكانی كۆمەڵگا سەختە و قورسایییەكی خۆی هەیە. پاراستنی ژینگە بە شێوەیەكی سەرەكی واتای پاراستنی خاك و سەوزایی و ئاو و ئاژەڵ و كەش و هەوایە. دەبێ ئەم بابەتە سەرەكیانە وەكو تەگبیری پتەوی پاراستن و ماددەی دەست لێبەرنەدراو، جێگای خۆیان لەناو پرۆگرامدا بگرن. ناچارییە پاراستنی ئاژەڵ و ڕێگرتن لە سەربڕینی هۆڤیانەی ئاژەڵان جێگای خۆی لە پرۆگرامدا بگرێت.

لە سایەی هەلومەرجەكانی كۆمەڵگای سەرمایەداری لەلایەك تەكنۆلۆژیا لەكار دەكەوێ، لەلایەكی دیكەوە دەكرێت بە دڕندەیەك كۆنترۆڵكردنی ئاستەمە. مسۆگەر پێویستە بەرامبەر بە پێشكەوتنی مەترسیدار و هەڕەشە ئامێزانەی تەكنۆلۆژیا هەڵوێستێكی بە پرەنسیپانە جێگای خۆی لە پرۆگرامدا بگرێت كە ئەو سیاسەتەی سەبارەت بە تەكنۆلۆژیا دیار دەكرێت كە بە گوێرەی پێویستیە سەرەكییەكانی مرۆڤایەتی بێت. ئاستی تەكنۆلۆژی و بەكارهێنانی بە شێوەیەكی گونجاو دەركەوتنی شارستانییەتی نوێ یەكلا دەكاتەوە. لە كاتێكدا سەبارەت بە هەندێ بوار لە سەرووی هەمووشیانەوە قەدەخەنامە و كۆنترۆڵێكی چڕ دەرهەق بە وزەی ناوكی، كاریگەری میوە نائاساییەكان، خۆراكە هۆرمۆنییەكان و تەكنۆلۆژیای جینۆلۆجیا پێشدەخرێت، ئەوا لە لایەكی دیكەوە چارەسەری و ڕێگرتن لە تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان و نەخۆشییەكان، پێشخستنی كار و خەبات لە بواری پەروەردە و گۆڕەپانە هاوشێوەكان ناچارییە كە بكرێن بە ماددەكانی پرۆگرام. بوارەكانی تەكنۆلۆژیا و ئابووری بە ئامانجی دیموكراتیزەكردنی دەوڵەت و سیاسەت و كۆمەڵگا لەناو یەكتردا چنراون.

دەبێ بەرامبەر بە كێشەكانی منداڵان و مرۆڤە بەساڵاچووەكان هەڵوێستێكی بەرپرسیار و وشیارانە لە پرۆگرامدا گوزارشتی لێبكرێت. ئەم بابەتانە هێندە بایەخدار بوون ناكرێ بۆ خێزان بەجێ بهێڵدرێ.

بە مسۆگەری دەبێ پێناسەی پێوانە ئەخلاقی ئاكارە نوێكان یەكلابكرێتەوە و بە شێوەیەكی ڕێكخراوەیی جێگای خۆی لە پرۆگرام بگرێت.یاساكانی ئەخلاقی نوێ و بە دەزگابوونی، دەبێتە تایبەتی ترین و پێویست ترین لایەنی ئەم دەرچوونە مێژووییە. لە میانەی دەركردن بەوەی هیچ یاسا و تەگبیرێكی سیاسی بەهێزی ئەخلاق ناگات، دەبێ ڕۆڵەكەی پێناسە بكرێت و بە دەزگابوون بگەیەنرێت.

هەڵوەشانەوەی ئەخلاقی لەناو كۆمەڵگایەكدا بەڵگەی قووڵبوونەوەی ئەو قەیرانەیە كە لە ئارادایە. بەڵام كاتێك دەڵێین ئەخلاق مەبەستمان داب و نەریتی باو و ڕێسا ئایینیەكان نییە. ئەخلاق؛ گوزارشت لەو هەڵسوكەوت و نەریتانەی كۆمەڵگا دەكات كە دان بە باشی و جوانی و ڕاستیەكەیدا دەنرێت، بە پەیوەندییەكی ویژدانی و خۆبەختی پەیڕەو دەكرێت، لە میانەی یاساكان ناكرێت بە ناچاری، بەڵام لە بەهێزترین یاساش بە تواناترە. هەروەكو چۆن ئەخلاقی پاشڤەڕۆ و موحافەزەكار هەیە، ئەخلاقی پێشكەوتووخواز و ئازادیخوازیش هەیە. بەرنامەڕێژییەكی ئەم جیاوازییە ڕەچاو بكات، ڕۆڵێكی وەرچەرخێنەر و بە ئەزموون دەبینێ. دەشێ ئەمە بە دەزگای مەعنەوی كۆمەڵگا ناوببرێت. ئەو ئەخلاقەی كە قەیران شپرزەی كردووە، تەنیا لە سایەی هەڵوەستەیەكی ئەخلاقی نوێ نوێدەكرێتەوە، ئەمەش لە تێپەڕكردنی تەنگژە و گەیشتنی كۆمەڵگای نوێ بە بەهای ڕاستەقینەی دامەزراندن، ڕۆڵێكی هەمیشەیی و جێگیر دەبینێ. لە ڕاستیدا بۆ ئەو سیستەمانەی كۆمەڵگا كە تەواوی پێویستییەكانیان پێكهێناوە، ئەخلاق ڕۆڵی پردێك دەبینێ لەوەی تایبەتمەندێتی كارەكتەری ڕاست و باشی كەسایەتی و هونەر ڕۆڵی خۆی ببینێ كە وەكو پۆشاكێكی قەشەنگ چاكەی ناواخنی بە جوانییەوە تەواو دەكات.

هەربۆیە لەنێو ژیانی كۆمەڵگادا، بە لایەنی كەم هێندەی ئەخلاق، پایەی هونەریش پێویستی بە سەرلەنوێ پێناسەكردن هەیە. كۆمەڵگایەكی بێ هونەر وەكو لاشەیەكی ڕووت و سەرەتایی وایە؛ لەمەش بەولاوە، گوزارە لە دابڕانی ڕۆح و لاشە دەكات لە پێكهاتەیەكی هزری ڕاست. كاتێك بە دەزگابوونی سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابووری لە میانەی پرۆگرامێكی هزری ڕاست دیاری دەكرێت، كاتێك ئەو ئامانجانەی دیاریكراوە لەگەڵ هونەر و ئامانجەكانی یەكانگیر نەبێتەوە، ئەوا بە سەقەتی و ڕووتی و ڤێزەوەنی دەمێنێتەوە. ناشێ بیر لە كۆمەڵگایەكی بێ هونەر بكرێتەوە. بە پێچەوانەی ئەو مەزەندانەی دەكرێ، هونەر لە چینە هەڵبژاردەكان زیاتر، دەبێ وەكو ئەو زمانەی گەل ببینرێ كە لەو ڕێگایەوە وەڵامی میتۆلۆژیا و ئایین و فەلسەفەی دەدایەوە. گوزارشت لەو هزر و ئەخلاقە دەكات كە لەلایەنی ئیرادە و هزرە باڵاكان ئەرێ كراوە و لە چوارچێوەی قاڵبێك داڕێژراوە كە گەل لێی تێ بگات و لەگەڵیدا بگونجێ. بەرنامەیەكی گشتگیر لە میانەی ئاواكردنی چوارچێوە هونەرییەكەی خۆی تەواو دەكات.

٣ ـ ناسنامەی ئایدیۆلۆژی لە میانەی هەڵوێستێكی ستراتیژی و تەكتیكی لێهاتوانە تەواو دەبێت، كە گوزارشت لەوە دەكات دەخوازێ لە میانەی كام ڕێباز و ڕێچكەوە بە پێكهاتەی بەرنامە و تیۆری بگات.

تیۆری ڕەسەن گوزارشت لە دیدگایەكی یەكلابۆوە دەكات، پرۆگرام لە تیۆرییەوە دەپاڵێورێ، ئەو ئامانجە كورت و یەكلابووانە دەخاتە ڕوو، كە بە پارزنگی ڕەخنەكردندا دەرباز بووە. بەڵام بۆ چۆنیەتی گەیشتن بەو ئامانجانە و دیاریكردنی ئامرازەكانی، ستراتیژی وەكو ڕێبازێكی ڕاست دیاریدەكرێ، تەكتیكیش وەكو هەنگاوی ڕاست و پتەوی بەرێوەچوون دیاری دەكات. ستراتیژی هونەری بژاردنی ئەو ڕێگایەیە لەناو چەندین ڕێگای كە بۆ گەیشتن بە ئامانج كەوتۆتە ڕوو. ڕێگای هەڵدێر هەیە؛ ڕێگا هەیە پڕ بە ئێشە و خوێنێكی زۆری تێدا دەڕژێنرێ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو ڕێگایانە كەم نین كە بەرلەوەی بگەیتە ئامانج، تەواو دەبێت. لە ڕەوشێكی بەمجۆرەدا ستراتیژی ڕاست گوزارشت لەو ڕێچكەیە دەكات تەواوی ئەم ڕێگایانە دەناسێ كە مەترسی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرن و پێویست بكات ئەو ئامانجانە سەرلەنوێ بەرچاو دەرباز دەكات كە بەدیهێنانی واقیعی نییە، گەل لەپێناو بەدیهێنانی مافی مێژوویی خۆی لە ڕێگای كاروانێكی سەركەوتووانە ڕادەكاتە سەرپێیان. ئەو كۆمەڵگا و ڕێكخراوانەی لە بەڕێوەبەرایەتی و ستراتیژییەتێكی بەمجۆرە بێبەشن، هەروەكو چۆن لە مێژووشدا گەلێك نموونەی بینراوە،

له ئاکامی ڕێگا هەڵدێرەکان و ئەو ڕێگایانەی خوێناوین له نیوەی ڕێگا بەجێ دەمێنن و دووچاری ڕەوشی تراژیدی و شکست دەبنەوە. ئەو هونەرەی ڕێگا لەپێش ئەمە بگرێت ستراتیژییەکە بە هونەری بەڕێوەبەرێتی دادەنرێت.

ستراتیژی؛ هێزە سەرەکی و یەدەکەکان و هاوڕێیە کاتییەکانی ڕێگا دەستنیشان دەکات، بەڕێوەبەرایەتی کاروانێك و بازدانێکی تەنانەت ماراتۆنێکی سەرکەوتووانەیە کە بە شێوەیەکی واقعیانە بەرەو ئامانج ئەنجام دەدرێت و کەمترین زیان و ئێش ڕەچاو دەکات. هەر کۆمەڵگا و ڕێکخراوێکی ئەم هێزەی ئاوا نەکردووە یاخود نازانێ بەکاری بێنێ، وزەی ژیانی خۆی بە فیڕۆ دەدات و بە دواکەوتوویی دەمێنێتەوە و له ڕزین و پەرتەوازەبوون ڕزگاری نابێت. پێکهێنانی ستراتیژی بۆ کۆمەڵگا یاخود ڕێکخراوێك، بە واتای پێکهاتنی هێزی مێشك دێت. هەروەکو دەزانرێ ئەو قەوارانەی بێ مێشك ماونەتەوە یاخود بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی پێکهاتوون، له سەرەتاییترین و دواکەوتوترین ئاستدا ماونەتەوە. هەربۆیە واتادار بوونی بۆچوونێکی تیۆری و بەرنامەیەك له میانەی هێزی ستراتیژییەتەوە فەراهام دەکرێت. ئەمەش له تەواوی قۆناخە گرنگەکاندا له میانەی گەیشتن بە هێزی بڕیاردان و بەڕێوەبردنی ستراتیژی و مێژوویی بەدی دێت. کاتێك پێویست بکات هۆکارەکانی بەرێوە نەچوون و سەرنەکەوتنی ستراتیژی دەستنیشان دەکات، دەبێ بزانرێ کە یەکێکی نوێتر پێشبخرێت و بەڕێوە ببرێت. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە چوارچێوەی ستراتیژییەت گوزارشت له پێکهاتنێکی تۆکمەی دەزگای فەرمانداریێتی و ڕێبەرێتی دەکات و له میانەی دەستەبەرکردنی هێزی داهێنان بەرێوەی دەبات. ئەو کۆمەڵگا یاخود ڕێکخراوە جۆرانەی لەم هێزە بێبەشن و ئاراستەی کاروانەکەی خۆی نازانێ، دیار نییە بەرەو پێشەوەچووە یان بۆ دوواوە، له جێگای خۆیدا دەژمێرێ و بەمجۆرە دووچاری لادان و گەندەڵ بوون دێن و دەبن بە دەستەیەك له ڕزین ڕزگاریان نابێت. بە پێچەوانەوە ئەو کۆمەڵگا و ڕێکخراوە ناتەواوانەی ئەم هێزە دەستەبەر دەکەن، خۆیان کۆدەکەنەوە و تۆکمە دەبن و بە ئامانج دەگەن و سەرلەنوێ مەزن و بەهێز دەبن. سەبارەت بە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی فاکتەری ستراتیژی تا ئەم ڕادەیە ژیانی و ناچارییەکە.

دواترین فاکتەری ناسنامەی ئایدیۆلۆژی له میانەی زاراوەی تەکتیك ئاماژەی پێدەکرێت. تەکتیك گوزارشت لەو وزە و ئۆرگانە پێویستانە دەکات کە دەبێ بۆ گەیشتن بە ئامانج هەبن. جگە له مێشك بە واتای تەواوی ئۆرگانەکانی لاشە دێت. هەروەکو چۆن له ژیانی ڕۆژانە پێویستی بە کارێکی یەکپارچەیی ئەم ئۆرگانانە هەیە کە له میانەی دابەشکردنی کارەوە بەڕێوە دەچێت، ئەوا کۆمەڵگا و ڕێکخراوەکانیش پێویستیان بە ئۆرگانی هاوشێوەی ئەمە هەیە کە لەنێو گشتگیرییەکدا خەبات بکەن.

دەوڵەتێك له ڕێگای ڕێکخستنەکانی بوارەکانی یاسادانان و بەڕێوەبردن و داد و ڕێکخستنە ئابووری و سەربازییەکانی خۆی، هەوڵدەدات بەو سیاسەتە بنەڕەتییانە بگات کە دەستنیشانی کردووە. کۆمەڵگاکانیش ئامرازی هاوشێوەی ئەوەیان هەیە. پێویستی و ئامانج ئەو ئامرازانە دیاری دەکات کە دەبێ هەڵبگیرێت. تەکتیك ئەوە دەستنیشان دەکات بۆ ڕزگارکردنی ئەو کۆمەڵگایانەی لەناو قەیراندان پێویستە ڕێکخراوە پێشەنگ و پابەندەکانی خاوەن شێوازێکی چۆنی کار و خەبات بن. کێشەکانی له جۆری، له ڕێگای توندوتیژی بێت یان بێ توندوتیژی، هێرش یان پاراستن، بەهێزێکی مەزن یان کەم، بە خێرایی یان له سەرخۆ، له چوارچێوەی کێشەکانی بەڕێوەبەرێتی تەکتیکین. بەڕێوەبەرێتییەکی تەکتیکی داخوازی سەرکەوتنی هەبێت، هەڵسەنگاندنێکی واقعیانەی ئەم کێشانە دەکات و هەوڵدەدات سەرکەوتوو بێت. له ڕەوشێکی پێچەوانەدا دەکەوێتە نێو ڕەوشێکەوە مێشکی گەورە بێت، بەڵام له هەموو یارمەتی و ئامرازەکانی پراکتیزەکردن بێبەش بن. هیچ کۆمەڵگایەك ناتوانێ بە بێ تەکتیك بژی، ئینجا چی لەنێو قەیران یاخود بەختەوەریدا بێت. سەبارەت بە ڕێکخراوەکانیش هەمان شت لەجێگای خۆیدایە. کۆمەڵگایەك یاخود ڕێکخراوێك هێزی تەکتیکی نەبێت یاخود توانستی تەکتیکی خۆی لەدەست دابێت، ئەوا تیۆری و پڕۆگرام و ستراتیژییەکەی چەندە بەهێزیش بێت، مەحکومی نشوستی خواردنە. هەربۆیە بە شێوەیەکی هاوتای ئەو ڕۆڵەی ئۆرگانەکانی لەش دەیبینێ، ئەوا پێویستە هەموو جۆرە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵگا لقە بە کاریگەر و شێوازی چالاکی خۆیان لەپێناو ژیانی ڕۆژانە دیاری بکەن. ڕاستتر بڵێین ناچارە ئۆرگانەکانی خۆی ئاوا بکات، بە گوزارەیەکی دی ناچارە خۆی ڕێك بخات و ڕێکخستنەکانی بخاتە گەڕ.

ڕێکخستن و چالاکی بە گوێرەی پێداویستییەکانی ئامانج، له بواری ڕۆحییەوە تا دەگاتە بواری سەربازی دەوڵەمەندی و هەمەڕەنگی لەخۆوە دەگرێت. هەر شێوەیەکی گونجاو ببینرێ پراکتیزە دەکرێ. له بواری چالاکیشەوە شێوەیەکی دەوڵەمەند و هەمەڕەنگ لەخۆوە دەگرێت، بە گوێرەی ئامانج له ئاشتیخوازترینیان تا دەگاتە دژوارترین توندوتیژی، له خەباتی ئابوورییەوە تا دەگاتە خەباتی سیاسی هەموویان دەگرێتەوە. کاتێك بەرەو ئامانج هەنگاو دەهاوێژرێ، ئەو کۆمەڵگا و ڕێکخراوانەی ئامراز و شێوەی تێکۆشانی ڕاستیان دیار نەکردووە له نشوستی و له ڕێ لادان ڕزگاریان نابێت. ئەوانەی له کاتی پێویست ناتوانن ڕێکخستن و شێوەی چالاکی نوێ له جێگای کۆنەکە ئاوا بکەن، له کاتی خۆیدا نوێکە پێشناخەن، بە خێرایی پێویست بەڕێوەناچن، ناتوانرێ بە ڕێبەرایەتییەکی تەکتیکی دروست دابنرێت. ئەوکۆمەڵگا و ڕێکخراوە هەمە جۆرانەی ڕێبەرایەتی تەکتیکی پێشناخەن کە بە واتای ئامراز و هێزی بەڕێوەبردنی چالاکی و ژیانی ڕۆژانە دێت، هەروەکو چۆن مەحکومی ژێرکەوتنن، ئەوا ئەوانەی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەم ڕۆڵە جێبەجێ دەکەن ناشێ بیر له سەرنەکەوتنیان بکرێتەوە. هەروەکو چۆن تەواوی تیۆری و ئۆرگانە ستراتیژی و بەرنامەی ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژیانە له پەلوپۆ دەکەوێت کە بە گوێرەی پێویست ئامراز و شێوەکانی چالاکیان پێشنەخستووە، بە پێچەوانەوە ئەو هێزانەی خاوەنی ئۆرگانی بەمجۆرەن و تەواوی ئامرازەکانی ڕێکخستن شێوەی چالاکییەکان له کاتی خۆیدا پێشدەخات و بە خێراییەکی پێویست بەکاری دێنێت، مسۆگەر له کاروان و گەیشتن بە ئامانج سەرکەوتوو دەبن. جێبەجێکردنی ڕۆڵی تەکتیك بە واتای ئەوە دێت، ئەو هێزەی جێگای باسە وەکو دیاردەیەك هەبوونی خۆی کردووە بە ڕاستینەیەك.

وەکو ئەنجام، له دایکبوونی ئایدیۆلۆژی بایەخی خۆی پاراستووە. شارستانییەتی کە لەسەر بنەمای کۆمەڵگای چینایەتیە، له کەسایەتی سەرمایەداری قەیرانی گشتی قووڵ دەکاتەوە و درێژەی پێدەدات. سەرباری ئەوەی چەندین تاقیکردنەوە کرا، تاوەکو ئێستاکەش له دایکبوونێکی ئایدیۆلۆژی دروست ئەنجامنەدراوە و دوور دیارە. هەبوونی توانستێکی زۆر له بواری ئۆبژەکتیف و سۆبژەکتیف (بابەتی و خۆیی) شانسی له دایك بوون زیاد دەکات. پێویستە ئەو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژیانەی له میتۆلۆژیاکانەوە تاوەکو سۆسیالیزمی زانستی پێشخراوە لەنێو گشتگیریەکی دیالەکتیکیدا هەڵسەنگێنرێت. دەرك کردن بە واتای پیرۆزی تاکە زاراوەیەك و ڕێز گرتن له توانستی مرۆڤایەتی، دەبێ یەکەمین هەنگاوبێ بۆئەو کەسانەی پەیوەندییان بە قۆناخی له دایکبوون هەیە. هەڵوێستی تاوانباری کردن و جنێودان سەرچاوەی خۆی له نەزانییەوە دەگرێت. تاوەکو ئەم فکرە بە قووڵاییەوە و وەکو خۆی دەرکی پێنەکرێت، ئەوا له میانەی زاراوەی میرێتی پەسندکردنی یاخود تاوانبارکردنی هەڵوێستێکی ڕاست نییە. ئەم هەڵوێستە بە واتای ئەوە نایێت بەرامبەر بە هەڵە و کەم و کوڕی بێ دەنگ بیت. بە پێچەوانەوە پێویست بوو له میانەی "بەهێزترین هەڵوێست تەنیا له میانەی ڕاسترین هەڵوێستەوە بە دیدێت" وەڵام بدرێتەوە. سەرەکیترین کارەکتەری ئەو چاخەمان ئەوەیە، تایبەتمەندێتی قەیرانی گشتی و هەڵوەشانەوەی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی و تایبەتمەندێتییەکانی قۆناخی پەڕینەوە بەرەو ناسنامەی شارستانییەتی کۆمەڵگای نوێ لەخۆوە دەگرێت. لەگەڵ ئەوەی تایبەتمەندێتیە جیاوازەکانی هەردوو جیهان بەرامبەر بە یەکدی دەکەونە نێو شەڕێکەوە، بەڵام ئەو هێزەی نییە کە بە خێرایی و بە شێوەیەکی یەکجاری یەکتری تێپەڕ بکەن، یان لەناو ببەن. تەنانەت ئەم دوالیزمەی ڕەش یان سپی لەگەڵ یاسا سەرەکییەکانی سروشتیش ناکۆکە. سروشت و ڕاستینەی کۆمەڵگا کە شێوەیەکی سروشتە، بەردەوام له نێوان کۆتایی و بێ کۆتایی بە گۆڕانکاریدا دەرباز دەبێت. هەڵسەنگاندنی شێوەکانی کۆمەڵگا و بەردەوامی شارستانییەت بە گوێرەی دوالیزمێکی تەسکی ڕەش و سپی، ڕێگا لەپێش مەترسیدارترین لادانی ئایدیۆلۆژی دەکاتەوە کە هەڵەی مەزن لەخۆوە دەگرێت. له ڕاستیدا سپی و ڕەش دوو جەمسەری جیهانی ڕەنگەکانن کە بە خێرایی دەگۆڕێن. مەزنترین لایەنی ڕاستی ئەوەیە، تەواوی ڕەنگە هەمە جۆرەکان له نێوان ئەم دوو جەمسەرە ڕیزبەند دەبن. بینینی وەرچەرخانی کۆمەڵگا و شارستانییەت لەنێو چوارچێوەی ئەم هەمە ڕەنگییە، گرنگییەکی ژیانی بۆ له دایك بوونێکی ئایدیۆلۆژی دروست هەیە. کاتێك دەگوترێ یان دەبێ سپی یاخود ڕەش بێ، واتای ئەوەیە کە "یان دەبم بە فاشیست یان سۆسیالیزمی بونیادنراو". کەواتە چی له ڕەنگەکانی دیکە بکەین کە جوانترە و دەوڵەمەندی لەخۆوە دەگرێت؟

لەژێر ناوی سۆسیالیزمی زانستییەوە کەوتنە ناو سنوورداری و تەسك بوونێکی بەم شێوەیە بناخەی تەواوی ئەو هەڵە و کەم کوڕیانەیە لە پراکتیزەکردندا دەرکەوتوون. ئەنجام رووخانە.

بەڵام دیسان پێویستە لە میانەی بەرچاوگرتنی هەبوونی جەمسەرەکان دەستنیشان کردنی شێوەی گونجاو، وەکو ئەرکێکی سەرەکی ئەو هێزانە ببینرێ کە لایەنگری خوڵقاندنی نوێن.

راستینەی مێژووی سەدەی بیستەم بۆتە شایەدی ئەوەی هەردوو جەمسەر بە هەموو گوڕوتینی کە هەیانە، خۆیان بەسەر مرۆڤایەتی سەپاندووە. مرۆڤایەتی لەژێر ئاگری بێ هاوتای تەکنۆلۆژیا، لەژێر سایەی ئاڵای رەش و سپی وەکو سیستەمی فەرماندان ناچاری ریزگرتن کراوە. ئێش و ئازاری تۆقینەر هاتۆتە ئاراوە و خوێن رژێنراوە. بەڵام تەوژمی دیالەکتیکی ژیان ئەم فشارانەی پووچەڵ کردۆتەوە و سەلماندوویەتی کە ژیان تەنیا رەنگی بەڵەك (رەش و سپی) نییە و هەمەڕەنگی لەخۆوە گرتووە. ئیتر چی ئەو سیستەمە رەشەی سیستەمی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی بێت کە خودای رەها و حاکیم و قەهار فەرمانی پێداوە، یان سیستەمی تاك رەنگی "کۆمۆنیزمی سپی" بێت کە وەکو دژی ئەو دیارە بەڵام لە گەوهەردا پێی دەچێ، لەگەڵ ئەوەی لە بواری تیۆریدا بیری لێکردۆتەوە و ناوە ناوەش لە پراکتیزەکردن نزیك بوونەتەوە، ئەمانە هەروەکو خۆیان مەزەندە دەکەن هیچ کاتێك مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی بەردەوام تێیدا ناژیت و سیستەمێکی یۆتۆپی و خەیاڵین.

مرۆڤایەتیش هەروەکو سروشت هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندێتی رەنگ لەسەر کۆمەڵگا پەیڕەو دەکات و درێژە بە ژیانی خۆی دەدات. لەم واتایەشدا میتۆلۆژیای سۆمەر بە گوێرەی ئایینە تاکخوداییەکان نەرمتر و مرۆییانەترە. هەڵبەتە لە هەندێ لایەنەوە سیستەمی خواوەندەکان واتە سیستەمی رەشی پادشاکانە. بەڵام کاتێك مێژووی تەواوی میتۆلۆژیا و ئایینەکان لێکۆڵینەوەی سەبارەت بکرێت، لەوێدا سیستەمێکی رەشی رەها لە ئارادا نییە. سەرەڕای هەموو لایەنە دۆگماتیکەکانیان لە پەسندکردنی هەمان هەمەڕەنگی رزگاریان نابێت.

پشتگیری و ئەرێ کردنی زانستیانەی ئەم راستینەیە بە شێوەیەکی بەربڵاو و لە سەدەی بیستەمدا نیشاندراوە. وەرچەرخانی مادده ـ وزە، تیۆرییەکانی پەرەسەندن، وەرچەرخاندنەکانی وزە، برە بیردۆزی فیزیا، رێژەیی شوێن و کات، بە زێدەییەوە سەلماندوویانە کە رەش و سپی دوو رەنگ یاخود سیستەمی نەگۆڕ نین.

کاتێك لە میانەی ئەم چوارچێوە فەلسەفی و زانستیە تەماشای راستینەی کۆمەڵگا بکرێت، باشتر دەرك بەوە دەکرێت کە دژەکان پێویستیان بەوە هەیە بۆ ماوەیەکی درێژ و گرێدراو بە یەکتری بژین. سەرکەوتنی دیموکراسی هاوچەرخ لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، لە راستیدا بۆ ئەو کارەکتەرەی دەگەڕێتەوە کە لەگەڵ واقیعدا کۆکە؛ فەلسەفەیەکی سروشت و شێوەبەندی هەمەڕەنگی کۆمەڵگا بە بناخە دەگرێت و پێشبینی کردنی ئەوەی کە لە بواری پراکتیکیشدا وەرچەرخانی پلە بە پلە بە بنەما دادەنرێت، سەرچاوەیەکی پێك دێنن، هێزی خۆی لە زانست و فەلسەفە وەردەگرێت. شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ، لە میانەی کاریگەری کردنە سەر گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگا و دەرککردنی بە قوڵایی یاساکانی پەرەسەندن، ئیتر دەبێت بە موڵکی تەواوی مرۆڤایەتی. ئەو رەوشە رێککەوت نییە و یەکێکە لە ئەنجامە گرنگەکانی هێزی زانست. چونکە زانست دیموکراتە. بەڵام هەروەکو چۆن دیسان پێکهاتەکانی پشت بە دۆگماکانی کۆمەڵگای کۆن دەبەستێ هەبوونی خۆی دەپارێزێ، ئەوا هەندێ پێکهاتەی یۆتۆپیاگەرایی کۆمەڵگای نوێ دێنە ئاراوە و پێکهاتەکانی خۆیان ئاوا دەکەن.

ئەگەر لەسەر ئەم بنەمایە دیموکراسی هاوچەرخ تەنیا وەکو سازشکاری هەردوو جەمسەر تاوتوێ بکرێت، بە هەڵەداچوون و خەڵەتاندنێکی مەزنە. گرنگترین بابەتی پێویستە بزانرێ، سەرباری ئەوەی نزیکبوونەوەی هەردوو جەمسەر لە ئارادایە، تاوەکو پابەندی پێوەرە دیموکراسییەکان بێت ئەوانیش مافی ژیانیان هەیە. بەڵام ئەوە سەرەکی و مسۆگەرە کە هەمەڕەنگی کۆمەڵگا دەوڵەمەندێتی هەمەڕەنگی بەرفراوانترین نەوەیە. دیموکراسی هاوچەرخ زیاتر پشت بە هەمەڕەنگی شێوەبەندی کۆمەڵگا دەبەستێت. لە رێککەوتنی دوو جەمسەر بەولاوەتر، وەکو سیستەمێك هەڵدەسەنگێنرێ، رێز لە هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندێتی کۆمەڵگا دەگرێت کە بە درێژایی مێژوو بەمجۆرە بووە و لەوە بەدواوەش بەم شێوەیە دەژی، گوزارشت کردنی ئازادانە و پراکتیزەکردنی وەکو پرەنسیپێکی سەرەکی دەبینێ. گوزارشت لە بیردۆزەییەکی تیۆری دەوڵەمەند و پێشکەوتنی کرداری و شێوەگرتن دەکات. تیۆرییەکی دەستنیشانکردنی دەسەڵاتێکی سیاسی ئاسایی نییە. ناتوانرێ دابخرێتە ریزی شێوەیەکی دەسەڵاتی سیاسیش. شێوەیەکی شارستانی درێژ خایەن و بەرفراوانە، فاکتەری کۆمەڵگای چینایەتی و بێچین لەخۆوە دەگرێت، بەڵام سیستەمێکە پشت بە شێوەی بێ سنووری لەرینەوەی تێکەڵی ئەوانە و دەست نیشانکردنێکی ئازادانە و پراکتیزەکردنی دەبەستێ. تیۆری و کرداری پێشکەوتنی ئازادانەی ژیانە. کاتێك تەواوی ئەمانە ئەنجامدەدرێ، سیستەمێکە لە دەرەوەی بەرگری رەوا کە پێناسە یاساییەکەی روون و ئاشکرایە پەنابردنە بەر توندوتیژی رەت دەکاتەوە. سیستەمێکە تەواوی توێژە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە وەکو کۆنترین رەگەز و چینی چەوساوە ژنان و منداڵان بە شێوەیەکی ئازادانە گوزارشت لەخۆیان دەکەن. سیستەمێکە تەنیا ناکۆکییەکانی ناوەوەی کۆمەڵگا چارەسەر ناکات، بەڵکو لە میانەی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی چارەسەری ئەو ناکۆکییەی لەگەڵ سروشت بە بناخەیی دادەنێت کە پێ بە پێ مەزن دەبێت. سیستەمێکە ئەنجامدانی گۆڕانکاری و وەرچەرخان لەنێو هەلومەرج و زەمینەی ئاشتی بە بنەما دەگرێت.

چەندین جار دووبارەکردنەوەی پێناسەی دیموکراسی هاوچەرخ، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گرنگترین چوارچێوەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پێکدێنێ. لەسەر ئاڵای ناسنامەی ئایدیۆلۆژی سەدەی بیستەم و "شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ"، نووسراوە. لەژێر سایەی ئەم ئاڵایەدا تەنانەت سوود لە پێکهاتە کۆنەکانیش وەردەگیردرێت، هێزی ئەوە نیشاندەدات لە خزمەتی کۆمەڵگا و نوژەنبوونی بەکار بێنێ. لەژێر ئەم ئاڵایەدا هێندەی بخوازن لە مێژوو، هێندەی بخوازن دەتوانن لە ئاییندەدا بژین. هێندەی بخوازن دەتوانن ببن بە هەنووکەیی. بەڵام دەبێ لە میانەی تێگەیشتنێکی قووڵی پێوەرە سەرەکییەکان و ناسینی هێزی بە دەزگابوون و نیشاندانی

رێز و پابەندبوونێکی لە رادەی پەرستن بژین. چونکە کەسایەتی ئەم ژیانە دیموکراسییانە، ئەو تاکڕەوێتیە نییە کە تیغ تیغەی قازانجی سەرمایەداری هاری کردووە و چۆنی بتانەوێ تێیدا بژین. دەبێ بڵێین ئەم ژیانە "ژیانێکە بە گوێرەی یۆتۆپیا شکۆدارەکانی ئایینده"، ژیانێکیش نییە کە بە گوێرەی ئارەزووی خۆت تەریقەتێکی نەخۆشی ناسی (پاتۆلۆژیك) بسەپێنی. هێندەی بخوازن تاکی ئازاد دەبێت، بەڵام بە خوڵقاندنی زانستیانەی مێژوو بە ئاییندە پابەند دەبن و خۆتان بونیات دەنێن. نابنە دیلی دۆگماکان و مەحکومی یۆتۆپیاکان.

دەبێ بزانن تەنیا کاتێك زانستی بن لە میانەی رابردو و ئاییندەوە بە ژیانێکی ئازاد دەگەن. نابێ دەرفەت بەوە بدەن لەپێناو دۆگما و یۆتۆپیاکان دەست لە تاکی ئازاد بەردرێت، یان لە ئەنجامی سووکایەتی پێکردن و جنێوپێدانیان ببن بە تاکێکی نکۆڵیکار (منکر). دەبێ تاکی ئازاد هێزی دۆگما و یۆتۆپیا بناسێ، بەڵام  ملکەچی بۆ نەکات، تاوەکو دەتوانێ هێزی فەلسەفی و زانستی بەدەست بێنێ و بەمجۆرە دەشێ ژیان بەڕێوە ببردرێت.

ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژییەی پەسندی دەکەین ئەم رێسایانەی لێ نووسراوە. ئەمانەش نە پێڕەو و رێسای قەدەرە و نە هی سەرلێشاوییە. تاوەکو دوایی پێڕەوی زانستی و ئازادییە.

لەدوای کەسێتی تاك دووەمین بواری گرنگی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی پێشکەوتنی هاوچەرخانەی کۆمەڵگای مەدەنییە، بە واتایەك مانای سەرلەنوێ لە دایك بوونە. ناوبردنی کۆمەڵگای مەدەنی بە گۆڕەپانی سێیەم دەشێ هەنگاوێکی یارمەتیدەرانەی دەستەواژە بێت. دەتوانرێ بگوترێ شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ لەسەر سێ پێچکە بەرز دەبێتەوە. ئەمانە کۆمەڵگای دیموکراتیك و سیاسەتی دیموکراسیانە و دەوڵەتی دیموکراسییە. بەڵام قۆناخێکە دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگای کۆن بە ئاستەمی و هێواش گەشە دەکات. هەرچی دیموکراتیزە کردنی دەوڵەتە، بەهۆی پێکهاتە کلاسیکیەکەیەوە سەختترینیانە. بەڵام ناچارکردنی بەرەو وشیاری دیموکراسیانە پێویستی بە تێکۆشانێکی مەزنی دیموکراسی هاوچەرخ هەیە. لە قۆناخەکانی دەستپێکدا سەرهەڵدانێکی گشتی کۆمەڵگا ئەمەی بەدی دەهێنا. بەڵام ئەو دەوڵەتەی بە پێی دەربازبوونی کات باڵادەستی ئایدیۆلۆژی و پراکتیکی بەدەست هێنا، هێزی کاردانەوەی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگای سست کردووە.

تەنگەتاوکردن و بەلاوەنانی رێڕەو و رێچکە کلاسیکییەکان ئاستەم نییە. بەسەرچوونی هەلومەرجەکانی شۆڕش و دژە شۆڕشە کلاسیکییەکان، رۆڵێکی گرنگی لەمەدا هەیە. ئیتر سیاسەتی دیموکراسی و ئامراز و شێوە چالاکییەکانی دەردەکەوێتە پێش کە وەکو ناچارییەك لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکەوێتە کار.

تاوەکو بلێی گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت لە مێژوودا ناسراوە. لە کاتێکدا هێزی یاخیبوونی گەلان وەکو دەنگ و داخوازی کۆمەڵگا ڕۆڵ دەبینێ، دەوڵەتیش وەکو کۆنترین دەسەڵات، نیشاندانی هەبوونی خۆی، هەروەکو قەدەرێك وایە؛ وا مەزندە دەکات رزگاربوون لە کاریگەرییەکەی نابێ. بە تایبەتیش دەوڵەت و کۆمەڵگا کلاسیکییەکانی لە دەرەوەی ناوەندەکانی شارستانییەتی سەرمایەداری دان بە خراپترین شێوە لە ناوەوە دەپوکێتەوە و ڕەنگدانەوەی بۆ دەرەوە، گەوهەرێکی بەمجۆرەیان هەیە موحافەزەکاری قاڵتر دەکەنەوە. باوەڕیان بەوە هێنابوو لە میانەی شۆڕشەوە ئەم هاوسەنگییە تێکدەشکێنرێ. هەندێ نموونەی سەرکەوتوو، بەرەو ئەنجامێکی بەمجۆرەی بردوون کە دەتوانن بەرفراوانی بکەن. بەڵام ئەو تەگبیرانەی ستاتۆی سیستەمی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیستی پێشی خست، کاریگەری ئەم ڕێچکە و ڕێبازەی زۆر سنوردار کرد. بە گوێرەی ئەوەی دەوڵەتی قۆناخی موحافەزەکاری لەخۆیەوە دیموکراتیزە نابێت، ئیتر جموجۆڵی گۆڕەپانێکی نوێ، بووە بە ناچارییەك و تەنانەت چەمکی ئەو دەوڵەتەی بە تایبەتی سروشت تێکدەدات و لە قۆناخی قەیرانی سەرمایەداریدا لە ناوەندەکانی سەرمایەداریشدا دەبێتە موحافەزەکار، لەم شوێنانەش جولانەوەی گۆڕەپانی سێیەمی کردبووە ناچارییەك.

گۆڕەپانی سێیەم، گۆڕەپانی سیاسەتی دیموکراسیانەیە. ئامرازێکی مەدەنی بۆ هەر پێویستییەك بووە ناچاری کە هەلومەرجە ئاڵۆزەکەی شارستانییەت دەیسەپاند. ئەو ئامرازانە نە ئامرازە دژوارەکانی شۆڕشە و نە ئامرازەکانی گەیاندنە کە دەوڵەت بۆ خزاندنی کۆمەڵگا درێژی کردۆتەوە. بەڵکو ڕێکخستنی سەربەخۆن و ناسنامەی خۆیان هەیە و بە پێی پێویستی شێوە دەگرێت، زیاتر لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادایە و مەودایەك دووری هەردووکیان وەستاوە. نە دژی دەوڵەتە و نە بەکرێگیراوێکی دەوڵەتە. لەژێر فەرمانی پێویستییەکاندایە. ڕێکخراوە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگاش جێگای خۆی تێدا دەگرێت. ئەندامەکانی بە گوێرەی ئەو ئەرکانە شێوەیان گرتووە کە بە شێوەیەکی سنووردار جێبەجێیان کردووە. لەگەڵ تەواوبوونی ئەرکەکان بەخۆشیان ڕێکخراوێکن کۆتاییان پێ دێ، بە لانی کەم ڕێکخستنێکن بە گوێرەی ئەرکی نوێ دەگۆڕێن. ئەو مۆدێلە بۆ رزگاربوون لەو بنبەستبوونەی شۆڕش و دژە شۆڕش قوڵیان کردبۆوە، وەکو پێویستترین ڕێچکە بۆ هەموو کەسێك کاریگەرێتی بوونی خۆی چەسپاندووە. لەبەر ئەوەی لە بواری ئابوورییەوە تا کولتوور، لە وەرزش تا ژینگە، ئاشتی تا دەگاتە بوارەکانی مافی مرۆڤ، پێویستییەکان خۆیان سەپاندووە، ڕۆژ بەدوای ڕۆژ گرنگی ئەم گۆڕەپانە زیاد دەکات.

لەم چوارچێوەیەدا پێناسە کردنی گۆڕەپانی سێیەم تێر ناکات. گۆڕەپان پێویستی بەوەیە لە بواری تیۆری و کرداری شوێنگەی خۆی یەکلا بکاتەوە.

ڕۆژ بەدوای ڕۆژ پێویستی بە تیۆری و پراکتیکی گۆڕەپانی سێیەم زیاد دەکات؛ پێویستی بە تیۆری و پرۆگرام و ستراتیژ و تەکتیکی خۆی هەیە. ئەمە بە واتایەك سەرلەنوێ بە پراکتیك بوونە. ئەرك بەندی لە میانەی چەمکی ئەو پارتییەی پشت بە بەرژەوەندی کۆمەڵگا و دەوڵەتی کلاسیك دەبەستێ، بە پێی پێویستی دەربازبوون بەرەو ئەو پارتیبوونەی ئاماژەی پێکرا، دەکاتە ناچارییەك. تەواوی ئەو ڕێکخستنانەی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی (منفعە) خوازین، لە سەرووی هەموویانەوە پارتە کلاسیکییەکان بە گوێرەی تیۆری کۆمەڵگای مەدەنی ڕووبەڕووی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەیە.

سەرکەوتنی شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ، پابەندی ئەوەیە لەم بوارەدا سەرلەنوێ ڕۆڵی خۆی پێناسە بکات و بە گوێرەی ئەوەش بە شێوەی چالاکی و ڕێکخستن بگات. ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتانەی گۆڕەپانی سێیەم پێشنەخەن لە دیموکراسی هاوچەرخدا لە سەقەت بوون رزگاریان نابێت. فاکتەری توندوتیژی و مەیلی جوداخوازی کە تەنگەتاوی دێنێتە ئاراوە، تەنیا کاتێك ئەم گۆڕەپانە ئازادی خۆی بەدەست بێنێ و بە تەواوی ڕۆڵی خۆی ببینێ، وەکو کێشەیەك کۆتایی پێدێت. ئەم دیاردەیەی لەم چوارچێوەیە دەتوانین بە گۆڕەپانی سیاسەتی دیموکراسیانە ناوی ببەین، لە سیاسەتی بنبەستبووەوە دەرگایەکی بەرەو سیاسەتێك کردۆتەوە چارەسەری لەگەڵ خۆی دێنێ. وەکو گەرمترین و بە پیتترین گۆڕەپان، گۆڕەپانی سیاسەتی دیموکراسیانە و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چەندە هەمەڕەنگ و چالاك و بەخشتەکاری (تنسیق) بن، بەو ئەندازەیە دەتوانێ چارەسەری بخولقێنێ. تاکە ڕێگا نە شۆڕش و نە دژە شۆڕشە. ڕێگا چارەی سیاسەتی دیموکراسیانەیە کە زیاتر ئەلتەرناتیفی چارەسەری جۆربەجۆر لەخۆوە دەگرێت. هەنگاو بە هەنگاو ژیان لەپێناو پەرەسەندنی کۆمەڵگای مەدەنی پێکهێنان و پراکتیزەکردنی پرۆژە دەردەخاتە پێش. هەر کێیەك کامە ڕێکخراو و پارتی هەڵگری ئەم پرۆژە و ڕێکخستن و خەباتەی کۆمەڵگای مەدەنی بێت، دەرفەتی ئەوە دەستەبەر دەکات خاوەنی گرنگترین ڕۆڵ و دەسکەوت بێت. ئەو ڕێکخراو و پارتانەی هەڵگری چەمکێکی دوور لە چەمکی سیاسەتی بەرژەوەندیخوازن و بەها دەخولقێنن و بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگای دیموکراتیك دەگوازێتەوە، ئەمە بەدی دێنن. ئیتر مێژوو ڕۆڵی وەرچەرخان بەو کەس و دامەزراوانە دەدات کە خاوەنی تیۆری و پرۆگرام و ستراتیژ و تەکتیکی بەمجۆرەن. ئەوانەی نابنە ماشەی دەستی فشارەکانی دەوڵەت و داواکاریە ناواقعییەکانی کۆمەڵگا، ئەوانەی باوەڕییان وایە تەنیا لە میانەی پێشخستنی پێودانگەکانی دیموکراسی هاوچەرخ سوودبەخش ترین خزمەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکەن، دەتوانن بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەم ڕۆڵە مێژووییەیان جێبەجێ بکەن. ئیتر لە ڕەوشێکدا کە چەمکی دەوڵەت لەنێو قۆناخی قەیراندا بنبەستبوون قووڵ بکاتەوە و ببێتە کۆسپێك، بەو واتایە دێت تیۆری گۆڕەپانی سێیەم بە دەرفەتی ئافراندنی چارەسەری گەیشت. چەندە بە لێهاتوویی و شێوەیەکی ڕاست کار بکەن و پێویستییەکانی جێبەجێ بکەن، بە واتای ڕێبازێکی تیۆری و پراکتیکی ئەوتۆ دێت سەرکەوتنەکەی بەو ئەندازەیە مەزنە.

تەواوی ئەم باسانە دیاری دەکەن شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ زۆر لەوە دوورە قۆناخێکی ستاتۆگەرایی بێت، هەروەها ئەوەشی نیشانداوە زۆر لە ئەندازیارێتی کۆمەڵگای مغامەرە و یۆتۆپی جیاوازترە. لە شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ لە میانەی ڕووخاندن و پارچەکردنی دەوڵەت سنووردار ناکرێت، دوای ئەوەی هێواش بە هێواش کرا بە ئامراز و کەرەستەیەکی خوردە فڕێ دەدرێتە زبڵدانی مێژوو. هەر ئەوە ڕاستە و بەدی دێت. ئەوە ئەو دەوڵەتە نییە کە وەکو ئامرازێکی نوێی فشار لە جێی کۆنترین ئامرازی شارستانییەت دابنرێت. بە پێچەوانەوە ئامرازێکی خشتەکاری گشتی (التنسیق العام)یە هی هەر کەسێکە و پشت بە تەواوی دەزگاکان و ڕەنجی بەرهەم هێنەری کۆمەڵگا دەبەستێ، لە بەرزترین ئاستدا نوێنەرایەتی پێوانەکانی ئازادی و دادوەری دەکات و چاودێریان دەکات. بەرچیغی لێدان و چەکی کوشتن و بەندیخانەی نابێت. هەرچەندە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ لە دابەشکردنی لە شێوەی "هەر کەسە و بە گوێرەی تواناکاری و هێندەی پێویستی" نزیك بێتەوە، کۆمەڵگایەك بەدی دێت کە دەوڵەتیش فڕێ دەداتە مۆزەخانەی کەل و پەلە کۆن و مێژووییەکان. شۆڕشە زانستی و تەکنۆلۆژییەکان لە هەموو کاتێك زیاتر مرۆڤایەتی لەم خەیاڵە واقیعیەی نزیك کردۆتەوە. ئەوەی کۆن قەڵغانی شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخە. بە گوێرەی ئەوەی مێژوو ئەویشی خستۆتە گەڕ، لە هەموو کاتێك زیاتر سەرکەوتن دەبێتە مافی زەحمەتکێشان و گەلە چەوساوەکان.

٤ ـ کاتبەندی چاخی دیموکراسی هاوچەرخ کێشەیەکی ئاڵۆز پێکدێنێت. ئەوە مسۆگەرە هەر چاخێك ڕۆحی سەردەمێکی دیاریکراوی هەیە. ناشێ بیر لەو چاخانەی کۆمەڵگا بکرێتەوە کە لە سەرووی سەردەم بن یاخود پەیوەندی خۆی لەگەڵ سەردەم گرێنەداوە. خودی کات فاکتەرێکی ئاکتیف و بونیادنەرە. لەگەڵ بوارە سەرەکییەکانی دیکە چالاك دەبێ و دەکەوێتە کار. کاتی چاخەکانی کۆمەڵگا ڕاستییەکە و پێویست دەکات بە باشی پەی پێ ببردرێ. چەندە تایبەتمەندێتی سەردەمەکان و کاریگەری دیالەکتیکیانەی کردوویانەتە سەر یەکتری بە شێوەیەکی ڕاست بخرێتە ڕوو، ئەوا بەو ڕادەیە تواناکاری پێناسەکردنی مێژوو لە ڕێگای ئەمیشیانەوە پێناسەکردنی زانستیانەی کۆمەڵگا دێتە ئاراوە.

ئەو تایبەتمەندێتیەی چاخی کۆمەڵگای نیۆلۆتیك جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە بۆ یەکەمین جار کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵی ماڵیکردنی ئەنجامدا، ئامرازێکی داهێنا بتوانێ ئەم کارانەی پێ ئەنجام بدات. خاك، چەندین جۆری دانەوێڵەی چاندن و داری میوە، ئاژەڵەکانی بەخێوکردن، گوندی جێ نشین، کۆمەڵگای دایکسالاری کە لە دەوری دایك شێوەی گرتووە، چەمکە ئایینی و مێتۆلۆژییەکانی پشت بە پیرۆزکردن و بەرزکردنەوەی ئەو هەبوونانە بۆ ئاسمان دەبەستێ کە سیفەتی خودایان پێدراوە و لە ژیانیشدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن، ئەمانە تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی ئەم چاخەن. تەور، گاسن، ڕەوڕەوە، ئامرازەکانی تەونکاری دەست، دەستاڕ، ئامرازی بەردتاشین، کەر، مانگا، مەڕ و ماڵات لە سەرووی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەهاتن.

کۆمەڵگا بە شێوەی تیرە لەسەر بنەمای موڵکایەتی گشتی لەنێو سیستەمێکدا دەژین. بازرگانی و ئاڵوگۆڕ لە ئاستێکی سەرەتایی ئەنجامدەدرێت. کۆمەڵەی زمانی بنەڕەتی پێکدێن و جیادەبنەوە. ماوەی چاخێکی بەمجۆرە وەکو بێکۆتایی دیارە، لە سەرخۆ بەڕێوە دەچێت. هەستەکانی رابردوو و داهاتوو پێشنەکەوتووە. پێکهاتەیەکی هزری و هەستی وەها پێشدەکەوێت کە وامەزندە دەکات: دونیا لە چاخی دەستپێکی ژیانێکدایە کە بە بەهەشت دەچێ. هەستی خزمایەتی نێوان مرۆڤ کە تا ئەو کاتە پێشنەکەوتبوو، ئیدی هێدی هێدی سەرهەڵدەدات. ئەو کولتوورەی کە لە کۆمەڵگای دایکسالاری بە بناخە دادەنرێت، ئاشتیخوازانەیە. جێگای دیاردەی توندوتیژی نییە کە بە شێوەیەکی سیستەماتیك و بە ئامانجی تاڵان پێشبخرێت. لە هزرێکی بەمجۆرە بێ ئاگا و نامۆن کە لەسەر بنەمای تاڵان و لەناوبردنی یەکتر بێ. زمان پێکهاتەیەکی شیعر ئامێزانەیە. هەربۆیە دەتوانرێ ئەم سەردەمە بە قۆناخی شیعر ئامێزانەی ژیانی مرۆڤایەتی ناوببرێت.

سەردەم و چاخی کۆمەڵگای کۆیلەداری پشت بە کۆیلەکردنی مرۆڤ و کردنی بە بابەتی موڵکایەتی دەبەستێ. بە پیتترین ئامرازی بەرهەمهێنان خودی مرۆڤە. لە میانەی جیابوونەوەی چینایەتی شێوازی کۆیلەداری کۆمەڵگای تیرەگەری پارچە دەکرێ کە پشتی بە خزمایەتی دەبەست، پەیوەندییەکی بەرفراوانی بەرێوەبەر ـ بەڕێوەبراو زاڵ دەبێت. ئەم دیاردەیەی بۆ یەکەمین جارە بەدی دێت، دەروازەی گۆڕانکاری مەزن لە حافیزەی کۆمەڵگادا دەکاتەوە. لە دەوروبەری بەڕێوەبەرەکان، شار و دەوڵەتی شار دەئافرێنرێ.

لە کاتێکدا بەشێکی مەزنی مرۆڤایەتی بۆ هەموو جۆرێکی خزمەتکاری بەکار دەهێنرا، بەشێکی کەمیش وەکو ئەو خاوەنانە مەزن کرابوون کە ژیانێکی ئاسوودەیان هەبوو و هەموو شتێکیان لە لایەن خزمەتکارەکانەوە ئەنجامدرا. رەنگدانەوەی ئەم وەرچەرخانە نائاساییە لەسەر پێکهاتەی هزر، دەست پێکردنی قۆناخی میتۆلۆژیاکانە. دوو فاکتەری گرنگ لە گەوهەری میتۆلۆژیا رۆڵ دەبینن. زێدەبوونی بەرهەم کە بە گوێرەی قۆناخی خۆی وەکو پەرجوو (موعجیزە)یەك وایە و شێوازی بەرهەمهێنانی کۆیلەداری پێشکەشی توێژی سەردەستی کرد، دووەمین هۆکاری گرێدراوی ئەمەش سەلماندنی ئەوەیە ئەم شێوازەی کۆمەڵگا خودی سیستەمی خۆڕسکە. داهێنەرەکانی میتۆلۆژیای سۆمەر ئەم ئەرکەیان بە شێوەیەکی نایاب پێکهێناوە. بەردەوام مەزنکردن و بەرزکردنەوەی خواوەندەکان (لە گەوهەری خۆیدا ئەوانەی مەزن دەکرێن چینی خاوەن کۆیلەن) و خستنی مرۆڤەکانی دیکە (کۆیلایەتی ئەمە پێویست دەکات) لە سەرووی ئەم کارانەوە دێت راهیبە سۆمەریەکان تێیدا سەرکەوتوو بوون. ئەمەش لە رێگای دەرکەوتنە سەر زیگۆراتەکان (زەقورە) و تەماشاکا کردنی جوڵەی بە سیستەمی ئاسمان؛ لە جوڵانەوەی مانگ، خۆر، وەرز، شەو رۆژ دەردەخات کە بەردەوام دووبارە دەبنەوە. هەروەکو چۆن یاساکانی ئاسمان ئیرادەی خواوەندەکان نیشاندەدات، ئەوا هێزی بەڕێوەبەرێتی یاساکانی سەر زەویش نوێنەری خودان ئینجا چی پادشا ـ راهیبەکان بن یاخود پادشا خانەدانەکان بن. ئەوان خوداوەند بەهێز دەکەن، خواوەندیش ئەوان بەهێز دەکات.

هزر و زمانی ئەم راستینەیە بە میتۆلۆژیا ناو دەبرێت. تاکو ئێستاش نەگەیشتنی بە ئاستی ئایینێك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لە ئاستی گێڕانەوەی مەتەڵ ماوەتەوە. دوای ماوەیەکی دیاریکراو کاتێك نێردراوەکان جێگای راهیبەکان دەگرنەوە، ئەمانە وەکو یاسای ئایینی وشك لەسەر سەری مرۆڤ کۆدەکرێتەوە. ناسنامەی خەیاڵی (تصور) میتۆلۆژی مۆرکی خۆی لە چاخی کۆیلایەتی داوە کە بە هەزاران ساڵی خایاندووە. ئەم چاخەی لەژێر ئابلۆقەی کۆمەڵگای نئۆلۆتیکدایە، بەڵام بە قوڵایی و بەرفراوانییەوە مەزن دەبێت، ناوبردنی بە چاخی میتۆلۆژیا لە جێگای خۆیدا دەبێت. قاڵبە سەرەکییەکانی هزری مرۆڤ لە میانەی ئەفسانە و چیرۆکە میتۆلۆژییەکانەوە داگیر کراوە. هەروەکو بڵێی کۆیلایەتی جەستەیی تێری نەدەکرد، پێ بە پێ کۆیلایەتی هزری دەچەسپێنرێ و زاڵ دەکرێت. ئەو مرۆڤایەتیەی وەکو منداڵێك بەرەڵا کراوە لە رێگای مەتەڵە ئەفسانەییەکانەوە دەخەڵەتێنرێ و بەڕێوە دەبردرێ. چاخێکە خانەدان و پادشا، بێ سنوور مەزن کراوە. هەربۆیە تێگەیشتنی مێژوو لە نزیکەوە پەیوەندی بە شیکردنەوەی چاخ و زمانی میتۆلۆژیاوە هەیە. ئەوەی بڵێ چاخی میتۆلۆژیا ئەفسانەیە و بەمجۆرە پێکەنێت و دەرباز بێت، ئەگەر بە ئەنقەست بێت یاخود نە، ئەوا خزمەت بەو رژێمەی کۆیلایەتی دەکات کە پێویستە نەفرەتی لێبکرێت. چاخی میتۆلۆژیا ئەو لانکەیەیە کە چاخی ئایینی خولقاندووە؛ نەریتێکی بنەڕەتی و رەسەنە.

سەردەمی دەرەبەگایەتی لەبەر ئەوەی چاخێکە ئایینپەروەری تێدا زاڵە بە چاخی ئیلاهیات (لاهوت) ناو دەبرێت. ئەو سیستەمەی پەیوەندی کە لە چاخی کۆیلایەتی ماوەتەوە کەمێك نەرم دەکرێت، بەڵام بە رێسای وشك گرێدەدرێت و درێژەی پێدەدرێت. رەنجی گرێدراو بە خاك وەکو فاکتەرێك بەردەوام دەبێت کە بە رادەی هەرە زێدە بەروبوومی ـ زێدە بەرهەم دێنێ. هەربۆیە رەوشی پەیوەندی وەرزێر ـ ئاغا، جوتیار ـ دەرەبەگ و میر ـ خوڵام بەردەوام دەبێت. دوالیزمی خودا ـ بەندە وەکو پیرۆزترین رەنگدانەوەی ئەم پەیوەندییە درێژەی پێدەدرێت و بەرز دەکرێتەوە. بوون و تاقانەیی خودا سەلمێنراوە (لە راستیدا یەکلابوونەوەی جیابوونەوەی چینایەتی و رژێمی پادشایەتی نیشان دەدات.)

ئەو ئەرکەی کەوتۆتە ئەستۆی مرۆڤ ئەوەیە کە سوپاسی ئەو خودا تاقانەیە بکات کە خاوەنی مەزنترین هێزە (خاوەنەکەی، مێردەکەی، باوکی) بکات چونکە لە نەبووەوە خوڵقاندوویەتی (سەرلەنوێ لە دایك بوون لەسەر بنەمای چینایەتی) و بەردەوام عیبادەت بکات.

بە گوێرەی ئەو باوەڕی و یاسا ئایینیانەی بوونەتە راستینەیەکی بێ چەندوچوون گرێدان بە سیستەم، سەرلەنوێ پیرۆز دەکرێتەوە و بەردەوام دەبێت. پادشایەتی و سەڵتەنەتی کە شێوەی نوێی کۆمەڵگای چینایەتین، وەکو نوێنەری سیستەمی ئاسمانی خودا لەسەر زەوی هەڵدەسەنگێنرێ و درێژەی پێدەدرێ؛ لەسەر بنەمای بەهێزتر لە هزری مرۆڤایەتی و دامەزراوە سیاسیەکانی، زاڵ دەکرێت. کاتێك لە باران رادەکات تەرزەی بەردەکەوێت یاخود بە پێچەوانەوە کاتێك لە بەفر و تەرزە رادەکات رێژنەی باران دەستگیری دەکات. تەواوی ناسنامە ئایدیۆلۆژییەکانی بە گوێرەی دەرەبەگایەتی رێکخراون لە سەرووی هەمووشیانەوە ئیسلامییەت و مەسیحییەت، هەم میتۆلۆژیای کۆن و هەم شێوازی هزری فەلسەفی تازە هاتۆتە ئاراوە لە خزمەتی ئاییندا بەکار دێنن و چاخی پرشنگداری ئیلاهیاتی چاخی ناوین ئەنجامگیر دەکەن.

بێگومان چاخەکانی پێغەمبەرایەتی و فەیلەسوفەکان رۆڵێکی مرۆڤایەتی مێژووییان لە بەلاوەنانی کۆیلەداری یاخود نەرم کردنیەوە بینیوە. بەڵام نیازیان هەر چییەك بووبێت، لەسەر میراسی ئەوان بە بینای قەشەنگی پەرستگا (مزگەوت، کڵێسە، دێر، حەورا) گەیشتن و وەکو پەردەیەکی سەرەکی سەردەمی دەرەبەگایەتی خزمەت دەکەن. باڵادەستی خوداکان لەسەر هزر و رۆحی مرۆڤایەتی بەردەوام دەکات. چاخی ئیلاهییات کە گوزارشت لە قووڵبوونەوە دەکات، بێ واتا بوون و لە بواری فەلسەفی تیۆلۆژیا و شیعری لە گەوهەری خۆی دابڕاند، بە تایبەتیش لە قۆناخی رووخاندا بووە بە دێوەزمەیەك کە ناوزەد کردنی بە چاخی تاریکی لە جێی خۆیەتی. بە لانی کەم هێندەی چاخی میتۆلۆژیا، چاخی ئیلاهییات راست شیبکرێتەوە، مێژوو رۆشن دەکرێتەوە، بەمجۆرە کۆمەڵگاش بە رەوشێك دەگات زیاتر دەرکی پێدەکرێت. کاتێك زمان و لۆژیکی شیعرئامێزی نئۆلۆتیك و میتۆلۆژیای کۆیلایەتی و ئیلاهیایتی دەرەبەگایەتی بە شێوەیەکی زانستی شیبکرێتەوە، ئەوا بە واتای راستەقینە کۆمەڵگاو گەلان و مرۆڤایەتی بە سەرکەوتن دەگەیەنرێت.

قۆناخی سەرمایەداری بەهۆی سەردەمی لە دایکبوونی، هەڵسەنگاندنی وەکو چاخی فەلسەفە، زیاتر نزیکی راستییە. شەڕی مەزنی هزری ئیلاهییاتی هەڵوەشاندۆتەوە. ئەم پەردەیەی سەر کۆمەڵگای بەلاوە ناوە و هەنگاوێکی مەزنی بۆ دەرککردن بە راستیەکەی هاوێشتووە. لەم لایەنەوە فەیلەسوفەکان رۆڵی پێغەمبەرەکانی چاخی نوێ دەبینن. تاکە جیاوازیان ئەوەیە، بە بێ ئەوەی هێندە خوداوەندە تەڤلی کارەکە بکەن، ئەو هێزەیان بەدەست هێناوە قۆناخەکانی کۆمەڵگا و سروشت لە میانەی یاساکانی ناوخۆیان روون بکەنەوە. لە راستیدا ئەم شێوازەی هزر لە بەرزترین ئاستدا گوزارشت لەو ئاستە گشتیەی وشیاری دەکات کە مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە. ئەو ئەزموونەی سەبارەت بە سروشت و کۆمەڵگا بەدی هاتووە، روون کردنەوەکانی نزیکبوونەوەکانی ئیلاهییات و میتۆلۆژیای سەبارەت بە سروشت و کۆمەڵگای خستۆتە رەوشێکی پێکەنیناوی. ئەو تاکەی لە سایەی دۆگماتیزم ئازادی خۆی لەدەست دابوو، بەدوای خۆیدا دەگەڕێ؛ وەکو بڵێی لە خوداکان تۆراوە و دەیخواست چارەنووسی خۆی بگرێتە دەست. رێپێوان بەرەو گەیشتن بەخود، پێویستی بە بوێری هەیە. مرۆڤ تازە بە تازە لە رەوشی سێبەر رزگاری دەبێت و هەوڵدەدات بگات بە گەوهەری خۆی. هەربۆیە لە بڕوا کردن بەخۆی بەولاوە هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. بڕوابوون بەخود، ئەو بوێریە فکریە لەگەڵ خۆیدێنێ کە خودا

نەخاتە ناو مەسەلەکانەوە. فەلسەفە قۆناخی هزری ئازادە کە بڕوابوون بە خود و بوێری دەروازەیان لەپێش کردەوە. ئیتر خواوەندەکان لەنێو مەسەلەکەدا نین. ئیتر وەکو منداڵان پشت بە گەورەیەك نابەستن و ناژین. ئیتر هەوڵدەدەن لە میانەی هێزی خود و ئارەزووە وشیار بووەکانیان و هزری خۆیان جیهان راڤە بکەن و بژین. فەلسەفە شێوەی هزری قۆناخێکە تاك بەهێز بووە. ئیتر رەوشێکی بەمجۆرە هاتۆتە ئاراوە ناتوانرێ لە میانەی ئەو شێوازە هزرییەی منداڵان دەخەوێنێ، ئەو چاخانە ئیقناع بکرێت کە کۆمەڵگا ئاڵۆز بووە و شارەکان مەزن و زیاد بوون.
ئەو فەلسەفەیەی لە شارە پێشکەوتووەکان لە دوا قۆناخەکانی کۆیلایەتی دەرکەوت، دوای ئەوەی لە چاخی ناوین لە خزمەتی ئایین بەکار هێنرا، لە سەرەتاکانی چاخی نوێ بە ئازادی خۆی گەیشت. چاخی فەلسەفە چاخی میتۆلۆژی و ئایینی منداڵێتی مرۆڤایەتی تێپەڕ دەکات و ئەو قۆناخە دەکاتە سەمبۆڵ کە ئیتر چارەنووسی خۆی دەگرێتە دەست. ئیتر لە جیاتی خوداوەندەکان لەگەڵ دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵگا بەدوای لێکدانەوە و ژیان دەگەڕێت. فەلسەفە هەنگاونانە بەرەو واقیعیەت، دەرککردنە بەوەی زیاتر سوود لە هێزەکانی سروشت وەربگیردرێت. ئەوە مسۆگەرە سەردەمی فەلسەفە چاخێکە مرۆڤایەتی بڵند کردۆتەوە.
ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێ لە رێگای فەلسەفەوە پێشکەوتنە زانستییەکان خێرا بوون. ناشێ بانگەشەی ئەوەش بکرێت کە فەلسەفە ئیتر لە پێویستییەك دەرکەوتووە، چونکە زانست فەلسەفەی تێپەڕ کردووە. بەڵام ئەمە راستییەکە لە قۆناخی پێگەیشتنی سەرمایەداریدا بایەخی جارانی نەماوە. بە ئەندازەی ئەوەی نابێت فەلسەفە وەکو شێوەیەکی هزری تایبەت بە سەرمایەداری ببینرێ لەهەمانکاتدا نابێ سەرمایەداری وەکو سیستەمێك هەڵسەنگێنرێ کە فەلسەفە بەلاوە دەنێت.
ئەوە مسۆگەرە کە زمانی هەڵبەستی سەرمایەداری، میتۆلۆژیا و ئیلاهییاتی لە هەناوی خۆیدا مەڵاس نەداوە. راستر ئەوەیە هۆنراوەکانی بە شێوەیەکی قەبە نکۆڵی لە ئیلاهییات و میتۆلۆژیا دەکات، خۆشی ژیرتر و ئاقڵمەندانەتر لە قەڵەم دەدات. ئەو سەردەمەی نوێنەرایەتی دەکات نە کاریگەری ئەفسوناوی شیعر و نە پاڵەوانەکانی میتۆلۆژیا و نە پیرۆزبوونی ئیلاهییاتی بەخۆیەوە نەبینیوە. لە میانەی نکۆڵیکردنێکی قەبە لەم چاخانە مرۆڤایەتی هەژار کردووە، لە راستیدا چاخی هۆشمەندی کە بەرزی کردۆتەوە لە تێرکردنی ئارەزووە خۆپەرستییەکان لە میانەی ئاقڵمەندی و لۆژیکێکی پێشکەوتووتر بەدواوە تێپەڕی نەکردووە. ئەوە سەلمێنراوە چاخێکی گرێدانی ماددی ئەوتۆیە، مەزنایەتی فەلسەفەش بەرگەی ناگرێت. سەرمایەداری رژێمێکە لەم لایەنەوە زێدەترین رەخنەی بەردەکەوێ. ئەو چاخانەی بە هەزاران ساڵ مرۆڤایەتیان لەخۆوە گرت، رۆحی سەردەمەکەیان بەلاوەنرا و بەرچاو نەگیرا، ترسناکتر ئەوەیە خستویەتیە مۆزەخانە و مەحکومی قۆناخێکی رووکەشی کردووە. رۆحی داهێنەرانەی مرۆڤایەتی بەربەست کردووە. مرۆڤی ئەم چاخە بە گوێرەی رەوشێك گونجێنراوە، لەپێناو خۆپەرستی خۆی هەموو شتێك بکاتە قوربانی. لێکدانەوەی وشکی بەرژەوەندی، لە میانەی گەمەکانی بۆرسە بۆ قومارێکی گشتی گۆڕاوە. بە تایبەتی لە ئاکامی ئەو تەنگژە گشتییەی تێیدا دەژی، ئیتر "کۆتایی مێژوو"، یاخود و "چاخی پۆست مۆدێرنیزمی" پێ بگوترێ. مێژووی مرۆڤایەتی گەیاندۆتە دەروازەی لەناوچوونێك کە لە چاخی جاهلییەت (نەزانی) دەچێ. لە کاتێکدا چاخی نوێ دەستپێدەکات، پەیوەندییە نزیکەکانی بەرژەوەندیخوازی سیستەمە بە شان و شکۆکە لەگەڵ هەژارییەکی مەزنی رۆحی و هزری رووبەڕوو بۆتەوە. بە خۆباوەڕی کەسێتی تاك و هزری خوڵقێنەر و رۆشنگەری و رۆمانتیك جێگاکەی بۆ ترس و گومانی تاکگەرایی و راکردن لە هزر و فەلسەفە بەجێهێشتووە؛ دونیایەکی تەم و مژاوی، دەروونێك تەسلیمی غەریزەکانی بووە و بەرژەوەندیخوازییەکی وەها زنجیری خۆی پچڕاندووە کە کۆمەڵگای بەرەو مەترسیدارترین قەیران، ژینگەشی رووبەڕووی تێکدان هێشتۆتەوە. هەربۆیە سەردەمی ئەو سەرمایەدارییەی تەواوی مێژوو و کۆمەڵگا و جیهان دەکاتە قوربانی بەرژەوەندییە بچووکەکانی خۆی، ناوزەد کردنی بە "قۆناخی خوداوەندە بچووکەکان" دەشێ جێگای تێ رامان بێت...
تەواوی وشەکانی ئەم چاخە گۆڕاوە و کراوە بە تەڵەزگە. هەروەکو بڵێی وشەکان و بە دەیان هزری هۆنراوە بۆ ئەوە ریزبەند کراون تاوەکو سروشتی رەسەنی مرۆڤ و هزر و رۆحی مرۆڤ چەواشە بکەن. ریزبەندییەکی خائینانە و ساختەکارانەیە. لەبەر ئەوەی ئەم وشانە نوێنەرایەتییەکی پتەوی هەندێ راستینەی دەکرد، مەترسی گەورە بووە. لە میانەی لۆژیك و زمانی سەرمایەداری هەروەکو بڵێی بەردەوام دەستدرێژی بۆ ناموسی مرۆڤایەتی دەکات و گەیشتۆتە رەوشێك گوێ بە هیچ شتێك نادات. هەروەکو چۆن سەردەمێك راهیبە سۆمەریەکان زیندە بەچاڵ کردنی کۆیلە و خزمەتکارەکانی لەگەڵ تەرمی پادشاکانیان بە فەرمانێکی سیستەمی خودایی ئاسمان لە قەڵەمدەدا، شێوەی لەخۆبایی سەرمایەداریش هیچ مەزنایەتی و پیرۆزییەك نەماوە لەپێناو بەرژەوەندییە بچووکەکانی خۆی یاری پێنە کردبێت و دەستی بۆ ناموسی نەبردبێت. ئەو سووکایەتی و لادانەی کە لە قۆناخەکانی قەیراندا سیستەمەکان پێیدا دەرباز دەبن، لە سەرمایەداریدا دەگاتە بەرزترین ئاست. چاخی تاکەکەسێتی بەرشکۆ: داڕووخاوترین و خائینانەترین راو و ڕووتی، مۆرکی فەرمی لێدراوە، وادیارە بووە بە چاخی بێ ئەخلاقترین تاکڕەوێتی کە لەژێر پاراستنێکی توند دایە و تا دوارادە بەرژەوەندیخوازە.
مسۆگەرە کە قۆناخێکی قەیراناوی و گەندەڵی سەردەمەکانی ئایدیۆلۆژی لە ئارادایە. تەنانەت چاخی وشکە بڕواکانیش بە گوێرەی خۆیان دونیایەکی لۆژیکییان هەیە. لە ناو خۆیاندا تیۆرییەکی جێگیری ژیان پەیڕەو دەکرێت. فەلسەفە هەم چەمکی گەردوونی، هەم لە لایەنی ئەخلاقییەوە لە هەندێ قۆناخدا نوێنەرایەتی مرۆڤایەتی کردووە. بەڵام لە سەردەمی قەیرانی گشتی شارستانییەتدا، ئەو تاکڕەوێتییەی خۆی کردووە بە ناوەندی هەموو شتێك، سەرباری تەواوی لۆژیکی بەرژەوەندیخوازی، نە بەرامبەر بە بەها مێژووییەکان و نە بەرامبەر خەیاڵە یۆتۆپیەکانی ئایندە، هیچ رێزێکی نییە. چوونێکی شێتانە بەرەو ئەو تاکڕەوێتیە هەیە کە بیر لە رۆژانە دەکاتەوە و لە مێژوو دابڕاوە و غەریزەکانی لە جێی ئازادی داناوە، بێ ئاسۆیە و زۆر رووکەشانەیە.
لە چاخەکانی وشکە باوەڕی (دۆگماتیزم)دا تاك لەناو کۆمەڵگا تواوەتەوە و پێشتر هەموو شتێکی دیاریکراوە. زێدەڕۆیی ئەمە گرنگترین فاکتەری بابەتی بناخەی بەرزبوونەوی کەسێتی تاکە لە چاخی نوێدا. هەرچی لە سەردەمی قەیرانی سەرمایەدارییدایە، قۆناخێکی پێچەوانەی ئەمە لە ئارادایە، تەواوی بەها واتادارەکانی کۆمەڵگا لەناو تاکڕەوێتییەکی زێدەڕۆ تواوەتەوە. ئەو کاردانەوەی لەژێر ناوی سۆسیالیزم بەرامبەر ئەمە نیشاندرا، بە واتایەك رێگای لەپێش سۆسیالیزمی راهیبە سۆمەریە هاوچەرخەکان کردەوە. ئەمانە نموونەی زەق و بەرچاون سەبارەت بەوەی چۆن زێدەڕۆیی یەکتری تەواو دەکەن.
لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی ئەوە بە بیری مرۆڤایەتیدا نەدەهات کە چاخ بە وەرچەرخانێکدا دەرباز نەبێت. دروست کردنی چەك لە وزەی ناوکی لە سەرووی هۆکارە تەکنۆلۆژییەکانی ئەمەوە دێت. قووڵبوونەوەی شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی، لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەدواوە خوڵقاندنی رۆحێکی نوێی سەردەمی کردۆتە ناچارییەك. شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی کە لە کەسایەتی سەرمایەداریدا لە دوا قۆناخی مەزنایەتی خۆیدا دەژی، لە رەوشێکی وەهادا نییە لە میانەی شەڕی خۆی یاخود لە رێگای کۆمەڵگایەکی دیکەی چینایەتی لەناو ئەو قەیرانە قووڵ و بەردەوامەی تێیدایە ناتوانێ پێهەڵگرتنێکی نوێ ئەنجامبدات.
لەنێو هەناوی داڕووخان و هەڵوەشانەوەدا، هەرچەندە و بە هێواشی بێت بەڵام چاخێکی نوێ هەنگاو بە هەنگاو گەشە دەکات. هەروەکو مەزەندە دەکرێ ئەمە لەوە زیاتر کە کاری رێکخراوە شۆڕشگێڕییە بچووکەکان بێ کە بە چڕی رێکخراوە، سەرەتای چاخێکە تەکنۆلۆژیا رۆڵی تێدا بینیوە و کردوویەتی بە ناچارییەك. شەڕی سەرتاسەری لە رێگای ئەو تەکنۆلۆژیایەی لە ئارادایە رەوشێکی بەمجۆرەی هێناوەتە ئاراوە سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو نەبێ. ئیتر لە رێگای شەڕەوە نە شارستانییەت ئاوا دەکرێ و نە دەڕووخێنرێ؛ تەنیا هەموو لەگەڵ یەکتردا لەناو دەچن. لە لایەکی دیکەوە لە میانەی ئەو تەکنۆلۆژیایەی لە ئارادایە ئاستێك بەدیهاتووە کە بە بێ پەنا بردنە بەر توندوتیژی دەرفەت و توناکاری چارەسەرکردنی تەواوی کێشەکانی کۆمەڵگا رەخساوە. شێوەکانی کۆمەڵگای بێ چینیش لەناویدا، گەیشتن بەو ئاستەی تەکنۆلۆژیا کە پرۆژەی وەرچەرخانی کۆمەڵگای نوێ ئەنجامدەدات، ئەو بوارە ماددییەیە کە چاخی نوێ

پشتی پێدەبەستێ. وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانە ماددەیە، ئاشکراترین فاکتەری گۆڕانکاری کارەکتەری سەردەمە. لە میانەی وەرچەرخانێکی بەمجۆرەی ماددە. سەردەمی چاخەکەش دەبێتە چاخێکی جیاوازتر.

لەو باوەڕەداین ئەم چاخەی هەوڵماندا بە شێوەیەکی بەرفراوان پێناسەی بکەین، ناو بردنی بە قۆناخی شارستانییەتی دیموکراسی راستی لەخۆوە دەگرێت.

بەرلە هەموو شتێك ئەم چاخە، چاخێکە بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا گەلان قورسایی خۆیان لە سیاسەتدا دیاری دەکەن. دیموکراسی (Demoskratiya) بە واتای بەڕێوەبەرایەتی گەل دێت. ئەمەش بە جۆرێکە لە گەلێك لایەنەوە بەدیدێت. تەواوی سەردەمە کۆنەکان لە میانەی ناوی چینە سەردەستەکانەوە دیاری دەکرا. هەروەکو چاخی کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری لەو سەردەمانەدا هەروەکو بڵێی گەلان بە نەبوو لە قەڵەم دەدەن. مێژوو لە رێگای ناوی پادشاکان و بنەماڵەکانیانەوە دەنووسرێ. هیچ ئاگاییەك سەبارەت بە خوڵقێنەرە راستەقینەکان نییە. تەنانەت ئایدیۆلۆژیاش رەنگدانەوەی راستینەی بەڕێوەبەرانە. کاتێك دەسەڵاتی ماددی تێری نەکرد، ئەوا هەموو ساتێك دەسەڵاتی مەعنەوی و هێزی خودایی لە تەنیشت سەریەوە لە ئامادەباشی داناوە. تەنانەت لە سەرمایەداریشدا نەتەوایەتی بە خێرایی بەرەو شۆڤێنیزم دەچێ، وەکو بوونێکی ماددی دەکرێتە گەورەترین بەڵای سەر سەری نەتەوە. لە جیاتی بەرژەوەندی راستەقینەی نەتەوە، لە میانەی نەتەوەپەرستییەوە، دزێوترین بەرژەوەندی چینایەتی دەشارێتەوە.

تەنانەت پراکتیزەکردنی کردارێکی ئاسایی سیستەمی دیموکراسی ئیتر ئەوەی سەلماندووە رۆڵی سەرەکی هی گەلە. ئیتر چاخی باڵادەستی بێ سنووری کەس و بنەماڵە و چینەکان تێپەڕ بووە. ئیتر گەلان بە هەموو هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندێتی کولتوورییەوە کەوتوونەتە گەڕ. تەنانەت ئەو دیکتاتۆرەی بەخۆشیەوە دەنازێ، کاتێك گەل پشتگیری لێبکات دەبێتە خاوەن هێز. لە سەردەمی نئۆلیتیك گەلان لە رەوشی بەرایی پێکهاتندا بوون. لەگەڵ دەربازبوون بۆ کۆمەڵگای چینایەتی هەروەکو بڵێی لە خاك چەقێنران. هەر خاوەنێکی کۆمەڵگای چینایەتی کە تازە دەهاتن، تاوەکو دوایی بەکاری هێنان و خستنیە نێو کار و شەڕەوە.

لە راستیدا ئەوان خاوەن و خوڵقێنەری راستەقینەی مێژوون. بەڵام تەنانەت ناویشیان تێدا دەرباز نابێت. خاوەن و خوڵقکارانی هەموو شتێك کۆیلەدار ـ خاوەنەکان و سیستەمە خوداییەکەیانە. لە کاتێکدا لەژێر ناوی مێژوو بەمجۆرە درۆی مەزن دەنووسرێ، ئەوانیش بەردەوام بە بێ دەنگی و لە قووڵاییەوە، بە ئێش و زەحمەتییەوە، لە زانیارییەکانی سەردەم فێردەبن و چاوەڕوانی ئەوە بوون چاخی خۆیان بێت.

سەرەڕای تەواوی ژەهری نەتەوەپەرستی و فاشیزمی سەرمایەداری، ئیتر سەرلەنوێ لە دایك بوونی گەلان دوا ناخرێت و کۆسپی لەپێش دروست ناکرێت. لەم چوارچێوەیەدا دەشێ قۆناخی دوای شەڕی دووەمی جیهان ببێتە سەرلەنوێ لە دایك بوونەوەی گەلان. چونکە خودی ئەم چاخە، چاخی شارستانی دیموکراسییە کە ژێرخانی پێویستی تەکنۆلۆژی و دەزگا سیاسییەکان بناخەی دەسەڵاتی گەلانن.

گەلێك قوربانی دراوە لەپێناو دەربازبوون بۆ چاخی گەلان. بە درێژایی مێژوو گەلان تەواوی باری ئەو شارستانییەتەیان هەڵگرت کە لەسەر بنەمای چینایەتی بوون. هەموو جۆرە شێوازێکی فشار و کوشتار و چەوسانەوە و تاڵان و دەربەدەری و توانەوەیان لەسەر پیادە کرا. هەر بەمەش نەوەستان؛ تاوەکو دوایی فشار و داسەپاندنی ئایدیۆلۆژی و مەعنەوی تاقیکرانەوە، وروژێنران و دژ بە یەکتریان بەکار هێنان. گەلێك جینۆساید روویدا. بە تایبەتیش لە ئاکامی شەڕە جیهانیە بەرفراوانەکانی سەدەی بیستەم و شەڕە هەرێمی و ناخۆییەکان دیسان ئەوەی تێکشکێنرا گەلان بوون. ئەو شەڕانەی لە چاخەکانی ناوین لەژێر ناوی ئایین بەڕێوەبردرا، ئەوا لە سەردەمی سەرمایەداری لەژێر ناوی نەتەوەپەرستی بە شێوەیەکی بەرفراوانتر و بێ زەییانەتر بەڕێوە برا.

لە تەواوی ئەم چاخانەش گەلان دەستەوەستان رانەوەستان. بەردەوام سەرهەڵدان و هێرشەکانی هۆز و تیرەکان بەرامبەر کۆیلەداری، شێوەکانی بەرخودانی تەواوی گروپە ئەتنیکی و گەلان و کۆمەڵگا نیو فەلسەفی ـ ئایینی و ئایینە تاکخوداییەکان لە چاخەکانی دێرین و ناوین کەم نەبووە. لەم چوارچێوەیەدا هەرچەندە لەژێر ناوی خێڵ و ئایین و ئایینزایی بێت ئەوا مێژوو وەکو مێژووی بەرخودانی گەلان بەردەوام بوو. ئەو مێژووەی کە نەنووسراوە، چەواشە کراوە، کراوەتە موڵکی هەندێکی دیکە، لە راستیدا مێژووی ئازادی گەلانە.

جوڵانەوە هاوچەرخەکانی بەرخودانی گەلان، لە سەدەی بیستەمدا مۆرکی خۆی لە چاخدا. سەرباری تەواوی کەم و کوڕی و هەڵەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لە راستیدا ئەو شەڕانەی لەژێر ناوی سۆسیالیزم و رزگاری نەتەوەیی بەڕێوە چوون لە گەوهەری خۆیدا شەڕی بەرخودان و ئازادی گەلانە.

لە تەواوی ئەم بەرخودانانە ئەو کولتوورانەی گەلان لەسەر پێ مانەوە کە سەرکوت دەکران و هەوڵی لەنێو بردنی دەدرا. تەنانەت ئەگەر بەرخودانی گەلان لە لایەنی سیاسیشەوە سەرکەوتوو نەبێ، ئەوا خۆ بەدەستەوە نەدانی کولتوورەکان سەرکەوتن و بەردەوام بوونیان سەلمێنرا. هەروەکو دەزانرێ لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی، نوێنەرایەتی کردنی گەلان لە دەزگا سیاسیەکاندا گەشەکردنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینی. ئەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لە سەرتاسەری دونیا سەرکەوتنی بەدەست هێنا سەرمایەداری نییە، بەڵکو دیموکراسییە. بۆ بەدیهاتنی ئومێد و خەیاڵی هەزاران ساڵەی گەلان و دیموکراسی هاوچەرخ یەکەمین و گرنگترین هەنگاوە. نموونەی سپی و رەشی باڵادەستی چینایەتی زێدەڕۆییەکە. گونجاوترین رێگای نەهێشتنی جیهانی چەوسانەوە بە پەیڕەو کردنی پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخدا دەرباز دەبێت. پێویستە دیموکراسی هاوچەرخ وەکو سیستەمێکی کارگێڕی گەل ببینرێ کە لادان و زێدەڕۆییەکانی چینایەتی راست دەکاتەوە، جیهانی دەوڵەمەندی گەلان ئاکتیف دەکات و جێگا بە نەریتەکانی ئاشتی و برایەتی دەدات. گەلان کەسایەتی راستەقینەی خۆیان لەژێر سایەی ئەو سیستەمە و دیموکراسییە پێشدەخەن کە بە پرەنسیپە و بەراستی پەیڕەو دەکرێت. ئەو کێشمەکێش و ململانێ ئایینی و ئەتنیکی و نەتەوەییانەی پێشتر بە لای جوداخوازی و پارچەبوون ئاراستەیان دەگرت و رێگایان لەپێش پەنابردنە بەر توندوتیژی و شەڕ دەکردەوە، لە سیستەمی دیموکراسی هاوچەرخدا لەنێو ئاشتیدا بە چارەسەری دەگات. ئەگەر بە گوێرەی داخوازی گەل بێت ژیان لەناو "فیدراسیۆنی جیهان" لە سەرووی هیواکانیانەوە دێت. دەوڵەتە بچوکەکان داخوازی گەلان نییە، بەڵکو ئاواتی تەواوی توێژە نەتەوەپەرست و ئەتنیکی و ئەو چینانەیە کە بەدوای باڵادەستی دەگەڕێن و کارەکتەری شۆڤێنیان هەیە. فیدراسیۆنە هەرێمییە بەرفراوانەکان هەموو جۆرە جیاوازییەکی کولتووری، زمان و ئایینی و نەژادیان بێ واتا کردووە و وەکو شێوەی دیموکراسی هاوچەرخ درێژە بە هەبوونی خۆیان دەدەن و گەشە دەکەن. پێشکەوتووترین و دیموکراسیانەترینیان لەژێر سایەی یەکێتی وەکو کۆمەڵەی دەوڵەتە سەربەخۆکان BDT ، یەکێتی ئەوروپا AB ، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا USA کۆبوونەتەوە. ئەوەی ئەمە دەکاتە ناچارییەك هەبوونی کولتووری گەلان و هێزی تەڤلیبوونی سیاسییە.

ئەوەی لە سەرتاسەری جیهان مۆرکی خۆی لە رەوشی هەنووکەیی داوە، وشیاربوونەوەی کولتوورەکان و گەیشتنی بە شێوەی هاوچەرخ، بووە بە فاکتەرێکی سەرەکی و دەست لێبەرنەدراوی ژیان. بۆ یەکەمین جارە گەلان لە ئایدیۆلۆژیا دوگماتیکیە سڕکەرەکان و فشاری یۆتۆپیا پڕوپوچەکان رزگاریان دەبێت، سەرلەنوێ لەو بۆچوونانە دەئاڵێ کە لە سەردەمی نئۆلۆتیکەوە ژێرخاك کرابوو. سەرلەنوێ رۆحیان بە بەردا دەکاتەوە، لە میانەی هەموو بوون و بەهاکانیەوە دەربازی قۆناخی هاوچەرخ بوون دەبێت.

ئەوە راستینەیەکە و رۆژ بە رۆژ زیاتر ئاشکرا دەبێ شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ بۆ رێنسانسی گەلان وەرچەرخاوە و پێویستە بەمجۆرە پێشبکەوێ. لاوازبوون و لەناوچوونی دیکتاتۆرییەتە چینایەتیە وشکەکان و رژێمە تۆتالیتار و دەستپۆتیزمە هەمە جۆرەکانی، کە گوزارشتی بەرجەستەی ئەم رژێمانەن، دەسکەوتێکی مەزنە بۆ گەلان. هەبوونی گەلان لەگەڵ دیموکراسیدا یەکسانە. لەنێو پەیوەندییەکی دیالەکتیکی دان، کە یەکێکیان بە بێ ئەوەیتر نابێت.

سیاسەت و دەوڵەت و کۆمەڵگای دیموکراتیك ئەنجامێکی زیادبوونی چالاکی گەلانە. ئەگەر دیموکراتیزەکردنی سیاسەت و دەوڵەت تا رادەیەك لەناو کۆمەڵگا بووبێتە رۆژەڤێکی بەپەلە کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوو بەراورد ناکرێت، ئەم پێویستییەش لە هەموو لایەکی جیهان لە ئارادا بێت، ئەوا ئەم راستینەیە لە داننان بە وشیاربوونەوەی گەلان و رۆشنبوونەوە و بوونیان بە هێزێکی سیاسی بەولاوە، هیچ واتایەکی دیکەی نییە. فاشیزم زێدەرۆیی دیکتاتۆرییەتی سەرمایەدارییە. سۆسیالیزمی بونیادنراو دەمارگیری چینی چەوساوەیە. بەڵام دیموکراسی هاوچەرخ سیستەمێکی ژیان و بەڕێوەبردنی گەلانە کە پێگەیشتوە و بناخە ماددیەکەی راستییە و هەربۆیە هەمیشەییە و سەرکەوتنەکەشی بەردەوامە.

ئەم پێناسانە بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا نیشانی دەدەن، سەرباری کارەکتەری قەیراناوی چاخەکەمان کە سەرمایەداری هەڵوەشاندۆتەوە و رووخاندوویەتی، ئەوا ئەوەی وەکو دژ و هێزی هەڵوەشاندنەوە پێشدەکەوێت، چاخی شارستانییەتی دیموکراسی گەلانە.

ئەگەر لە چوارچێوەی پێشکەوتن و پێناسەی چاخی شارستانییەتی دیموکراسی هەوڵبدەین جارێکی دیکە تایبەتمەندێتیەکانی پوخت بکەینەوە:

ا ـ پشت بە بناخەیەکی بەرجەستەی تەکنۆلۆژی و زانستی و ئایدیۆلۆژی دەبەستێ. لەگەڵ ئامێرە میکانیکییەکانی بنەچەیان بۆ فیزیا دەگەڕێتەوە، ئەو ئامێرانەی لەسەر بنەمای کۆنترۆڵی وزەی ئەلکترۆنی و ناوکین بنەما ماددییەکانی کۆمەڵگای دووچاری گۆڕانکارییەکی ریشەیی کردووە. ئەمانە کاتێك بە شێوەیەکی راست و لە جێگای خۆیدا بەکار بێت، دەتوانن هەموو جۆرە زنجیرێکی هەژاری پارچە بکەن کە جیاوازی چینایەتی و نایەکسانی کۆمەڵایەتی پشتی پێدەبەستێ. ئەوە دەست نیشانکردنێکی زانستییە کە سەرچاوەی سەرەکی جیاوازی چینایەتی و نایەکسانی کۆمەڵایەتی بۆ پاشکەوتوویی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەگەڕێتەوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە تەکنۆلۆژیا. شۆڕشە تەکنۆلۆژییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، کۆمەڵگای لەو مەحکووم بوونە رزگار کردووە، زەمینەی ماددی ئەو دەزگایانەی پارچە کردووە کە تەواو پشت بە نایەکسانی دەبەستن. ئەگەر بە پەیوەندی بەڕێوەبەرێتییەکی سیاسی و ئابووری بگەیەنرێن کە لە خزمەتی تەواوی کۆمەڵگا بەکار بهێنرێت، ئەوا لەژێر سایەی ئەم بناخە تەکنۆلۆژیە مرۆڤایەتی دەتوانێ ئازادی و یەکسانی بەیەکەوە پێشبخات. لە رابردوودا خەیاڵی ئەمە دادەنرا. بەڵام لە سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسیدا ئەو ئامرازانەی هاتونەتە ئاراوە، دەتوانن ئەم خەیاڵە بەدیبێنن. لەم چوارچێوەیەدا تەکنیك فاکتەرێکی سەرەکی بەدیهێنانی ئازادییە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا لە دەستی هێزە خۆپەرست و پاشڤەرۆکاندا درندەیەکی لەناوبەرە. هەروەها تەواوی تەکنۆلۆژیا کەوتۆتە خزمەتی سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسی. تەواوی کێشەکە ئاواکردنی بەڕێوەبەرێتیەکی دیموکراسیانەی دەوڵەت و سیاسەت و کۆمەڵگایە کە، بە باشترین شێوە بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا لە خزمەتی کۆمەڵگادا فەراهەم دەکات.

شۆڕشی زانستی و کۆمەڵگای زانیاری تایبەتمەندێتیەکی دیکەی بایەخداری سەردەمە. زانست کە لە رابردوودا کاری دەوروبەرێکی تەنگ بوو، لە سایەی تەکنۆلۆژیای گەیاندن بە خێرا دەگەیەنرێتە کۆمەڵگا. راستینەی کۆمەڵگای زانیاری لێرەوە دێت. لە سایەی ئەمەش دیموکراسی و هێزی بەڕێوەبەرێتی خود بەدەست دەهێنرێ. کۆمەڵگا و دەوڵەت و سیاسەتێکی لە میانەی زانیارییەوە پڕچەك کرابێت، ناچارن بەرامبەر یەکتر روون بن (شفاف) و بەرامبەر یەکدی کۆنترۆڵی دیموکراسیانە پەیڕەو بکەن. ئەو پێشکەوتنانەی لە نێوان زانست و تەکنۆلۆژیا زێدە بووە و رێگای لەپێش تەواوکردنی یەکدی کردۆتەوە، خێراتر بووە. ئەم دیاردەیەی یەکەمین جارە بەدیدێت سەبارەت بە دەرفەت و تواناکارییەکانی بەرهەمهێنان، رێگا لەپێش تەقینەوەیەکی مەزن دەکاتەوە. تەواوی زانیارییەکانی دەرهەق بە فیزیا، کیمیا، بیۆلۆژیا و کۆمەڵگا، هەرەس ئاسا پێشدەکەوێت و دەبێتە سەرچاوەیەکی مەزنی هێزی کۆمەڵگا. هەروەکو مەسەلەی بەڕێوەبردنی تەکنۆلۆژیا، ئاواکردنی کارگێرییەکی دیموکراسیانە بۆ بەکار هێنانی زانستیش کێشەیەکە.

رۆڵی سەرەکی ئایدیۆلۆژیا، رووخاندنی دۆگماتیزمی داب و نەریت و ئاواکردنی یۆتۆپیای ئومێد و بە زیندوویی هێشتنەوەیەتی. لە کاتێکدا لە رابردوو دۆگماکان بەسەر هزر (ژهنیە) زاڵ بوو. لە سەردەمی سەرمایەداریدا ئایینە گەرایی و یۆتۆپیا گەراییە هەمە جۆرەکان پێشکەوت. هەردوو شێوەی ئایدیۆلۆژیاش هەڕەشە و مەترسی مەزنیان لەسەر هزر و هەموو جۆرە بە دەزگا بوونێك ، خوڵقاندووە. ئایدیۆلۆژییەکانی لە جۆری دۆگماتیزم دەبن بە کۆسپ. هەرچی یۆتۆپیا گەراییە لەگەڵ ئەوەی مەترسییەکەی کەمترە و رێگا لەپێش داهێنانێکی سنووردار دەکاتەوە، بەڵام دابڕانی لە واقیع، باوەڕی پوچ و خەیالگەرایی وشك و کەسایەتی چاوەڕێ کار، دێنێتە ئاراوە. دووربوونی هەردوو شێوەی ئایدیۆلۆژی لە جیهانی دیاردە واقیعیەکان و خوڵقکاری، خاڵی سەرەکی هاوبەشێتیانە. هەردووکیشیان نابن بە بناخەی ئایدیۆلۆژی چاخی شارستانییەتی دیموکراسیانە. سەردەم ناچارە خوڵقکاری و زانستی ئایدیۆلۆژیا بە بناخە دابنێت. هەڵبەتە پەیوەندییەکی توند لە نێوان هەردووکیاندا هەیە. چەندە دیاردە و پەیوەندییەکان لە میانەی زانستەوە رۆشن بکرێنەوە، ئەوا بەو ئەندازەیەش دەرفەت و تواناکاری خوڵقکاری دەرەخسێ. ئەو تاکەی لە میانەی زانیارییەکانی مێژوو و کۆمەڵگا وشیار بۆتەوە، ئەقڵی بەسەر شێوازی کاروباری دیالەکتیکیانەی سروشتدا دەشکێ، واتە بە ئایدیۆلۆژیای چاخ گەیشتووە. هێزی دۆگما دەناسێ بەڵام خۆی بەدەستیەوە نادات. خاوەن یۆتۆپیایە بەڵام پشت بە زانست دەبەستێ. چاخەکەمان پشت بە ئایدیۆلۆژیایەك دەبەستێ کە لەسەر ئەم بنەمایە بەرز دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی لە میانەی زانیارییە راستییەکانی سەبارەت بە تەواوی دیاردە و پەیوەندییەکان دەجوڵێتەوە، بە شێوەیەکی لێهاتووانە بە هێزی هونەری و ئەخلاقی جوانی و چاکە دەگات.

ب ـ سیستەمی شارستانی دیموکراسی وەکو چاخی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا جێگای باسە:

لەم بوارەدا پێویستە گەلان لە رێگای ناسنامە و وشیاری و ئیرادەی ئازادی خۆیان بکەونە گەڕ. ئەو ناسنامانەی بە هەزاران ساڵ سڕکراون و سەرکوت کراون، هەوڵدەدەن خاوەنداری لە خۆیان بکەن، هەبوونە کوولتوورییەکان وەکو بەهادارترین میراس پەسند دەکرێ و دەبنە هەوێنی ژیانی نوێ. ئەو هەوڵانەی تاکو ئێستا لەپێناو بەرژەوەندی کەس و بنەماڵە و پێکهاتە و بوونە ئایینیەکان ئەنجامدەدرا، ئیتر بوون و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بۆ خۆی و لەپێناو پێناسەکردن و پراکتیزەکردن ئەنجامیدەدات. دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا؛ بە واتای ئەوەشدێت وەکو کۆمەڵگای زانیاری دەرك بە بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکات، ئەمە دەکات بە داواکارییەك و بۆ دەزگا سیاسییەکانی دەگوازێتەوە. ئەمەش واتای ئەوەیە لە ئیرادەیەکی سەرکوت کراوەوە دەبێتە دینامیکێکی چالاك و دڵخواز و چاودێری کردن. یەکەمین جارە لە مێژوودا کۆمەڵگا لەم چوارچێوەیەدا بە شێوەیەکی زانستیانە خۆی دەناسێ، بەو وشیاریە دەگات کە خاوەن مافە، بە ئاستێك دەگات ئازادانە چارەنووسی خۆی دیاری بکات. ئەم راستینەیە بە پێی پێویست دەیسەلمێنێ کە بۆچی شارستانییەتی دیموکراسی، چاخی دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگاکانە.

ج ـ یەکێك لەو فاکتەرە بنەڕەتییانەی چاخی شارستانییەتی دیموکراسی یەکلاکردۆتەوە، دیموکراتیزەبوونی سیاسەتە. سیاسەت کە بە درێژایی مێژوو وەکو چڕبوونەوەی هێزی باڵاترین کارگێڕی و هونەری بەکار هێنانیەتی، رزگاربوونی لەم پۆشاکە نهێنی و تەسك و دەمامکەکانی پێشکەوتنێکی شاهانەی سەردەمەکەمانە. ئەمەش بەو واتایە دێت سیاسەت لە ئاسمانەوە لە خوداوە، هاتۆتە سەر زەوی. ئیتر ئەو وتووێژانەی سەبارەت بە سەرچاوەکەی دەکران و بێ کۆتایی بوون، کۆتایی پێدێت و دان بەوەدا دەنرێت سەرچاوە سەرەکییەکەی کۆمەڵگایە. ئەو سیاسەتەی بە درێژایی چەندین سەدە بە ئامانجی خەڵەتاندنی مرۆڤ و بەڕێوەبردنێکی مێگەڵ ئاسایانە، ساختەترین و پێشکەوتوترین بەرگی پیرۆزییان لەبەر کردبوو، کراوە بە ئامرازێکی ئاسایی کۆمەڵگا. بەڵام دەرك بەوە کراوە تەنیا وەکو ئامرازێکی درێژخایەن و بەرژەوەندیە ژیانییەکان بەهایەکی دەبێت. ئەم ئامرازە سیحراوی و بە توانا و خودابیەی سەدان ساڵەی بە واتای راستەقینەی خۆی گەیاندووە، لە میانەی پەسندکردنی وەکو ئامرازێکی خزمەت کردنی گەل، بووە بە تایبەتمەندێتیەکی دیار و بەرچاوی سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسی.

سیاسەتی دیموکراسیانە وەکو گۆڕەپانی سێیەمی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا، رۆڵی خوڵقکارترین و نوژەنترین دەزگا دەبینێ. تەواوی دەزگا هاوچەرخەکانی لە هەموو بوارەکاندا ئاوا کراون، لە سەرووی هەمووشیانەوە پارتییە سیاسییەکان کە کارەکتەری دادوەرانە و دیموکراسیانەی ئەو بەهایانە دیار دەکات کە پێویستە بەردەوام وەکو ئەڵقەی سەرەکی گواستنەوەیان لە کۆمەڵگا بۆ دەوڵەت لە دەوڵەت بۆ کۆمەڵگایە، ئەم ئامرازانەی سیاسەتی دیموکراسیانە کە لە هەموو بوارەکانی ئابووری تا رامیاری، لە مافەکانی مرۆڤ تا پاراستنی ژینگە، لە کولتوور تا تەندروستی، لە پەروەردە تا ئاشتی پێکهاتوون، ناتوانرێ باس لە دیموکراتیزەبوونێکی دروستی کۆمەڵگا و پێشخستنی وشیاری ئەم دامەزراوانەی کۆمەڵگای مەدەنی بکرێت کە وەکو کۆمەڵگای سێیەمی

گۆڕەپانی سێیەم بەرز دەبنەوە و بوونەتە پێویستییەکی ژیانی چاخەکەمان. بە شێوەیەکی تێر و تەسەل سەلمێنراوە چاخی شارستانییەتی دیموکراسی سەردەمی هەموو جۆرە ڕێکخراوێکی کۆمەڵگای مەدەنییە.

د ـ پێشخستنی وشیاری دیموکراسیانەی دەوڵەت، تایبەتمەندێتیەکی دیکەی سەرەکی سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسییە. گەیاندنی ئەم ئامرازە بە دەزگای دیموکراسیانە، کە کۆنترین ئامرازی مێژووە و کەوتبێتە دەستی کێ بووە بە ئەژدەها، لە ڕاستیدا گرنگترین پێشکەوتنی شۆڕشگێڕانەیە. ئەوە فەرمانێکی سەردەمە کە ئەو ئامرازەی وەکو نوێنەری بوونی (سیستەمی) ئاسمانی لە سەر زەوی بەرزکراوەتەوە، نابێ لە ئامرازێکی خشتەکاری (تنسیق) ئاستی بەرزی کۆمەڵگا هیچ واتایەکی دیکەی هەبێ. بە شێوەیەکی تێر و تەسەل ڕۆشن کراوەتەوە دەوڵەت لەپێناو تاك و کۆمەڵگایە، پەیوەندی بە خوداییەوە نییە، هاربوونی بە درێژایی مێژوو لەوەوە سەرچاوە دەگرێت وەکو ئامرازی دەستی تاکڕەوێتی و بنەماڵەگەرێتی و دەمارگیری دەستەیەکی سنووردار و تەسك بەکار هێنراوە. بە پێی پێویست ڕوون بۆتەوە، هەر شتێکی دەوڵەت وەکو قەوارەیەکی داڕنراو مەزن کردووە ساختەکاری بووە، بە پێچەوانەوە ئەو کۆمەڵگایانەی داکۆکیان لەسەر ئەوە کردووە پێویستە ببێتە ئامرازی هەرە گشتی کۆردیناسیۆنی کۆمەڵگا، مەزن بوونی واقیعی بووە. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە وەرچەرخاندنی دەوڵەت و خستنە ژێر کۆنترۆڵەوە، گرنگترین دەسکەوت و ڕاستینەی چاخی شارستانییەتی دیموکراسییە. بەمجۆرە گۆڕینی دەوڵەت بۆ ئامرازێکی خزمەت کردن و بەرزکردنەوەی سیاسەتی دیموکراسیانە بۆ ئاستی سەرەکیترین دەزگا، لەهەمانکاتدا هەڵسەنگاندنێکە لە بەرزترین ئاستدا گوزارشت لە سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسی دەکات و شایستەیەتی. وەرچەرخانی بە شێوەی دەوڵەتی دیموکراسیانە سەرەکیترین پێشکەوتنی سەردەمەکەمانە.

کێشەی شێوەکانی دەوڵەتی دیموکراسیانە، لە پلەی دووەمدا جێگای بایەخە. بەڵام وەکو دەرئەنجامێکی پێکهاتە میانڕۆکانیان، ئەوا لە شێوەی کۆنفیدراسیۆنەوە تا دەگاتە شێوەی یۆنیتار لە گۆڕەپانێکی بەرفراواندا تواناکاری ڤەبوونیان هەیە، ئەمەش سەبارەت بە کارەکتەری چارەنوس ئامێزانەیان بایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. بە گوێرەی هەلومەرجی واقیعی و بەرجەستەی وڵاتەکان و گەلان دەشێ بڕیار لەسەر گونجاوترین شێوە بدرێت. بێگومان ئاڵۆزی کێشەکان و ئامراز و دەزگا زۆرەکانی چارەسەری دیموکراسیانە، فاکتەری سەرەکی ئافراندنی دیموکراسییە. کاتێك دەوڵەت ناچار بێت پشت بەو دەزگایانە ببەستێ بێگومان واتای کلاسیکی خۆی لەدەست دەدات، بە واتایەك وەکو باڵاترین ئامرازی کۆردیناسیۆنی نێوان دەزگاکان ڕۆڵ دەبینێ. سەرەکیترین کارەکتەری دەوڵەتێکی خاوەن ئەم پێکهاتەیە بێت، دیموکرات بوونەکەیەتی. کاتێك دیموکراسی فرەلایەنی ڕژێمی دەزگاکان بێت، بە شێوەیەکی سروشتی دەوڵەت ناچاری شێوەیەکی فرەلایەنی دەکات. بە تایبەتی لەگەڵ زیادبوونی بایەخی ئۆرگانە هەرێمییەکان، مەرکەزیەتگەرایی کردووە بە بارێکی گران. هێز لێشاو لە ناوەند بۆ خۆجێی و لە چاوگی سەرەکی بۆ چاوگی خۆجێی دەکاتە ناچارییەك. لێشاوی گشتی سەردەمیش بەو ئاقارەدایە. لە کۆمەڵگاوە تا خێزان، لە دەوڵەتەوە تا ئابووری، لە هەموو ئاستێکدا لەسەر بنەمای ئازادی و دابەشکردنێکی دادوەرانەی تواناکارییەکان و هێز پێکهاتەیەکی فرەلایەنی پێشدەکەوێت. ئەم چوارچێوەیە لە لایەکەوە پەرەسەندنی دیموکراسیانەی دەوڵەت پێشدەخات، لە لایەکی دیکەشەوە وەکو ئامانجێکی گرنگی جوڵانەوەکانی دەستووری نوێ لە شێوەی کۆنفیدراسیۆنەکانەوە تا دەگاتە پێکهاتەی دیموکراسی یۆنیتار بەرەو شێوەگرتنێکی دەوڵەمەندی دەبات. هەروەکو چۆن ئەم دیاردەیە ئەو مەترسیانەی بەلاوەناوە کە لە چەمکی یەکێتی زۆرەملێیانەوە سەرچاوە دەگرێت، لە ئەنجامدا مەترسی دەوڵەتە جوداخواز و بچووکەکانیش لە ئارادا ناهێڵێ کە زیان بە هەموو لایەنەکان دەگەیەنێ. دیاردەی وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا و یەکێتی دەوڵەتە سەربەخۆکان، ئاراستەی پەرەسەندنی دەوڵەتی دیموکراسییانە نیشاندەدات، پێشکەوتنی مێژوویی ئەوتۆن لە گەوهەری خۆیاندا کۆمەڵگای نوێ و سیاسەتی دیموکراسیانە دەکاتە ناچارییەك.

هـ ـ چاخی شارستانییەتی دیموکراسیانە بە ئەندازەی ئەوەی سەرلەنوێ لە دایکبوونی گەلانە، بە شێوەیەکی زەقتر سەردەمی لە دایکبوونی ژنانە. ژن کە هێزی خوداوەندی زایینی کۆمەڵگای نیئۆلیتیك بوو بە درێژایی مێژووی کۆمەڵگای چینایەتی، بەردەوام ڕووبەڕووی وون بوون ماوەتەوە. بە واتایەکی دیکە مێژوو، مێژووی ئەو پیاوە باڵادەستەیە لەگەڵ بەرزبوونەوەی کۆمەڵگای چینایەتی بووە خاوەن هێز. کارەکتەری باڵادەستی چینایەتی لەگەڵ کارەکتەری پیاوی باڵادەست بەیەکەوە پێکدێن. لێرەشدا ئەو یاسایانەی پەیڕەویان لێدەکرێت، درۆ میتۆلۆژییەکان و سزادانە ئیلاهییەکانە. بەڵام زەبری قەبە و ڕووت و ڕاستینەی چەوسانەوە لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. کارەکتەری پیاوی باڵادەستی کۆمەڵگا، تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تەنانەت دەرفەتی ئەوەی نەداوە هەڵسەنگاندنێکی زانستیانە سەبارەت بە دیاردەی ژن بکرێت. لە ئایین زیاتر بە بابەتێکی تابۆ کراو لە قەڵەم دەدرێت. لە ڕاستیدا لەژێر ناوی نامووس ڕاستینەی ژن و مافەکانی شاراوەتەوە کە پیاو بە شێوەیەکی تەڵەکەبازی و خائینانە و زۆردارانە زەوتی کردووە. بە درێژایی مێژوو بێبەشکردنی ژن لە ناسنامە و کەسایەتی خۆی و گرێدانی بە پیاوەوە، دیاردەیەکە لە جیابوونەوەی چینایەتی زیاتر ڕێگای لەپێش دەرئەنجامی خراپتر کردۆتەوە. دیلێتی ژن، پێوانەیەکی کۆیلایەتی گشتی و کەوتنە؛ پێوانەیەکی ئەو درۆ و دزی و زۆرداریەیە کە لەناو کۆمەڵگا بڵاوبۆتەوە؛ پێوانەی هەموو جۆرە ڤرێژی و خولامێتییەکە.

بە پێچەوانەوە گۆڕینی ئەم مێژووە، بەڵگە نەویستە کە ئەنجامی کۆمەڵایەتی قووڵ لەگەڵ خۆیدا دێنێ. سەرلەنوێ لە دایکبوونی ئازادانەی ژن، تەواوی دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگا ئازادی و ڕۆشنگەری و دادوەری گشتی دەکاتە ناچارییەك. مرۆڤایەتی بەوە ئیقناع دەکات لە جیاتی شەڕ ئاشتی زۆر بەهادارترە و پێویستە بەرز بکرێتەوە. سەرکەوتنی ژن، لە هەموو ئاستێکدا بە واتای کۆمەڵگا و تاکی سەرکەوتوو دێت. تەنانەت ئەم چوارچێوە کورتەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە، ئەنجامدانی دیموکراتیزەبوون لە گۆڕەپانی ئازادی و مافەکانی ژن، چەندە مێژووییە. لەم چوارچێوەیەدا دەستپێکردنی سەردەمی ئەو ژنەی وشیار بۆتەوە، ئازاد و بەهێز بووە، لە سەدەی ٢١ مدا دیاردەیەکە لە ڕزگاری چینایەتی و نەتەوەیی گرنگترە. سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسیانە، لەهەر قۆناخێك زیاتر ژن تێیدا بەرز دەکرێتەوە و دەسکەوت بەدەست دێنێ.

بابەتێکی دیکەی کولتووری پیاوسالاری پشت گوێی خستووە، هەڵوێستی نەزانی و بێ بەرپرسیارێتییەتی بەرامبەر منداڵان و بەساڵاچووانە. ئەمانە بە شێوەیەك خراونەتە ڕەوش و ئاستێکی دووەمین و سێیەمینی دوای ژن. بەرامبەر منداڵان جیهانێکی زۆردار و بێ خەم سەپێنراوە. سیستەمی پیاوسالاری بە بێ ئەوەی سایکۆلۆژیا و جیهانەکەیان ڕەچاو بکات، دوور لە بەهاکانی ئازادی و یەکسانی، ئەو کەسایەتی و جیهانەیان کە بەردەوام خیانەت لە خەیاڵە مەزنەکان دەکات و کۆتایی پێهاتووە، هەروەکو خۆی بە ڕۆژ و بە شەو لە هزر و مێشکی منداڵان دەخوێنن و ناترسن؛ هیچ ناکەوێتە نێو ئەندێشەیەك و ئەشکەنجە نابینێ. هەڵوێستی بەرامبەر منداڵان زۆر لەوە ترسناکترە کە مەزەندە دەکرێ. ئەم ڕاستینەیە لە ناوخێزان تا قوتابخانە، لە کۆڵان تا یاریگە زاڵە و بە دەزگا کراوە. مێردەزمە بەسەر جیهانی منداڵان زاڵکراوە. جیهانی بەساڵاچووانیش لە لایەن چەمکێکی هاوشێوەی ئەوە ئابڵۆقە دراوە. هەروەکو بڵێی دیوارێکی پۆڵایین لە نێوان بەساڵاچووان و نەوەکانیان بەرز کراوەتەوە. بێ خەمییەکی دی کۆمەڵگای چینایەتی پێشیخستووە لەم بوارەدایە. مێژوو لەم گۆڕەپانەشدا فەرمانی گرانی خۆی جێبەجێ دەکات. بێ خەمی و بێ ویژدانی گشتی دەرد و خەمەکانی قۆناخی پیری زیاد دەکات.

سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئەم دوو گۆڕەپانە لە لایەنی کۆمەڵگای دیموکراسییەوە پێویستییەکی ژیانییە. ژیان تەنیا بریتی نییە لە لاوێتی هەرزەکاری و بەرەڵا. جیهانێکی تایبەتی منداڵان هەیە کە نابێ هیچ کاتێك خیانەتی لێبکرێت و بەردەوام ڕێزی لێبگیرێت و پێداویستییەکانی جێبەجێ بکرێت. خیانەت کردن لەم جیهانەی منداڵان، گەلێك شتی لەدەست کۆمەڵگا دەرخستوە و ون کردووە. هەرچی بەساڵاچووەکانن، جیهانێکی بلیمەتانەیان هەیە کە بە پارزنگی ئەزموونەکانی ژیاندا تێپەڕ کراوە. کۆمەڵگایەکی ئەزموونەکانی ئەم جیهانە وەرنەگرێت، ناشێ بە دروستی بیربکاتەوە و بژێت. هەربۆیە منداڵێتی و پیری دوو دونیای بەرخۆر نین، بەڵکو جیهانی بەرهەمهێنان و هەمە ڕەنگ و دەوڵەمەند کردنن. سەرلەنوێ بە دەزگا کردنی ئەم دوو جیهانە بە گوێرەی هەلومەرجی کۆمەڵگای دیموکراسیانە و لەسەر بنەمای ئەو ماف و ئازادیانەی کە بۆ ڕەوشەکانیان پێویست و قازانج کردنیان، ئەرکێکی دەست لێبەرنەدراوی

شارستانییەتی هاوچەرخە. لەهەمانکاتدا شارستانییەتی دیموکراسی سەردەمێکە منداڵان و پیران بە خۆشەویستی و ڕێزەوە یادیان دەکرێتەوە و کۆمەڵگا و ئەو وشیاری و هەڵوێستە ئەخلاقییە لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە بوون.

و ـ چاخی شارستانییەتی دیموکراسی دەبێتە سەردەمێك کە مافەکانی مرۆڤ و کەسێتی تاك تێیدا بەرز دەبێتەوە و دەبنە تایبەتمەندێتی دەست لێبەرنەدراوی شێوازی نوێی ژیان. هاتنەوە هۆش خۆی ئەو مرۆڤایەتی و تاکەی لەژێر سایەی دۆگماکان و یۆتۆپیاکان زیانێکی زۆری بەرکەوتبوو، هەرچەندە بۆ قۆناخێکی درێژی مێژوویی بگەڕێتەوە، زیاتر لە میانەی ڕێنسانسەوە هەنگاوێکی مێژوویی هاوێشتووە، بەڵام لە ئەنجامی تاکڕەوێتی سەرمایەداری دیسان ڕووبەڕووی لەدەستدان بۆتەوە. شۆڕشە زانستی ـ تەکنۆلۆژییەکانی سەدەی بیستەم، مرۆڤایەتی و تاکی ناچاری هیومانیزم و کەسێتییەکی پێگەیشتووتر دەکات. تەنیا سەدەیەکی خیانەت و خوێن ڕشتن نییە کە بە شێوەیەکی سەیر تاك و مرۆڤایەتی دووچاری دۆڕان کرد، لە میانەی تواناکارییەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا سەرلەنوێ مرۆڤپەروەری و کەسێتی تاك وەکو بەهای هەڵکشاو بەدەست دەگرێتەوە و زاڵ دەکرێت. مرۆڤپەروەری و تاکە کەسێتی کە هێندەی مێژووی مرۆڤایەتی کۆنن و لە سەردەمی پێکهاتنی کۆمەڵگاوە وەکو ئومێدێك مەزن دەبن، لە سایەی زەمینەیەکی ماددی پتەو و زانستدا بۆ یەکەمین جارە بە سەردەمێك گەیشتووە توانای بەدی هاتنی هەیە. ئەو مرۆڤایەتیەی بەردەوام لە میانەی تایبەتمەندێتیە ئەتنیکی و ئایینی و نەتەوەییەکان دابەشکرابوو، ئیتر بە ڕەوشێك گەیشتووە کە لە میانەی زمانی تەکنۆلۆژیا و زانست و دیموکراسی ببن بەیەك. توانستەکانی هێندە دەوڵەمەندە دەتوانێ مرۆڤایەتییەکی ڕاستەقینە تێر بکات. ئەنتەرناسیۆنالیزم بووە بە دەزگایەك لەگەڵ هیچ قۆناخێکی ڕابردوو بەراورد ناکرێت و ناتوانرێ دەستی لێبەربدرێ. مافەکانی مرۆڤ تەنیا وەکو گۆڕەپانێکی یاسایی ناوەستێ، بەڵکو لە بواری تاکە کەسێتیشدا بە وشیارییەك دەگات کە بە شێوەیەکی واقیعیانە هاوسەنگییەکی سەرکەوتوو لەگەڵ کۆمەڵگا بەدی دێنێ و بە دەزگا دەبێت.

بۆ یەکەمین جارە بە پێی پێویست بە کۆمەڵگا بوون و بەخود گەیشتن لە میانەی یاساوە، لە سەنتەری ژیانی هاوچەرخدا جێگیر دەبێ. لەوانەیە واتادارترین پێشکەوتنی مێژوو ئەوە بێت کە یەکەمین جارە بە کۆمەڵگا بوون و خودگەرایی بە ڕەوشێکی لەبار گەیشتوون، توانای بەدیهێنانیان هەیە. هەربۆیە تەنانەت ئەگەرچی لەبەر ئەم هۆیەش بێت دەتوانرێ بگوترێ سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسی، سەردەمی مرۆڤایەتی ڕاستەقینە و مافی مرۆڤ و بەخود گەیشتنە.

ز ـ ڕەهەندە کاتییەکانی شارستانییەتی دیموکراسی لە سەرەتاکانی خۆیدایە. بەڵام دەتوانرێ بگوترێ بۆ یەکەمین جارە ئەو قۆناخەی شارستانییەت تێپەڕ دەکرێ کە هەلومەرجە جوگرافییەکان مۆرکی خۆی لێدەدا. ئەم ڕاستینەیەش بە واتای ئەوە دێت پەرەسەندنی شارستانییەتی نوێ هەلومەرجی جوگرافی ناکات بە پێویستییەك. گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی تەواوی شارستانییەتەکانی ڕابردوو لەژێر کاریگەری دژواری جوگرافیادا بوون. ئەم قۆناخە لە میانەی سەردەمی سەرمایەداری کۆتایی پێهات. لە ڕەوشی ئێستادا جگە لەوەی سەرمایەداری لەهەر پارچەیەکی جیهان لە ڕەوشێکی ناهاوسەنگی دایە، پێویستی ئەوە نابینێ سەرلەنوێ وەرچەرخان بکات و لە پارچەیەکی دیکەی زەویدا بڵاوبێتەوە. بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت لەژێر ناوی جیهانگیری دا لە سەرتاسەری جیهان هەلومەرجێکی یاسایی هاوشێوە بخوڵقێنێ کە بۆ خۆی لەبار بێت و پەیڕەو بکرێت. لە جوگرافیاکی لەبار زیاتر، لە هەلومەرجێکی یاسایی لەبار دەگەڕێت. بە گوێرەی سروشتەکەی ئەوەی مەرامێتی لەژێر یاساوە ئەنجامی بدات، ڕزگاربوونیەتی لەو پێکهاتانەی دەزگا ئابووری و سیاسیانەی دەبنە کۆسپ. ئەوەی لەم بوارەدا سەرمایەداری نوێ ئەنجامی دەدات نەتەوەپەرستی نییە، بەڵکو کوسمۆپۆلۆتیکە. قۆناخەکانی سەرمایەداری کۆن چەمکی نەتەوەیی و دەوڵەتی نەتەوەیی دەسەپاند، بەڵام سەرمایەداری گەردوونی ئەگەر زۆر ناچار نەبێت نەتەوایەتی و دەوڵەتی نەتەوەیی دەرناخاتە پێش و تەنانەت ئەمانە وەکو کۆسپێکیش دەبینێ. بۆ یەکەمین جارە سوود لە تواناکانی شۆڕشی زانستی تەکنۆلۆژی دەبینێ و بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی سەرلەنوێ دەزگاکانی جیهانگیری ئاوا دەکات. ئیتر لە جیاتی پێوانە نەتەوەییەکان پێوانەکانی جیهانگیری پەیڕەو دەکرێن. هەموو شتێك بە گوێرەی پێوانەکانی جیهانگیری نرخ و بەهای پێدەدرێ. کاتێك بەها نەتەوایەتییەکانیش لەگەڵی نەگونجێن، فرێدەدرێتە مۆزەخانەی ئاسەوارە کۆنەکان. ئەم هەڵمەتە هاوچەرخەی سەرمایەداری چارەیەك نییە بتوانێ لەو قەیرانە قووڵ و بەردەوامە ڕزگاری بکات کە تێیدا دەژی. سەرمایەداری لە میانەی وەرچەرخاندا ئامانجی درێژکردنی تەمەن و گەیشتنیەتی بە ڕەوشی هێزێکی دیاریکراو لە شارستانییەتی دیموکراتیدا. هەربۆیە دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە سەرمایەداری لە بواری تیۆری و کرداری زوو هەستی بە پێویستی وەرچەرخان کرد. سوودی لە ئەزموونی مێژوویی بینی و لە بەرامبەر سۆسیالیزمی بونیادنراو زووتر کەوتە خۆ و ئەو گۆڕانکاریانەی ئەنجامدا کە شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی دەیسەپاند، بەمجۆرەش باڵابوونی خۆی سەلماند. ئەمە زیاتر بۆ ناوەندە پێشکەوتووەکانی سەرمایەداری لە جێگای خۆیدایە، کە لەژێر ناوی جیهانگیری تەواوی جیهان، سۆسیالیزمی بونیادنراویش تێیدا، سەرلەنوێ وەکو زەرییایەك بەخۆیەوە لکاندووە. ئەمەش وایکردووە پەیوەندییەکانی نێوان ناوەند و کەنار ببێتە کێشە گەرمەکانی جیهانگیری نوێ.

ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان خۆی نوێ نەکاتەوە، مسۆگەر وەکو دەزگایەکی نێودەوڵەتی تێپەڕ دەکرێت. یەکێتی و یەکینە هەرێمی و کیشوەرییەکان پێویستییەکی هاوشێوەیان بە نوژەن بوون هەیە. لە بواری سیاسیشدا چەمکی کلاسیکی یەکێتی نێوان دەوڵەتان لە ڕەوشێکدایە، نە دەتوانێ بۆ جیهانگیری سەرمایەداری و نە بۆ پێوانەکانی شارستانییەت هاوچەرخ ببێتە وەڵام. ئەمەش ئەنجامی هاوسەنگییەکەی نێوان سەرمایەداری کلاسیك و سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو. هەروەکو چۆن ئەم قۆناخە تێپەڕ کرا، پێویستە پێکهاتە سیاسییەکانیشی بەلاوە بنرێت.

پێویستە وەکو دەزگای سەرەکی سەربازی هاوپەیمانێتی ناتۆ و وارشۆ کۆتاییان پێبێت. بە گوێرەی ئەوەی لە مێژە هاوپەیمانێتی وارشۆ کۆتایی پێهاتووە، ئەوا هاوپەیمانێتی ناتۆش بێ ڕۆڵ ماوەتەوە. پێناسە نوێکانی سەبارەت بە ڕۆڵەکەشی دەکرێت هیچ واتایەك بە مانەوەی نابەخشێ. هاوپەیمانێتی سەربازی بەمجۆرە سەردەمیان بەسەرچوو.

ئاستەمە ڕێکخراوە ئابوورییەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی بە بێ خۆ نوێکردنەوە بتوانن درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن. لۆژیکی ئەم ڕێکخراوانە گۆشەگیرکردنی وڵاتەکانی سەر بە سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو لە بواری ئابووری و بەستنەوەی ئابووری وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان بە ناوەندە بەهێزەکانی ئابووری. بە گوێرەی ئەوەی ئەم جیهانە تێپەڕ کرا کە پشتی بەم لۆژیکە قەبەیە دەبەست ئەوا سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئابووری ناچارییەکە. لە ڕاستیدا نارەزایی دژی جیهانگەرایی دژی جیهانگیری نییە، بەڵکو زیاتر دژی ئەم ڕێکخستنە کۆن و ناعادیلانەیە.

سەرمایەداری هاوچەرخ کە بە پێی دەرککردن بەم ڕاستینانە هەڵس و کەوت دەکات، بە تایبەتیش لەسەر بنەمای ئەو ئەزموونانەی لە میانەی شەڕی دووەمی جیهانی و چەندین شەڕی هەرێمی و ناوچەیی وەریگرتوە، بۆی ڕوون بۆتەوە بژاری فاشیزم ڕێگای ڕزگاربوون لە قەیرانەکان نییە. لە میانەی سوود وەرگرتن لە ئەزموونەکانی دیموکراسییەتی بۆرژوازییەت، وادیارە باوەڕی بەوە هێناوە کە سەبارەت بە ناوەند و دەوڵەتەکانی کەناریش، خۆ گونجاندن لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ باشترین بژارە. ئەمەش فاکتەرێکە لە بەرزترین ئاستدا دەرفەتی پەرەسەندنی شارستانییەتی دیموکراسی زیاد دەکات. ئەو ناوەندانەی پێشتر لە دیموکراسی ڕایان دەکرد و هەوڵیاندەدا پەنا ببەنە بەر پاشڤەڕۆتی و فاشیزم، لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەدواوە وەکو بژارێکی گشتی بە چوار پەل خۆیان بە سیستەمی دیموکراسییەوە گرێداوە. سەرباری ئەوەی دەستی لەپێشینەیی و پێوانەکانی چینی خۆی بەرنەداوە، ئەوا بۆ ئەوەی هەموو شتێك لەدەست نەدات چینێکە لە تەواوی چینەکانی دیکە زیاتر دەرکی بە پێویستی پەیڕەو کردنی پێوانە گشتییەکانی دیموکراسی کردووە.

بێگومان شارستانییەتی دیموکراسی دیاردەیەك یان داهێنانێکی سەرمایەداری نییە. هەروەکو لە بەشی پەیوەرستداردا ئاماژەمان پێکرد قۆناخێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییە لەپێناو دەرکەوتن لە قەیران. ئەوەی سەرمایەداری لەم بوارەوەوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوە بوو زوو لە قۆناخ تێگەیشت و خۆی لەگەڵدا گونجاند. سۆسیالیزمی بونیادنراویش کە لە کاتی خۆیدا دەرکی بەمە نەکرد و خۆی لەگەڵ نەگونجاند، بۆیە لە هەڵوەشان ڕزگاری نەبوو. چونکە لە ئەنجامدا لۆژیکی سەردەم و هێزی سوڕەکەی، فاکتەری یەکلایی کەرەوەیە.

داکەوتنی ڕەهەندی کاتی شارستانییەتی دیموکراسی بۆ پلەی دووەم بەرەو لێپرسینەوەی  چلۆنایەتی پێشینەکەیمان دەبات. تایبەتمەندێتی گەردوونی پەرەسەندنی تەکنۆلۆژی و زانستی، فاکتەری هەرە سەرەکییە. زانست و تەکنۆلۆژیا دوو بەهای کۆمەڵایەتی سەرەکین کە موڵکی تەواوی مرۆڤایەتین. کارەکتەرێکی هاوبەشی ئەوتۆیان هەیە ناتوانرێ بکرێ بە موڵکی شارستانییەتێك یان چینێك و نەتەوەیەك. تەواوی مرۆڤایەتی بەشداری تێدا کردووە. ئەو یەك دوو هەنگاوە بچووکەی کۆمەڵە سەرەتاییەکانی سەردەمی هۆڤێتی هاوێشتوویانە، لەو هەنگاوانە کەم بایەختر نییە کە زانایە ئەمریکی و ئەوروپاییەکان هاوێشتوویانە. مێژوو ئەوە نیشاندەدات کە تەنیا لە ساڵانی ١٦٠٠ ی زایینی پێشکەوتنێکی زانستی ئایدیۆلۆژی ئەوتۆ هاتە ئاراوە کە هاوتای ئەو پێشکەوتنە بێ کە لە ساڵانی ٦٠٠٠ تا ٤٠٠٠ پ.ز لە کەوانی بە پیت ئەنجامدرا. بە گشتی کۆك بوون لەسەر ئەو بۆچوونە کە پێشکەوتنەکانی زانست و ئامرازەکانی سەردەمی نئۆلیتیك ئەنجامی گشتگیر و گەردوونی لە بواری مرۆڤایەتی و کات و بەرفراوانیدا خوڵقاند.

دوای ئەوەی زانست و تەکنۆلۆژیا تایبەتمەندێتی گەردوونی لەخۆوە گرت و شێوازی کۆن لە سەرلەنوێ دابەشکردنی جیهاندا بێمانا بوو، دیاردەیەکن بۆ یەکەمجارە بەم گشتگیریە بەدی دێن. ئەو دیاردانە نیشاندەدەن ناتوانرێ پەیوەندییەك لە نێوان بڵاوبوونەوەی جوگرافی و پێشکەوتنی ئاوا بکرێ. ئەم راستیەش داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات، ناتوانرێ شارستانییەتی دیموکراسی وەکو بەرهەمی ناوچەیەکی دیاریکراو هەڵسەنگێنرێ، بەڵکو هەروەکو زانست و تەکنۆلۆژیا داهێنانێکی گەردوونیە. بەهادارترین بەرهەمی شارستانییەتە و لە میانەی ئەزموونی درێژخایەنی مرۆڤایەتی پاڵێوراوە. جارێکی دیکە باس لە گەشەکردن و گشتگیری و شێوەبەندیەکەی ناکەین چونکە پێشتر لە چوارچێوەی پێناسە کردندا ئاماژەمان پێکردبوو. هەوڵدەدەین ئەو ڕەوشە روون بکەینەوە کە لە میانەی ڕەهەندی گەردوونییەوە ئەنجامدراوە و لە بواری فێربوونەوە سوددمەندە.

بەرلە هەموو لایەك ناوەندە بەهێزەکانی سەرمایەداری توانای گەیشتن بە شارستانییەتی دیموکراسیان نیشاندا. ئەم تایبەتمەندێتیەش پەیوەندییەکانی نێوان شارستانییەتی دیموکراسی و پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی دیاری دەکات. راستتر ئەوەیە کاریگەری شارستانییەتی دیموکراسی لەسەر گەشەکردن یەکلا کەرەوەیە. کامە دەوڵەت و سیستەمی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گشتگیر ئەم پەرەسەندنە بەخۆیەوە ببینێ، پێکهاتە ئابووری و سیاسیەکەی زیندووتر و بە بەروبوومتر دەبێ. هەروەها لەبەر ئەوەی ناوەندە پێشکەوتووەکانی سەرمایەداری بە شێوەیەکی بەرفراوان و زوو دەرکیان بەم ڕەوشە کرد، توانیویانە ببنە پێشەنگی پێشکەوتنەکانی سەردەمی نوێ. لە بواری لێکۆڵینەوەی وردەکارانەی تیۆری و کرداری دیموکراسیانە و هەرسکردن و پراکتیزە کردندا، زۆر بەرەو پێشەوە چوون.

لەم بوارەدا ئەوروپا ڕۆڵی پێشەنگ دەبینێ. هەرچەندە هەندێ جیاوازییان لە نێواندا هەبێت، بەڵام تەواوی وڵاتانی ئەوروپا دەرکیان بە پێویستی هەرسکردن و پێشخستنی سیستەمی دیموکراسی کردووە. بە تایبەتی ئەو ئامارە مەزن و خوێناویەی پێکدادانە ئایینی و نەتەوەییەکان ڕێگایان لەپێش کردەوە و بە سەدان ساڵی خایاند، ئەوروپای بەرەو ئەم ئاقارە برد بە شێوەیەکی توند و چڕ بە کارەکتەری ئاشتیخوازی و تەبایی و دیموکراسییەوە بئاڵێ. چارەسەرکردنی کێشە هەمە جۆرەکان لە ڕێگای ڕێککەوتن و بە بێ پەنابردنە بەر توندوتیژی گرنگترین تایبەتمەندێتی کولتووری نوێی سیاسییە، ئینجا ئەم کێشانە چەندە ئاڵۆز بن و کێشەکان مەسەلەی سنووری سیاسی بێت یاخود جیاوازی ئایینی و ئایدیۆلۆژی و فاکتەری ئەتنیکی و نەژادی. پێ بە پێ پەرەسەندنی دیاردەی یەکێتی ئەوروپا گوزارشتی هەرە بەرجەستەی ئەم پەرەسەندنانەیە. یەکێتی ئەوروپا تەنیا یەکێتییەکی سیاسی نییە بەڵکو پرنسیپێکی گشتییە. ئەم یەکێتیە کێشەی بەرفراوان بوون و قووڵ بوونی هەیە. شیمانەی هەرە مەزن کۆکردنەوەی تەواوی وڵاتانی ئەوروپایە لەژێر سایەی فیدراڵیەتێکدا. ناشێ ڕێگا بە ئەوروپایەکی دواکەوتووتر بدات. چاوەڕوانی دەکرێت لە میانەی ئەم پرۆژەی شارستانییەتی نوێ کاریگەری لە تەواوی جیهان بکات. هێندەی شارستانییەتی دیموکراسی بەرفراوان و قووڵبکاتەوە بەو ئەندازەیە دەتوانێ پایەی پێشەنگایەتی خۆی لە جیهان تۆکمەتر بکات. بەڵام بەردەوامبوونی ئەو هەلومەرجەی سەرمایەداری هێنایە ئاراوە و ڕەگ داکوتانی ژیانی سەرمایەداری، هەڵگری ئەم وزە شاراوەیە نییە بتوانێ ئەم ڕەوشە زیاتر بەرەو پێشەوە ببات. نوێنەرایەتی هێزە راستڕەوەکانی گەشەکردنی شارستانییەتی نوێ دەکەن. هەروەکو لە چەندین پێشکەوتنی شارستانییەتی دیکە بینراوە، پێویست دەکات ڕۆڵی ناوەندی لە گۆڕەپانێکدا پێشبکەوێت کە زۆر دووریەتی و تەنانەت لەگەڵیشیدا ناکۆك بێت. ئەوەی ئەم ڕۆڵە لە ئەستۆ دەگرێ، لە هەلومەرجی جوگرافی ئەو گۆڕەپانە زیاتر هەلومەرجی کولتووری پایەیەکی یەکلاکەرەوەی دەبێت.

تا رادەیەکی مەزن ئەوروپا وزەی شاراوەی خۆی بەکار هێناوە. شتێکی نوێ نەماوە بیخوڵقێنێ. لەبەر ئەوەی هزر و ڕۆحی سەرمایەداری پەردەیەکی پتەوی پێکهێناوە ڤەبوونی بەرەو کەسایەتی شارستانییەتی نوێ سنووردار دەبێ. بەڵام دیسان بەهۆی ناکۆکییە ناوخۆییەکان زۆربەی کەسایەتی و ناوەندەکانی هێز، ڕۆڵێکی بونیادگەرایی لە شارستانییەتی نوێ دەبینن. ناتوانرێ نکۆڵی لە تەواوی خاسییەتەکانی ئەوروپا بکرێت، مەگەر پاشڤەڕۆکان ئەمە ئەنجامبدەن، بەڵام ئەمەش دەرفەت بە پەرەسەندن نادات. ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت، لە میانەی هەڵوێستێکی رەخنەگرانەوە چی بە کەڵکی وەرگرتن دێ وەربگیرێ، توێکڵە موحافەزەکارەکەش تێك بشکێنرێ و فرێ بدرێت. بەهۆی ئەوەی ئەوروپا لە میانەی کاردانەوەی خۆی توانای بەدی هاتنی شارستانییەتێکی نوێی نییە، تەنیا ڕۆڵی بەشداریکردن دەبینێ. هەڵوێستی هەرە راست ئەوەیە، نە نکۆڵی لێبکرێت و نە چاوەڕوانی ڕۆڵی فریادڕەسی لێبکرێت. بەڵکو شیکردنەوە و بەرجەستەکردنی هێزی تێپەڕکردنی لە میانەی ناسنامەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژی، پێویستییەکی ئەم هەڵوێستەیە. بەمرِنگە ئەوروپا بە ڕەوشێك دەگات؛ وەك ئەو سەردەمەی ناوەندەکانی شارستانییەتی سۆمەر، میسر، گریك و ڕۆما پێیدا دەرباز بوون. لە راستیدا دەربازی ئەم قۆناخە بووە. پێویست دەکات بە قووڵایی لەنێو ئەم قۆناخەدا بژیت. هەر لە ئێستاوە چەندین وڵاتانی کەنار وەکو ناوەندێك ئەوروپایان تێپەڕ کردووە. لە کاتێکدا ئەوروپا پیر دەبێت، نەوەکانی کامڵ دەبن.

ئەمریکا کوڕێکی لەخۆبایی ئەوروپایە و لە کیشوەرێکی دیکە لە دایکبووە. جوگرافیای دەست لێنەدراو و لەباری باکوری ئەمریکا دەرفەتی پێدا بە خێرایی مەزن بێت. ئەم جوگرافیایەی ڕەوتەکانی (مغامرە)ی ئەوروپییەکانی بەخۆیەوە بینی، هێندە سوورەکانی ڕووبەڕووی ڤڕکردن کردەوە. دوای بەرخودانێکی دیاریکراو لەم دوو سەدەیەی دوایی سەربەخۆیی خۆی بەدەست هێنا و لە گەلێك بواردا باڵابوونی بەدەست هێنا. ئەو کۆچەی لەهەر چوارلای جیهان ڕوودەدات مۆدێلێکی دونیای هێناوەتە ئاراوە. دەشێ ئەمە بە جیهانی تازە پێگەیشتووەکان ناو ببرێت. لەخۆبایی و هیچ نەدیتیەکەی لەم تایبەتمەندێتیەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو دانیشتوانەی بە رق و تووڕەیی ژێرکەوتنەکانی وڵاتی خۆیان دەجووڵاننەوە؛ جیهانێکی ڕۆحی بێ ویژدان و پێکهاتەیەکی لۆژیکی بێ هەستی پێکهێناوە کە بێ زەیینانەیە، هەموو شتێکی پارەیە و لە تەواوی پێوانەکانی دا بەرژەوەندیخوازی و براگماتیزم بە بنەما دەگرێت. دەتوانرێ بگوترێ تەواوی ناڕەسەنەکانی مرۆڤایەتی لێرەدا کۆبوونەتەوە و بوون بەیەك و جیهانێکی دژیان پێکهێناوە. ئەمەش دوالیزمێکی خوڵقاندووە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لایەك و جیهان لە لایەکی دیکەوە.

ئەگەر بڵێین سەدەی بیستەم سەدەی ئەمریکایە تا رادەیەك  و لە هەندێ بوارەوە راستە. ڕۆڵ و بەشدارییان لە زانست و تەکنۆلۆژیا لەپێشەوە دێت. لە پێشخستنی شارستانییەتی دیموکراسیشدا ناتوانرێ ڕۆڵی بچووك بکرێتەوە. لەگەڵ ئەوەی لە هەر دوو لایەندا تەواوکەر و پاشکۆی ئەوروپایە، بەڵام لە بواری جیهانگیریدا هەڵگری هەنگاوی خێرا و بەهێزترە. لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم خۆی لە لوتکەدا دەبینێ. بەڵام مسۆگەرە لە ناو خۆیدا دووچاری شپرزەیی هاتووە. تەنانەت ئەگەر لە دوا ڕۆژگارەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆماش نەچێت، بەڵام دیسان لە جیاتی بەرزبوونەوە زیاتر نیشانەکانی ڕووخانی پێوە دیارە. ئەو داگیرکاریە نوێیەی خواستی بۆ جیهان پێشی بخات لە کەسایەتی ڤێتنام، تێپەڕ و بەلاوەنرا. هەرچی هەنگاوەکانی جیهانگیریە ڕۆژ بە ڕۆژ ناڕەزایی بەرامبەر زیاد دەبێ و گۆشەگیر دەبێ. باڵادەستی جیهان لە میانەی نەتەوە یەکگرتووەکان و سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی و ناتۆ زۆر بە سستی بەڕێوە دەچێت و خەرجییەکەی گران دەکەوێت؛ هەروەکو دیارە تێپەڕکردنی ئەم سەروەرییە لە سەدەی بیست و یەکەم و کەوتنە ریزی دووەمەوە، ناچارییەکە.

دەشێ ئەم ڕەوشەی ئەمریکا وەکو ڕەنگدانەوەیەکی ئەوروپاش ببینرێ. ناشێ بیر لەوە بکرێتەوە ئەو ڕەوشەی ناوەند و دایك دووچاری دێت ڕۆڵەکانی پێیدا دەرباز نابن. شتێکی نوێ لە ئارادانییە. وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسی ئەنجامی بدات. بەڵام دیسان ئەو ڕۆڵە سنووردارەی لە جیهان دەیبینێ لەگەڵ ڕۆڵی یەکێتی ئەوروپا دەگونجێ. ئیتر لەخۆوە گرتن و تێرخۆراك کردنی مەیلەکانی سەرەڕۆیی و فاشیزم دژی بەرژەوەندییەکانێتی. هێزێکی بەمجۆرەی نییە بتوانێ دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا ئەنجام بدات. بە پشت بەستن بە هێزی زانستی ـ تەکنۆلۆژی و لەژێر دەمامکی دیموکراسییەت و جیهانگیری درێژەدان بە تەمەنی خۆی کردۆتە ستراتیژییەتێکی سەرەکی. مسۆگەرە لە ناوەوە و دەرەوەش ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبێتەوە و سنوورێك بۆ کاریگەرییەکەی دادەنرێت. ئەو ڕەوشەی سەردەمێك جیهانی گریك بەرامبەر ڕۆما پێیدا دەرباز بوو، ئەمڕۆ لە دووانەی ئەمریکا و ئەوروپا دەبینرێ. هەروەکو بڵێی مێژوو دووبارە دەبێتەوە. سروشتییە کە چارەنووسیشیان لە یەکتر بچێت. هەروەکو چۆن پەلاماری بەربەرییەکان قۆناخی ڕووخانی ڕۆمای خێرا کرد، ئەوا ئەو ڕەوتانەی شوێنگەیەکی هاوشێوەیان هەیە هەرچەندە بە بەربەرەکانی جیهانیش ناوزەد نەکرێن، ڕۆڵێکی هاوتا دەبینن لە قەیران و هەڵوەشانەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. شێوازی دیالەکتیکی سەدەی بیست و یەکەم پێشبینی دەکات، ئەمریکاش دووچاری هەمان ڕەوشی سۆسیالیزمی بونیادنراوی روسیا بێت.

ئاسیای کیشوەری دایکی شارستانییەتەکان پێشکەوتنێکی پارچە پارچە بەخۆیەوە دەبینێ. ناتوانرێ باس لە شوێنگەی ڕەسەنی هیچ یەکێك لەمانە بکرێت؛ لە باکوور و ناوەڕاستی ئاسیا هاوپەیمانێتی کە روسیا ڕێبەرایەتی دەکات، چین لە ڕۆژهەڵات و زەریای ئارام، هیند لە باشوور و یابان و ئوستڕالیا هیچ ڕۆڵێکیان نییە و تەنیا بەردەوامی شارستانییەتی ڕۆژئاوان.

روسیا و روسەکان نە تەواو ئەوروپایین و نە ئاسیایین، لە نێو دوالیزمێکی قووڵدا دەژین. دوورن لە گەیشتن بە ڕەسەنایەتی. هەوڵدانیان بۆ ڕێبەرایەتی کردنی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەم بۆ روسیا و هەم بۆ جیهان بەگرانی بۆتە ماڵ. ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دەربازبوونی سەدەی بیستەم بە شێوەیەکی خوێناوی و خەمگینی. لە ڕێگای شێوە دۆگماتیك و یۆتۆپیا بێواتاکان هەوڵیاندا لەژێر ناوی سۆسیالیزم، کراسی شێتایەتی لە مرۆڤایەتی بپۆشن. کاتێك لەوەدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا پەنایان بردە بەر سیاسەتی خۆدزینەوە و هەروەکو بڵێی هیچ بەرپرسیارێتییەکیان نییە، بێ ئابڕوویی و داتەپینی خۆیان سەلماند. بەمجۆرە لە دێوەزمەی کۆمۆنیزمەوە بەرەو لایەنەکەی دی چوون و کەسایەتی مافیای سەرمایەداریان هەڵبژارد و بەمجۆرەش بە بێ هیچ دوودڵییەك گوزارشتیان لە دووڕوویی داڕزاوەکەیان کرد. ئێستاکەش لە نێو ڕەوشێکی حەپەساویدان و نازانن بە کام ئاقاردا دەچن. هەروەکو دیارە دوو لایەنییەکەی کەسایەتیان بەردەوام دەبێت. لە کاتێکدا سەرمایەداری قووڵ دەکەنەوە لە دەربازبوون بەم ڕەوشە درەنگ ناکەون کە لە ڕەوشی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەچێت. هەر کاتێك بکەونە خۆ هەوڵدەدەن کاریگەری خۆیان زیاد بکەن بە تایبەتیش لە ئاسیای ناوین و قەفقاسیا. بەڵام چاوەڕوانی ناکرێت ڕەوشیان لە سەدەی بیست و یەکەمدا بگاتە ئەو ئاستەی سەدەی بیستەم. وەکو ناوەندێکی کەنار دەبێ شوێنگەی خۆیان پتەو بکەن و بە قۆناخی خۆماڵی بوون دەرباز ببن. هەوڵدەدەن لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیا و شارستانییەتی دیموکراسی لاسایی ئەمریکا و ئەوروپا بکەنەوە، بیر لە ئەرکێکی ڕەسەن ناکەنەوە.

دەشێ چین پەرەسەندنی سەیر بەخۆوە ببینێ. تاوەکو ئێستاش توانیویەتی هاوسەرێتییەکی دزێو لە بواری ئابووریدا لەگەڵ سەرمایەداری و لە بواری سیاسیشدا لەگەڵ سۆسیالیزمی بونیادنراو درێژە پێبدات. ئەمەش تەواو هاوسەرێتییەکی نامەشروعانەیە. مەزنی ژمارەی دانیشتوان و چالاکبوونیان، ڕێگا لەپێش مەزنبوونێکی ئەژدەها ئاسایانە دەکاتەوە. تاکو ئێستا دیار نییە تا چ ڕادەیەك لە داهاتوو دەبێتە شارستانییەتێکی ڕەسەن. لە مێژوودا باڵابوونی چین و بە توانایی لە لاسایی کردنەوەی شارستانییەتە مەزنەکاندا دەبینرێ. دەشێ بگوترێ چینیەکان لاسایی کەرەوەیەکی کارامەن. یابانییەکان و گەلە هیندۆ ـ چینیەکانیش جێگای خۆیان لەناو ئەم لێشاوە دەگرن. بە شێوەیەکی نایاب لە لاسایی کردنەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراویش سەرکەوتن. تاکو ئێستاکەش هەموو بوارە بە سوودەکانی هەر سیستەمێك وەردەگرن. دیار نییە بەرامبەر بەمە چی لە جیهاندا بڵاودەکەنەوە. شیمانەی بڵاوکردنەوەی ئاشتی و ئارامی بەهێزە. بەڵام لە کاتێکدا لەگەڵ هەر هێزێکی جیهان بکەوێتە نێو شەڕەوە، لە سەرووی ئەو هێزانەوە دێت کە توانای نانەوەی کارەساتیان هەیە. هەروەکو دیارە دەبێتە هێزێکی هەڵکشاو لە سەدەی بیست و یەکەمدا. چۆنیەتی دەرئەنجامی ئەم هاوسەرێتیە دزێوە بابەتێکی جێگای مەراقە. بەڵام نابێ چاوەڕوانی بکرێت کە ببێتە ناوەندی دەرچوونی شارستانییەتێکی جیاواز. بەڵام چینییەکان لە سەرمایەدارەکان زیاتر نوێنەرایەتی سەرمایەداری دەکەن، لە کۆمۆنیستەکان زیاتر نوێنەرایەتی کۆمۆنیستی دەکەن، لە میانەی نیشاندانی توناکاری جامبازی تەنیا دەتوانن بە لاسایی کردنەوە بەرەو پێشەوە بچن. هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ سەنتێزێکی نوێ نییە.

بەڵام هەروەکو دیارە ڕەوشی هیندستان لە کولتووری ڕەسەنی خۆی زیاتر، ئەم باڵادەستیە کولتووریانە قووڵ دەبێتەوە کە بە درێژایی مێژوو لە ئارادابوون. لە سەردەمێکی مێژوودا هیند لە میانەی دەنگدانەوەی دەنگی کولتووری ئاری پێشکەوت، بە براهمانیزم گەیشت و بودای خوڵقاند. کولتووری ئیسلامی بەخۆوە بینی. بە قووڵایی دەرەبەگایەتی کردە موڵکی خۆی. داگیرکارییەك نەماوە نەیناسیبێ و هەرسی نەکردبێت. بەمجۆرە ڕەوشی لەو ژنە دەچێ کە لەگەڵ هەر داگیرکارییەك دەخەوێ و دواتر لێی بە خاوەن دەردەکەوێ. هەروەکو بڵێی لەو مێردە ئینگلیزەی سوودمەند بێت کە لەگەڵ سەرمایەداریدا کردی بە هاوسەر. دەتوانێ دیموکراسییەتی ـ لیبرالی پراکتیزە بکات. دەشێ لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیادا بە ئاستی ئەمریکا بگات. خاوەنی مۆزائیکێکی گەلەرییە کە لایەنی ئاشتیخوازی لەپێشە. وەکو هەمە ڕەنگترین کولتوور جێگای خۆی لە نێو نەریتی ئاسیادا دەپارێزێ. بەڵام زۆر لە هەنگاونانی بەرەو شارستانییەتێکی نوێ دوورە. پەرەسەندنی ڕاستگۆیانەی خۆی لەسەر ڕێبازی ئینگلیزی درێژە پێدەدات. لەم چوارچێوەیەشدا دەتوانێ ناسنامەی مێژوویی خۆی بپارێزێت و پێشکەوێت و درێژە بە هەبوونی خۆی بدات.

ئاسیا چەندین کولتووری مارژینالی وەکو تورکەکان و ئێرانییەکان و ئەندەنوسیەکانی هەیە. بەڵام ئەمانە زیاتر بە گوێرەی ئەوە گونجاوترن جێگای خۆیان لەناو هاوسەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوین بگرن. ناشێ چاوەڕوانی بکرێت روسیا و چین و هیند لە بۆتەی ئاسیای هاوبەشدا ببن بەیەك. وا دیارە لە میانەی ئەو گەوهەرەی هەنووکەیان ناتوانن بگەن بە ئاستی ئەمریکا یاخود یەکێتی ئەوروپا. تەنانەت ڕەوشێکی ڕێککەوتنی گشتیشیان لە ئاسۆدا نابینرێ. ئاسیا تا ئێستا لە مێژوودا چۆن بووە هەروا دەمێنێتەوە و درێژە بە ڕەوشی بەرەی دواوەی تەواوی شارستانییەتەکان دەدات. بەڵام هیچ کاتێك دەست لەو ڕەوشەی بەرنادات کە خۆی بە زەبەلاحی نیشاندەدات.

بەڵام ئەمریکای لاتین تێکەڵەیەك و بەردەوامی ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە. ئەو پەیوەندییەی لەگەڵیاندا ئاوای کردووە، ڕێگای لەپێش هەمە ڕەنگییەکی نایاب کردۆتەوە. هەمە ڕەنگی نەژادی و کولتووری و سیستەمەکانیان بە جوانیەکانیانەوە چەندە سەیر و سەرنج ڕاکێشە؟ ئاستەمە ڕەسەنێتیەك لەمە دەربکەوێت بەڵام کولتوورێکی ئامادەیە بۆ دەرکەوتنی قارەمانێتی و ڕەسەنایەتی تاك. دەشێ درێژە بە خوڵقاندنی کەسایەتی لە جۆری بۆلیڤار و گیڤارا و زاباتا و کاسترۆ بدات. پێویستە چاوەڕوانی نەکرێت وەکو چین و هیند لاسایی برا گەورە بکەنەوە. روکاری یاخیبوونیان هەیە، بەڵام ئاستەمە لە میانەی کەسایەتی موتوربە کراویان بتوانن هەنگاوێکی شارستانییەتی نوێ بخوڵقێنن. بەڵام دیسان چاوەڕوانی دەکرێت لە میانەی هەنگاوی شۆڕشگێڕی نوێ، نوێنەرایەتی کیشوەر و کولتوورێك بکەن کە ئاواتەکانی نوژەن بوون بە زیندوویی بهێڵێتەوە. بە سانایی دەست لەوە بەرنادات بەردەوام ئەو کەسایەتیە دڵسۆز و شەرەفمەندانە بن بۆ ئەوانەی دووچاری تەنگەتاوی دێن. بەڵام هێزەکەیان توانای خوڵقاندنی سیستەمێکی نییە. تەنانەت دەتوانرێ هەرسکردنی شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ لە سەدەی بیست و یەکەمدا بۆیان بە سەرکەوتنێك لە قەڵەم بدرێت.

لە نزمترین ئاستدا ئەفریقیای ڕەش درێژە بە ڕۆڵی خۆی دەدات. نەژادی ڕەش سەمبۆڵێکی ئەم ڕاستینەیە . نەخۆشی ئایدز وەکو کێشەیەکی مەزن بەردەوام دەکات.   وەکو کیشوەر هەموو توناکارییەکی هەیە کە بتوانێ ببێتە دایکێکی گەشاوە. بەڵام بە دەستی مێردە خراپەکانی ناوخۆ و دەرەوە، وا بە سانایی لە ڕەوشی خراپ ڕزگاری نابێت. ئەگەر درەنگیش بکەوێت، لە دایکبوونی لە شێوەی دایکێکی ڕەشی جوانکەلە دەبێت. دەبێتە گۆڕەپانێك زۆر بە سانایی ئەو شارستانییەتەی لێ بڵاو دەبێتەوە کە ڕەنگ و مۆری ژنی پێوەیە نەك پیاو. ئەمریکای لاتین و

هیندیش پەیڕەوی دەکەن. لەهەر سێکیاندا نەریتی ژن و دایك بەهێزە و ئومێد بەخشن. ئەگەر درەنگ بکەوێت و ئاستەمیش بێت، ئەفریقیا بەرخودان دەکات و لەوانەیە لەگەڵ سەرکەوتنی تەواوەتی پێشکەوتنی شارستانییەتی نوێ، بە ناسنامەی راستەقینەی خۆی بگات.

لە بەرامبەر پەرەسەندنی شارستانییەت، ئەو دۆگماتیزمەی پشتی بە بەردەوامکردنی کۆن دەبەستی و هێزی یۆتۆپیای گوزارشت لە خەیاڵەکانی دیاریکردنی نوێ دەکات، دووچاری تێکشکانێکی مەزن هاتن. بە گومانەوە پێشوازی لە تواناکارییەکانیان سەبارەت بە پەلکێشکردن دەکرێت. قۆناخی هاوشێوەی ئەمە لە مێژوو دەبینرێ. لە سەردەمی کەوتن و وەرچەرخانی شارستانییەتی سۆمەر لە دوای ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز و هەڵوەشانەوەی دیدگای کۆیلەداری لە سەرەتاکانی زایین و قۆناخەکانی دەرکەوتنی جوڵانەوەی رێنسانس لە ساڵانی ١٥٠٠ ی زایینی، هەموویان قۆناخی هاوشێوەی ئەمەن و تێیدا گومان سەبارەت بە رابردوو زیاد دەبێت. لێگەڕین و رەشبینی سەبارەت بە ئاییندە بەناویەکداچوونە. جیهانی ٢٠٠٠ رەوشێکی هاوشێوە بەخۆوە دەبینێ. لە کاتێکدا دۆگماتیزم لە پەلەقاژەی لەناوچوون دایە، ئەو رەوشەی یۆتۆپیاش تێی کەوتووە خەیاڵەکان پووچەڵ بۆتەوە، کاریگەری پراگماتیزمی مرۆڤایەتی سڕ کردووە و بێ جۆش و تا رادەیەکیش بێچارەی هێشتۆتەوە. بە تەواوی فەلسەفەی رۆژانە پەیڕەو دەکرێت. تواناکاری ئافراندنی خەیاڵی نوێ لە لایەن سەرمایەداری لە ئارادا نییە. ئەمریکا ئەم خەیاڵە نوێیانە لە میانەی فیلمەکانی هۆلیۆد دەخولقێنێ، بەڵام ناتوانرێ لە رێگایەوە بۆ ماوەیەکی درێژ مرۆڤایەتی بخەڵەتێنێ و خەریکی بکات. ئەو براگماتیزمەی لە میانەی کۆمەڵگای بەکاربردن پەیڕەو دەکرێت، ناتوانێ پێکهاتەیەکی نەریتی فەلسەفی بنەڕەتی و خەیاڵێك بخولقێنێ، چونکە ئەمە لەگەڵ گەوهەرەکەیدا ناکۆکە. لە هەموو بوارێکدا پرەنسیپی ژیانی رۆژانەیی پەیڕەو دەکرێت. ئەمەش چەمکی قۆناخەکانی قەیرانە کە بەسەربردنی ژیانی رۆژانە بە بنەما دەگیردرێ. سەقەتیە هەرە سەرەکییەکەی بنەمای یۆتۆپیای کۆمۆنیزمی، نیشاندانی پراکتیکی ناکۆك بوو لەگەڵ ئەو ئامانجانەی بۆی تێدەکۆشا لە میانەی نموونە نەرێییەکەی سۆسیالیزمی بونیادنراو گۆمانێکی مەزن بەرامبەر بە سەرنج راکێشی سۆسیالیزم پێشکەوت. سۆسیالیزم پێویستی بە هەوڵ و کۆشش هەیە لەپێناو نوێبوونەوە و وەرچەرخانێکی ریشەیی.

بەرامبەر بەو راستینەیە مرۆڤی ئەم چاخەمان ناچارە سەرلەنوێ بکەوێتە نێو لێگەرینێکی مەزنەوە. دەشێ لە میانەی ئەو تواناکارییەی بە دەستیەوەیە رۆژی خۆی بباتە سەر، بەڵام ناتوانێ پێکهاتەیەکی بنەڕەتی بۆ ئاییندە ئاوا بکات. بە رەوشێك گەیشتوە چاوەڕوانی فریاکەوتن لە لایەن دۆگماکان ناکات. ئەزموونی ئەوەشی بینی کە بە دواکەوتنی ئەو یۆتۆپیایانەی هەڵگری بناخەیەکی زانستی و تەکنۆلۆژی پێویست نین، ئەنجامێکی جیاواز لەوەی دۆگماتیزم لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. لەگەڵ ئەمەشدا لە نێو گەورەترین شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی سەردەم دەژی. ئەو شارستانییەتە دیموکراسیەی ئەم بناخەیە دەرفەتی پێداوە، تەواوی جیهانی راپێچ کردووە. بەڵام خودی شارستانییەتی دیموکراسیش لەوە دوورە بتوانێ ئەو جەمسەرە دژانە نەرم بکات تەنانەت قۆناخی بەربەریەتیشیان دەرباز کردووە، هەروەها هەر نەیتوانیوە لە میانەی پلاتفۆرمی گونجاوی تەبایی چارەسەری ئاسان بکات، تاکو ئێستا لاوازی نەبوون بە ریشەیی و هەمیشەیی و درێژخایەنی بەلاوە نەناوە. لە راستیدا ئەم قۆناخەی لە ئارادایە قۆناخێکی مێژووییە پێویستە لە میانەی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و قووڵکردنەوەی لێگەڕینەکان و بینینەوەی چارەسەری ریشەییانە بەسەر ببردرێن و درێژخایەن و ناچارییە. بە بێ تێپەڕ بوون بەم قۆناخە توانای پەڕینەوە نییە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا هەروەکو لە کۆمۆنەی پاریس و چەندین نموونەی کارەساتی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەرکەوت ناتوانرێ رێگا لەپێش دەرئەنجامی تێکدەرانەی چارەسەریە پێنەگەیشتووەکان بگیردرێ.

ئەو ئەنجامە پڕ لە مەینەتیانەی چەندین پراکتیکی شۆڕشگێڕی خاوەن ئامانجی بەرز و پیرۆز دووچاری هاتن، گرێدراوی ئەم راستینەیە. سەنتێزێ نوێی مرۆڤایەتی سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسی، لە ئەنجامی چەندین تێز و دژە تێزی هەمە لایەن و ئاڵۆز و لە میانەی تێکۆشانێکی هەمەڕەنگ و گەردوونی و مرۆڤانە بەدیدێت، کە جگە لە مافی بەرگری رەوا جێگای توندوتیژی تێدا نابێتەوە. لەگەڵ ئەوەی لە گەلێك ناوەندی جیاوازی جیهاندا ئەم توانستانەی پێشکەوتن لە ئارادایە، بەڵام چاخەکەمان زۆر لەوە دوورە بتوانێ سەنتێز بخولقێنێ. جارێکی دیکە ئاراستەکردنی چەمك و توانای چاودێری و بەدواداچوونمان بۆ نەریتی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین کە سەرلەنوێ بۆتە لانکەی شارستانییەت و لاوێتی خۆی ئافراندووە، هەڵسەنگاندنی وزە شاراوەکەی و ئاسۆکەی لە هێنانە ئارای سەنتێزێکی شیمانە بۆکراو، گەوهەرێکی چارەنووس ئامێزانە لەخۆوە دەگرێت.

## بەشی پێنجەم

### ئایا نەریتی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین

### دەتوانێ ببێتە سەنتێزی شارستانییەتی نوێ؟

**رۆژهەڵاتی** ناوین وەکو گۆڕەپانێکی هەلومەرجی جوگرافی خولقێنەری شارستانییەت، واقیعی نییە بۆ قۆناخی ئاییندە باس لە رۆڵی مێژوویی بکرێت. بە پێچەوانەوە بە هۆی زیادبوونی چۆلەوانی و گەرمایی و بێ ئاوی، چاوەڕوان دەکرێت بکەوێتە رەوشێکی نالەبارترەوە. لەم ماوەیەی دواییشدا سامانی دەوڵەمەندی نەوت بە هۆی ئەو شەڕ و پارچە بوونانەی رێگایان لەپێش کردەوە، رۆڵێکی باشیان نەبینیوە. ئەم سامانەش هیچ بەهایەکی نییە جگە لەوەی داواکاری بەکار بردن (أستهلاك)ی دەستەیەك دەوڵەمەندی دوور لە خولقکاری و داهێنان جێبەجێ دەکات. جگە لەوەی تەواو بوونی ئەم چاوگە نەوتیانە لە ماوەیەکی نزیکدا ناچاری و چاوەڕوان نەکراوە. هەرچی رووبارەکانی لە جۆری فورات و دیجلە و نیلە کە شارستانییەتییان خولقاندووە، زیاتر دەبێتە بابەتێکی گرژی و قەیران. دەشێ کشتوکاڵی ئاودێری لەسەر بنەمای تەکنۆلۆژی نوێ پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینێ. ناشێ چاوگە سروشتییەکانی دەوڵەمەندێتی هاوشێوەی ئەمانە لەپێناو ئەرك و پایەی مێژوویی ناوچە، رۆڵی فاکتەری سەرەکی ببینن. زۆربەی ناوچەکانی جیهان لەم بوارەدا شانسیان لە رۆژهەڵاتی ناوین زیاترە. بە کورتی هەروەکو هەوڵماندا شیبکەینەوە لە سەنتێزی قۆناخی ئاییندە و مێژووی مرۆڤایەتیدا، کاریگەری یەکلاکەرەوەی هەلومەرجی جوگرافی لەخۆیەوە ناگرێت. دوا شارستانییەتی کە جوگرافیا رۆڵێکی چارەنووس سازی تێدا بینی شارستانییەتی سەرمایەداری ئەوروپی بوو. دوای ئەم قۆناخە رۆڵی دیاری کراو بۆ فاکتەری دیکە گواستراوەتەوە.

تەکنۆلۆژیای زانستی بە تەنیا ناتوانێ سەنتێزی سەرەکی شارستانییەت دیاری بکات. هێزی گەیشتنی تەواوی کۆمەڵگاکان بە زانست و تەکنۆلۆژیا توانستێکی بەمجۆرەی لە دەرفەتێکی بە کەڵك دەرخستووە. تەنیا دەتوانێ زەمینەی ماددی لەبار بۆ خولقاندنێکی نوێ پێك بێنێ. لە رەوشێکی بەمجۆرە دایە دەتوانێ ئەم رۆڵەی لە بواری گەردوونیدا ببینێ. هەموو کۆمەڵگایەك دەتوانێ پێی بگات. جوداخوازی ناوچەیەك یا کۆمەڵگایەك نابێ؛ تەکنۆلۆژیای گەیاندن و راگەیاندن بە خۆی دەرفەت بەمە نادات. زیاتر دەتوانێ بە خێرایی و شێوەیەکی هاوسەنگ تازە ئافرێنراو لە دایك بووەکە بۆ ئاستەکانی گەردوونی بگوازێتەوە.

کارەکتەر و رۆڵی سەرەکی شارستانییەتی دیموکراسی روون کراوەیە. لە سەدەی بیست و یەکەمدا ئەم شارستانییەتە لە تەواوی جیهان بە قووڵی و فراوانییەوە درێژە بە بڵاوبوونەوە دەدات. ناچارییەکە دەبێ تەواوی مرۆڤایەتی بە گشتگیری ئەم شارستانییەتە بە خۆیەوە ببینێ. دەشێ چاوەڕوانی بکرێ لە بواری بەڕێوەبردن و شێوەی ژیان بەرەو شێوەی دەوڵەمەندێتی و کامڵ بوون گەشە بکات. بەڵام تەنیا سەربەخۆ سەنتێزێك نییە. ئەو چوارچێوە و شێوەیەیە کە سەنتێز دەئافرێنێ. بێگومان یەکێتی و تەواو کردنێکی دیالەکتیکی لە نێوان شێوە و

ناوەڕۆك لە ئارادایە. بەڵام هاوتا كردنی هەردووكیان بە واتای خزان بۆ میتافیزیكیا دێت. هەربۆیە پێویستە بۆ سەنتێزێكی هەمیشەیی مرۆڤایەتی لە چەمكی دیكەدا بگەڕێین و لەویٚ بدۆزرێتەوە.

جەخت لەسەر ئەوە كرا كە ئەم قۆناخەی تێیدا دەژین قۆناخی لێكۆڵینەوە و لێگەڕینی ریشەییە. هەر لە ئێستاوە ناتوانین ئەنجامی ئەم قۆناخە دیاری بكەین، چونكە دیاری كردنی بە واتای كەوتنە نێو دۆگماتیزم و یۆتۆپیایەكی بیٚ بنگە دێت. تاوەكو ژیان بەردەوام بێت، پەیڕەوی دیالەكتیكی بەردەوام دەبێت. گرنگ ئەوەیە، مەزەندە بكرێت ئەو هەبوونەی دێتە ئاراوە لەسەر بنەمای كامە توانست دەبێت.

كاتێك هەڵسەنگاندنمان سەبارەت بە ناوەندە هەرە گرنگەكانی جیهان كرد بینیمان بە لانی كەم ئاراستەی رێڕەوی خۆیان بۆ سەدەی بیست و یەكەم داناوە. تەنیا ئەگەر هەلومەرجێكی نائاسایی بێتە پێشەوە، ئەگەرنا ناشیٚ لەم رێڕەوە دوور بكەونەوە. شیمانەی هەرە لەپێش ئەوەیە لەمیانەی بەرفراوان كردنی رژێمە دیموكراسییەكان و قووڵ كردنەوەی بە ئاقاری چاوەڕوانكراو و لادانی بچووكەوە درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن.

رۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی ئەم جیهانە و رێنومایییەكانی سەردەم دەبێتە خاوەن شوێنگەی هەرە تایبەت. ئاماژەمان پێكرد ئەمە لەمیانەی پابەند بوون بە جوگرافیاوە بەدینایەت. كەواتە ئەم فاكتەرە سەرەكیانە چین كە ئەم تایبەتمەندێتییانە دیاری دەكەن؟ راسترین شت ئەوەیە لە نەریتی كولتووریدا بەدوای وەڵامدا بگەڕێین. تەنانەت ئەگەری كاریگەری جوگرافیاش، تەنیا كاتێك رەنگدانەوەی خۆی بكاتە سەر كولتوور واتادار دەبێت. دوای پێكهاتنی كولتوور، گرنگی هەلومەرجەكانی دەوروبەر دەخاتە پلەی دووەمەوە. فاكتەری یەكلایی كەرەوە بۆ دینامیكیەتە گەوهەرییەكان دەچێت. هاوبیرییەكی گشتی لەسەر ئەوە هەیە كە مێژووی شارستانییەت مێژووی توانستەكان و پێشكەوتنی كولتوورییە. شتی گرنگ لێرەدا پێناسە كردنی كولتووری و شوێنگە رەسەنەكەیەتی لەپێشكەوتنی شارستانییەتدا. رۆژ بە دوای رۆژ جێگای رۆژهەڵاتی ناوین لە مێژووی شارستانییەتدا روون دەبێتەوە و لە ئەنجامی ئەو لێتۆژینەوانەی دەكرێت دەركی پێدەكریٚ. سەردەمی نئۆلیتیكی ١٠٠٠٠ ساڵ رۆڵی زایینی بەم جوگرافیایە بەخشی و دەرباز بوو. راستییەكی حاشاهەڵنەگرە تەواوی شارستانییەتەكان قەرزاری سەردەمی نئۆلیتیكن. شارستانییەتی سۆمەر و میسر كە بە یەكەمین شارستانییەت دادەنرێت پشتیان بەو داهێنانانەی سەردەمی نئۆلیتیك بەست كە لە ناوچەی كەوانی بە پیت ئافرێنران.

لە تەواوی بەشە جیاوازەكانی هەڵسەنگاندنەكاندا هەوڵماندا لەمیانەی زنجیرەیەك چۆنیەتی كاریگەری ئەوە تا رۆژگاری ئەمرۆمان دیاری بكەین. لە ماوەی سەدەی نێوان دەیەم و پازدەهەمی زایینی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین كەوتە نێو قەیرانێكی قووڵ و بەردەوام و تا ئەم قۆناخە هاتووە. داڕووخانی رۆژهەڵاتی ناوین لە هەڵوەشانەوەی هیچ ناوچەیەكی دیكەی جیهان ناچێت، ئەمەش سەرچاوەی خۆی لە كارەكتەری دایكی زایین وەردەگرێت. ئەو ناوچەیەی بە درێژایی ١٥٠٠٠ ساڵ رۆڵێكی خوڵقكاری لەپێشكەوتنی مرۆڤایەتی بینی، لەگەڵ قۆناخی هەڵوەشانەوەدا تایبەتمەندێتی جیاوازتری لە تەواوی ناوچەكانی جیهان بۆ ئەم گەوهەرە یەكلاكەرەوە و درێژ خایەنە دەگەڕێتەوە. بەم واتایە رۆژهەڵاتی ناوین كەسایەتییەكە. ئەگەر خواستمان بە شێوەیەكی گشتگیر پێناسەی بكەین، دەتوانین بڵێین كەسایەتییەكی مێژوویییە و پێشكەوتنە مێژووییەكانی كردۆتە موڵكی تەواوی مرۆڤایەتی، ناتوانریٚ هەمان شت سەبارەت بە ناوچەكانی دیكەی جیهان بگوتریٚ.

بۆ نموونە چین و هیند و روسیا و ئەمریكای لاتین و تەنانەت ئەوروپا و شوێن كەوتووەكانی، هەروەكو بڵێی جل و بەرگ دەگۆڕن سیستەمی جیاواز شایستەی ناسنامەی خۆیان دەبینن. واتە لای ئەوان سیستەمی سیاسی هەروەكو جل و بەرگ وایە كە ناوە بە ناوە پێویستی بە ئاڵوگۆڕ هەیە. كاتێك كۆن دەبێت یاخود مۆدێلی تازەتر دەردەكەویٚ، گۆڕینی هیچ گیروگرفتێك پێك ناهێنیٚ. چونكە لە ناواخنی خۆیدا شارستانییەتی هەرس نەكردووە. بەڵام بۆ كەسایەتی رۆژهەڵاتی ناوین شارستانییەت جل و بەرگ نییە بەڵكو خودی ژیانە. بە هۆی ئەو شارستانییەتانەی پێیدا دەربازبوون هەروەكو یەكێتی گۆشت و ئێسقانی لێهاتووە. تەنانەت تاوەكو بۆهێڵەكانی چووە و بۆماوەیی جێگای باسە. ژیانی خۆی وەكو بەرگێك فریٚ نادات. هیچ ناوچەیەكی جیهان رەوشێكی بەمجۆرەی بە خۆوە نەدیوە و وەكو رۆژهەڵاتی ناوین لە ناواخنی خۆیدا تێیدا نەژیاوە. مێژوو، كولتوور، شارستانییەت و ژیان، كەسایەتی و كۆمەڵگایەكی ئەوتۆی لە رۆژهەڵاتی ناوین دروست كردووە كە لە هیچ ناوچەیەكی دیكە ناچێت. كولتووری كشتوكاڵی هەزاران ساڵە بۆهێڵی (جین) كۆمەڵایەتی تایبەتی خۆی خوڵقاندووە. شێوەكانی هزری میتۆلۆژی و ئایینی بە هەزاران ساڵ لە بیری (ژاكرە) كۆمەڵگادا ژیاوە. دۆگماتیزم و قەدەرگەرایی بووە بە پارچەیەكی جیا نەكراوەی ژیان. بەمجۆرە هزری خوڵقكار و رەسەن بۆ ماوەیەكی درێژ خایەن كەوتە خەوەوە. فەرمووده و رێنوماییەكانی ئیلاهییات، وەكو تابۆی پیرۆز، بە بیٚ هیچ گومانێك بۆ باوەڕی پێهێنانە. دەركەوتن لە فەرمانەكانی كتێبە پیرۆزەكان بە گەورەترین تاوان لە قەڵەم دەدرێت. بەمجۆرە ئەو چیرۆكانەی لە سەردەمی میتۆلۆژیا زار بە زار دەگێڕدرانەوە بوونەتە رێسای وشكی باوەڕ؛ بووە بە ئایین و خوداوەندێك یادەوەری و خەیاڵەكانی خوڵقێنەری شارستانییەتیان بەند كرد.

تەنانەت مرۆڤ بۆخۆشی لەوە تێنەگەیشت كاتێك بوونە دیلی ئەو شتەی بە دەستی خۆیان خوڵقاندیان، چۆن كەوتنە ناو یەكەمین و گەورەترین نامۆیی مێژوو. كولتوورێك پێكهات كە خوڵقێنەری كرد بە خوڵقێنراو، خوڵقێنراوی كرد بە خوڵقێنەر، ئەوەش كرا بە بابەتێكی سەرەكی هزر و باوەڕ، تەنانەت بەندایەتی كردن و پەرستنی ئەم سیستەمەی كرد بە باشترین ناسنامەی مرۆڤ. بەمجۆرە گومان كردن لەو پیرۆزییە بە گەورەترین تاوان دادەنێن. لە لایەكی دیكەشەوە لە ئاكامی ئەو هێزەی بۆ یەكەمین جارە لە بە دەوڵەت بوون وەردەگیریٚ میتۆلۆژیا بەهێزەكانی گەل و باوەڕییەكان لە بەرژەوەندی دەسەڵاتدارەكان خەسڵەتی خودایی پێدرا و بوو بە چەكێكی دەستیان. لە راستیدا مرۆڤ و كۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین كاتێك داهێنانەكانی خۆی لە بواری ماددی و مەعنەوییەوە لە دژی شكایەوە و بووە دیلی دەستیان، بە ناوی تەواوی مرۆڤایەتی خۆی كرد بە قوربانی. ئەم شارستانییەتەی لەسەر بنەمای ئەم نامۆ بوونە بەرز بۆوە لە چاخەكانی سەرەتا و ناویندا كاریگەرییەكی هێندە قووڵی هەبووە، هیچ گۆشەیەكی جیهان ناتوانیٚ لە ژێر كاریگەرییەكەی رزگاری بێت. ئەمەیە ئەو دیاردەیەی بە كەسایەتی مێژوویی ناوی دەبەین لەمیانەی هەندیٚ بەراوردكارییەوە دەشیٚ زیاتر دەرك بەو رووداوانە بكرێت. كەسایەتی و مردنی دایك لە ئەنجامی ژان و لە دایكبوونی نویٚ بەدیدێت. دار گەورە دەبێت، كاتێك لە رێگای تۆوەكانییەوە دەوروبەری پڕ لە داری هاوشێوەی خۆی كرد دەمرێت. لە راستیدا مردن پێویستییەكی زیاد بوونە. داری كولتووری رۆژهەڵاتی ناوینیش دیاردەیەكە لەم راستینەیە دەچێت؛ تۆوەكانی خۆی لەهەر چوار لای جیهان بڵاوكردۆتەوە. لەبەر ئەوەی دارێكە لە دار بەڕوو دەچێت، هەرچەندە لق و پۆپەكانی لێبكرێتەوە ئەوا لەمیانەی رەگەكانییەوە بە گوڕتر درێژە بە ژیان دەدات. بە یەكەم داری كولتووری رۆژهەڵاتی ناوین لە قەڵەم دەدرێت.

دوای ئەوەی لە ساڵانی ١٠٠٠ تا ١٥٠٠ ی زایینی كەوتە نێو قۆناخی داڕووخان، كولتووری رۆژهەڵاتی ناوین رەسەنایەتی خۆی لە دەستدا. بەمەش لەو دار بەڕووە دەچێت كە تاوەكو رەگ پەلوپۆ و قەدەكانی بڕاوەتەوە. بە گوزارەیەكی دیكە هەروەكو بڵێی بۆ كۆنە گۆڕستانی ئەو مرۆڤایەتیە گەڕاوەتەوە كە خۆی خوڵقاندوویەتی. گۆڕستانێكە هێندەی ئەهرامەكان و زیگۆراتەكان گەورەیە! ئەوە نزیكەی هەزار ساڵە روو دەدات لە بێدەنگی مردن بەولاوە هیچ واتایەكی دیكەی نییە. ئەو لە پەلوپۆ كەوتنەی لە ئەنجامی زایینێكی (ولادە) زۆرەوە هاتە ئاراوە، توانا و رەوشێكی ئەوتۆی نییە هەنگاوێكی خوڵقكارانە بهاوێژیٚ. سەردەمی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەكان تەواو گوزارشت لە زێرەڤانێتی گۆڕستان دەكات. رۆڵی سەرەكیشی ئەوە بوو مردنی نویٚ فەراهەم بكات و لەمیانەی بەخشیشەكانییەوە درێژە بە گوزەران بدات. هەرچی ئایین و بانگدان و سەڵاواتە پڕێتی لە خەمگینی و لە پەیام و بانگەوازی مردن بەولاوە هیچ ئامانجێكی دیكەیان نییە. ترساندن لە رێگای باسی مردن، ئامادەكاری مردن لەمیانەی پەیامەكانی بەهەشت و دۆزەخ، بۆتە شێوەی شارستانییەتی قۆناخی دوایی. هەر لە مێژەوە دەست لە زانست و تەكنۆلۆژیا بەردراوە. كۆمەڵگا و سیاسەت بە شێوەی قاڵبی هەتا هەتایە (أزلی) سووڕاوە و دووبارە بۆتەوە. هەروەكو نموونەی گرگرەی بیر كە سووڕانەوە بە دەوری بیر قەدەرێك دەبینیٚ و بیر لە جۆرێكی دیكەی جوڵانەوە و بەڕێوە چوون ناكاتەوە. چەسپاندنی ئەم شێوە دۆگماتیكیە قووڵە بەسەر ئەو شارستانییەتە مەزن و خوڵقكارە تۆڕێكی قەدەرگەرایی لەگەڵ

خۆیدا دێنێ و ئەمەش دەبێتە هۆکاری ڤەیران و داڕووخان. بەڵام ئەم تابلۆیە راستییەکە و چیرۆکی رۆژهەڵاتی ناوین روون دەکاتەوە. کۆتایی هاتنی تەواوی چیرۆکەکانی خۆشەویستی بە سووتان و بوون بە خۆڵەمێش پەیوەندی بەو واقیعەوە هەیە.

پانزدە هەزار ساڵ رۆڵی دایك دەبینێ و هەموو شتێك بۆ مرۆڤایەتی دەخوڵقێنێ، دواتریش دەکەوێتە رەوشی بەندەیی بێ توانا و بێچارە! ئەو وڵاتە بیت کە بۆ یەکەمین جار خوداوەندە ژنەکانی خوڵقاند و هەموو پێویستییەکی مرۆڤایەتی بخوڵقێنێ، دواییش وەکو پارچە قوماشێك بەکار بهێنرێت و فرێدرێتە گۆشەیەکەوە! تەواوی مەزنایەتی و خوداوەندەکان بخوڵقێنە دواتریش ببیتە بەندەیەکی بێچارەی ئەم خوداوەندانە! تەواوی ئەو پیشانە دەخوڵقێنی کە جیهان تێر دەکات، دواتر بە خۆت بە برسێتی دەمێنییەوە! هەموو شوێنێك دەکەیتە ئاوەدانی، دوایی بە خۆت دەبیت بە لانەواز! دەبیت بە چرا و هەموو کەسێك رۆشن دەکەیتەوە! تاکو ئێستاش لە تاریکایی رزگاریت نابێت! بۆ هەموو کەسێك دەبیت بە دەنگ، مۆسیقا و شیعر بخوڵقێنە؛ دوایی ببیت بە کەڕ و لاڵ! زانست و رێزگرتن و ئامراز بۆ هەموو کەسێك بخوڵقێنە، دواییش بە نەزانی بمێنیتەوە! کۆشك و دیوەخان بۆ هەموو کەسێك دەخوڵقێنێ، دواییش پێویستیت بە بستێك خاك دەبێت! بەڵێ شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین ناوی ئەم ناکۆکییە تراژیدییە گەورەیەیە. هۆکاری سووتان و بوون بە خۆڵەمێش لە چیرۆکەکانی خۆشەویستیدا لەم ناکۆکییەدا شاراوەیە. لەمیانەی تەواوی ئەم بەهایانەوە گەورە دەبێت، دواییش دەبێت بە بستەباڵا. ئەمە تەنیا لەمیانەی سووتانەوە پاك دەبێتەوە. بۆ یەکەمین جار بە یەك گەیشتنی خودای ژن و پیاو دەخوڵقێنێ، دوایی دەبیت بە ژن و پیاوێك کە کەوتوونەتە نێو سووکترین رەوشی سواڵکەرییەوە! ئەمەش تەنیا بە سووتان پاك دەبێتەوە.

گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین زۆر دەگرین. بێگومان دوای لەدەستدانی تەواوی ئەو بەهایانەی خوڵقاندوویەتی دەگریێت. لەم هەزار ساڵەی دواییدا رۆژهەڵاتی ناوین لەسەر بێدەنگی مردن دەگریێت. بانگدان، گۆرانی و ئاوازە مۆسیقییەکان پڕ لە خەمگینین و بانگەوازی مردن دەکات. ئەمانەش هیچ یەکێکییان رێکەوت نییە؛ گوزارشت لە رووداوەکان دەکەن. ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمە ئەنجام درابایە بێ واتا دەبینرا. لێرەدا زیاتر روون دەبێتەوە بۆچی ئەو گۆڕانکاری و رووداوانەی لە جیهان روو دەدەن رۆژهەڵاتی ناوین پێی کاریگەر نابێت. ئەوانەی بناخە و گۆڕەکانیان هێندە گەورە و قووڵە؛ ناشێ لە کەسانی دیکە تێبگەن. چونکە بە بێ خواردنەوە بەردەوام سەرخۆشن، یانیش بە مردوویی لە دایك بوون. ناشێ رابردوویەکی بەمجۆرە لێی ببوردرێ. هۆکاری لێخۆشنەبوونیش دیارە. نابێ ئەم شارستانییەتە بە فرێدراوی بەجێ بهێڵدرێ. ئەوانەی بە جێی دێڵن لە نێو خیانەتی هەرە مەزندان. ئەوانەی لە نێو خیانەتێکی هێندە گەورەدان، لێیان نابوردرێ. خیانەتکردن لە شارستانییەت تاوانێکی گەورەیە و زۆرن ئەوانەی خیانەتییان کردووە. هەربۆیە جوڵانەوەکانی تۆڵەسەندنەوەش مەزن و زۆرن. بەڵام ئەمە چی رزگار دەکات؟ کوشتن و کوژران، لە گەورە کردنی گۆڕستان زیاتر هیچ سوودێکی هەیە؟ لە رۆژهەڵاتی ناوین لە ژێر بیانووی کێشمەکێشی ئایینی و بنەماڵەیی و مەسەلەی نامووس و موڵك و تەنانەت گەلێك بیانووی بچووکی هێندەی ناوکە هەنجیر، جۆگەلەی خوێن دەرژێنرێ. تەواوی ئەمانەش بروبیانوون. شکستی گەورە و خیانەت بناخەی ئەم خوێن رشتنانە پێك دێنن. نەریتی تۆڵەسەندنەوە شتێکی سانایی نییە، چونکە رەگەکەی بۆ رابردوویەکی بەمجۆرە درێژ دەبێتەوە. گەلێك تاوان کە روو دەدەن بۆ راستینەی  ئەم داب و نەریت دەگەڕێتەوە. دیسان بناخەکەی ئەم مێژووە نەفرین لێکراوەیە. تەواوی بەهاکانی شارستانییەت زەوت کراوە و نامووسەکەی پێشێل کراوە. هەروەکو چۆن ئەم راستینە لەسەر گەلێك شت پەیڕەو دەکرێت بەڵام لە مەسەلەی کچ و ژندا کراوەتە سەمبۆل. ئەگەر شتێك لە سەمبۆل بێت، واتا پیرۆزی مەزن پیس کراوە. هەربۆیە سزاکەی هێندە گران دەبێت و بە شێوازێکە پەسند ناکرێت. تراژیدیا سەرچاوەی خۆی لەم مێژووە وەردەگرێت.

رۆژهەڵاتی ناوین گۆڕە لەناو گۆڕێکی دی، گرێیە لەناو گرێ. جیهان دەگۆڕێت بەڵام ئەو ناگۆڕێت. ناچارە وەکو خۆی بمێنێ. دار بەڕووە، بەردەوام رەگەکەی ئەستوور دەبێ. هەرچەندە لقەکانی ببڕدرێت دیسان بەخۆی دەمێنێتەوە. هیچ کاتێك ئومێد بۆ سەوز بوونەوەی نابڕێت. رۆژهەڵاتی ناوین مۆڵگەی ئومێدە. تەنیا ئومێد بە دەست رۆژهەڵاتی ناوینەوە ماوە. لە کاتێکدا نەریتەکە بێبەزەییانە و جێگای لێنەبوردنە و بەردەوام ئومێد چاوەڕوانی چەکەرە کردنی رەگی داربەڕووە. ژیان تەنیا وەکو ئومێدێکی مەزن ماوەتەوە. دانەبڕان لە داب و نەریتە باوەکان، لە هێزەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت. بەڵام سەرلەنوێ نەخوڵقاندنەوەی خۆی، پەرە بە پووکانەوە دەدات. لە کاتێکدا تەواوی ناوچەکانی جیهان رێڕەوی پەرەسەندنی خۆیان دیاری دەکەن، ئەوا پارێزگاری رۆژهەڵاتی ناوین لە تایبەتمەندێتی و رەسەنایەتی خۆی بۆ کاریگەری قووڵی شوێن پەنجەی شارستانییەتی رابردوو دەگەڕێتەوە. ئەم رەوشە هۆکاری ئەوەشە کە ناتوانێ بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە گۆڕانکارییە هاوچەرخەکان هەرس بکات. شوێنەواری شارستانییەتەکانی رابردوو و شارستانییەتی هاوچەرخ دەکەونە نێو ململانێوە. بە واتایەکی دیکە، پێویستی پێکهاتنی سەنتێزێکی نوێ دەخاتە روو. بەڵام سەبارەت بە هیندستان و ئەفریقیا یاخود ئەمریکای لاتین لە سەنتێزێکی نوێ زیاتر، لەسەر بنەمای ئەو چەشنەی سەرمایەداری درێژە بە پەرەسەندنی خۆیان دەدەن کە هەنگاویان بۆ هاوێشتووە. لە بەرخودان زیاتر، قۆناخی هەرسکردن پەیڕەو دەکرێت. رەوشی ناوچەکانی دیکەی جیهانیش لەمە دەچێ. زەمینەیەکی کولتووری بەهێز لە ئارادا نییە. پێویستییان بە ململانێ و سەنتێزێکی نوێ هەبێت. لە رۆژهەڵاتی ناوین نە توانەوە نە وەرچەرخان وا بە سانایی روو نادات. ئالێرەدا بە هێزی نەریتی کولتووری جگە لەوەی بە سانایی ناتوێتەوە و بە وەرچەرخان دەرباز نابێت، ئەوا وزە شاراوەکەی لە خوڵقاندنی نوێدا جێگای بایەخ پێدانە. لە کاتێکدا لە هەموو لایەکی جیهان کێشە نەتەوەیی و ئەتنیکی و ئایینیەکان لەمیانەی رێگایەك بە چارەسەری دەگەن، ئەوا سەبارەت بەم بابەتەش جیاوازی رۆژهەڵاتی ناوین دەردەکەوێتە روو.

ئەگەر کێشەکان لەمیانەی رێچکەکانی شارستانییەتی هاوچەرخ چارەسەر نابێت، ئەوا بەهۆی بەرخودانی کوێرانەی کولتوورییە کە لە ناواخنی ئەم راستینەیەدا شاراوەیە.

پێویستە ئەم راستینەیە بە شێوەیەکی نێگەتیڤ هەڵنەسەنگێنین. بە پێچەوانەوە راستر ئەوەیە وەکو تواناکارییەکی رزگار بوونی سەرمایەداری لەو ڤەیرانە گشتگیر و هەمیشەییەی تێی کەوتووە هەڵیسەنگێنین. ئەو ناکۆکییەی لە ئارادایە ئەوەیە، نەریتی رۆژهەڵاتی ناوین خۆی شینەکردۆتەوە و نەبووە بە نەریتێکی هاوچەرخ. هەندێ فاکتەری دەرەکی و ناوەکی رێگا بەوە نادەن وزە شاراوەکانی ئاکتیف بێت. بەڵام رەگە بەهێزەکانیشی کۆسپ دەخاتە پێش ئەوەی نەریتی دەرەوە بکات بە خۆجێیی. ئەنجامیش قووڵکردنەوەی بنبەستبوون و پێکدادانە. ئەم قۆناخە لە ماوەی نێوان ١٥٠٠ ـ ٢٠٠٠ ی زایینی قووڵ بۆوە و بەردەوام بوو. تاوەکو ساڵانی ١٥٠٠ بە بێ پچڕان هاوسەنگی و باڵابوون بە درێژایی ١٥٠٠٠ ساڵ لەدەستی کولتووری رۆژهەڵاتی ناویندا بوو. ئەم باڵابوونەی لە بواری ماددی و مەعنەوی و دەزگاکانی ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگا بەرەو بەخۆ بڕوابوونێکی زێدەی برد و باوەڕی بەوە هێنا کە بۆتە سەنتێزی جیهان. باوەڕی بەوە نییە جیهانێکی شارستانی لەو باڵاتر پێشبکەوێت، خۆی لە جێگای تەواوی جیهان دادەنێ. ئەوانەی دیکە بە بیانی و گاوڕ لە قەڵەم دەدات. ئەم ٥٠٠ ساڵەی رابردوو تێری تێکشکاندی ئەم دۆگماتیزمەی نەکردووە. باڵابوونی شارستانییەتی رۆژئاوا دەبینێ و هەست بە هێزە ماددی و مەعنەوییەکەی دەکات، بەڵام بە شێوەیەکی دروست دان بەوە دانانێت و هەرسی ناکات. لێرەدا ئەو جیابوونەوە چینایەتییەش کاریگەرییان هەیە کە لە دەوروبەری سەرمایە پێکهاتوون. ئەمانە وەکو پێکهاتەی دروستکراو دەبینن. نە توانای هەیە لەمیانەی قووڵبوونەوە لێپرسینەوە سەبارەت بە بنەما مێژووییەکانی بکات، نە توانای رەتکردنەوەی هەیە. توانای ئەوەشی نییە شیبکاتەوە و بیکات بە کەرەستەی سەنتێزێکی نوێ. چونکە بەردەوامێکی ساکارانەی دەرەوەن. تەنانەت رێگانادات پێکهاتەی لەم جۆرەش ببنە هێزێکی ناوخۆیی.

تاوەکو ئێستاکەش نوژەنی سەرمایەداری رۆژهەڵاتی ناوین دوورە لەوەی دیالۆگ لەگەڵ کولتووری خۆجێیی ناوچە بکات. وەکو بریکارێکی بیانی دەمێنێ. لە لایەکی دیکەشەوە کاتێك خودی کۆمەڵگاش لە نێو ڤالبەکانی ١٠٠٠٠ ساڵ پێش ئێستای سەردەمی نیۆلیتیك دەژیت، لەهەمانکاتدا لە ژیانی ڤاڵبەکانی کۆیلەداری و دەرەبەگاتیش دوورنییە. کاتێك سەرمایەداری و سۆسیالیزمی بونیادنراویش لەسەر تەواوی ئەمانە زیاد بوون، قۆناخی هێندە سەخت هاتە پێشەوە کە دەرکەوتن لێی ئاستەم بوو. رەوشێك لە ئارادایە تاوەکو دوایی تێکچڕژاوە و پەشۆکاوە. هیچ رەوت و دەزگایەکی بە کاریگەر لە ئارادانییە. هەموو شتێك لە نێو شلەژان دایە. پێویست دەکات ئەم قۆناخە کۆتایی بێت و رزگاربوون بەدیبێت. ئیتر تێکەڵییەکی بەمجۆرە هاتۆتە ئاراوە ناتوانرێ هەڵوێستەکانی هەڵگەڕانەوە و خیانەت و هەڵوێستە رەسەنەکان لێك جیا بکرێتەوە.

پێویسته قەیران و داڕووخانی ڕۆژهەڵاتی ناوین پەسند بکرێ. گەورەترین بە هەڵەداچوونی شارستانییەتی ڕۆژئاوا ئەوەیە، کە بە پێی پێویست و بە شێوەیەکی واقیعیانە هێزی ئەو ناوچەیان هەڵنەسەنگاندووە کە بنچینەکەیان پێکدێنێ. هەرە زێدە ڕەگەکەی خۆی تاوەکو شارستانییەتی گریك و ڕۆما درێژ دەکاتەوە. بەڵام شارستانییەتی گریك و ڕۆما قۆناخێکی ڕۆژهەڵاتی ناوینن. مافی سەردەمی نئۆلیتیکیش نادات کە تێرخۆراکی کردووە و خۆپەرستانە هەڵسوکەوت دەکات. لەبەر ئەوەی ئەم بە هەڵەداچوونە ڕێگا نادات دیالۆگێکی ڕاست لەگەڵ ڕابردوو بکات، ناهێڵێ پەیوەندییەکی دیالەکتیکی واتاداریش لەگەڵ ئەم واقیعەی لە ئارادایە ببەستێ. بە ئەندازەی ناسینێکی ڕاست سەبارەت بە ڕابردوو، ئەوا پەیوەندی دیالەکتیکی لە دیاری کردنی سەنتێزی ئاییندەشدا وەکو ناچارییەکە. کاتێك ئەوروپا وەکو (تێز) بیرۆکەیەك پەسند دەکەین، ناشێ ئەمریکا، ڕوسیا، چین یاخود کولتووری ناوچەیەکی دیکە ببێتە (ئانتی تێز) دژە بیرۆکە. هەروەکو لە سروشتدا لە ئارادایە، بیرۆکەکان، دژە بیرۆکەی خۆیان لەو ناوچانە پێکدێنن کە خۆیان لەوێوە هەڵکەوتوون. جگە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین، دەشێ تەواوی ناوچەکانی جیهان ببنە بەردەوامی بیرۆکەی ئەوروپا، بەڵام نابن بە دژە بیرۆکە. یان ئەوەتا هەڵگری جیاوازی و لە یەکچوونی وزەی شاراوەی پێویست نین، یان هێندە دوورن ناتوانن ببن بە دژە بیرۆکە. لە ئەنجامدا یان پاشکۆیەتی یان پێیەوەلکاوە. بوون بە بیرۆکە و دژە بیرۆکەی یەکدی، پێویستی بە یەکێتی سەرچاوەی پێشوو هەیە. ئەمەش لە ڕۆژهەڵاتی ناوین لە ئارادایە.

ئەم هەڵسەنگاندنەش پرسیارێك دەخاتە ڕوو ئەویش: چۆن دەتوانرێ ڕۆژهەڵاتی ناوین بکرێ بە دژە بیرۆکەیەك؟ تەواوی هەوڵەکانی لە یەکچوونی بە درێژایی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو هیچ ئەنجامێکی سەرکەوتووی لێنەکەوتەوە. نەتەوەپەرستی و سۆسیالیزم وەکو دوو تێزی شارستانییەتی ڕۆژئاوا، لە ناوچەکەدا ڕزگاریان نەبوو لەوەی وەکو دیاردەی دروستکراو نوێنەرایەتییان بکرێ. تەنانەت ئەو ئیسلامییەتەی هەرەسی هێنا و لێکدانەوەکانی خۆی لەدەستدا تەنیا سەربەخۆ توانای نییە دژە بیرۆکە بخوڵقێنێ، ئەم تێزە لەوە دەچێ کە باری کەرێك پڕ لە کتێب بکەیت و بە ئۆتۆمبێل بیگەڕێنی. ڕێکخراوەکانی شارستانییەتی دیموکراسیش بە هۆی لە ئارادابوونی نەریتەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت، دوورە لەوەی خاوەنی هەلومەرجەکانی خۆ گونجاندن بێت. بە لانی کەم دامەزراوەکانی شارستانییەتی دیموکراسی پێویستی بە ڕێنسانس و شۆڕشی ڕۆشنگەری و ریفۆرمی ئایینی هەیە. کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین ئەم سێ قۆناخە مێژووییە سەرەکییەی بەخۆوە نەدیوە. هەربۆیە داکۆکی کردن لەسەر ئەوەی ڕێکخراوە دیموکراسییەکان بە سانایی پەرە دەسەنن. بەرەو هەڵەیەکی مەزنمان دەبات. هەربۆیە ئەم جۆرە دەزگایانە ڕۆڵی دامەزراوێك دەبینن کە لە دەرەوە پارچەکانی پێکەوە لکێنراوە و چەسپێنراوە. ڕاستینەی ئیسرائیل پێیەوە لکێنراوە و تاوەکو ئێستاش هەرسی نەکردووە. پارتە لیبرالییەکان و کۆمۆنیستەکان پارچەیەکی ئەم پێوە لکاندنەن. لە قووڵاییدا لەگەڵ قەوارەی مێژوویی و کولتوورییەکەی نامۆ بووە. دووبارە زیندوو کردنەوەی ئیسلام ڕێگا لەپێش هیچ دیاردەیەکی خولقکارانە ناکاتەوە. تەنیا یادکردنەوەی مێژوو دەسەپێنێ، ئەمەش لە لەبیرچوونەوەیەکی یەکجاری باشترە.

ئەو دەستێوەردانە جۆربەجۆرانەی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندایە، لەوە دەچێ بە حەبی ئەسپرین نەخۆشییەك چارەسەر بکرێت کە لە سەرەمەرگ دایە. تەواوی مەیلەکانی بەرخودان، لە ڕەوتە ئیسلامییەکانەوە تا پارتە کۆمۆنیستیەکان، لە نەتەوەپەرستی تا لیبرالیزم، تەنانەت شێوەکانی فشاری شێوازی ئیسرائیلیش لە مەزن کردن و وورووژاندنی بچووکترین گرفت بەولاوە هیچ ڕۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە. ئەم ڕاستینەیەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە دەستنیشان کردنی نەخۆشی و چارەسەر کردنەکەی زۆر لە واقیعی پێکهاتەکەی دوورە. قەوارەیەکی دروستکراو لە زاراوەی دروستکراوەوە پێك هێنراوە. وا مەزەندە دەکرێ لەمیانەی دەستنیشان کردن و چارەسەرییەکی بەمجۆرە، کارەکان ئەنجام بدرێت. تەواوی ئەوانەی بەناوی نوژەنییەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین هەن، لە قەوارەیەکی بێ گیان بەولاوە هیچ ڕۆڵێکی دیکە نابینن. تاوەکو ئێستا ناوچەکە خۆی نەناسیوە. سەبارەت بە مێژوو لە نێو نەزانییەکی کوێرانە و نامۆ بوونێکی قووڵ دایە. هەروەکو بڵێی کۆمەڵگا بووە بە کۆنکریت. دەزگاکانی سیاسەت و دەوڵەت تەواو ڕۆڵی تەنێکی شێرپەنجە دەبینن. خەیاڵە لێڵ و تاریکەکانی دێوەزمەکانی سەردەمێك دەخولێتەوە. ڕەوشێکی لێکدان و ڕزین لە ئارادایە کە گەلێك لەو تێکدانانەی مەغۆل و ئاشوورییەکان قووڵترە. ڕۆژهەڵاتی ناوین بە نهێنییەکی شاراوە و هاوکێشەیەك دەچێت گەلێك نهێنی لەخۆوە دەگرێت و تاوەکو ئێستا شینەکراوەتەوە.

تواناکاری شیکردنەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوین گرێدراوی ئاواکردنی پەیوەندییەکی ڕاستە لەگەڵ شارستانییەتی ئەوروپا. کاتێك ئەم بابەتە لەمیانەی یەك بوونێکی دیالەکتیکی تاوتوێ بکرێت. واتای ڕاستی خۆی دەبەخشێ. چەندەی پێویست دەکات ئەوروپا لە شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەدوای بنەماکانی شارستانییەتی خۆی بگەڕێت و بەڕاستی دەستنیشانی بکات، ئەوا ڕۆژهەڵاتی ناوینیش کە بەها شارستانییەکانی بۆتە پاشخانەی کولتووری، پێویستە بە شێوەیەکی ڕاست شارستانییەتی ئەوروپا پێناسە بکات، تاوەکو بتوانێ بە گوێرەی ئەم سەردەمە دژە بیرۆکەی خۆی پێکبێنێ. هەروەها پێویستە بە بایەخەوە جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە نابێ پێناسە کردن بە شێوەی هەرسکردن یاخود لاسایی کردنەوە بێت. ئەوەی لەم دووسەد ساڵەی دواییدا ئەنجام دراوە لاسایی کردنەوەیەکی هەرزانە. سەرباری ئەوەی لاسایی کردنەوە قۆناخێکە ڕاکردن لێی نابێت، بەڵام هەروەکو پەیڕەوی فێرکردنی مەیموونی سەرەتایی و دواکەوتوو وایە. هەروەکو چۆن دووبارە کردنەوەی ئەم قۆناخە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هیچ واتایەکی نییە، ئەوا بە خێرایی بەلاوەنانی قۆناخی لاسایی کردنەوە مەرجی یەکەمە بۆ ڕێزگرتن لە خود و شەرەفمەندێتی.

تاوەکو ئێستا قۆناخی هەرسکردنی ئەوروپا لە ئارادایە. ناتوانرێ باس لە ڕاستینەی هەرسکردنێکی دروست بکرێت. سەرکەوتنیشی لەو توانستە دەبینرێ کە بە تەواوی دەرفەتی بەدیهاتنی هەیە. قۆناخی هەرسکردن و بوون بە دژە بیرۆکە بە یەکەوە بەڕێوە دەچن. بینینی هەرسکردن وەکو قۆناخێك کە دەشێ تا کۆتایی بەردەوام بێت، بە واتای دانەنان بە میراس و هێزە مەزنەکەی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین دێت. چەندین هێزی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئەخلاقی و هونەری کە ئەمەیان تاقیکردەوە لە شکست ڕزگاریان نەبوو. هۆکارەکەشی بۆ بێ توانایی و سنوورداری هەوڵ و کۆشش ناگەڕێتەوە، بەڵکو سەرچاوەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەو میراسەی شارستانییەت و هێزەکەی ناناسێ کە بناخەکەی خۆی پێکدێنێ و هەروەها ئەوەی هەڵنەسەنگاندووە ئەم هێزە کارەکتەرێکی هەیە تاوەکو دوایی لاسایی کردنەوە و هەرسکردن پەسند ناکات. دەبێ هیچ کاتێك لە بیر نەکەین: کاتێك لە کارە ستراتیژییەکاندا وەرچەرخانێکی گشتگیری ڕەچاو نەکرێت، ئەوا ڕۆڵێك ناگێڕدرێ شایستەی مێژوو بێت. ئەو جوڵانەوە مێژووییانەی دەخوازن لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا ڕۆڵ ببینن، ناچارن لاسایی و لەیەکچوون و هەرسکردن تێپەڕ بکەن و دژە بیرۆکەی خۆیان پێکبێنن. ئەو جوڵانەوانەی لەمەدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنن لە بەلاوەنان ڕزگاریان نابێت. ئەم تێپەڕکردنەش یان لە ئەنجامی لەدەستدانی هێزی بەرخودان ئەنجامگیر دەبێ، یاخود لەمیانەی ڕەتکردنەوەی لاسایی کردن و هەرسکردن لەلایەن نەریتی کولتوورییەوە. پەیوەندییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەگەڵ ئەوروپا بە تایبەتیش لەم دووسەد ساڵەی دواییدا ئەمەی پشت ڕاست کردەوە کە هەوڵە ڕووکەشیەکانی نوژەنی ئەم دووسەد ساڵە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دووچاری شکست هاتووە، هەم بە شێوەیەکی ساختەکاری و بێناموسانە دەبوایە لە ئەنجامدا پەند و ئەزموونی لێوەربگیردرایە. بەڵام هەروەکو دەزانرێ ساختەکار و بێشەرەفەکان کێشەی پەند و ئەزموون وەرگرتنیان نییە. ئەوانەی دیکەش پابەند بوون بە خێڵایەتی کە شێوەیەکی بەرخودانی هەزاران ساڵ پێش ئێستا بوو، بۆ خۆیان وەکو مەعریفەت و شەرەف لە قەڵەم دەدەن. تاوەکو ئێستاکەش لەمیانەی دەوڵەتی نەتەوەیی و نەتەوەپەرستی کە شێوەیەکی هاوچەرخی خێڵایەتییە، بە بێ هیچ شەرمێك خۆیان بە قارەمان لە قەڵەم دەدەن و تەنانەت شانازیشی پێوەدەکەن.

بەرامبەر بە میراس و هێزی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین، خێڵایەتی و شێوە هاوچەرخەکەی واتە نەتەوایەتی، بە بچووکی دەمێننەوە و ناچاریشن بەمجۆرە بن. دەشێ بەرخودانەکانی هۆریت و ئامۆریتەکانی تیرەکانی شاخ و بیابان بەرامبەر بە شارستانییەتی سۆمەر واتایەکی مێژوویی هەبێت. ئەم بەرخودانانە دەروازەی لەپێش داستانی خێڵایەتی کردەوە. هەروەها بەرخودانەکانی تیرە و هۆزە عیبرانییەکان بەرامبەر بە فیرعەون و نەمرود لە ژێر ناوی ئایینی تاکخودایی، واتایەکی مەزنی هەیە و کتێبە پیرۆزەکانی هێناوەتە ئاراوە؛ لە مێژوودا توانای بەشداری کردنیان لە پێکهاتنی بیرۆکە و دژە بیرۆکە نیشانداوە. بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەو بەرخودانانەی کە بنەمایەکی خێڵایەتی و ئایینی و نەتەوەییان هەیە بەرامبەر شارستانییەتی ئەوروپا هیچ تایبەتمەندێتیەکیان نییە کە ببن بە بیرۆکە و دژە بیرۆکە. زیاتر ئامانجیان لاسایی کردنەوەیەکی سەرکەوتووانە و هەرسکردنە وەکو جۆرێکی پێشکەوتوی

لاسایی کردنەوە و بوون بە خۆجێیی. دەشێ وەکو پابەند بوون بە بیرەوەری رابردوو ریش بهێڵنەوە و کەفیە (عەگال) ببەستن و بخوازن خۆیان وەکو دژە بیرۆکە نیشان بدەن. ئەمەش تەنیا گوزارشت لە گۆڕانی لاسایی کردنەوە بۆ جامباز دەکات. ئەو هەرسکردنەی لە وەرچەرخان بۆ خۆجێیی سەرکەوتوو دەبێت، ناشێ تایبەتمەندێتییەکی بەمجۆرەی هەبێ کە هێزی گەوهەری و دژە بیرۆکە بخولقێنێ. تەنیا دەتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە لەخۆوەگرتن، قووڵبوونەوە و بەها خۆجێیەکانی لێ موتوربە کردووە.

تاوەکو ئێستا ئەو سیستەمە مۆنارشی و کۆماریانەی هەن زۆر لەمجۆرە هەرسکردنە دواکەوتووترن. ناتوانرێ بگوترێ بە گوێرەی واتا ئەوروپیەکەی بوونەتە مۆنارشی و کۆمارێکی تەواو. هەرچی کۆماری دیموکراسی و عیلمانییە تەنیا لە ئاستی وشەدا ماوە، تەنیا قسە و دیماگۆجییەتە. هەرچی شارستانییەتی دیموکراسییە هێشتا زۆر دوورە لەوەی بە واتای زاراوەی خۆی بگات. لەمیانەی قووڵکردنەوەی بابەتەکانی خێڵایەتی، بنەماڵەگەرێتی، نەتەوەپەرستی سەرەتایی و شۆڤێنی بەرژەوەندییە تەسك و تاکە کەسێتییەکانی خۆیان دەشارنەوە و لەمیانەی بەدڕەوشتترین رێچکەکانی تەڵەکەبازی و پێشێلکاری بەسەر گەلێکدا دەچەسپێنێ. ناشێ بگوترێ پێکهاتەی سەرخانی باڵادەستی کۆمەڵگا لەمە بەدواوە خەریکی کارێکی دیکەی رەسەن بێت. هەروەها پێویستە بە بایەخەوە ئاماژە بەوە بکرێ کە زۆر لە رەسەنایەتی تیرە و هۆزەکانی چوارهەزار ساڵ پێش ئێستا دواکەوتووترن. هەرچی سیاسەتی فەرمی رۆژهەڵاتی ناوین و دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانێتی، هەوڵدەدات دژوارترین شێوە ترسناکەکانی سەرکووتکردن بۆ سەپاندنی لاساییکردنەوە و توانەوە بەسەر جەماوەر پەیڕەو بکات و ئەمەش لە ژێر ناوی نوژەنی و پێشکەوتوخوازی ئەنجامدەدات، لە لایەکی دیکەشەوە لەمیانەی تاڵانکاری سەرەتاییترین سەرمایەداری، سامان کەڵەکە دەکات. ناتوانرێ بگوترێ سەردەستەکان پەند و ئەزموونیان لە رابردووی خۆیان وەرنەگرتووە. لە کاتی پێویستدا ریش دەهێڵنەوە و جل و بەرگێك دەپۆشن رابردوویان بێنێتەوە یاد، بەڵام شێوەکانی بەڕێوەبەرێتی دەسپۆتیزمی پاشماوەی کۆیلەداری و پادشایەتی کە پاشماوەی چەمکەکانی سەڵتەنەتی چاخەکانی ناوینە، لە ژێر ناوی نوژەنی رتووشی ئەوروپیانەیان بۆ کردووە، ئەمەش بۆتە داهێنانەکانیان. هەندێك ئەمە بە ریفۆرم، هەندێکی دیکەش بە شۆڕش ناوی دەبەن. لە راستیدا نە شۆڕش و نە ریفۆرم ئەنجامنەدراوە. بەڵکو ئەو ستاتۆیەی لە ئارادایە بەهێزکراوە. لەمیانەی چەقاندنی پارچەی نوێ و بزمارەکانی ئەوروپا، شۆڕشی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین لەولاوە بمێنێت، تەنانەت تاوەکو ئێستا رۆژهەڵاتی ناوین ئاشنای ریفۆرمیش نەبووە. ئەوەی لە دەرەوە دەسەپێنرێ نەك ریفۆرمە، بەڵکو بە کۆلۆنیکردن و داگیرکردن ناودەبرێت. لەوانەیە پێشکەوتنێك لەوە بەدیبکرێ، بەڵام بە هیچ جۆرێك ریفۆرم و شۆڕش نییە. تەنانەت لەو وڵاتانەی قووڵبۆتەوە، داگیرکاری نوێ تێپەڕ ناکات و وەکو ئامانجێك پەسند دەکرێت. دەتوانرێ سەبارەت بە بەهاکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بگوترێ کە لەمیانەی چالاکییەکانی گەڕان و لێکۆڵینەوەکانی ئاسەوارناسی پاشماوەکانی دەردەهێنرێت. هەروەکو چۆن ئەمە سەرکەوتنێکی ئەو رۆژهەڵاتناسانەیە کە پشت بە شارستانییەتی ئەوروپا دەبەستن، ئەوا ئەمە لە رێگای شرۆڤە هەڵە و ناتەواوەکان بەڕێوە دەچێت. جگە لەمەش زانست و تەکنۆلۆژیاش دوورە لەوەی نموونەی ئەو کەرەی دەربازکردبێت کە بارەکەی پڕ لە کتێبە. بە فیڕۆچوون و زەوتکردنی چاوگە ماددییەکان ئەوە روونەدەکاتەوە کە بە واتای سەرمایەداری ئابووری بونیادنانرێ. هەروەکو جەختی لەسەر کرایەوە، دەزگا سیاسییەکانیش لەمیانەی لەیستۆکە هاوچەرخەکانەوە درێژە بە دەسپۆتیزم و سیستەمی سەڵتەنەتی دەدەن. هەروەها لە بواری ئایدیۆلۆژیشدا کاریگەری کۆنکرێتی راستینەی میتۆلۆژیا و ئایین بەسەر مێشك و هزردا زاڵکراوە. هەروەکو چۆن ئەم کاریگەرییە تێکنەشکێنراوە، تەنانەت لە ئاکامی تێکەڵکردنی لەگەڵ فەلسەفە و زانستی هاوچەرخ شێوەیەکی ترسناکتری بەخۆوەگرتووە. بە کورتی ئەو کاریگەرییەی دووسەد ساڵەی دوایی شارستانییەتی ئەوروپا، لە ژێرکەوتووترین نموونەی جیهان رزگاری نەبووە. سەرباری دەوڵەمەندێتی شارستانییەت و چاوگە ماددییەکانی، ئەوا ئەم رەوشە گوزارشت لە قووڵایی نەزانی و گەندەڵی دەکات. جارێکی دیکەش ئەم بۆچوونە پشت راست دەکرێتەوە: تاوەکو ئەو شێوازەی پەیوەندی پێکنەیێت کە لەسەر بنەمای دژە بیرۆکە و سەنتێز بێت لەگەڵ شارستانییەتی ئەوروپا، کە ئەمەش رێگا بە شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین دەدات و پێویستییەکی دیالەکتیکی سەردەمە، ئەوا رابردووی مەزن لەو ناوچەگەرێتییە و لە گەندەڵی هەڵوێستی رۆژانەی نابوورێت.

ئەم بارودۆخەش پەیوەندی بە گەوهەری شارستانییەتەکان هەیە. ئەوانەی دەتوانن لە رێگای شارستانییەتی ئەوروپا و لەسەر بنەمای پێکهاتنی دژە بیرۆکە پەیوەندییەکی دیالەکتیکانە لە رۆژهەڵاتی ناوین ئاوابکەن، شایانی پێکهێنانی هێزی هەڵمەتی قەڵەمبازێکی مێژوویین، ئەمەش هەر تەنیا بۆ ناوچەکە نییە، بەڵکو بۆ تەواوی جیهانە. تەواوی پێهەڵگرتنە مێژووییەکان ئەو واتایە لەخۆوە دەگرن. گلگامێش، سەرجۆن، ئیبراهیم، مووسا، زەردەشت، سوقرات، عیسا، مەحەمەد و رێنسانسخوازەکان یەکەمین نموونەن بە بیری مرۆڤدا دێن. رۆژهەڵاتی ناوین هەڵگری کولتوورێکە لە هەموو کولتوورەکان زیاتر ئەم قەڵەمبازە مێژوویی و سەرەتاکانی شارستانییەتەکانی بەخۆوە بینیوە. هەڵکشان و مەزن بوونی مێژوویی ئەم کولتوورە بە شێوەی ئەڵقە ئەڵقە و زنجیرە روویداوە. بەڵام نزیکەی هەزار ساڵە ئەو زنجیرەیە پچڕاوە، ماوەیەکی درێژە و لەگەڵ خۆیدا رێگا لەپێش رزین و ژەنگارییەکی زیادە دەکاتەوە.

ئەو پرسیارە سەرەکییەی پێویستە بکرێت ئەوەیە: ئایا دەشێ قەوارەی مێژوویی و کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین کە لەسەر بنەمای قەڵەمبازی مەزن بونیادنراوە لەمیانەی پێوەکردنی ئەڵقەیەکی هاوچەرخ خۆی زیندوو بکاتەوە و بە ئایندەی بگەیەنێ؟ گرنگتریش ئەوەیە، دەشێ ئەڵقەیەکی نوێ بخاتە سەر ئەو نەریتە میتۆلۆژییەی بۆتە ئومێدی فریادڕەسی مرۆڤایەتی؟ ئایا دەتوانێ بە هێزی پێکهێنانی دژە بیرۆکە و سەنتێز بگات و تەنیا بە هەرسکردنی ئەوروپا سنووردار نەبێ؟ رۆژهەڵاتی ناوین یان ئەوەتا ئەڵقەیەکی نوێ دەخاتە سەر زنجیرەی قەڵەمبازە مێژووییەکان و توانای جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە بەدەستدێنێ، یاخود لەنێو قووڵایی ژیانێکی نەفرەتلێکراو رزگاری نابێت. هەمان مێژوو دەرفەت بە رێگای سێیەم نادات. مـێـژوو دەڵـێ: "تۆ نابیت بە روسیا، چین، هیندستان یاخود ئەمریکایەکی نوێ، ئەوان وەکو دەوروبەری ناوەندێکی بەمجۆرە بەردەوام چاوەڕوانی قەڵەمبازێکی نوێی مێژوویین، مێژوو بەمجۆرە چارەنووسیانی دیارکردووە، بەڵام چارەنووسی تۆ کاروانی ئەو شارستانییەتە مەزنەیـە کە لەسەر قەڵەمبازێکی بەهێز ئاواکراوە، ئەمەش لێشـاوێکی بەهێزی لەجۆری رووبارەکانی فورات و دیجلەیە، ئەی رۆڵەی ناڕەسەن و نەفرین لێکراو، ئەگەر وەکو ئەوان نەبیت لێت نابوورم". لـەهـەمـانـکـاتـدا وەکـو جێنشینی خوداوەندە ژنەکان رۆژهەڵاتی ناوین دەڵێ "ئەی پیاوەکە، ئەی مێردی خەڵەفاو و بێچارە! لەگەڵ تۆدا نابم، دەسووتێم و دەبم بە خۆڵەمێش، بەڵام لەگەڵتا بەشداری ژیانێکی خیانەتکارانە ناکەم". وەکو وڵاتی شوێنگەی خوداوەندەکان دەڵێ "ئەی گرگنەکان تەنانەت ئێوە بە بەندەی خۆشم پەسندناکەم، ئێوە نەفرین لێکراون، تەنیا لە نێو ئاگری دۆزەخدا شایستەی سووتانن". هونەرمەندە مەزنەکانیش دەڵێن: "ئیتر ئێمە گۆرانی ناڵێین و مۆسیقا ناژەنین و داستان نانووسین، چونکە ئێوە جوانی رۆحی ئەدەب و هونەری دێرینتان لەدەستدا"، تەواوی هونەرمەندە مەزنەکان بەرامبەر بە مێژوو دەوەستن و پێکەوە دەڵێن: "لێتان نابوورین".

شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بە کپی ئەمە دەڵێ. بێباکانە وەڵامی فشارەکانی دەرەوە دەداتەوە. دەخوازێ لەمیانەی ئەنجامدانی وەرچەرخان ئەمە روونبکاتەوە و مانەوەی بە شێوەی بەرد بە شانازی و شەرمەزاری دەبینێ. هەزاران ساڵە بە هێشتنەوەی نەوەکانی بەرامبەر بە هەموو جۆرێکی شکست و هەڵوێستی داتەپیو، تۆڵەی خۆی دەسەنێتەوە. بەمجۆرە وەڵامیدەداتەوە. لەوانەیە وەڵامی سەیر و سەرنج راکێشتری هەبێت؛ ئەمانەشی بۆ داهاتوو حەشارداوە، بـۆ وەڵامدانەوە ئامادەیە، دەڵێت: "ئەی بەشە نەفرین لێکراوەکەی مێژوو و رۆژگاری گـرگـن، وەڵامـت بـەرامـبـەر ئـەوجـۆرە هـەڵـوێـسـتـانـە چ دەبێت؟ ئەگەر ئازا و قارەمانی هەڵسە سەرپێ و وەڵامبدەرەوە".

دەشێ گەلێك هەڵسەنگاندنی بەرفراوان سەبارەت بە هەڵوێستی خۆڕاگری و بەرخودانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین پێشبخرێت. لەو باوەڕەدام ئەمە بۆ سەرنج راکێشان بەسە و تێردەکات. ئیتر با هەوڵبدەین لە مەسەلە گرنگ و بایەخدارەکە نزیکبینەوە. چۆن لەگەڵ شارستانییەتی ئەوروپا دەکەوێتە نێو پەیوەندی دژە بیرۆکە و سەنتێز؟ هەڵسەنگاندنمان سەبارەت بە چۆنێتی دەرکەوتن و پێشکەوتن و بڵاوبوونەوەی شارستانییەتی ئەوروپا لە جیهان، ئەنجامدا. هەروەها لەمیانەی هێڵە گشتییەکان دەرئەنجامەکانی هەڵوێستی داگیرکاری و تواندنەوەی سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوینیشمان بینی. ئەگەر ژیان لەم جوگرافیایە بەردەوام بێت کە شارستانییەتی خولقاند و بەخێوی کرد، ئەوا لە ئەنجامدانی وەڵامدانەوەی پرسیاری "چۆن بژین" بە راستینەی خۆی دەگات. بێگومان تاوەکو ئەو رۆح و مێشکانە نەکرێنەوە کە سەدان ساڵە بوونە بە کۆنکریت و گرێکوێرە، ناتوانرێ وەڵامێکی راستی ئەم پرسیارە بدرێتەوە.

پێویستە ئەوەش روونبکرێتەوە مەبەست لەوە چییە کاتێ دەگوترێ پێویستە رۆژهەڵاتی ناوین وەکو لایەنێك لە پێکهاتنی دژە بیرۆکە و سەنتێزدا رۆڵ ببینێ. لە مێژە شارستانییەتی ئەوروپا بە رەوشێك گەیشتووە بیرۆکەکانی لە تەواوی جیهان بەهێزبێت. لە ئابوورییەوە تا دەگاتە ئایدیۆلۆژیا، لە هونەرەوە تا سیاسەت، لە تەکنۆلۆژیاوە تا دەگاتە مێژوو و بنەما زانستییەکان و بیرۆکە بە ئەزموونەکانی بەهێز و پتەوە. بڵاوبوونەوەی قووڵایی جیهانگەرایی و جێنشینی بە حاڵەتی دیالەکتیکی تاکو ئێستاکەش لە رێگای هەرسکردنەوە دەکرێ بە موڵك. هەرچی لە رۆژهەڵاتی ناوینە، بڵاوبوونەوەیەکی بەمجۆرەی ئەنجامنەداوە، چونکە لێرەدا بەرخودان لە ئارادایە. ئەو مێژووەی ئەوروپاشی خولقاند، ناخوازێ یەکلایەنە تەسلیمی لاساییکردنەوە و هەرسکردن ببێت. ئەو میراسە مێژووییە مەزنە دەخوازێ خۆی بکات بە دژە بیرۆکە و سەنتێز، تاوەکو ببێت بە هێزی سەرەتاییەکی نوێی شایستەی مێژووەکەی. بەرامبەر بە بیرۆکەی ئەوروپا بوون بە دژە بیرۆکە بە واتای نکۆڵیکردنێکی رەها و قەبە نایێت. بۆ نموونە پێهەڵگرتنە ئیسلامییەکان هیچ بەهایەکی ئەوتۆیان نییە ببن بە دژە بیرۆکە. تەنانەت ئەگەر خاوەن بانگەشەش بن، ئەو هێزەیان نییە. ئەوە لەولاوە بمێنێ هەڵوێستەکانی نەتەوەپەرستی و کۆمۆنیستی لە ئارادایە ببن بە دژە بیرۆکەیەك، لە پرۆسەی لاساییکردنەوەیەکی ساکار بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە؛ تەنانەت هێندەی رۆژهەڵاتناسەکانیش رۆڵی رۆشنگەرییان نەبینیوە. ئەوانەی راستەوخۆ هاوکاری و رێککەوتن لەگەڵ ئەوروپا دەکەن لە فەرمانبەری بچووك و نۆکەر بەولاوە تێپەڕنابن. هەربۆیە ئەرکی بوون بە دژە بیرۆکە چاوەڕوانی خاوەن لێدەرکەوتنە.

ئەوەی دەخوازرێ لەمیانەی دژە بیرۆکە پێناسە بکرێت ئەوەیە کە: چۆن دەتوانین هەبوونی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین لەگەڵ پێکهاتەی شارستانییەتی ئەوروپا بکەین بە دژە بیرۆکەیەك رێگا لەپێش بانگەشە و قەڵەمبازێکی نوێ بکاتەوە؟ چۆن دەتوانین لە ئاکامی پەیوەندی هەردوو شارستانییەت دیاردەیەکی دژ یان تایبەت بێنینە ئاراوە؟ بە بێ ئەوەی لە ناویدا بتوێتەوە یان بە شێوەیەکی رەها رەتیبکاتەوە بەڵکو لەمیانەی پێبەخشین و تێرکردنی، دەتوانین ئەو دژە بیرۆکەی دیالەکتیکی پێکبێنین کە مرۆڤایەتی بەدوایدا دەگەڕێ. هێشتا کاتی بوون بە سەنتێز نییە. بەڵکو بە واتای ئەنجامدانی دژەهەڵمەتێك دێت، جیهان لە بوون بە چۆڵەوانییەکی گشتی رزگاربکات و لە رەوشێکی ئەوتۆدا بیهێڵێتەوە تواناکاری و دەرفەتی ژیانی تێدابێت. چونکە مەترسییەکی بەمجۆرە لە ئارادایە کە بڵاوبوونەوەی یەکلایەنەی جیهانگیری و گەردوونی تێزی باڵادەست ئەگەر بە دیموکراسییانەترین شێوازیش بێت، دەشێ رێگا لەپێش فاشیزمی لە جۆری رەش و سپی بکاتەوە. جگە لە رۆژهەڵاتی ناوین ناوچەکانی دیکەی جیهان تا رادەیەکی مەزن وەکو رێککەوتنێك لەسەر کرداری هەرسکردن پێویستییەکانی خۆبەدەستەوەدانی ئەم بیرۆکەیە جێبەجێدەکەن. ئەنجامی ئەوەش فاشیزمێکی بە شێوازی دیموکراسییانە یاخود پەرەسەندنێکی هاوشێوەی ئەمە دەبێت. ئەمەش مەترسیدارترین ئاکامە بۆ مرۆڤایەتی. ئەگەر ئەمەی باس دەکرێت رووبدات، ئەوا دەبێتە "کۆتایی مێژوو". روونەدانی ئەم رەوشە گرێدراوی خولقاندنی دژە بیرۆکەیە. ئەو سۆسیالیزمە بونیادنراوەی بە سەرکێشی روسیا تاقیکرایەوە، کاتێ نەیتوانی ببێت بە دژە بیرۆکە و لە کۆتاییدا لەمیانەی خراپترین داڕووخاندا خۆی بەدەستەوەدا، بۆ مرۆڤایەتی ئەنجامی خراپی لەگەڵ خۆی هێنا. ئەو بەرخودانە پیرۆز و ترسناکانە، ئەو ئێش و ئازار و خوێنڕشتنانە، پێویستبوو بەمجۆرە ئەنجامگیرنەبێ. سەرەکیترین هۆکاریش ئەوەیە، بە بێ ئەوەی لە بوون بە دژە بیرۆکە سەرکەوتن بەدیبێنن، بە هەڵەداچوون و ساختەکارانە باسی یۆتۆپیای کۆمۆنیستییان کرد. هەر بە هەڵەداچوونێك لە کۆتاییدا بە خیانەت و خۆبەدەستەوەدان ئەنجامگیردەبێت.

چەندین جار دووبارەمان کردەوە کە راستینەی مێژوویی رۆژهەڵاتی ناوین رێگا بە کردارێکی ساویلکەی هەرسکردن نادات. چونکە تەنانەت بەرماوەکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوینیش بە بێ دژە بیرۆکە ناتوانێ بێتەوە هۆش خۆی. بەمجۆرە دەتوانێ ئەو مرۆڤپەروەرییەی لە کەسایەتی ئەم شارستانییەتەدا هەیە، سەرلەنوێ لەو هەلومەرجەی لە ئارادایە، بۆ تەواوی مرۆڤایەتی ببێتە ئومێدێك. پەسند کردنی لەمە کەمتر، تەنیا لەمیانەی نکۆڵیکردن لە خود دەبێت. زۆرن ئەوانەی ئەمەیان تاقیکردۆتەوە. زۆر ئاشکراشە هەبوونیان بە چ واتایەك دێت. رۆژهەڵاتی ناوین ئەم پێکهاتە دروستکراو و لاساییکەرەوانە پەسند ناکات، چونکە گەدە کولتوورییەکەی بەمە تێرنابێت. تەواوی جیهان بیخوات، ئەو نایخوات، دەخوازێ بە خۆی ببێتە بەهایەکی نوێ، ئەمەش پێویستییەکی گەوهەر و کەسایەتیەکەیەتی. کەواتە چۆن دەبێت بە دژە بیرۆکە؟ وەکو ئەرکێکی سەرشانمان هەندێ بۆچوونی خۆمان بە شێوەی هێڵی گشتی و قووڵ و بەبێ لادان پێشکەش دەکەین.

نوژەن کردنەوەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئەرکێکی مێژوویی لەپێشینەیە. جوڵانەوەکانی رێنسانس و ریفۆرم و رۆشنگەری کە تا ئێستا لە کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین ئەنجام نەدراوە، پێویستە وەکو یەك جوڵانەوە ئەنجامبدرێ. ئەو وەرچەرخانانەی لەم سێ بوارەدا ئەنجام دەدەرێن ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ دیاریدەکات. ئەمەش بە واتای وەرچەرخانی بنەڕەتی و بواری هزری و رۆحی دێت.

شارستانییەتی ئەوروپا لەمیانەی ئەو شۆڕشە هزرییەی لە سەدەی پانزدەهەم تاکو سەدەی هەژدەهەم بەردەوام بووە، توانیویەتی دەزگاکانی خۆی ئاوابکات. دواترین قۆناخ کە پێیگەیشتووە ئەو شارستانییەتەیە کە لەسەر بنەمای دامەزراوە دیموکراسییەکانە. هەرچی رۆژهەڵاتی ناوینە ناوێرێ ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم زاراوانەش بکات. بەڵام پێویست دەکات هەندێ بە هەڵەداچوون لەم بابەتە بەلاوەبنێین. هاوردنی زانست و تەکنۆلۆژیا و بونیادنانی کارگە و بوون بە خاوەن هەندێ دەزگای دیموکراسی بە واتای بەدیهاتنی رێنسانس و ریفۆرم و رۆشنگەری نایەت. ئەمانە پەرەسەندنی پارچە پارچەیە و پەیوەستی گەوهەر نین؛ لە پێکهاتەیەکی چینە بژاردەکانە، کە لە چوارچێوەی هەمان هزری توانەوە و کۆڵۆنی پێکهاتووە، گوزارشت لە شتێکی دیکە ناکات. جگە لەو ئاستەی قۆناخی بە رۆژئاواییبوون کە لەم دووسەد ساڵەی دوایی پێیگەیشتووە، هیچ پەرەسەندنێکی گەوهەری نابینرێت. رەوتە ئیسلامگەراییەکانی وەکو کاردانەوەیەك گەشەیان کرد جگە لەو نەتەوەپەرستییەی رەنگی خۆی گۆڕیوە هیچ واتایەکی دیکەیان نییە.

دەشێ رەسەنایەتی لەمیانەی ئەنجامدانی ئەم سێ شۆڕشە هزرییە ئەنجامبدرێ. دوای بینینی نەبوونی رێگایەکی دیکە، دەرك دەکرێ لە بەدیهێنانی ئەم شۆڕشە لە واقیعی رۆژهەڵاتی ناوین بەملاوە هیچ رێگایەکی دیکەی چارەسەری لە ئارادانییە. لەپێناو ئەنجامدانی شۆڕشێکی ئاکاری و هزری لە رۆژهەڵاتی ناوین بەر لە هەموو شتێك دەبێ لێدانێك لە بواری ئایینی بوەشێنرێ. دەبێ داکۆکی لە سەر ئەوە بکەین ئەم هەلوێستەمان هیچ پەیوەندییەکی بە عیلمانییەتێکی هەرزانەوە نییە. لەهەمانکاتدا ئەوەی پێویستە لێدانی بەرکەوێ ئەم عیلمانییەتە ساختەیەیە. هاوکات ئەمە پەیوەندی بە توێژە ئیماندار و دڵسۆزەکەش نییە. بە پێچەوانەوە ئەوان بەهادارترین پێکهاتەی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوینن و تا ئێستا هەڵنەوەشاوەتەوە. هەروەها ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە نکۆڵیکردن لە ئایین و خودا و سووکایەتیکردن بە مزگەوت نییە. بەڵکو ئەنجامدانی شیکردنەوەی زانستی تەواو سەبارەت بە پێکهاتەی مێژوویی ئەم ناسنامانە دەسەپێنێ. ئەوەی پێویستە ئەنجامبدرێ، شیکردنەوەیەکی راستی پێکهاتە میتۆلۆژییەکانە کە تەسەورەکانی ناسنامەی راهیبە سۆمەریەکان بوون؛ بیر لە ئیلاهییات (خوداناسی) بکرێتەوە کە دەرئەنجامێکی جیابوونەوەی چینایەتییە و سەرەتا هەڵگری کارەکتەر و کەسایەتییەکی میتۆلۆژی بوو دواتریش بووە خاوەنی کارەکتەرێکی ئایینی، دواتریش گۆڕا و بوو بە کەرەستەیەکی خاوی ئەدەبی مێژوویی.

سۆمەریەکان بەردەوام میتۆلۆژیا و ئایینی خۆیان گۆڕیوە. بە بێ دوودڵی و بوێرییەوە ژمارەی خوداوەندەکانی خۆیان کەمکردۆتەوە و ناوەڕۆك و ناوەکانیان گۆڕیوە. لە نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم دا بوێری لە ئاستێك دایە زۆرانبازی لەگەڵ خوداوەند دەکرێ (ئیسرائیل = زۆرانبازی لەگەڵ خودا)، لە دواییشدا بڕیار لەسەر "ئەل" واتا ئەڵڵا دەدرێت. مووسا ئەوەی کردووە بە خوداوەندی قەوم. عیسا جارێکی دیکە بۆ زاراوەی "خوداوەندی سیانی" گەڕاوەتەوە. بەهۆی پێویستی بە دەسەڵاتێکی تاك و یەکبوو، حەزرەتی مەحەمەد بە زاراوەی ئەڵڵا گەیشت کە لەمیانەی ٩٩ تایبەتمەندی بەهێزکراوە. ئەم کورتە دووبارەکردنەوەش، روونیدەکاتەوە تەنانەت ئایین و خوداوەندەکانیش بەردەوام لە ناو گۆڕانکاریدابوون. ئیسلامییەتیش گوزارشت لە یەکێتی هەلومەرجی بەرجەستەی قۆناخی دەرکەوتنی و هزرە ئایینیەکەی ئەوکاتە دەکات. هەرچی شێوەکانی عیبادەتە، لە بەهێزکردنی کەسایەتی نوێ بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. تەنانەت دواتر گۆڕانکاری مەزنی بەخۆوە بینی. مەسیحییەت و یەهوودیەت کەخاوەن هەمان ریشەن بەردەوام بە نێو گۆڕانکاریدا دەربازبوون. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا زیاتر وەکو

سەرچاوەی ئەدەبیات و بەهایەکی ئەخلاقی دەبینێ. ریفۆرمەکانیان لە بواری ئاییندا بەردەوامە و لەژێر سایەی سەرکێشی زانست پەرەدەسێنێ. هەروەکو دەزانرێ لە ئاکامی ئەو گۆڕانکارییەدا دەسکەوتێکی زۆریان بەدەستهێنا.

تەنانەت تاوەکو ئێستا لە ئیسلامییەت و نەریتی هاوشێوەی ئەو گۆڕینی تاکە وشەیەکیش بە گوناه دادەنرێت. ئەمەش لەیستۆکێکە لەپێناو دیلگرتنی پێکهاتەی هزری بە شێوەیەکی ترسناك. لە هیچ قۆناخێکدا، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەرە خولڤکارەکانیش ئایین بەمشێوەیە نەبۆتە ئامرازێکی خراپبوون. ئایین لەمیانەی ئەو شێوەیەی جێگایەکی هەرە دواکەوتوو نەفرینی لە مێژوودا گرتووە. مافی هیچ دەسەلاتێکی سیاسی و مەعنەوی نییە هێندە لە ئاستی ئایین نزمبکاتەوە و بیخاتە ئەم رەوشە. کردەوەیەکی لەوە مەترسیدارتر بۆ ژەهرخواردەکردن و ئیفلیجکردنی بیری کۆمەلگاکانیان، بە ئەقلیاندا نایەت. کۆمەلگاکانی رۆژهەلاتی ناوین بە تایبەتیش لەم هەزار ساڵەی دواییدا کاریگەری بەردەوام بوونی ئەم مەترسییەیان بەخۆوە بینی. ئەم شێوەبەندییە ئایدیۆلۆژیە ترسناکە، هزر دەئاوسێنێ و دیلی دەکات و پێشکەوتنی رۆحی دەوەستێنێ و پووچەڵی دەکاتەوە لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا لە سەرووی ئەو سەرچاوە پاشڤەڕۆیانە دێت کە لەوانەیە هەستیشی پێ نەکرێت. لەبەر ئەوەی کۆشش و تێخوێندنەوەیەکی راستی سەبارەت ئەنجامنەدراوە، تاوەکو ئێستاش یەکلانەکراوەتەوە تا چ رادەیەك و چۆن کۆمەلگای لە پەلوپۆ خستووە. چونکە تەواوی دەسەلاتە ناوەندی و ناوچەییەکان، عیلمانییەکانیشی لەناودا، ئەمە وەکو ئاسانترین ئامرازی چەوسانەوە بەکاردێنن.

تەنانەت کاتێك ئیسلامییەت لە قۆناخی دەرکەوتن و بلاوبوونەوەشدابوو بەردەوام ریفۆرمی پێویستی بەخۆوەدیوە. شیعەگەرایی ئێرانی، عەلەویگەرایی کوردان، بەگداشییەت و مەولەویگەرایی تورکان و چەندین تەریقەت و ئایینزای دیکە ریفۆرمن کە لە ئایینی ئیسلامیەتدا روویانداوە. ئەم قۆناخە لە ساڵانی ١١٠٠ زایینی وەستێنرا، لەسەر بنەمای ئەو ستاتۆیەی لە ئارادایە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان بە شێوەی هەرە وشکی خۆی بەردەوام بووە. مەترسی لەوەدا نییە چەندە راستی و هەڵە لەخۆوە دەگرێت؛ بەڵکو وەستاندنی هزری ئازاد و لەناوبردنی کەسێتی تاکە. ئەو مرۆڤەی ئازادانە بیر نەکاتەوە و خەیاڵی تاکەکەسێتی نەکات، واتا هێزی خولڤکاری ئەو مرۆڤە مردووە. ئەو کۆمەلگایانەی لەسەر بنەمای ئەمجۆرە تاکە بونیاد دەنرێن سەرچاوەی ژیانیان وشکی کردووە. گەورەترین کارەسات بۆ کۆمەلگاکانی رۆژهەلاتی ناوین لەسەرپێ هێشتنەوەی ئەم رەوشەیە بە شێوەیەکی پتەو. لەوانەیە تەواوی ستەمکارەکانی و تالانکارەکانی ناوخۆ و دەرەوە سود لەم رەوشە ببینن. بەلام لەبەر ئەوەی کۆمەلگا و دەوڵەت بەهاکانی خولڤکارییان لەدەستداوە، بۆیە بەردەوام لە نەداری و وشکهەلاتی رزگاریان نابێت.

لە حاڵەتێکی بەمجۆرە لەپێناو ئەنجامگیر کردنی ریفۆرمی ئایینی کە زۆر درەنگ کەوتووە و لەوەش گرنگتر بۆ رێخۆشکردن لەپێش تاکی ئازاد؛ پێویستە ئەو هەڵمەتە سەربخەین کە بە تەواوی دۆگمای ئایینی پارچە پارچە دەکات. رێگای ئەمەش بەوەدا دەرباز دەبێت کە هەموو کتێبە پیرۆزەکان وەکو سەرچاوەی ئەدەبی هەڵسەنگێنرێ و لەمیانەی شیکردنەوەی ئاکاری و کۆمەڵناسی بەرەو ئەخلاقێکی ئازاد وەرچەرخێنرێ، مسۆگەر دەبێ لەم رەوشە دەربخرێت کە وەکو دۆگمایەك بەسەر تاکدا بسەپێنرێ. گرێدراوی ئەمەش لەجیاتی شێوەکانی عیبادەت پێویستە لەسەر بنەمای پەیوەندییەکانی کتێبە پیرۆزەکان و پاشکۆکانیان بە مەسەلە مێژوویی، کۆمەلایەتی، سیاسی، ئابووری، چەوسانەوە، زانست، ئازادی، پێشکەوتن، ماتریالیزمی دیالەکتیکی، ئایدیالیزمی میتافیزیکی و ئاکارییەکان شیکردنەوەیەکی قووڵ بە زمانێك پێشبخرێت گەل لێی تێبگات. لەسەر ئەم بنەمایەش دەبێ شرۆڤەی ئایەت و فەرموودەکان بکرێت.

لێرەدا مەبەست ئەو پەیڕەوە وشکەی وەعزکاری نییە کە پڕوپاگەندەی سیستەم دەکات، بەڵکو پێشبینی ریفۆرمێکی ریشەیی دەکات و وەکو مەرجێکی دەبینێ. مزگەوتەکان و ناوەندە هاوشێوەکانی دەتوانن رۆڵی ناوەندەکانی زانست و هونەری ناوچەکەی خۆیان ببینن، بەمجۆرە دەتوانرێ شانۆگەری رەسەن سازبکرێ. نابێ لە بیربکەین نوێژ شێوەیەکی دواتری دراما سەرەتاییەکانە. نوێژ بە خۆشی بە واتا گشتییەکەی شانۆگەرییەکە. شتی گرنگ ئەوەیە ئەوەی کە ئاماژەی پێدەکەین لەلایەن توندڕەوەکانەوە چەواشە نەکرێت. دیسان دووبارەی دەکەمەوە با لێکۆڵینەوە سەبارەت بە سەرچاوەکانی رۆژو و نوێژ و جەژن و قوربانی سەربڕین بکرێ، ئەوکاتە دەبینرێ ریشەکەی بۆ ئەو نمایشانە دەگەڕێتەوە کە گەلان لە هەندێ وەرزی گرنگدا نیشانی دەدەن. عیبادەتەکان و ئەو نمایشانە، یەکەمین شێوەی شانۆگەرییەکانە (دراما، تراژیدیا، کۆمیدیا) دواتریش بە پێی پێویستی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. هەربۆیە پێویست دەکات پێویستییەکانی ئەم چەرخە رەچاوبکرێت و بۆ شێوەیەك وەرچەرخێنرێ کە هزر بە سەربەستی بهێڵدرێ و بە هەموو قووڵاییەکەوە مێژوو روونبکاتەوە و بە چێژی هونەرمان بگەیەنێ و رێگا بە ئاکاری سوودبەخش بدات. رێوڕەسمەکانی پاڕانەوە، قوربانیدان، رۆژو و نوێژ کە هەموویان تەگبیرەکانی بە کۆمەلایەتیبوونی قۆناخی خۆی بوو، پێویستە هەموویان لەسەر ئەو بنەمایە بە وەرچەرخاندا دەربازبین. بەمجۆرە سەرچاوەکانی سەردەمی لە دایکبوونی ئایینەکان بە واتای خۆی دەگات. باشترین رێگا ئەوەیە شوێنە پیرۆزەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە مزگەوتەکان بکرێن بە شوێنی ئەکادیمیای فێرکردنی گەل و شانۆی هونەری. پێویستە زانا و هونەرمەند و بیریاران لەم ناوەندانە، وانە بلێنەوە و گەل بێ پەروەردە بە نەزانی نەهێڵنەوە.

پێویستە هەمان رێکخستن سەبارەت بە شێوەکانی دیکەی عیبادەتیش بکرێت. باشتر و سوودمەندتر ئەوەیە لەجیاتی ئەو قوربانی سەربڕینەی کە ئیتر شێوەیەکی دڕندەیی بەخۆوە دەگرێت. سەندووقێك بۆ یارمەتیدانی هەژاران و کاری دیکەی خێرداری ئامادە بکرێت. پێویستە رۆژو گرتنیش بە ئامانجی پەروەردەکردن و راهێنانی نەفس بە شێوەیەکی سنووردار پەیڕەوبکرێت. لە ئەنجامدا پێویستە هەموو شێوەکانی عیبادەت بە گوێرەی پێویستییەکانی سەردەم سەرلەنوێ رێکبخرێنەوە. لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن "خودا لە کوێ ماوە؟". لە سەرووی هەموو شتێکەوە پێیان دەڵێم: لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەلایەتیدا  ئەویش وەکو ناسنامەی تەسەورەکانی راهیبە سۆمەریەکان بەردەوام پەرەسەندنی بەخۆیەوە دیوە،"ئەل"ی ئیبراهیم تیرەکەیەتی کە پێویستە بەهێز بێت، یاهۆڤا(یەهوە)ی مووسا تیرە و هۆزەکانی ئیسرائیل و یەهوودە کە پێویستە ببن بە یەك، رەبی عیسا سەنتێزی ئایین و ویژدانە سەرەتاییەکەی چەوساوەکانی ئەو سەردەمەیە. ئەڵڵای مەحەمەد گوزارشت لە یەکبوونی تیرە سەرەکییەکان و پێویستی بەهێزبوونیان دەکات؛ تەسەورێکی هاوبەشی تیرە رەوەندەکانە (بدوی) و هێزی تیرە و هۆزە عەرەبە یەکگرتووەکانە. هەر کۆمەڵێکی بە ئەندازەی ئەوەی خۆی بەهێزدەکات، سەرلەنوێ نیگاکردنی (تصور) خوداکەی خۆی دوا ناکەوێت. ئەمەیە راستینەی مێژوویی و کۆمەلگا. گەوهەری زانست خودای رۆژگاری ئەمڕۆمانە، ئیتر خودا بەخۆی لەسەر بنەمای دیالەکتیکی گەردوونی خۆی هەڵدەسوورێنێ، هەموو شتێکە، کە بێ کۆتایی دەگۆڕێت و گۆڕانکاری ئەنجام دەدات. ئایا دەشێ بیر لە فکرێك بکرێتەوە سەبارەت بە خودا لەمە شکۆدارتربێت؟

پێویستە ئەو یۆتۆپیاگەرایییەش تێکبشکێنرێ کە بەسەر پێکهاتەی هزری رۆژهەلاتی ناوین زاڵە و هیچ بنگەیەکیشی نییە. هەروەها پێویست دەکات دەست لە خەیاڵە یۆتۆپیاکانی لە جۆری بەهەشت و دۆزەخ، سیرات، مەحشەر، چاوەڕوانکردنی فریادڕەس، نەتەوەی باڵا، رەش و سپی بەربدات کە زیاتر داهێنانەکانی راهیبەکانی میسر و سۆمەرن. هێندە ئایدیالیزەکردنی خۆپەرستی (أنانیە) رێگا لەپێش شێوە بێ هاوتاکانی چەوساندنەوە و سەرکوتکردنی دەکاتەوە. هەروەکو هێزی دۆگماکان (قالبەکان)، هێزی یۆتۆپیاش دەبێتە ئامرازێکی دەستی خاوەن هێز و دەسەلاتداران. جگە لەوانەی زانستین و مەزەندەی بەدیهاتنیان هەیە، یۆتۆپیاکانی سەبارەت بە هەتا هەتایی بن (أبدی) هزر دووچاری دیلی و تەمبەلی دەکەن. بە تایبەتیش ئەگەر ریشەیەکی ئایینیان هەبوو، ئەوا رێگا لەپێش کاریگەرییەکی بەستەڵەکی دەکەنەوە. چەندە پێویستی بەو پرۆژە و بۆچوونانە هەیە کە لەسەر بنەمای زانستی ـ تەکنۆلۆژین، ئەوا ئەوانەی بێ بنەمایەکی زانستین هێندە پووچ و مەترسیدارن. تاوەکو راستینەی دۆگما و یۆتۆپیا تێکنەشکێنرێ کە لە کولتووری رۆژهەلاتی ناوین زۆر بەهێزن، ناشێ رێنسانس ئەنجامبدرێت. تەسەورێکی هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا، کە بەرهەمی زانست و (تەکنۆلۆژیا) یەکی دواکەوتووە (سەرەتایی) و هەروەها لەسەر بنەمای هەلومەرجەکانی نایەکسانی ناو کۆمەلگا پێشکەوتوە، ئەگەر لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا بە بێ ئەوەی واتاکەی بزانرێت وەکو مەزنترین پیرۆزی دەپەرسترێ، بێگومان ئەمە گەورەترین نەخۆشی کۆمەلگا و تاکەکەسە.

پێش هەموو شتێك تاوەکو ئەم نەخۆشییە بەلاوەنەنرێت، ناتوانرێ چاوەڕوانی گەڕانەوەی وشیاری ویژادن بکرێت بۆ رەوشی سروشتی خۆیان. کولتووری کۆمەلگایەك کیژۆڵەیەکی پانزدە ساڵی بە بیانووی ئەوە بکوژێت کە کوڕێکی خۆشویستووە، نەخۆشییەکی ترسناکە. نابێ لە بیربکرێ هەر بوارێکی ژیان بەمجۆرە دەکوژرێ. ئەم خاك و کولتوورەی سەردەمێك بەردەوامی خەیاڵەکانی خوداوەندی ژن و پیاوی ئاوادەکرد، لەبەر ئەوەی وەرچەرخانی پێویست و خولڤێنەری ئەنجام نەداوە، ئیتر رێگای لەپێش بێڕۆحی وڵاتێکی بێخێر و بیابان و نەزۆك کردۆتەوە.

ئیلهامبەخش نییە، شیعر ناخولقێنێ، خۆشەویستی پێشناخات، چونکە لە مێژە ژەنگی گرتووە، بەدەستی یۆتۆپیا و دۆگماکان وشکی کردووە، بەستوویەتی و بووە بە خاکێکی بێ خێر.

شۆڕشی ڕێنسانس: بە واتای سەرلەنوێ ڕووانی ئەم خاکە و بوونی بە چاوگی ئیلهامی خۆشەویستی و داستانی نوێ و هەڵسانەوە سەرپێیەتی لەمیانەی خەونە نوێ و واقیعیەکانی بەهەشت و هەموو لایەك قەشەنگ دەبێت. بە واتا سەرلەنوێ ڕێگای خۆ بونیادنانەوە و خۆ خولقاندنەوەی هزرە بەستووەکان و ڕۆحە وشکهەڵاتووەکان و ڕۆحە ڕەقبوو و چەواشەکراوەکان دەکاتەوە. زەمینە بۆ هزری زانستی لەبار و گونجاوە، دەشێ گەلێك شت لە دەسکەوتەکانی ئەوروپا وەربگیردرێت. تەکنۆلۆژیاش ئامادەیە، بە سانایی بەدەستدەکەوێت. ئەم ڕاستینەیە شانس و هێزی ڕێنسانسی ڕۆژهەڵاتی ناوین دیاریدەکات. ئەگەر بێتو دۆگما کۆنەکان و خەیاڵەکانی ئایینده لەسەر بنەمایەکی زانستییانە شیبکرێتەوە، ئەوا سەرلەنوێ مێژوو دەبێت بە تاڤگە و لێشاوەکەی بە خوڕ بەرەو ئاییندە دەچێت. ئەوکاتە بەڕاستی ئومێد دەبێتە هێزێك و وەکو لافاو دێتەخوار.

لەمیانەی زانستەوە توانستی بەهێزی ڕۆشنگەری پێکهاتووە. ئەوەی ناتەواوە ئاراستە کردنیەتی بۆ مێژوو و واقیع. لەمیانەی هزری زانستییەوە مێژوو بە ڕوونکردنەوەیەکی دەوڵەمەند دەگات. شیکردنەوە سەبارەت بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، ئان و سات ڕێگا لەپێش زیندووبوونەوە دەکاتەوە. تەنانەت شیکردنەوەی یەکێك لە مرۆڤەکانمان بەسە بۆ ئەوەی لە جیهان تێبگەین. لە شوێنێکدا چەندە کەوتن ڕوویدابێت، کەواتە هێندەش دەرفەتی مەزنبوون هەیە. چەندە تاریکایی قووڵبێتەوە، واتا ڕووناکیش هێندە نزیکە پێویستە سەبارەت بە هەموو شتێك ڕەخنەگرانە ببن، بەڵام هەرگیز نابێت ئومێدی دۆزینەوەی ڕاستی لەدەست بدەین. پێویستە دەست لە خێڵایەتی و بنەماڵەگەرێتی و ژنایەتی و مێردایەتی و نەتەوەپەرستی و ئایینگەرایی من منێتی هەڵبزرکاو بەربدەین. پێویستە بۆ ئەم چەمکە دەوڵەمەند و مەزنەی مرۆڤایەتی بگەڕێینەوە کە گشت لە تاکدا دەبینێ و تاکیش لە گشت دەبینێ. پێویست ناکات چەمکی مرۆڤپەروەری لە دەرەوە وەربگرین. مەزنترین دەوڵەمەندێتی ئەم خاکە مرۆڤپەروەریەکەیەتی. پێویستە هەڵیسێنینەوە سەرپێیان و دیسان دەروازە لە پێش خۆشەویستی مەزن بکەینەوە. پێویستە هەزاران جار بەرامبەر بە تیۆری خودایی و کردارە پیرۆزەکەی تۆبە بکەین و لەمیانەی دەرك کردن بە دڵسۆزی مەزن و پابەندبوون بە بەهای شارستانییەت و خاکەکەی و بەهای مرۆڤ، هەوڵی بەرجەستەکردن و پەیڕەوکردنی بدەین. هەروەها پێویستە ببینین لەیلا و مەجنوون، کەرەم و ئەسلی، فەرهاد و شیرین لە گۆڕەکانیان سەرهەڵدەبڕن و بە هێزی ژیان دەگەن و بە بێ دابڕان درێژە بە چیرۆکی ئەشقی خۆیان دەدەن. پێویستە بۆ زۆر کۆن، بۆ سەردەمی گلگامێش خۆمان درێژبکەینەوە، تاوەکو بە ئاگا بێتەوە و ببینێ کە شارستانییەتەکەی نەمردووە و هێشتا ئەنکیدۆ زیندووە؛ پێویستە نیشانی بدەین کە ئەشقی خاوەن باوەڕەکان کۆتایی پێنایەت. پێویستە هەموو پێغەمبەرەکان هەستنەوە؛ پێویستە نیشانیان بدەین ئایینەکانیان توانای خولقاندنی چی هەیە، تا چ ڕادەیەك مرۆڤایەتییان مەزن کردووە.

پێویستە ئیبن ئەلرشد و ئیبن سینا و کندی و هەڤاڵەکانیشیان هەستنەوە: تاوەکو ڕۆڵی خۆیان لە دەسکەوتەکانی زانست ببینن و هزرە مەزنەکەیان لەمیانەی بینینی ئاستی پەرەسەندنی زانست تێر بکەن. پێویستە کاوەی ئاسنگەر و هەڤاڵەکانی، مەنسووری حەللاج، سەهرەوەردی، کۆرئۆغلو و بابەك و مەزدەك و هەڤاڵەکانیان هەستنەوە تاوەکو ببینن بەرخودان و جوامێری و ئێش و ئازارەکان بە فیڕۆ نەچوون و خەڵکانێك دەسەڵاتدارن کە شایستەی ڕەنجەکانیانن.

ئەمانە خەیاڵی هەرزان نییە؛ بەڵکو ئەو مەزنایەتییە مێژووییە شکۆدارانەن کە پێویستبوو لە زووەوە لەمیانەی ڕێنسانسەوە هەڵیانسێنینە سەرپێیان. پێویستە لەمیانەی ئەدەبی هاوچەرخەوە سەرلەنوێ لە سەرەتا تا کۆتایی مێژووەکەمان زیندووبکەینەوە. گرنگتریش ئەوەیە مسۆگەر دەبێ ئەدەبیاتی سەردەمی نئۆلیتیك بەدەستبێنینەوە. بە تایبەتیش پێویستە ئومێد و خەیاڵ و هزر و ڕۆح و دایکەخوداوەند و دایکی کۆمەڵگای دایکسالاری وەکو خۆی زیندوو بکەینەوە کە هێزی خولقاندن و زایینی هەموو شتێکە. ئەگەر بەمجۆرە مێژوو بناسین، خۆشمان دەناسین. جگە لە مێژوو ئێمە چین! لە مێژوو بەدەر، لە هیچ زیاتر ئێمە چین! سەرلەنوێ بەرجەستەکردن و ڕۆشنکردنەوەی زاراوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینی وەکو میتۆلۆژیا، ئایین، ئایینزا، تەریقەت، بنەچەی خانەدان، خێڵ، میر، خولام، بەندە، خوداوەند، خوداوەندە ژن، شێخ، سەرۆك، بەگ، دایك، باوك، منداڵ، ئاسنگەر، ئەسپ، شمشێر، گاسن، تەور، کانزا، تالان، شەڕ، ئەشق، پێغەمبەرایەتی، ڕاهیب، سۆفی، بلیمەت، خائین، ساختەکار، شەرەف، نامووس، پیرۆزی، قەدەر، ئومێد، جەژن، مردن، بەهار، زستان، هاوین، چیا، ڕووبار، بیابان، ڕێگا، وشتر، سەگ، کەر، چێڵ، بزن، مەر، گا، مێگەڵ، شوان، جووتیار، نووسەر، خەلیفە، سەرباز، فەرماندە، زانا، جوانی، دزێوی، لەمیانەی زمانێکی ئەدەبی هاوچەرخ، ئەرکێکی هونەری و زانستی شۆڕشی بووژانەوەیە (ڕێنسانس) هزری زانستی و ئەدەبیاتی لە ئارادایە لە ڕاستینەکانی کۆمەڵگا و مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوین دابڕاوە؛ گوزارشت لە بۆچوونی پارچە پارچەیی و فەنتازیای بێ سیستەمی ئەو گروپ و تاکە بێ بنگانە دەکات کە لەلایەنی کۆلۆنیالیزمەوە توێنراونەتەوە. هەرچی پێکهاتەی هزری کۆمەڵگایە لە ڕەوشێکی ئیفلیجی دایە. ئەو ئەدەبیاتەی هەڵگری پێکهاتەیەکی دۆگماتیکیانەیە و ڕێگای لەپێش ئەو ڕەوشە کردۆتەوە، پیاهەڵدانێکی بێ واتایە. ئەنجامدانی ڕێنسانس لە ئەدەبدا بناخەی سەرهەڵدانی کەسایەتی ئازادە. تەنیا ڕزگاربوون لە دۆگما و خەیاڵە بێ بنگەکان تێرناکا و بەس نییە. بەڵکو پێویستە لەمیانەی کاریگەرییەکانی زیندوو کردنەوەی ئەدەبدا تەواو بکرێت.

لە ئەنجامدا ئەوەی دێتەئاراوە ئایینێکی نوێ نییە. بەڵکو ئایین لە ئاکامی خزانی بۆ گۆڕەپانی ئەخلاقی بە شوێنگەی شایستەی خۆی دەگات؛ بەمجۆرە ویژدانێکی دادوەر و ئازاد دەخولقێنێ. هێندە پەیوەستی بواری زانست نابێت، ئەمە بۆ فەلسەفە بە جێدێڵێ.

سەبارەت بە فەلسەفە و زانست کێشەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەیان نییە. لەمیانەی یەکبوونیان لەگەڵ وشیاری مێژوویی، ئەو هێزەی ڕۆشنگەری دێننە ئاراوە کە پێویستە لەسەر هزری ئازاد و خولقکارەکاندا زاڵبێت. کاتێك دەسکەوتە فەلسەفی و زانستییەکانی ئەوروپا لەگەڵ ڕاستینەی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوین یەکانگیردەبن، ئەوا مێژووی گشتی جیهان و هزری مرۆڤایەتی بە ڕووناکییەکی زیاتر و پێشکەوتوتر دەگات. پەرەسەندنی دژە بیرۆکەش ئەم واتایە دەگەیەنێ. ئەو ڕۆژهەڵاتی ناوینەی بیر لەخۆی بکاتەوە دژە بیرۆکەیە. تەنیا لە ئەنجامی تەشەنەکردنی شۆڕشی ڕێنسانس و ڕۆشنگەرییەوە ئەم هێزە بەدەست دەخرێت. هەوڵی چەند کەسێك یان گروپێك تێرناکات. دەرکەوتنی خولقکارەکان لە هەموو نەتەوە و گروپێك و کاریگەریکردنە سەر کۆمەڵگاکانیان بە واتای ڕێنسانس و ڕۆشنگەری ناوچە دێت.

١ ـ تایبەتمەندێتی بەرچاوی ئەم قۆناخە دەرکەوتنی ڕۆشنبیری و تاکی ڕاستەقینەیە. تاوەکو ئێستا ئەم دیاردانە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دەرنەکەوتووە و دوورە. بوون بە خاوەن کەسێتی و ڕۆشنبیر، زۆر لە بوون بە جوڵانەوە و پارتی ئۆپۆزسیۆن سەختترە. پەرەسەندنی کەسێتی تاك، واتای سەرهەلدانی کۆمەڵگای ئازادە. دەشێ هەندێ جار تاکێکی ڕۆشنبیر نوێنەرایەتی نەتەوەیەك یا کۆمەڵگایەك بکات. کولتووری گروپ و خێڵ و بەندەیی بە سانایی دەرفەت بە پەرەسەندنێکی بەمجۆرە نادات. کاتێك تاك و ڕۆشنبیر پێویستییەکانی کاروانیان جێبەجێبکەن، ئەو ئاراستەیە بەدیدێت کە کۆمەڵگاکان بۆ سەدانساڵ شوێنی دەکەون؛ بەمجۆرەش ئەو کارەی چەندین شەڕ و پارتی ناتوانن ئەنجامی بدەن، ئەو جێبەجێی دەکات. پێویستە بەردەوام بە بیرخۆمان بێنینەوە هونەرمەندان و پێغەمبەران و فەیلەسوف و بیریاران، هەر یەکە و لە قۆناخی خۆی ڕێنسانس و کاروانێکی ڕۆشنگەری بوون. ئەو کۆمەڵگایەی ڕۆشنبیری نەبێت وەکو ئەم قافلە وایە کە ڕێزانی خۆی لەدەستداوە. کاتێك بکەوێتە سەر ڕێگای چەوتیش بە مەودای سەدان ساڵ لە ئامانج دوور دەکەوێتەوە. لەبەر ئەوەی شۆڕشی ڕۆشنگەری و ڕێنسانس تاکی هێندە پێویست و ژیانی بۆ کۆمەڵگاکان دەخولقێنێ و خۆشی لەلایەن ئەو تاکانەوە دەخولقێنرێ، هەربۆیە بایەخێکی مەزن و دەست لێبەرنەدراویان هەیە. بەردەوام ئەوانەی بۆ یەکەمین جار ڕێگایەك دەگرنە بەر، پێویستییان بە ڕێزانێك هەیە. بە تایبەتیش کۆمەڵگایەك و کولتوورێك تازە هەڵسابێتەوە سەرپێیان بە ڕادەی هەرە زێدە پێویستی بە کەسایەتی ڕێزان هەیە. ئەو قۆناخەی لە ئارادایە زۆر لەو مەزەندانە زیاتر پێویستی بە نموونەی کەسایەتی بەمجۆرە هەیە.

گەیشتنی تاك بە کەسێتی خۆی لەبیرکردنەوە لەخود زیاتر بە واتای ئەو تاکە دێت کە بەو هێزە گەیشتووە لە کۆمەڵگادا کەسایەتی خۆی، لە کەسایەتی خۆشیدا کۆمەڵگا بونیادبنێ. ئەوەی لەخۆبایی بووە و بەدوای بەرژەوەندی خۆی وێڵە، ناشێ بە تاك ناوببرێت. هیچ کاتێك بەرژەوەندیخوازە ساویلکە و خۆپەرستەکان نوێنەرایەتی تاك ناکەن. کاتێك تاك پێدەگات، هونەرە

جوانەکان بە تایبەتمەندێتی خولقکاری خۆیان دەگەن و گەشەدەکەن. تاك و هونەر پێویستییان بە یەکتری هەیە. کاتێك یەکێکیان بەدیدێن ئەوەیتریش شوێنی دەکەوێت. هونەر واتای بالگرتنی هزر و رۆحە. ئیـتـر لەجیاتی بەرێوەچوون، باڵدەگرن و دەفڕن. فڕین بۆ کۆمەڵگا و شارستانییەت واتای گەیشتنە بە هێزی خۆیی و بەرێوەچوونە بەرەو سەرکەوتن.

دەشێ هەڵسەنگاندنی زۆر بەرفراوان سەبارەت بە رێنسانس و ریفۆرم و رۆشنگەری رۆژهەڵاتی ناوین بکرێت. بەڵام ئەمە بەسە کە بزانین، بۆچوونە نێو بابەتەکەوە چ پێویستە. بە شێوەیەکی واقیعیانە بیرکردنەوە لە ریشەی خود و بڕیاردانێکی ئازادانە سەبارەت بە بەرپرسیاری "چۆن بێت و چۆن بژین؟" و چۆنێتی نیشاندانی هێزی پێویست لەپێناو ئەم ژیانە، ئەمە بناخەیەکە بۆ ئەوانەی بانگەشەی ئایندە دەکەن و دەخوازن ببن بە بیرۆکە و دژە بیرۆکە. سەرکەوتن لەمەدا بە واتای بەرێوەچوونێکی سەرکەوتووانە دێت لەسەر رێبازی رۆشنگەری و رێنسانسی مرۆڤایەتی خۆی. هەرچەندە درەنگیش کەوتبێت، بەڵام تاوەکو دژە بیرۆکە لە رۆژهەڵاتی ناوین نەخولقێنرێت ئەوا شارستانییەتی ئەوروپا بە تەنیا ناتوانێ دەروازە لەپێش سەنتێز بکاتەوە کە لەهەمانکاتدا بە واتای شارستانییەتی نوێ دێت. دژە بیرۆکەی رۆژهەڵاتی ناوین شارستانییەتی گریك ـ رۆمان بوو. بیرۆکە و دژە بیرۆکەی ئەم دوانە، شارستانییەتی ئەوروپای کرد بە سەنتێز. ئێستا شارستانییەتی ئەوروپا بیرۆکەیە (تێز). لەمیانەی رێنسانسەوە دژە بیرۆکە لە رۆژهەڵاتی ناوین پێکدێت. یەکێتی دیالەکتیکی هەردووکیان سەنتێزێکی نوێ بۆ جیهان پێکدێنێت. دیالەکتیکی مێژوویی بەردەوام بەمجۆرەیە. دەشێ جارێکی دیکە وەرگێڕانی گۆڕانکارییەکانی لەسەر بنەمای دیالەکتیکی رێگا لەپێش قەڵەمبازێکی مێژوویی بکاتەوە.

ب ـ دیاردەیەکی سەرەکی کە پێویستە بە شێوەیەکی بە ناو یەکداچوو لەگەڵ سەرلەنوێ لە دایکبوون و رۆشنگەری رۆژهەڵاتی ناویندا بەرێوەبچێت، پرۆسەی شارستانییەتی دیموکراسییە یاخود بیرۆکەی شارستانییەتی ئەوروپایە. لەبەر ئەوەی بە بەرفراوانی هەڵوەستە سەبارەت بە شارستانییەتی دیموکراسی کرا، بۆیە دیسان پێویستی بە روونکردنەوە نییە. بەڵام گونجاندنی لە رۆژهەڵاتی ناوین و پێکهێنانی دژە بیرۆکەکەی کێشەیەکی بەرفراوانترە. لەگەڵ ئەوەی نوێبوونەوەی هزر و رۆح و بناخەی ئەمە پێکدێنن، کەچی مەودایەك و کەلێنی لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگا هەیە. زیاتر دوور لە چوارچێوەی هەردووکیان بەدیدێت. تاکە رەسەن و گەوهەرییەکان لەخۆوەدەگرێت. هەرچی بیرۆکەی شارستانییەتی دیموکراسییە، بە پێچەوانەوە کۆمەڵگا و دەوڵەت بە بنەمادەگرێت و ناچارە حیساب لە هەردووکیان بخوازێ و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات.

ئەو وەڵامەی لەو لایەنەوە رۆژهەڵاتی ناوین دەیداتەوە بیرۆکەی ئەوروپا، تاوەکو ئێستا لە ئاستی وتووێژکردنیشەوە نەبووە بە رۆژەڤ و جێگیرنەبووە.

سەرنەکەوتنی وەڵامەکەی سۆسیالیزمی بونیادنراو، هەم رەوشەکەی سەختکردووە، هەم پێکهێنانی بژارەیەکی کردووە بە ناچارییەك. لە راستیدا لقی ئەوروپای شارستانییەتی دیموکراسی نوێنەرایەتی رەوتە راستڕەوەکەی دەکات. بە گوزارەیەکی راستتر شارستانییەتی ئەوروپا نوێنەرایەتی رەوتی راستڕەوی شارستانییەتی دیموکراسی دەکات کە ئەوی تێپەڕ کردووە. ئەم رەوشەش سەرچاوەی خۆی لە هێزی سەرمایەداری وەردەگرێت. ئەوروپا وەکو کۆنترین و گەورەترین ناوەندی سەرمایەداری ئەم رۆژگارەمان، لە راستڕەوی دانابڕێت. لەمە زیاتر پێش ناکەوێت. بەرەو دواوە فاشیزمە، بەرەو پێشەوەش سۆسیالیزمە. هەربۆیە رەوتی راستڕەوی ماقوولترین شوێنگەیە. سۆسیالیزمی بونیادنراو بواری ئەزموونگەرایی بە واڵایی بەجێهێشتووە. ئەگەری ئەوە لە ئارادانییە ئەم بۆشاییە لەلایەن دەوڵەتە تازە گەشەسەندووەکان پڕبکرێتەوە. تەنانەت ئەگەر بتوانن ببن بە پاشکۆ و شوێن کەوتەش ئەوا بۆ خۆیان بە سەرکەوتن لە قەڵەمدەدەن. چین و دەوڵەتەکانی هاوشێوەی ئەو، کێشەیەکی بەمجۆرەیان نییە.

تەنیا کاتێك قۆناخی دیموکراسییانە لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی بچەسپێ ئەوکاتە رۆژهەڵاتی ناوین دەتوانێ ببێ بە دژە بیرۆکە. ئەنجامدانی لەمیانەی ریفۆرم یاخود شۆڕش، هیچ لە گەوهەرەکەی ناگۆڕێ. دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا بە پەلەترین رۆژەڤە. هەروەکو لە تەواوی جوڵانەوە گەلەری و شۆڕشگێڕییەکاندا بینراوە، ژنان و لاوان پێشەنگایەتی ئەمە دەکەن. ئەم دوو هێزە بەهێزترین فاکتەری دیموکراسین.

ژن جێگایەکی رەسەن و تایبەتی لەناو رابوونی دیموکراسییانەی رۆژهەڵاتی ناوین هەیە. وەکو هێزی خولقاندنی شۆڕشی نئۆلیتیك، ناتوانێ بە هیچ جۆرێك رەوشی بچووککردن و بەلاوەنانی لەلایەن کۆمەڵگای چینایەتییەوە هەرس بکات. بەردەوام بە گومانەوە تەماشای سەرداری پیاوی کردووە. باش هەست بە زەوتکراوی مافەکانی دەکات. بێچارەییەکەی لە نێو ئێش و خەم و پەژارەیەکی ئێجگار زۆری هێشتۆتەوە. دەرك بەوە دەکات هیچ کاتێك شایستەی ئەمڕەوشە نەبوو کە تێیکەوتووە. لە راستیدا بە نهێنی لایەنگری کولتووری خوداوەندی ژنە و پەیڕەوی دەکات. هیچ کاتێك لە دڵەوە باوەڕی بە خوداوەندە پیاوەکان نەهێناوە. ئەوەش دەزانێ کە بەردەوام لە نێو بۆشاییەکدایە. پڕ بە ئێش و تووڕەبوونەوە هەست دەکات ئەو خۆشەویستی و رێزەی بەرامبەر نیشان نەدراوە کە شایستەیەتی. هەرگیز لەوەی نەبووریوە کە بەمجۆرە بکەوێتە رەوشێك هێندە پێویستی بە پیاو بێت؛ زیاتر لە خۆی نەبووریوە. دەزانێ پیاو زۆر لە خۆشەویستی دوورە، دڵڕەقە و بێڕەوشتە، لە هێزی ئەشق بێبەشە. بوونی بە قوربانی تەواوی ئەم ناکۆکییانە بە پێچەوانەی مەزەندەکانی ژن بەرەو نەزانی نابات، بەڵکو زیاتر لە بلیمەتی نزیك دەکاتەوە. کاتێك باوەڕی دێنێ، هیچ هێزێکی دیکە ناتوانێ ببێتە رێگر و نەهێڵێ پێداویستییەکانی باوەڕهێنانی خۆی جێبەجێ بکات. بە گشتی تەواوی ژنان بە تایبەتیش ژنانی رۆژهەڵاتی ناوین بە هۆی ئەو تایبەتمەندێتییانەیان زیندووترین و چالاکترین هێزی کۆمەڵگای دیموکراسییانەن.

سەرکەوتنی یەکجارەکی کۆمەڵگای دیموکراسییانە بەدەستی ژن بەدیدێت. ژنان و گەلان کە لە سەردەمی نئۆلیتیك بەولاوە لەلایەن کۆمەڵگای چینایەتی ژێرخاککراون، وەکو خاوەنی راستەقینەی هەڵمەتی دیموکراسی، هەم تۆڵەی خۆی لە مێژوو دەسەنێتەوە، هەم لەمیانەی چەسپاندنی رەوتی چەپڕەوی شارستانییەتی دیموکراسییانە دژە بیرۆکەی پێویست پێکدێنێ، لە راستیدا لە چوون بەرەو کۆمەڵگایەکی یەکسان و ئازاد، پتەوترین کۆڵەکەی کۆمەڵایەتی پێکدێنن. چونکە دیموکراتیزە بوونی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین و بوونی بە دەزگا و بیرۆکە، زیاتر لە سایەی ژنان و دواتریش گەنجانەوە بەدیدێت. وشیاربوونەوەی ژنان وەکو هێزی پێشەنگی کۆمەڵگا و جێگرتنی لە شانۆی مێژوودا، بەهای دژە بیرۆکەیەکی راستەقینەی هەیە. جیهانی ژنان و وشیاری و ویژدان و خۆشەویستییەکەی پاڵێوراوە بۆ خولقاندنی بەهای تایبەتی شارستانییەت. پێشکەوتنی پیاوسالاریانەی شارستانییەت کە وەکو پێویستییەکی کەسایەتی و کارەکتەرەکەیانە، لەم بوارەشدا ژنان بەرەو رەوشی دژە بیرۆکەیەکی بەهێز دەبات. هەم بەلاوەنانی جیاوازییەکانی کۆمەڵگای چینایەتی، هەم کۆتاییهێنانی بە باڵابوونی پیاو لە دژە بیرۆکە بەولاوە، بەهای سەنتێزێکی نوێی هەیە. هەربۆیە رۆڵی پێشەنگایەتی ژنان لە وەرچەرخانی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین بۆ کۆمەڵگایەکی دیموکراسییانە بۆ سەرتاسەری جیهان، بە واتای دژە بیرۆکە و سەنتێز دێت و تایبەتمەندێتی مێژوویی لەخۆوە دەگرێت.

رۆڵی لاوانیش تا رادەیەك لە هی ژنان دەچێت. لاوانیش کە بە خێرایی دەرك بە جیهانی هاوچەرخ دەکەن، رق و کینێکی مەزنی بەرامبەر بەو رەوشە بێچارەیەی رۆژهەڵاتی ناوین هەیە. تەکنۆلۆژیای زانیاری و گەیاندن لاوان بەرەو وشیاربوونەوە و تێگەیشتنێکی خێرادەبات. تەنانەت منداڵانیش وەکو نەوەی لاوان بە خێرایی پایەی هێزی دیموکراسییانە بەدەستدێنن. بێزار بوونی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین لە تیرەگەرێتی و نەتەوەپەرستی، بە هۆی ئەو بێچارەییەی رێگایان لەپێش کردەوە و زیاتریش بە هۆی لەخۆوەگرتنی شوێنەواری کولتووری مێژووی هاوبەش، وایکردووە ئەم کۆمەڵگایە لەمیانەی گەوهەری راستینەکەیەوە زیاتر نزیکی دیموکراسییەت بێت. رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراسییانە بە گوێرەی مێژووی گەلان و راستینەی کۆمەڵگاکان لەبارە. بەناویەکداچوونی جوگرافی و کولتووری، پێداویستیە ئابوورییەکان، هاتوچۆ و سەرچاوە ئاوایییەکان، فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی هاوبەش دەکاتە باشترین ئەلتەرناتیف بۆ ناوچەکە. تەنانەت رابردووی مێژوویی رۆژهەڵاتی ناوین بریتییە لە فیدراسیۆنی گەلان و هۆز و تیرەکان. هەربۆیە فیدراڵییەت بە باشترین سیستەم دەبینرێ کە لەگەڵ بونیادی رۆژهەڵاتی ناوین دەگونجێ، ئەمەش سەرچاوەی خۆی لەم واقیعە ئاماژەپێکراوە دەگرێت. کۆمەڵگای دیموکراسی لە تەواوی سیستەمەکانی دیکە زیاتر لەگەڵ ئومێد و داخوازییە مێژووییەکانی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین دەگونجێ و کۆکە.

گەلان لەمیانەی تەواوی پێویستیە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان هێزێکی دیموکراسی رادیکالن. لە رێگای ئەم شوێنگەیەیان راستینەی جیهانێکن هەرە زێدە نزیکی پێکهێنانی دژە بیرۆکەن لە ناو رەوتی چەپڕەوی شارستانییەتی دیموکراسی. بژاری دیموکراسیيانەی رۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی ژنان و گەلانیەوە، لە هەموو لایەنێك زیاتر پاڵێوراوە بۆ پێکهێنانی ئەو دژە بیرۆکەیەی شارستانییەتی ئەوروپا زۆر پێویستیەتی. سروشتی راستینەکان ئەم دژە بیرۆکەیە دەخولقێنێ. یەکێتی دیالەکتیکی راست و چەپی ناوەندی هەردوو شارستانییەتی بەهێز کە بیرۆکە و دژە بیرۆکە پێکدێنن، جارێکی دیکە هەروەکو رابردوو رووبەڕووی ئەرکێکی مێژووییە تاوەکو دەست بەکاربێت و فەڵەمبازێك لەپێناو بەدیهێنانی سەنتێزێکی نوێی مرۆڤایەتی ئەنجامبدات.

بە جۆرێك مێژووی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین لە مێژووی ژن دەچێت. ئەویش لە سەردەمی نئۆلیتیکەوە بێ رۆڵ کراوە و ژێرخاك بووە.

تاکە ئاستەنگ ئەو دەوڵەتە دەسپۆتانەی کە لە ناوەندی دەزگا سیاسییەکاندا زاڵ و جێگیرە، بەڵام بە بنەماگرتنی جیهانگیری لەلایەن شارستانییەتی سەرمایەداری شکاندنەوەی بەلای شارستانییەتی دیموکراسییانە، دەرفەتی درێژەدان بە سیستەمی کۆنی کەم دەکاتەوە. هەروەکو دیارە نارەزایی گەلان لە ناوەوە کە لە رێگای تەکنۆلۆژیای گەیاندن و راگەیاندن زیادبووە، لە دەرەوەش لە ئاکامی جیهانگیری ئەو دەوڵەتە ستەمکارییانە دەڕووخێن. بۆ یەکەمین جارە مێژوو لە بەرژەوەندی پارچەکردنی ئەو تەنە نەخۆشەی ناو لاشەی کۆمەڵگا کاردەکات. هەربۆیە ئەگەری بەرخودانێکی درێژخایەنی سیاسەت و دەوڵەت بەرامبەر بە وەرچەرخانی دیموکراسییانە لە ئارادانییە. لە ماوەیەکی کورتدا لە پاکتاوبوون رزگاریان نابێت. بە ناویەکداچوونی تواناکاری و پێویستی وەرچەرخانی دیموکراسییانەی کۆمەڵگا و دەوڵەت وەکو شانسێکی مێژوویی، ئەم ئاراستەیە وا دەکات بژاری دیموکراسییانەی رۆژهەڵاتی ناوین بە خێرایی گەشەبکات. پەرەسەندنێکە دیاردەی بوون بە دژە بیرۆکە بەهێزدەکات. لە حاڵەتێکی بەمجۆرەدا کاتێك دەڵێین شۆڕشی هزری و دیموکراسی بە شێوەیەکی بەهێز ئەم دەرفەتە دەخولقێنێ کە شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین ببێتە دژە بیرۆکە، ئەم راستیانە رۆڵی دیاریکراو دەبینن.

ج ـ پەرەسەندنی شارستانییەتی دیموکراسی رۆژهەڵاتی ناوین لە نزیکەوە پابەندی تیۆری و کرداری گۆڕەپانی سێیەمە. بونیادی باوی دەوڵەت و کۆمەڵگا رۆڵێکی سەرەکی لەم مەسەلەیەدا دەبینن.

فشاری دژواری سەر کۆمەڵگای کۆن و دووچارهاتنی نامۆبوون لەخود، لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی ژیانی باو رێگای لەپێش لەدەستدانی رادەیەکی مەزنی دینامیکێتی گەوهەری کۆمەڵگا کردەوە. ئەو نوژەنیە رووکەشیەی لەسەر بنەمای سەرمایەداری ئەنجام دەدرێت، ئەم رەوشە خراپتردەکات. دەوڵەتی کلاسیکی کە بە هیچ شێوەیەك رۆڵی پێشکەوتوخوازانەی سەرمایەداری نیشان نادات، بە تایبەتیش کولتووری قۆناخی رۆشنگەری بۆ کۆمەڵگا ناگوازێتەوە. بە پێچەوانەوە چەمکی توندڕەوی نەتەوەپەرستی و تۆتالیتاری لەگەڵ پێکهاتە باو و دەسپۆتەکان دەکاتە یەك و لەمیانەی رتوشێکی دەزگاکانی دەیسەپێنێ، هێندەیتر بێچارەیی و رزینی پێکهاتەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوینی زیادکردووە. رەوشی دەوڵەتی کلاسیکی و باو و کۆنەپەرست و موحافەزەکارترن.

ئەم دوو فاکتەرە کاریگەرییەکی نیگەتیفانە دەکەنە سەر گەشەکردنی شارستانییەتی دیموکراسی و کۆمەڵگای مەدەنی. تا دوارادە ئاستەمە کۆمەڵگا و دەوڵەتی کلاسیکی بە تەنیا تواناکاری وەرچەرخانی دیموکراسی نیشان بدەن. کۆمەڵگای مەدەنی و وەرچەرخانی دیموکراسییانە وەکو گۆڕەپانی سێیەم بایەخداردەبن. تەنیا ئەگەر کۆمەڵگای مەدەنی و دیموکراتیزەبوون وەکو فاکتەری سێیەم لە نێوان هەردوو فاکتەر پێشبخرێت، دەرفەتی وەرچەرخان دەرەخسێ. بۆ کردنەوەی گرێکوێرە گەورەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بە رادەی هەرە زێدە پێویستی بە پێشخستنی تیۆری و چالاکییەکانی گۆڕەپانی سێیەم هەیە. پێکهاتەی دەزگاکان و هزری کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین کە بە بنبەستبوون گەیشتووە، هەبوونی دیموکراتیزەبوون لەسەر بنەمای کۆمەڵگای مەدەنی کە وەکو گۆڕەپانی سێیەمە، کردووە بە فاکتەرێکی چارەنووسساز و هەنگاوێکی گرنگ. بە بێ ئەوەی ئەم هەنگاوە سەرکەوتووانە ئەنجام بدرێت، ئەوا هەروەکو چۆن واقیعی نابین، کاتێك چاوەڕوان بین کۆمەڵگا و دەوڵەت لەخۆیانەوە بە بێ دەستێوەردانی دەرەوە ئەمە ئەنجامبدەن، ئەوا ئەم رەوشە رزان و بێچارەیی قووڵتردەکاتەوە. ئەو چالاکی و رێکخراوانەی دەخوازرێ لە جێگای ئەوان ئاوابکرێ و پشت بە دژواری و توندوتیژی دەبەستن رەوشەکە ئاڵۆزتر دەکات و دەیکات بە گرێکوێرە. لە کاتێکدا دەوڵەت لەمیانەی دژوارترین رێچکەوە خۆی بەهێزدەکات، کۆمەڵگا زیاتر پرەدەبێت. ئەو پێکهاتانەی خۆیان بە ئەو پەرگیری راستڕەو و چەپڕەو دادەنێن داب و نەریتێکی خراپی زەبریان لە مێژووی ناوچەکە تۆمارکردووە. لە سەدەکانی رابردووشدا هەڵوێستە هاوشێوەکانی توندوتیژی سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. ئەم رەوشە بایەخی شێوازی بەرخودان نیشاندەدات، نەك بێ واتاییەکەی.

لەخۆڕانییە شارستانییەتی دیموکراسی کە لە سەرتاسەری جیهان سەرکەوتنی بەدەستهێناوە بە رادەی هەرە زێدە پشت بە کۆمەڵگای مەدەنی دەبەستێ؛ بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەلمێنراوە تەنیا بەم رێگایە دەتوانرێ موحافەزەکاری دەوڵەت و کۆمەڵگا تێپەڕبکرێت. رۆژهەڵاتی ناوین پێویستی بە تیۆری و پرۆگرام و ستراتیژ و تەکتیکی سەرتاسەری و بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنی هەیە. لە هەموو بوارەکانی ئابووری تا تەکنۆلۆژیا و ژینگە، لە بواری کۆمەڵایەتی تا یاسایی، تاوەکو کولتوور و زانست، لە وەرزشەوە تا دەگاتە هەموو لقەکانی هونەرە جوانەکان، لە ئایدیۆلۆژیا تا سیاسەت پێویستی بە پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی ئەلتەرناتیفی نوێ و بەربڵاو رێکخراو هەیە. ئەم کۆمەڵگامەدەنییە ئەلتەرناتیفە کە پاشکۆی دەوڵەت و کۆمەڵگای کلاسیکی نییە و خاوەنی دیدگایەکی جیهانی سەربەخۆیە، لەمیانەی شێوەی پاڵێوراوە بۆ گەیشتن بە ئامانج، بەرنامەیەکی تێر و تەسەل و رێکخستنێکی چالاك و رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لە رەوشی ئاڵۆزدا هەیە، هەروەها لەمیانەی شێوە لەبارەکانی پراکتیزەکردن رێڕەوی رێگای پەیڕەوکراو دیاریدەکات، کۆمەڵگایەکی مەدەنی ئەلتەرناتیفی بەمجۆرەیە دەتوانێ گرێکوێرە بکاتەوە و کۆمەڵگا بێنێتە سەر رێبازی پێویست.

تایبەتمەندێتی گرنگی تیۆری گۆڕەپانی سێیەم ئەوەیە بە بێ رووخاندنی پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتانەی رێگا لەپێش بنبەستبوون دەکەنەوە هیچ چارەسەرییەك لەخۆناگرێت، بە بێ ئەوەی سیستەمی یاسایی کە لە ئارادایە بەرامبەر خۆی ببینێتەوە، بەڵام کەموکوڕی و هەڵە و بۆشاییەکانی دەبینێت و وەکو نموونەیەك خۆی بونیاد دەنێت و بەمجۆرە بەرەو ئەنجام دەچێ. هەروەکو بڵێی ئەمە پشت بە چەمکی "تۆ ناتوانیت کاربکەیت، من ئەنجامی دەدەم" دەبەستێ. هەرچی تیۆرییەکانی شۆڕش و شۆڕشی چەواشەی سەردەمی رابردووە، بۆ گەیشتن بە ئەنجام رووخاندنی ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتەی لە ئارادایە، بە بناخە دەگرێت. زۆرجار بینراوە کە سەرکەوتنە خوێناوییەکانیان لە رەوشی گومانی بەردەوام رزگاری نەبووە. لە راستیدا ئەو رێبازانەی وەرچەرخان بەرەو پێش یاخود دواوە کە بەرهەمی قۆناخێکی دواکەوتووە و پشت بە دواکەوتوویی زانست و تەکنۆلۆژیا و پیادەکردنی جیاوازی چینایەتی لەمیانەی زەبر دەبەستێ، لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و دیسان لەسەر بنەمای شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی گرنگی و بایەخی خۆیان لەدەستدا. تیۆری و پراکتیکی کۆمەڵی مەدەنی پشت بە گەشەکردنی شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی دووەمین نیوەی سەدەی بیستەم دەبەستێ. دەرکەوتنی بناخە مادديیەکەی لەمیانەی ئەم شۆڕشانە، شانس و دەرفەتی سەرکەوتنی کۆمەڵگای مەدەنی زیاتر دەکات. لە رابردوودا دەزگا مارژینالْ و شازەکان بە بناخە دادەنرا. هەروەکو بڵێی تەقینەوەی شۆڕشی کۆمەڵگای مەدەنی روویدا. بایەخدار بوونی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە رۆژگاری ئەمرۆمان هۆکاری مێژوویی، زانستی، تەکنۆلۆژی، دەوڵەت و کۆمەڵگای بەمجۆرەی هەیە. پێویستە تەواوی کۆمەڵە و گروپەکانی لە جۆری پیشەکاران، فەلسەفی، ئایینی کە لە مێژوودا بە مارژینالی ماونەتەوە لە نێو کۆمەڵگای مەدەنیدا لە قەڵەمبدرێن. بەڵام لاوازی تواناکارییەکانیان کۆسپ بوو لەپێش ئەوەی ببن بە ئەلتەرناتیف. هەروەکو دەزانرێ چەندین کەسایەتی کە لەناو ئەو دامەزراوە ئاماژە پێکراوانە پێگەیشتوون، دواتر لە بەرێوەبردنی دەوڵەت و کۆمەڵگا و پێشخستنیان رۆڵێکی هەرە گرنگیان بینیوە. جیاوازی هەرە گرنگی رۆژگاری ئەمرۆمان، کۆمەڵگای مەدەنی هێزی بوون بە ئەلتەرناتیفی بەدەستهێناوە. لەسەر بنەمای کۆمەڵگای مەدەنی تاوەکو دوایی رێگای وەرچەرخانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاواڵا بووە.

لەبەرچاوگرتنی ڕاستینەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان و بەرجەستەکردنی ئەم مۆدێلە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین، بایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەم چالاکییانەی لە مێژوودا لەمیانەی تەریقەتی جیاواز و کاسبکار و ڕێکخراوەکانی چەتەگەری بەڕێوەبراون، دیسان لەمیانەی بەخۆوەگرتنی شێوەی تەریقەت و نیقابەکان لە پێشکەوتنخوازی زیاتر، دەکەونە ڕەوشێکی کۆنەپارێزانە. هەرس نەکردنی شارستانییەتی دیموکراسی ڕۆڵێکی مەزن لەمەدا دەبینێ. پێویستە دیموکراتیزەکردنی پێکهاتە مارژیناڵە کۆنەکان وەکو ئەرکێکی گرنگ ببینرێ. بەڵام گرنگتر خولڤاندنی دەزگا هاوچەرخەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە کە کۆڵەکەی سەرەکی شارستانییەتی دیموکراسییە.

ئەگەر هەوڵبدەین هێڵە گشتییەکانی دیاری بکەین دەتوانین بڵێین: لە بواری ئابووریدا لە سەرووی هەمووشیانەوە بواری بەکاربردن، ڕێکخستنی کۆمەڵگا و جڤات و گەلە پەیوەستدارەکە هێزێکی گرنگی وەرچەرخان دێنێتە ئاراوە. تەنانەت لە کۆمەڵگا پێشکەوتوەکانیشدا ڕێکخستنی بەکاربردن ڕێگای لەپێش کاریگەربوونیان کردۆتەوە. ئەگەر بە تایبەتی کۆمپانیای گواستنەوە و کۆمەڵەی بەکاربردن، کامپانیای گەشت و گوزار، یەکێتییەکانی بەرهەمهێنان، ڕێکخراوەکانی ئەوقاف، یەکێتی بازرگانی و داراییەکان لەسەر بنەمای گەلاڵە نامەیەکی ئابووری و گونجاو و بنچینە یاساییەکانی ئاوابکرێت، ئاشکرایە کە گرنگترین هێز پێکدێنن. ئەو کاتە دەشێ کۆمەڵگا و دەوڵەتی کلاسیکی بکەونە پلەی دووەمەوە. هەربۆیە دەبن بە گرنگترین ئامرازی بەڕێوەبردنی دیموکراتیزەبوون. توێژێکی گەل یان جڤاتێك کە ڕێکخراوەکانی بەکاربردنی خۆی هەیە و دەزگای وەکو ئوتێل، بانك، ژوور، وەقف و سەندووقی هاوکاری ڕێکخستووە، تەواوی کۆمەڵگا و دەوڵەت ناچارن بەهەندی بگرن و لەگەڵی ڕێکبکەون.

جڤاتێکی لە بواری کۆمەڵایەتی لە سەرووی هەمووشیانەوە لایەنی پەروەردە و تەندروستی لەمیانەی هێزی گەوهەری خۆیان ڕێکخستووە، دەبێتە یەکێك لە هێزە دیاریکراوەکانی ئەو شوێنەی جێگای خۆی تێدا دەگرێت. هەروەها کۆمەڵگایەکی مەدەنی کە دەزگا گەوهەرییەکانی خۆی کردار و چالاکی لە جۆری شانۆگەری، سینەما، ئەدەبیات، مۆسیقا، ڕەسم، فیلم، دیکۆمێنت ڕێك دەخات، تا دواڕادە بە کاریگەر و سەرنج ڕاکێشە. هەروەها ئاواکردنی هۆڵ و گۆڕەپانی وەرزشی و شوێنی ڕێپێوان لە چیا و لادێ بە تایبەتیش ئەوانەی سەبارەت بە جەماوەر و ژن و لاوانن، گرنگییەکی زۆریان دەرهەق بە تەندروستی و هزری باش هەیە. بە تایبەتیش لە زەمینە و هەلومەرجی شارە پێشنەکەوتووەکان ڕێکردنەوە لەپێش وەرزشی جەماوەری، ئیتر بووە بە پێویستییەك. لەجیاتی وەرزشی فەرمی و تەماشاکردن کە کۆمەڵگا سڕدەکات، وەرزشێك کە لەسەر بنەمای تەڤلیبوونێکی چالاکانەی کۆمەڵگای مەدەنی بێت، پاڵێوراوە ببێت بە یەکێك لە دەزگا هەرە هاوچەرخەکان.

ڕێکخستنی گەوهەری کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری یاسایی دامەزراوێکە ناتوانرێ دەستبەرداری لێبکرێت، چونکە ڕەوشی بێ یاسایی پەرەیسەندووە و بە شێوەیەکی گشتی وشیاری یاسایی لاوازە. خاوەنداری و گەیشتنی هەموو یەکێتی و گروپە گەلەرییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە نووسینگەی یاسایی گرنگییەکی ژیانی هەیە. نووسینگەکانی سەبارەت بە ماف، هەم وشیاری یاسایی بڵاودەکاتەوە و بەرەو سیاسەتی دیموکراسییانەی ڕاستیان ڕاکێش دەکات، هەم وەکو بنەما و چەکەرەی سەرەکی تێکۆشان بەرامبەر بێ یاسایی، لە چەسپاندنی سیستەمی یاسایی گەردوونی بە پێویستیترین دامەزراوەی کۆمەڵگای مەدەنی دادەنرێت. بە شێوەیەکی گشتگیر تاوتوێکردنی ڕێکخراوەکانی نەقابەی پارێزگاران و مافی مرۆڤ، نەهێشتنی هیچ شوێنێك کە یاسا و مافناسەکانی پێنەگەیشتبێت، تەنانەت دەستنیشان کردنی نوێنەری نووسینگەکان لەهەر گوندێك ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە لە سەرخستنی کۆمەڵگای مەدەنی دەبینێ.

لە بواری سیاسی بە تایبەتیش بە پارتیبوون وەکو ئامرازێکی ڕاستەوخۆ چوون بۆ دەسەڵات، دەزگای ئەوتۆن پێویستە سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی بە بایەخێکی مەزنەوە تاوتوێ بکرێت. بەلاوەنانی ئەو بە پارتیبوونانەی پشت بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەتی کلاسیکی دەبەست و لەجیاتی ئەو بە بنەماگرتنی ئەو پارتە سیاسییانەی هێزی گەوهەری کۆمەڵگا دەخەنە ڕوو و ئاراستەی دەستووری بۆ خۆی دەکات بە بناخە و هەڵگری وشیارییە، مەرجێکی گرنگی کۆمەڵگای مەدەنییە و بە بێ ئەوە نابێت. سیستەمی پارتە سیاسییەکان کە لقی تایبەتی خۆی لە هەموو لایەکی کۆمەڵگای مەدەنی تەنانەت لە گوند و شارۆچکەکانیش هەیە، لەمیانەی کادری ئامادەکراوەوە سیاسەتێکی تەباییانە لەگەڵ کۆمەڵگای کۆن و دەوڵەت بەڕێوە دەبات، لە ڕێگای فشاری ئاشتیخوازانە وەکو ئامرازێکی سەرەکی وەرچەرخانی دیموکراسییانە، دەوڵەت و کۆمەڵگا ناچاری وەرچەرخانی دیموکراسییانە دەکات.

بەلاوەنانی کۆمەڵگای توندوتیژی کە لە هەندێ ناوچە و جڤاتدا بایەخی زیادی کردووە و دەربازبوون بەرەو کۆمەڵگایەکی ئاشتی، پێویستییەکی مەزن بە کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی دەستەبەرکردنی ئاشتی پێشدەکەوێت. مسۆگەر پێویستە ڕێکخراوە ئاشتیخوازەکان پێکبهێنرێن کە واتا و گرنگی ئاشتی ڕووندەکەنەوە و ڕێگە و ڕێچکەکانی دیاریدەکەن و چالاکبوونی فەراهەم دەکەن. بە تایبەتیش بۆ کۆمەڵگاکانی وەکو ڕۆژهەڵاتی ناوین کە تاوەکو مۆخی ئێسقانیان توندوتیژییان لەخۆوە گرتووە، ئاشتی و ئامرازەکانی ئاشتی و چالاکییەکانی، دامودەزگایەکی مەدەنین کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەردەکەوێتە پێش. باوەڕ پێهێنانیان و بەڕێوەبردنیان لەمیانەی هێزێکی مەزنەوە لە گەشەکردنی کۆمەڵگای دیموکراسییانە و دەوڵەت دەشێ یەکێك لە ڕۆڵە هەرە ژیانییەکان ببینن. یەکێتیە هەمە لایەنەکانی ژنان و لاوان کە لە هەموو چین و توێژەکانی دی زیاتر پێویستییان بە ئاشتی و ئازادی هەیە، لە سەرووی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دێت. ئەو ڕێکخستنانەی بوونەتە وەڵامدەرەوەی ئامانجە سیاسییەکان و ڕەوشی بەرجەستە و مێژووی لاوان و ژنان، لە لایەکدا کۆسپەکانی کۆمەڵگای موحافەزەکار و دەوڵەتی دەسپۆت بەلاوە دەنێت، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو بناخەیەی بۆ بەڕێوەچوونی تەواوی کۆمەڵگا دیاری دەکرێت، ڕۆڵی ئامرازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەبینێ. لەمیانەی ڕێکخستنێکی کە چەندایەتی و چۆنایەتییەکەی بەرنامەڕێژکراوە و باوەڕی پێهێنراوە، یەکینە و کۆمەڵەکانی ژنان و لاوان بنەڕەتیترین گەرەنتی سەرکەوتنی کۆمەڵگای مەدەنین.

لە چوارچێوەی سنووری ئەو وڵات و دەوڵەتانەی دامەزراوەی "فیدراسیۆنی دیموکراسی"یان هەیە کە تەواوی ئەم دەزگایانەی کۆمەڵگای مەدەنی لەخۆوە دەگرێت، هەروەها ئەو هاوکاری و هەمئاهەنگییەی لەگەڵ دامەزراوەکانی وڵات و دەوڵەتەکانی دیکە دەکرێت، ئەوا لەمیانەی شێوازەکانی ڕێکخستنی فیدراسیۆنی دیموکراسییانە سیستەم کامڵ دەبێت.

بەرگری ڕەوا بابەتێکی سەرەکی و گشتی کۆمەڵگای مەدەنییە و پێویستە بە شێوەیەکی دروست دەرکی پێبکرێت و پراکتیزەبکرێت. بەردەوام شیمانەی هێرشی دەوڵەت و کۆمەڵگای باو بۆ سەر کۆمەڵگای مەدەنی لە ئارادایە، چونکە ئەو هێزانەی دەخوازن کۆمەڵگای مەدەنی پووچەڵ بکەنەوە یاخود بورووژێنن ئینجا بە شێوازێکی نهێنی بێت یاخود ئاشکرا، ئەم ڕێچکانە بەکاردێنن. چونکە دەروازەی بەرژەوەندییەکانیان تا ڕادەیەك دادەخرێت، هەربۆیە ناشێ وا بە سانایی ئەم ڕەوشە پەسندبکەن. بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی چەندین دەزگا لەکاردەکەون و دووچاری شڵەژان دێن، هەربۆیە هەموو کاتێك شیمانەی لادان لە یاسا و بە ڕۆژەڤکردنی توندوتیژی هەیە. ڕەوشی بەمجۆرە بەرگری ڕەوا دەکاتە ڕۆژەڤ و بابەتێکی هەڵوێستەکردن، کە مافێکی دەست لێبەرنەدراوی یاساییە. پێویستە زۆر بە باشی دەرك بە ناوەڕۆك و شێوەی بەرگری ڕەوا بکرێت. کاتێك ئەو تاك و کۆمەڵانەی بۆ بەدێهێنانی ئەو مافانەی لەلایەن دەستوور و ڕێککەوتن و یاسا دەوڵەتییەکان دانی پیانراوە، ناچاربوون مافی بەرگری گەوهەری پەیڕەوبکەن، دەتوانن لەمیانەی ڕاپەڕین تا دەگاتە خۆپێشاندان لە یاداشتی گشتی تا دەگاتە پەنابردنە بەر دادگا، دەتوانن هەموو ڕێچکە و شێوازێکی تاکە کەسی یان بە کۆمەڵ، گشتی یان پارچە پارچە، تا کۆتایی هێنان بە بێدادی و بەدەستهێنانی مافەکانیان، مافەکانی بەرخودان بەکاربێنن.

ئەگەر ڕێگای یاسایی و سیاسییەکانی چارەسەری لەپێش گەلێك داخرابێت کە ستەمکاری بەرامبەریان و دژ بە زمان و کولتوورەکەیان پەیڕەو بکرێت. پێویست بکات دەتوانن دەربازی نێو بەرخودانێکی درێژخایەن یان کورت خایەن ببن. ئەمە یاخیبوونێك نییە بەڵکو مافێکی ڕەوا و داوانەکردنی ماف یاخود بەکارنەهێنانیان گەورەترین پێشێلکاری یاساییە. ئەو شوێنانەی ڕەوشەکەی بەمجۆرە بێت، یاساکانی دارستان پەیڕەو دەکرێت. هەربۆیە ئەو گەل و کۆمەڵە و تاکانەی خاوەن مافن و بەرامبەر بێدادی بێدەنگ دەمێنن، یاساکان پێشیل دەکەن. نەخواستنی ماف یاخود کاتێك لەمیانەی فشارەوە مافەکانی زەوت دەکرێ، پێویست بکات، سەرهەڵدانیش مافێکی پیرۆزی بەرخودانە. ئەمەش گەوهەری پێکهاتنی دادوەری و یاسایە. هیچ گەلێك یاخود تاکێك مافی نییە بەرامبەر بە بێ یاسایی و بێدادی بێدەنگ بێت و ملکەچی بۆ بکات. پێشێلکاری ڕاستەقینەی یاسا و ژەهراوی کردنی کۆمەڵگا و دەوڵەتێك، سەرچاوەی خۆی لەو ملکەچ کردنە وەردەگرێت. بەرگری ڕەوا هەڵوێستەیەکی یاساییە و بۆ خولڤاندنی یاسا و بەکارهێنانی هەرگیز دەستی لێبەرنادرێت. ئەو تاك و جڤات و گەلانەی پێداویستییەکانی ئەوە جێبەجێ

ناکەن، مافی سکاڵاکردن و خۆ بە مرۆڤ دانانیان نییە. مافی مەدەنی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تاك، مافە کولتوورییەکانی و مافی دیاریکردنی گەلان بۆ چارەنووسی خۆیان کە بە مافەکانی یەکەمین و دووەمین و سێیەمینەوە دادەنرێت و بووە بە مافێکی فەرمی و ژیانی تەواوی یاسا گەردوونییەکان و بەهای هەڵکشاوی سەردەمن، یەکێکن لە بەردەکانی گۆشەی بناخەی شارستانییەتی دیموکراسییەت.

مەسەلەی رێبەرایەتی و کادیران کێشەیەکی گرنگی کۆمەڵگای مەدەنییە. لەپێناو ئەو پرۆژە بەرفراوانانەی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستی بە دامەزراوەی زۆر گرنگ و بایەخداری پەروەردە و فێرکردن هەیە. ئەم مۆدێلەی کۆمەڵگا لە رێی کەسی ئاسایی و ناشارەزاوە ئاوا ناکرێت. هەربۆیە دەبێ بە گوێرەی پێویستی ئەو دەزگایانە ئاوا بکرێن کە کادیرە سەرەکییەکانی ئامادە دەکات. هەروەها پێویستە گشتگیری ئەم دامەزراوانە دەوڵەمەند بێت و لە گەوهەری ئایدیۆلۆژییەوە تا دەگاتە بوارەکانی تەکنۆلۆژیا هەموو بوارێك لەخۆوە بگرێت. هەروەها پێویستە ئەکادیمیا و ئەنیستۆی بە توانا ئاوا بکرێت کە هەموو بوارەکانی فەلسەفە، ئیلاهییات (لاهوت)، مێژوو، یاسا، زمان، هونەر، زانست، وەرزش، ئابووری، سیاسەت، راگەیاندن و بڵاوکردنەوە لەخۆوە بگرێت. سیستەمی پەروەردەی گشتی دەوڵەت و کۆمەڵگا کادیری پێویست بەرهەم ناهێنێ. دەشێ ئەم کادیرانە لەو فێرگانە ئامادە بکرێن کە لەگەڵ گەوهەرەکانیان دەگونجێن و شێواز و رێچکەکانیان بە گوێرەی ئامانجەکانیانەوە لەمیانەی ئەزموونگەراییەوە تۆکمە بکرێن.

پێویستە بە بایەخەوە شێواز و تەرزی کۆمەڵگای مەدەنی لەپێناو چارەسەرکردنی بنبەست بوونی پێکهاتەی دەوڵەت و کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین تاوتوێی بکەین و خراپەکاری و تێکدانەکانی رێچکەکانی توندوتیژی کلاسیکی سنووردار بکرێت، ئەم مۆدێلە لەمیانەی هەڵوێستەی تیۆری و کردارییەوە، پێبەپێ بایەخدار دەبێت. پێویستە هەموو کەسێك لە سەرووی هەمووشیانەوە عەرەبەکان، ئیسرائیل، ئێران، ئێراق و کوردان دان بەوە دابنێن کە تەواوی رێچکەکانی توندوتیژی و چەمکەکانیان کە تاقی کرانەوە، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی سەردەم سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. ئیتر پرۆژەیەکی گشتگیری کۆمەڵگای مەدەنی کە بەردەوام مافی بەرگری رەوا لە رۆژەڤدا دەهێڵێتەوە، بۆتە ناچارییەك. هیچ کاتێك ناشێ لەمیانەی چەمکی نەتەوەپەرستییەوە کێشەی قودس چارەسەر بکرێت. ئەگەر ئەم چەمکە بەردەوام بێت، چارەسەرکردنی کێشەی کورد سەدەیەکیتریش بەردەوام دەبێت، شەڕەکانی ئایینزایی کۆتاییان پێنایەت، تیرەگەرێتی و خێڵەکی کۆتایی پێنایەت. ئەو کۆمەڵگایەی توندوتیژی لەخۆوە بگرێت، بەردەوام لە نێو یاخیبوون دەبێت، دەوڵەتیش دەست لە گۆپاڵ بەرنادات. بەڵام تەواوی ئەو رێچکانە بنبەستبوون قووڵدەکەنەوە. لە سەردەم نزیکی ناکاتەوە، بەڵکو مەودای نێوانیان زیاتر دەکات.

بەرامبەر بەمەش شێوازی چارەسەری کۆمەڵگای مەدەنی کە کۆڵەکەی سەرەکی شارستانییەتی دیموکراسییە، هەرچەندە لە سەرخۆ بێت و بە گوێرەی داخوازی هەموو کەسێکیش نەبێت، وەکو رێگاچارەیەکی گشتی و هاوسەنگکار لەمیانەی پێوانە دیموکراسییەکان و هەنگاوە یەك بە دوای یەکەکانی رێبازی چارەسەری، ئاشتی پێش دەخات و دەبێتە ناچارییەك. شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین کە بە درێژایی مێژوو فیدراسیۆنێکی سروشتی و خۆڕسك بووە، کاتێك لەمیانەی پێوانەکانی شارستانییەتی دیموکراسی پەرە بە کۆمەڵگای مەدەنی دەدات، دەشێ بە رەوشی دژە بیرۆکەیەکی خاوەن بانگەشە بگات. لە ئاکامی بیرۆکەی راستڕەوی شارستانییەتی ئەوروپا و دژە بیرۆکەی چەپڕەوی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین یەکێتییەکی دیالەکتیکییانە پێکدەهێنرێت، بەمجۆرە هەروەکو لە مێژوو روویداوە جارێکی دیکە لە رێگای سەنتێزی پێویستەوە، دەشێ هەڵمەتێکی راست لەپێناو تەواوی مرۆڤایەتی ئەنجام بدرێت. بەمجۆرە هەڵسووڕانی رەوڕەوەی مێژوو دەشێ رێگا لەپێش هەنگاوی پراکتیکی سەرکەوتووانە و ئومێدی هەلکشاو بکاتەوە.

دواترین بابەت کە پێویستە سەبارەت بە پێکهێنانی دژە بیرۆکەی رۆژهەڵاتی ناوین هەڵیسەنگێنین، رۆڵی گەلانە وەکو هێزێکی سیاسی کارا. ئایا ئەوانەی رۆڵی کولتوور گواستنەوەیان بینی و شارستانییەتەکەیان تێکچڕژاوە، وەکو کۆنترین گەلانی مێژوو لە رۆژگاری ئەمڕۆمان گوزارشت لە چی دەکەن و لە ئاییندەدا رۆڵیان چۆن گەشەدەکات؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسە، دەشێ رێگای پێشهاتەکان رۆشن بکاتەوە. بە کورتی لە ئاستی پێناسەکردندا ئاماژەی پێدەکەین:

١ ـ راستینەی عەرەبی و ئیسرائیلی کە خاوەن هەمان بنەچەی سامین لە سەرووی ئەم دیاردانەوە دێن کە ناوچەکەیان بە خۆیانەوە خەریککردووە و بەردەوامیشی پێدەدەن. ئەمە ریشەکەی بۆ چوارهەزار ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە. لە ماوەی نێوان ٩٠٠٠ ـ ٦٠٠٠ پ.ز کولتووری سامی لە رەوشی پەیدابوون و پێکهاتندابوو. دواتر بە ئاراستەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و باکوور و باشوور بڵاوبۆوە. ناوچەکانی ناوەوەی نیمچە دوورگەی عەرەب کە ئەم کولتوورەی تێدا دەرکەوت، لە ٩٠٠٠ تا ٣٢٠٠ پ.ز کەشێکی لەباریان هەبوو، ئەم کەشە لەبارەش رۆڵێکی سەرەکی بینی لە پێکهاتنی ئەو تیرە سامیانەی کاریگەریان کردە سەر تەواوی نیمچە دوورگەی عەرەبی و باکووری ئەفریقیا و رۆژهەڵاتی دەریای سپی و کەنارەکانی رووباری فورات و چیای تۆرۆس، لەم قۆناخەدا چەندین شێوە زمانی هەمە جۆری سامی پەیدابوون. ئەو وشکاییەی لە ٣٠٠٠ ی پ.ز روویدا کۆچکردنی تیرەکانی بەرەو ناوچە لەبارەکانی ژیان و گوزەران خێراترکرد. هێزی کاری سەرەکیبوون لە ئاواکردنی شارستانییەتی میسر و سۆمەر. دیسان ئەوانەی بۆ یەکەمین جار لە نێوان هەردوو شارستانییەت و نێوان خۆیاندا فێری بازرگانی بوون، ئەم تیرانەن. سۆمەریەکان ئەم تیرانەیان بە ئامۆریتەکان (رۆژئاواییەکان) ناوزەدکرد کە بەرەو ناوچەکانیان کۆچیان کرد، میسرییەکان بە ئابیرۆ ناوزەدیان کردوون ( ئابیرۆ: ئەوانەی لە بیابانەوە هاتوون، وشەی عیبرانی لێرەوە هاتووە). لە کاتێکدا کە لە سەردەمی ئەکەدییەکان و بابلی و ئاشوورییەکان، ئامۆرییەکان بە تەواوی بەسەر سۆمەریەکاندا زاڵبوون، ئەوا عیبرانییەکان لە نێوان هەردووکیان لە نێو هەڵکشان و داکشان بوون. ئیبراهیم لە ناوچەی سۆمەریەکان لە ئور بەرەو ئورفا دەچێ، مووسا لە میسر پێهەڵگرتن ئەنجام دەدات. ئەمەش بەرامبەر بە شارستانییەتی کۆیلەداری تا رادەیەك شەڕە لەپێناو ئازادی. لە ئاکامی کاریگەری چڕی هەردوو شارستانییەت، ئەم قۆناخە بە دەرکەوتن و گەشەکردنی ئایینە تاکخوداییەکان ئەنجامگیربوو.

بەرامبەر بە فرەخودایی میسرییەکان و سۆمەریەکان، ئایینی تاکخودایی لەمیانەی بواری ژیانی چۆنییەکی (رۆتینی) تیرەکان و پێویستی یەکبوون، بایەخداردەبێت. تەنیا لە رێگای باوەڕهێنان بە خودایەکی توند و تاقانە دەشێ ئەم تیرە و هۆزانە بکرێن بە یەك و بەڕێوە ببردرێن. کاریگەرییەکانی هەلومەرجی نیمچە دوورگەی عەرەبی رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لەو قەڵەمبازە ئایینیە بینی. هەروەها ئەوە روونبۆتەوە و دەرکی پێدەکرێ دوای شەڕی ئایینی تاکخوداییەکان بەرامبەر بە ئایینە فرەخوداییەکان و تەوتەمگەراییەکان، ئەم قۆناخە بەدیهاتووە. ئیبراهیم هەنگاوی بەرایی بۆ ئەم قۆناخە هاوێشت و لە رێگای مووسا بوو بە ئایینی قەوم، عیساش دەیکات بە ئایینێکی گەردوونی. لەمیانەی مەحەمەدیشەوە دەبێتە ئایینی تەواوی عەرەبەکان، دواتر جارێکی دیکە دەبێتە ئایینی مرۆڤایەتی. ئەوەی عیسا بەناوی هەژاران ئەنجامیدا، مەحەمەد لە ژێر ناوی بازرگانەکان، واتە لە ژێر ناوی چینی ناوین ئەنجامیدا. هەردووکیشیان بە رادەی گەردوونی بوونی ئەم چینانە، وەکو ئایینی گەردوونی هێزی گەشەکردن بەدەستدێنن.

سووربوونی یەهوودییەکان لەسەر ئایینی قەوم، دەروازەی لەپێش ئەوە کردەوە ببنە فاکتەرێکی مەزنی گۆڕانکاری مێژوویی. لەم بوارەدا یەهوودیەت وەکو ئەو هێزە سەرەکییەی وەرچەرخان و تەنگەتاوکردن و ورووژاندنی ناوهەناوی مرۆڤایەتی وایە. لە سەردەمی دەرکەوتنیانەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان ئەم رۆڵەیان بەردەوامبووە.

عەرەبەکان وەکو دواترین نەوەی تیرەکانی بیابان، لەگەڵ نوێکردنەوەی ئایینی ئیبراهیم لەلایەن حەزرەتی مەحەمەدەوە تەقینەوەیەکی مەزنی ئەنجامدا و جێگای خۆیان لەسەر شانۆی مێژوو گرت. ئیسلامییەت و ئەڵڵا و نەتەوەپەرستی عەرەب، ناسنامە و بونیادێکی ئایدیۆلۆژی چڕ پێکدێنن. ئاشکرایە لەلایەنی ئایینی و نەژادییەوە خزمایەتییان لەگەڵ یەهوودیەت هەیە. بەرزبوونەوەی ئاستی ناکۆکییەکانی نێوانیان سەرچاوەی خۆی لە جیاوازی چینایەتییەوە دەگرێت. لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلام ئەم ناکۆکییە هەنگاوێکیتر بەرەوپێشچوو. لە نێوان یەهوودییەکانی کە لە رێگای بازرگانیکردن دەوڵەمەندبوون و ئەو عەرەبانەی گوزارشت لە دواترین یەکێتی تیرەکانی بیابان دەکەن. لە راستیدا ئەم قۆناخە بە حەزرەتی ئیبراهیم دەستپێکردووە. ئەویش بەرامبەر بە پادشاکانی شاری سۆمەریەکان هەلوێستی نیشانداوە کە زۆر لە عیبرانییەکان دەوڵەمەندتر بوون. مووساش هەمان تیرە هەژارەکانی عیبرانییەکانی

بەرامبەر پادشای میسرییەکان راکردۆتە سەرپێیان. لە ئیسرائیلی رۆژگاری ئەمڕۆشمان ناکۆکی بەمجۆرە بەردەوامە. ئەم ناکۆکییانە لەگەڵ هێلینیەکان و رۆماییەکان و بابلی و ئاشوورییەکان کەم نەبۆتەوە. شارەزایی و وشیاری مەزنی یەهوودییەکان لە مێژوو بۆ ئەزموونەکانی ئەم ناکۆکییانە و هێزی بازرگانی دەگەڕێتەوە. یەهوودییەکان جگە لەو کۆچبەرییەی بەدەستی بابلیەکانەوە دووچاری هاتوون، لەلایەن رۆماییەکان دووچاری گەورەترین کۆچبەری هاتن و دوای ساڵی ٧٠ ی زایینی لە تەواوی جیهان پەرتەوازەبوون.

لەبەر ئەوەی یەهوودییەکان خاوەنی فێڵبازترین هزری بازرگانین، ئەو گەلانەیان وروژاندووە کە لەگەڵیاندا ژیاون، ئەمەش بەردەوام رێگای لەبەردەم فڕکردنیان کردۆتەوە. لە دواییدا لە دەرئەنجامی فاشیزمی ئەڵمانی هیتلەر لە دایکبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو بە ناچارییەك. ئیسرائیل باجی ئەو فڕکردن و ریشەکێشکردنەیە کە فاشیزمی ئەڵمانی دژی یەهوودییەکان پەیڕەویکرد و بەسەر تەواوی لایەنە پەیوەستدارەکان شکاوەتەوە، لە سەرووی هەمووشیان عەرەبەکان. یەهوودییەکان لە سەرووی کاراترین ئەو گروپانەوە دێن کە لە پێشکەوتن و بڵاوبوونەوەی سەرمایەداری رۆڵیان هەبووە، لە سەرووی هەمووشیانەوە لە گەشەکردنی شارستانیەتی ئەمریکا و ئەوروپا. لە بوارەکانی بازرگانی، دارایی، زانستی، هونەری، تەنانەت لە لقە هەستیار و گرنگەکانی سیاسەتدا لە سەرتاسەری جیهان بە کاریگەرن. شارستانیەتی سەرمایەداری کۆمەکیان دەکات. سەبارەت بە مەسەلەی خاك ناکۆکییەکانیان لەگەڵ عەرەبەکان چڕبۆتەوە. لەناوبردنی ئیسرائیل مەحاڵە. بەڵام وەرچەرخانی ئەو شێوەی ئێستای دەشێ ئامرازەکانی چارەسەری بەرهەم بێنێ. بەڵام لەهەمانکاتدا وەرچەرخانی نەتەوەپەرستی عەرەبیش مەرجێکە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا هەر دوو شێوەی نەتەوەپەرستی دەشێ رێگا لەپێش بەکارهێنانی بۆمبایەکی ئەتۆمی بکەنەوە. لە شێوازێکی بەمجۆرەی شەڕ باڵابوونی ستراتیژی ئیسرائیل لە ئارادایە. بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی بۆ پێشکەوتنە مەیدانی و کردارییەکان نییە.

لە راستیدا دژوارترین و بێزەییانەترین گرێکوێرەی نەتەوەپەرستی چەقبەستوو، کە رێگای لەپێش کردەوە، لە سەرتاسەری جیهان دووچاری بنبەستبوون هاتووە، گرێیی قودسە. هەروەکو بڵێی ئەم شارە پیرۆزە ماکی نەفرەتی نەتەوەپەرستی و تیرەگەرێتی کۆن لەخۆوە دەگرێت. هەرچی ناوەکەیەتی بە واتای پیرۆزی و جێنشینی ئاشتی دێت. لە باوکێتی ئایینە تاکخوداییەکان یەهوودییەکان رۆڵیان بینی لە دەرکەوتنی چەمکی نەتەوەپەرستی. هەر بەخۆشیان لە ئاستێکی هەرە بەرزدا بوونە قوربانی ئەم دوو چەمکە. لەگەڵ ئەمەشدا لەمیانەی ئەو ئەزموونانەی لەناو شارستانییەتەکان وەریانگرتووە رێگای لەپێش ئەوەکردەوە لە بوارەکانی زانست، هونەر، ئابووری یەهودییەکان، بەهای بەهێز پێبگەیەنن و بێننە ئاراوە. لە نووسینەوەی کتێبی پیرۆز تاوەکو دەگاتە چەندین شاکاری زانایانە و هونەر، لەناو یەهوودییەکان دەرکەوتوون. لە بواری ماددی و مەعنەوییەوە بوون بە هێزێکی مەزن. تەنانەت تەواوی ئایدیۆلۆژیا و دەزگا سەرەکییەکان لەسەر پەنجەی خۆیان دەسووڕێنن.

عەرەبەکانیش وەکو دواترین گروپە سامیەکانی بیابان بە دواکەوتوویی ماونەتەوە. بەڵام بڵاوبوونەوەیان لە تەواوی نیمچە دوورگەی عەرەب و ئەفریقیای باکوور، بە لایەنی کەم رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە لە بواری جوگرافی بە دەوڵەمەندی و هێزی چەندایەتی بگەن. بەمجۆرە دوو گروپی بە رەچەڵەك سامی لە سەرتاسەری جیهان رووبەڕووی یەکتری بوونەتەوە. بوونەتە قوربانی ئەو ئایین و نەتەوەپەرستییەی بە خۆیان خوڵقاندییان، ئەو حەزیایانەی خۆیان خوڵقاندیان، قووتیان دەدات. هەربۆیە بەلاوەنانی ئەو هەڵوێستانەی پشت بە ئایین و نەتەوەپەرستی دەبەستن تاکە رێگای چارەسەرییە. ئەم دوو گروپەی دەتوانن رۆڵی گرنگ و پۆزەتیف (ئەرێیی) لە رۆژهەڵاتی ناویندا ببینن، پێویستە لە چوارچێوەی پێوانەکانی شارستانییەتی دیموکراسی رێکبکەون. لەجیاتی پارچەبوونی میللی و ئایینی، فیدراڵیەتێکی میانڕۆ، تاکە رێگای رزگاربوونە. پێویستە فیدراسیۆنێکی عەرەب ـ ئیسرائیلی لە ژێر سایەی سیستەمی ئابووری بازاڕی سەربەست و ئازادی قەوارە کولتوورییەکان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەرنامەڕێژ بکرێت. تەنانەت فیدراسیۆن بۆ عەرەبەکانیش ناچارییەکە، کە بۆ بیست و سێ دەوڵەتۆکە پارچەکراون. یەکێتی عەرەبان کە لە ئارادایە "الجامعه العربیه" کارا نییە. فیدراسیۆنێکی دیموکراسییانەی عەرەب ـ ئیسرائیل، عەرەبەکان ناچاردەکات لە ژێر یەك چەتردا ببن بە یەك. ئاشکرایە جگە لە هەندێ لایەنی کۆنەپەرست تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین سوود لەم فیدراڵیەتە وەردەگرێت. وادیارە پەیوەندییەکانی عەرەب ـ ئیسرائیل لە سەدەی بیست و یەکەمدا لە ژێر سایەی فیدراسیۆنی دیموکراسییانە بە چارەسەری دەگات. دەشێ ئەزموونی دیموکراسی ئیسرائیل لە سەرتاسەری جیهان رۆڵێکی مێژوویی لە دیموکراتیزەکردنی عەرەبەکان ببینێ.

هەروەها رێگای خۆدزینەوە لە عیلمانیەتێکی قووڵ نییە کە پارچەیەکی جیا نەکراوەی ئەم دیموکراتیزەبوونەیە. بەلاوەنانی ئەو پاشڤەرۆیەتی و تێکدانانەی بە هەزاران ساڵ لە ژێر ناوی ئایینەوە بەڕێوەبراوە ئیتر لەمیانەی ریفۆرمێکی ئایینی گشتگیر، بووە بە ناچارییەك. لەگەڵ ئەنجامدانی ریفۆرمی ئایینی سەرکەوتنی عیلمانییەت هەم هێز بە دیموکراتیزەبوون دەبەخشێ هەم هێزی لێوەردەگرێت. هەروەها پێویستە ئایدیۆلۆژی نەتەوەپەرستیش تێپەڕ بکرێت. کاتێك ئەو ئایدیۆلۆژیایانە تێپەڕبکرێن کە لەم دوو گۆڕەپانەدا پێکدادانیان قووڵ دەکردەوە، ئەوا دواتر فەلسەفەکانی ئازادی و یەکێتی دادوەرانە سەرکەوتن بەدەستدێنن کە پشت بە زانست دەبەستن. ئەم چەمکە فەلسەفیانەی بنەماکانی شارستانییەتی دیموکراسی پێکدێنێ، تەبایی و ئاشتییەکی هەمیشەیی بەدیدێنن. ئەم رەوشەش لەجیاتی پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیل ئاراستە بەرەو رێککەوتنی عەرەب ـ ئیسرائیل و یەکێتی دیموکراسیانەیان دەگرێ، ئەم پێشکەوتنەش کاریگەری لەسەر رۆژهەڵاتی ناوین و تەواوی جیهان دەکات.

تەبایی عەرەب ـ ئیسرائیل تەکانێکی مەزنە بەرەو رێگای یەکێتی دیموکراسییانە و ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوین. بەمجۆرە لەمیانەی تەبایی ئاماژە پێکراو، دژە بیرۆکەی بەرامبەر شارستانییەتی دیموکراسی ئەوروپا، هێز بەدەستەوەدێنی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین تێرخۆراك دەبێ، پێبەپێ کاریگەری لەسەر تەواوی جیهان دەکات. هەروەها ئەم قۆناخە نوێیەی لەسەر بنەمای فیدراسیۆنی دیموکراسییانە ئاوادەکرێت بەشداری دەکات و رۆڵی هاندەری دەبێ لەوەی رۆژهەڵاتی ناوین بەرەو سەنتێزی شارستانییەتی دیموکراسی قۆناخێکی شارستانی ئاراستە بکرێت کە شایستەی مێژووەکەی بێت. ئەنجامە مێژووییەکانی رێککەوتنی عەرەب ـ ئیسرائیل زۆر گرنگ و بایەخدارە. ئەمەش لە ناوچەکە چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی دیکە خێراتردەکات و رێگاچارەی دیموکراسییانە دەکاتە ناچارییەك. ئەمجۆرە پێشکەوتنەی هەر لە ئێستاوە کاریگەرییەکەی دەبینرێ دەبێتە خاوەن کەسایەتی و کارەکتەرێکی زاڵ. ئیتر چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت ئەو قۆناخەی پێکدادان کە لە ئارادایە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەنێو ناکۆکی و بێ واتایی و ناتەبایی بەردەوام بێت. نە هەلومەرجەکانی نێودەوڵەتی، نە هی ناوچە و ناوخۆش زیاتر بەرگەی ئەم رەوشە ناگرێت.

لە سەدەی بیست و یەکەمدا ئاشتییەکی لەسەر بنەمای دیموکراتیزەبوون لە نێوان خودی عەرەبەکان، عەرەب ـ ئیسرائیل و تەواوی ناوچە پێشبکەوێت، هەنگاونان بەرەو هەڵکشانی ئابووری و هونەری لەگەڵ خۆی دێنێ. لەسەر ئەم بنەمایەش رۆژهەڵاتی ناوین هێز بەدەستدێنێ و پێشکەوتنی ئەوتۆ دەخوڵقێنێ شایستەی مێژووی بکات و کاریگەری لەسەر هەموو جیهان دەکات، تواناکاری ئەوە دێتە ئاراوە کە شارستانییەتی دیموکراسی بەرەو سەنتێزێکی نوێ گەشەبکات.

ب ـ گۆڕەپانی شارستانییەتی ئێران لە رۆژهەڵاتی ناوین بەرخودان لەسەر ئەو رەسەنایەتیە دەکات کە لە مێژووەکەیەوە بۆی ماوەتەوە. ئەو رۆڵەی لە دووڕیانی شارستانییەتی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا بینی، ئەمڕۆ لەمیانەی ئەزموونی دیموکراتیزە کردنی کولتووری ئیسلامی دەخوازێ درێژەی پێبدات. ئەم کارەکتەرە ریفۆرمخوازییەی گۆڕەپانی ئێران بۆ کۆنترین سەردەمە مێژووییەکانی درێژدەبێتەوە. ئەوەی سیستەمی دژواری کۆیلەداری سۆمەریەکانی نەرم کردۆتەوە، شارستانییەتی ئێرانە. لە راستیدا نەریتی زەردەشتی و هەڵکشانی پارس و ریفۆرمیزەکردنی کۆیلەداری، بە گوێرەی قۆناخی خۆی بە واتای سەرکەوتنی دیموکراتیزەبوون دێت. رۆڵی ئێران لە ئاشنابوونی کیشوەری ئاسیا بە شارستانییەت زۆر گرنگە. هەر لە یەکەم پێشوازیکردنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی ئیسلامی دووچاری ریفۆرم کردووە. شیعەگەرایی ئێران یەکەمین ریفۆرمی ئیسلامە بەلای پۆزەتیفەوە. پێشتر مانی و مەزدەك خواستوویانە سیستەمی کۆیلەداری ساسانیەکان ریفۆرمیزە بکەن. هەروەها بابەك بەرامبەر بە سیستەمی سونیگەرایی عەباسییەکان رۆڵی رێبەرێکی گەلەری دەبینێ. رووخانی ئەمەوییەکان لە ژێر

کاریگەری ئێران بوو. دیسان ئەوەی عەباسییەکانی نەرم کردووە ئەو کاریگەرییەی ئێرانە. بەرامبەر بە پاشڤەڕۆیەتی ناوەندی دەرەبەگایەتی وشکی سونیگەرایی عوسمانییەکان، شارستانییەتی سەفەوی ـ ئێران زیاتر نزیکی گەلە، پشتگیری لە عەلەوییەکان دەکات. لە سەدەی نۆزدەهەمیش رۆڵی ریفۆرمخوازی ئێران بەردەوام بوو.

دواترین شۆڕشی مەزنی سەدەی بیستەم بۆتە بەشی ئێران. شتی سەیر ئەوەیە وەکو شۆڕشێکی رۆژهەڵاتی ناوین بە سانایی کز نابێتەوە. کاتێك کاریگەری دەرەوەی شارستانییەتی دیموکراسی لەگەڵ کارەکتەری ریفۆرمخوازییەکەی دەبێتە یەك کە لە مێژووەوە هاتووە، ئەوا هەڵوەشانەوەی موحافەزەکاری ئیسلامی لەژێر ناوی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەبێتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو. یان ئەوەتا شۆڕشی ئیسلامی ئێران بەخۆی کۆتایی بەخۆی دێنێ، یان لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو موحافەزەکارییەی رۆژهەڵاتی ناوین دەکات کە لەژێر ناوی ئیسلامییەتەوە پەیڕەو دەکرێت، بەمجۆرە چارەسەرییەکی ریشەیی ئەم کێشەیە دەکاتە ناچارییەك. هەربۆیە هێندە بە سانایی کۆتایی بە دەرئەنجامەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران ناهێنرێ. رەوشی هەنووکە قۆناخی پەڕینەوەیە. یان لە ناوخۆیدا زیاتر بەرەو موحافەزەکاری دەچێ، جەماوەریش بەرگەی ئەمە ناگرێت و پێی پەسند ناکرێت؛ یاخود پێویست دەکات دەربازی نێو قۆناخی ئەنجامی دوایی ریفۆرم بێت. لە رەوشێکی بەمجۆرەشدا لە تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین دەروازە لەپێش شەپۆلێکی دیموکراسییەتی ئیسلامی دەکاتەوە. هەروەکو چۆن رۆژئاوا لەمیانەی دیموکراتیزەبوونی سەرمایەداری ئیسرائیل فشار دەخرێتە سەر فیوداڵیزم و نەتەوەپەرستی عەرەب و بەرەو دیموکراسییەتی راکێش دەکات، ئەوا لە رۆژهەڵاتیش بە تایبەتی ئێران لەناو ئیسلامدا هەوڵدەدات لەمیانەی دیموکراتیزەبوونەوە هەمان رۆڵ ببێنێ.

هەروەکو بڵێی دەرەبەگایەتی ئیسلامییەت کە قورسایی عەرەبەکانی پێوەیە، کەوتۆتە نێوان هەر دوو زاری کەماشە. ناشێ ئیسلامی فیوداڵی و دژە دیموکراسی بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بێت. ئەم رەوش و قۆناخەی پەڕینەوەی ئێرانیش درێژ ناخایەنێ. ئەگەر بەرەو موحافەزەکاری ئاراستە بگرێت، ئەوا لەلایەنی نەتەوەپەرستی و ریفۆرمخوازەکانی ناوخۆ تێك دەشکێنرێ. ئەگەر لە وەرچەرخان بەرەو دیموکراسییەتێکی تەواو سەرکەوتن بەدیبێنێ، یەکێتی فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی ئێران دەبێتە مۆدێلێکی هەرە بەهێز و کاریگەری لەسەر رۆژهەڵاتی ناوین دەکات؛ کۆماری ئیسلامی دیموکراسییانەی ئێران دەبێتە کۆڵەکەیەکی بەهێزی دیموکراتیزەبوونی رۆژهەڵاتی ناوین. هەروەکو چۆن ئەم شارستانییەتە ئەلتەرناتیفە، پەیوەندییەکی بەهێزتر لەگەڵ ریشە مێژووییەکەی دەبەستێ، ئەوا لەمیانەی شارستانییەتی دیموکراسییەوە دەتوانێ کێشەکان لە نێو تەبایی و ئاشتی چارەسەر بکات. لەهەر دوو حاڵەتیشدا دەشێ لە واقیعی ئێراندا دژە بیرۆکە گەشەبکات. لەبەر ئەوەی ئێران بەردەوام رۆڵی شارستانییەتی بینیوە، بۆیە دیسان ناچارە هەمان رۆڵ بگێڕێ. ناشێ ئێران کاریگەری نەکاتە سەر ئاسیای ناوین و قەفقاسیا و تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین. دەخوازێ ئەمە لەمیانەی خوڵقاندنی چارەسەرییەکی ریشەیی ئیسلامی دیموکراسییانە ئەنجام بدات. دەشێ گفتوگۆ بکرێ، دەتوانێ لەمەدا سەرکەوێ یان نا. لە حاڵەتی سەرنەخستنی ئەم هەوڵە، پێبەپێ سیستەمێکی موحافەزەکارتر دێتە ئاراوە، ئەنجامی ئەمەش پارچە بوون و تێکشکانە. بەڵام پارچەبوونێکی ریشەیی نەتەوەپەرستی چاوەڕوان ناکرێت. زیاتر یەکێتییەکی فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی هاوچەرخ وەکو ئەلتەرناتیفێکی دیکەی چارەنووسی  ئێران دیارە. ئەگەر ئێرانێکی دیموکراسییانە ئاوا نەبێت، ئەوەی لە ماوەیەکی درێژخایەندا پێکدێت، فیدراسیۆنی ئێرانی دیموکراسییانەی هاوچەرخە و پێویستی بە دەمامکی ئایینی نییە. لە ماوەیەکی درێژخایەندا ئەو بژارە ئەگەرێکی بەهێزە.

بە درێژایی مێژوو ئێران خاوەن کارەکتەرێکی فیدراڵی بووە. تاکو ئێستاش بۆ چوار هەرێمی مەزن دابەشکراوە. هەربۆیە فیدراسیۆنی ئێرانی دیموکراسییانە قۆناخێکی هێندە ئاستەم نییە. لەهەر دەوڵەتێکی رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر و خێراتر دەتوانێ دەربازی ئەم قۆناخە بێت. لە راستیدا ئەو فیدراسیۆنە سنووردارەی ئێستا لە ئارادایە، دەتوانرێ زەقتر بکرێت و رووکارێکی دەستووری پێبدرێت.

بە دڵنیاییەوە دەتوانرێ بگوترێ پەرەسەندنەکانی ئێران دەبێتە یەکێك لە هێزە سەرەکی و دیاریکراوەکانی هەڵکشانی گەشە کردنی رۆژهەڵاتی ناوین لە سەدەی بیست و یەکەمدا. لە پێکهێنانی ئەو دژە بیرۆکەیەی کە رۆژهەڵاتی ناوین بەرامبەر شارستانیەتی ئەورووپای پێشدەخات، ئێران سێیەمین بەردی مەزنی گۆشەکەیەتی. ئەگەر یەکەمیان ئیسرائیل، دووەمیان عەرەبەکان بن، ئەوا لەمیانەی مێژووەکەی و لە بواری ئەو جوگرافیا سەراوبن بووەی لە ئارادایە، ئێران دەکات بە سێیەمیان. دژە بیرۆکەی رۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی ئەو قورساییەی ئێران، هێزێکی مەزن پێکدێنێ. لە کاتێکدا ئیسرائیل لەو دژە تێزەدا نوێنەرایەتی تەواوی شارستانییەتی رۆژئاوا دەکات، عەرەبەکانیش نوێنەری نیمچە دوورگەی عەرەب و کیشوەری ئەفریقیا دەکەن و ئێرانیش نوێنەرایەتی کیشوەری ئاسیا دەکات. ئەو دژە بیرۆکەیەی کە لە چەپڕەوی شارستانییەتی دیموکراسی رۆژهەڵاتی ناوینی سەدەی بیست و یەکەم جێگیردەبێ، لە واقیعی راستینەی ئێران و خوڵقاندنی سەنتێزە نوێیەکەی شارستانییەتی شایستە بە مێژووی رابردوو خوڵقکارتر دەبێت و هێزێکی هەمە رەنگ بەدەست دەهێنێ، لەمیانەی بەشداری و رۆڵی مێژوویی لە ئومێدی مرۆڤایەتی سەبارەت بە شارستانییەتی نوێ، رێگا لەپێش هەنگاوە سەرکەوتووەکانی پراکتیزەکردن دەکاتەوە.

ج ـ ئەنادۆل، تورکیا، کە جێی خۆی لە باکووری رۆژهەڵاتی ناویندا دەگرێت و لە هەموو قۆناخێکدا رۆڵی دیاریکراوی بینیوە، لە قۆناخی شارستانییەتی هاوچەرخیشدا درێژە بە بانگەشەی خۆی دەدات. لە مێژوودا ئەنادۆل هێڵی وەرچەرخان و پەڕینەوەی سیستەمەکانە. بەهاکانی درێژایی ١٥٠٠٠ ساڵی رۆژهەڵاتی ناوینی لە رێگای قەفقاسیا و بەلکانەوە بۆ ئەورووپا گواستەوە، لەم دووسەد ساڵەی دواییشدا بەهاکانی ئەورووپا بۆ رۆژهەڵاتی ناوین دەگوازێتەوە. هیتیتەکان (الحیپون) کە بە رەچەڵەك ئارین، لە ساڵانی ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز رۆڵی گەلانی بەرایی دەبینن. راستتر چەندین گەل لەژێر ناوی هیتیتەکان کۆبوونەتەوە. تازە بە تازە لە سەردەمی نئۆلیتیکەوە بەرەو شارستانییەتی کۆیلەداری هەنگاویان دەهاوێشت. لە ئاکامی کەوتنی یەك بە دوای یەکی قەڵاکانی تەرواده، فریگیا و لیگیا (١٢٠٠ ـ ٦٠٠ پ.ز) ئەنادۆل دەکەوێتە ژێر کاریگەری گریکەکان. قۆناخی هێلینی بەخۆیەوە دەبینێ. ئەمە تاوەکو ساڵانی ١٠٠٠ ی زایینی بەردەوام دەبێ. ئەرمەنییەکان لە هێڵی باکووری رۆژئاوا، کوردەکانیش لە هێڵی باشووری رۆژهەڵات دەمێنن و جێگیر دەبن. لە ساڵانی ١٠٠٠ ی زایینی بەدواوە ئەنادۆل بە رووی هۆزە تورکەکان دەکرێتەوە. ئەم جێنشینی بوونانە تا سەدەی چواردەهەم بەردەوام دەبێت. لەمیانەی شارستانییەتی عوسمانییەکان و سەلجۆقییەکان بە قووڵیی جیابوونەوەی چینایەتی بەخۆیەوە دەبینێ. دابەشبوونی ریشەیی چینایەتی تورکەکان لەم قۆناخەدا بوو. لە کاتێکدا تورکمانەکانی ناوچە شاخاوییەکان تایبەتمەندێتی تورکێتییان پاراست، تورکەکانی شارەکان دووچاری توانەوەیەکی دژوار هاتن. هەم سەلجۆقییەکان هەم عوسمانییەکان مەزهەبی سوونی ئیسلامییەت بە بنەما دەگرن. بەمجۆرە دەمارگیری دەرەبەگایەتی بەرامبەر ریفۆرمخوازی ئێران هێزی بەدەست هێنا. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هاوسەنگی هەستیاری نێوان سەرمایەداری و دەرەبەگایەتی بەدەست هێنا و تاوەکو سەردەمی گەشەکردنی شارستانییەتی سەرمایەداری بڵاودەبێتەوە و بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەژیت. بەڵام بەرامبەر بە قۆناخی بڵاوبوونەوەی سەرمایەداری نەیتوانی بەرخودان بکات، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم هەڵوەشایەوە و بوو بە مێژوو. ئەم جارە تورکەکان لەجیاتی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی موحافەزەکار، لەژێر رێبەرایەتی مستەفا کەمال لەمیانەی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستی بەرامبەر بە سوڵتانەکان و دارودەستەکانیان کە ببوونە نۆکەری کۆلۆنیالیزمی رۆژئاوا و کۆمپرادۆرە ئەرمەنی و رۆمەکان، لە دەرەوە لەگەڵ بەلشەفیکەکان و لە ناوەوەش لەمیانەی ئەو رێککەوتنانەی لەگەڵ کوردەکانیان بەست، هەم لە شەڕی رزگاری نیشتماندا سەرکەوتن، هەم هەنگاوێکی مێژووییان هاوێشت و دەربازی قۆناخی کۆمار بوون. ئیتر ئەنادۆلی سەدەی بیستەم وەکو کۆماری تورکیا رۆڵی خۆی دەبینێ.

کاتێك کۆماری تورکیا بە بیانووی یاخیبوون کوردەکانی سەرکوت کرد کە لەو قۆناخەدا رۆڵیان لە دامەزراندنی کۆمار بینی، ئیدی دەرفەتی گەشەکردنی مێژوویی لەدەستدا، چونکە وەرچەرخانی دیموکراسی ئەنجام نەدا. لە حاڵەتیکدا پاڵێورابوو بۆ ئەوەی بە ئاستی ژاپۆن بگات، بەهۆی کێشەی ئاماژە پێکراو کەوتە نێو قەیرانەوە، تاوەکو ئێستاش ئەم بنبەستبوونە بەردەوامە. لەمیانەی هەڵکەوتە جوگرافییەکەی لە رۆژهەڵاتی ناوین و ئاستی شارستانییەتدا زیاتر نزیك بە ئەورووپایە. گفتوگۆیەکی چڕوپڕی دیموکراسی بەخۆیەوە دەبینێت. بەهۆی دیموکراتیزە نەبوون، مەسەلەی ئەندامێتی لە یەکێتی ئەورووپا بەرەو پێشەوە ناچێت. مەسەلەی کورد لە بناخەی ئەمەدا شاراوەیە. ئەم کێشە سەرەکییەی تورکیا گەیشتۆتە ئاستێك

چارەنووسەکەی دیاری دەکات. رووبەڕووی دووڕیانێك بۆتەوە، یان ئەوەتا لە چوارچێوەی کۆماری دیموکراسییانە کێشەکە بە ڕێگاچارەی دیموکراسییانە چارەسەر دەکات، یاخود گۆشەگیر دەبێت و لە ناوخۆیدا دەپووکێتەوە. تاوەکو ئێستاش چۆنێتی چارەسەرکردنی کێشەکە یەکلا نەبۆتەوە. هاوکات تەواوی هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکییەکان چارەسەری دیموکراسییانە دەسەپێنێ.

تورکیا لە نێوان دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین خاوەنی لەبارترین هەلومەرجی کۆمەڵگایە بۆ دیموکراتیزەبوون. لەم بوارەدا چەندین هەنگاوی هاویشتووە. لە حاڵەتێکدا ئەگەر هەنگاوەکانی دیکە بهاوێژرێ، ئەوا بە رەوشێك دەگات بتوانێ جێگای خۆی لە ئەندامێتی یەکێتی ئەورووپادا بگرێت. لەم چوارچێوەیەشدا لە رێگای شارستانییەتی دیموکراسی ئەورووپا هێز بە بژاری دیموکراسییانە دەبەخشێ، کاریگەرییەکی زیاتریش دەکاتە سەر تورکەکانی ئاسیای ناوین. شیمانەیەکی بەهێزە تورکیای سەدەی بیست و یەکەم گەشەکردنێکی بەمجۆرە بەخۆیەوە دەبینێ. لەم حاڵەتەدا دەبێتە چوارەمین بەردی گۆشەی بناخەی دیموکراتیزەکردنی رۆژهەڵاتی ناوین. بەمجۆرە ئیسرائیل، عەرەبەکان، ئێران و تورکیا وەکو هێزی سەرەکی چارەسەری ئاقاری هاوکێشەی دیموکراسی رۆژهەڵاتی ناوین و بە شێوەیەکی بەهێز دەکەونە نێو قۆناخی پێکهێنان و پەرەپێدانی دژە بیرۆکەی رۆژهەڵاتی ناوین. ئەگەر پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیل و کێشەی دیموکراسییەت و یەکێتی نێوان عەرەبەکان خۆیان چارەسەر بکرێت، کە رۆڵی ئاستەنگ دەبینن هەروەها فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی ئێران بە پێکهاتەیەکی هەمیشەیی بگات (لەژێر پەردەی ئیسلامی یان هاوچەرخ) و هاوکات تورکیا کێشەی دیموکراسی چارەسەر بکات، ئەوا سەدەی بیست و یەکەم بۆ تەواوی ناوچەکە دەبێتە قۆناخی هەڵمەتێکی هەڵکشان. فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی رۆژهەڵاتی ناوین کە لەسەر بناخەی ئەم چوار کۆڵەکە سەرەکیە ئاوا دەکرێت، وەکو دژە بیرۆکەیەکی راستەقینە بەرامبەر شارستانییەتی ئەورووپا دەتوانێ هەنگاوێکی بەهێز و سەرکەوتووانە بە ئاراستەی پێکهێنانی سەنتێزی مێژوویی لەسەر بنەمای پەیوەندی دیالەکتیکییانە بهاوێژرێ.

د ـ کوردان و کوردستان جێگایەکی رەسەنیان لەنێو مێژووی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین هەیە. بۆ تێگەیشتنێکی راست سەبارەت بە قۆناخەکان پێویستە رۆڵی ئەم گەلە پێناسە بکرێت، ئینجا چ لە قۆناخەکانی هەڵسووڕانی رەوڕەوەی مێژوو بێت، یاخود ئەو پەرەسەندنانەی لە ئارادان.

شتێکی مسۆگەرە کە کوردستان بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافییەکەی و کولتووری دانەوێڵە و ماڵیکردنی ئاژەڵ بۆ یەکەمین جار لە جیهاندا بۆتە بێشکەی سەردەمی نئۆلیتیك. ئەو گۆڕەپانەیە کە شۆڕشی کشتوکاڵی و گوندی تێدا ئەنجامدرا. لە ڕێگای پاشماوەکانی ئاسەوار و ئاسەوارناسییەوە سەلمێنراوە کە خاوەنی کولتوورێکی جێگیرە و ریشەکەی بۆ ١١٠٠٠ پ.ز دەگەڕێتەوە و مێژوویێکی لەوە کۆنتر لە جیهاندا نییە. ئێمە قەرزاری سۆمەریەکانین  سەبارەت بە سەرچاوە نووسراوەکانی ناو لێنانی ئەو گەلەی چاخی نئۆلیتیکی خوڵقاندووە. ئەم گۆڕەپانە و گەلەکەی بە ناوچەی شاخاوی و گەلی شاخی ناو دەبەن. ئەم زاراوانە تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە. "کور" بە سۆمەری بە واتای شاخ دێت. پاشگری "تی" بە واتای (ئنتماو) دێت. هەربۆیە "کورتی" بە واتای گەلی چیایی و چیا دێت. هەروەها هەندێ ناوبردنی دیکەی سۆمەریەکان هەیە. "ئورارتی" بە واتای وڵاتی بەرزاییەکان دێت، هەروەها لەبەر ئەوەی بە گامێش خاکیان کێڵاوە. بە"گوتی" ناودەبرێن کە واتای گەلی خاوەن گامێش دێت (گود = گا، تا ئێستا لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێ)،  "ئاریان" بە واتای ئەو گەلە دێت کە بە گاسن زەوی دەکێڵن، هەروەها دواتر ئاشووریەکان بەهۆی چاوگەکانی کانزا (معادن) بە "ماتا" مادەکان ناویان بردوون، لووییەکان بە "گوندوانا"یان ناوبردووە و بە واتای مەملەکەتی بەرزاییەکان دێت، بە زمانی گریکییەکان "کوردیانا"ی پێگوتراوە، هەروەها بە "کۆماگەنە" ناوبراوە کە مانای گەلە خاوەن چادر و شوانکارەکان دێت، لەمیانەی ناوی جیاجیاوە هەمان راستینە زاراوەی جیاوازی پێبەخشراوە. کاتێك پەیوەندییان لەگەڵ عەرەبەکان بەست بە "ئەکراد" ناوبران (کۆی ووشەی کوردە)، هەروەها مێژوو دیاریکردووە کە سوڵتانی مەزنی سەلجوقی سنجار ئەو ناوچەیەی بە "کوردستان"  ناو بردووە. لە سەردەمی عوسمانییەکانیشدا زاراوەی کوردستان سەبارەت بە ولایەتی حکوومەتە هەرێمییەکان بەکار هێنراوە. هەروەها مستەفا کەمال دامەزرێنەری کۆماری تورکیا بە دەیان جار باسی کوردستان و کوردانی کردووە و وەکو فاکتەرێکی دامەزرێنەری کۆمار ناوی بردوون. هەروەها بەهۆی یاخیبوونەکانی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم ئەم ناوو زاراوانە بە بەربڵاوی لە ئەدەبی جیهانیدا بەکار هێنراوە.

رۆڵی مێژوویی کوردان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خوڵقێنەری سەردەمی نئۆلیتیکە. مسۆگەر بووە کە ئەم ناوچەیە نیو دەشت ـ نیو چیایی لەلایەن دیجلە و فورات و زنجیرە چیای زاگرۆس ـ تۆرۆس تێر ئاو دەکرێت شوێنی لە دایکبوونی سەردەمی نئۆلیتیکە. مسۆگەرە سۆمەریەکان، میسر، هیتیتیەکان و پارسەکان خۆراکی خۆیان لە کۆمەڵگای نئۆلیتیکی ئەم جوگرافیایە وەرگرتووە. بایەخداربوونی کانزا و هەڵکەوتنی چاوگە کانزاییەکان لەم ناوچەیە رێگای لەپێش ئەوە کردەوە ببێتە جێگای چاوتێبڕین و تاڵانکاری و دەست بەسەرداگرتن. لەهەر چوارلاوە تەنگەتاوکردن و فشار بۆهێنان وایکردووە ئەم گەلەی خوڵقێنەری شۆڕشی نئۆلیتیك لە چیاکان لە نێو رەوشی خۆپاراستندا بمێنێتەوە. ئەمەش زۆر بە باشی ئەوە روون دەکاتەوە کە بۆچی لە رەوشی خێڵەکی وشك و پارچە پارچە ماونەتەوە. چونکە بە گوێرەی هەلومەرجەکانی شاخ، تەنیا بە شێوەی یەکینەی خێڵەکی دەبێت. هەرە زێدە دەتوانرێ سیستەمی کۆنفیدراسیۆن ئاوا بکرێ. بۆ دامەزراندنی ناوەندی بەهێزی شارستانییەتی شار لەبار نییە. رەوشی جوگرافیاکەی کە وەکو قەڵایەکی بەرزکراوەی رۆژهەڵاتی ناوین وایە، بە شێوەیەکی خۆڕسکانە رۆڵی سەنگەری خۆپاراستن و بەرخودانی بینیوە. ئەم بارودۆخەش ئەم راستینەیە روون دەکاتەوە چۆن کولتووری رەسەنی ١٠٠٠٠ ساڵە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە.

کوردان و وڵاتەکەیان دووچاری تەواوی پەلامارەکانی سەردەمی کۆیلەداری هاتوون. ئەگەر لە گلگامێشی سۆمەریەوە دەست پێبکەین دەبینن کە بابلی و ئاشووری و پارس و هێلینی و رۆم و ساسانی و بێزەنتی و عەرەب و تورك و مەغۆلەکان یەك بەدوای یەك ئەم ناوچەیەیان داگیر کردووە. بەڵام سیستەمی سەرەکی تیرەگەرێتییە. هەندێ جار بوون بە یەك، زیاتریش لەگەڵ یەکتردا لەنێو ململانێ و پێکدادان بوون و تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان درێژەیان بەم نەریتە داوە.

لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا میرنشینە کوردییەکان پەرەسەندنێکی مەزنیان بەخۆیانەوە بینی. لەسەر ئاستی دەوڵەت و حکوومەتی هەرێمی رۆڵیان بینی. بە درێژایی ٤٠٠ ساڵ بە رێککەوتن و تەبایی لەگەڵ عوسمانییەکاندا ژیاون. لە ئاستی کەسایەتی و بنەماڵەیی دیاریکراو و بەرچاو لە ئیسلامییەت و شارستانییەتی ئێرانی بەر لە ئیسلامییەت رۆڵێکی بەهێز و کاریگەریان هەبوو. چینی سەردەستی کوردان دووچاری توانەوەیەکی بەربڵاو هاتن. قەوارەی خێڵەکی کولتوورەکەی پاراستووە. یاخیبوونەکانی سەردەمی سەرمایەداری بە گرانی بەسەریاندا شکایەوە، رێگای لەپێش کۆنەپەرستانەترین رۆڵی دەرەبەگایەتی کردۆتەوە. لە سەردەمی سوڵتان یاووز و فەبوونی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەرەو رۆژهەڵات و نیمچە دوورگەی عەرەبی، کوردان رۆڵێکی پشتگیری و سەرەکییان بینی و بەرامبەر بەمەش ئازادی خێڵەکییان و مانەوەیان بە شێوەی حکوومەتی هەرێمی بەردەوام بوو. پارچە پارچە بوونیان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بە دژی بەرژەوەندییەکانیان شکایەوە. ئەگەرچی وەکو ئەندامێکی دامەزرێنەر و ئازادیخواز جێگای خۆی لە رزگاری نیشتمانی گرتووە کە مستەفا کەمال رێبەرایەتی کرد، وەلێ کاتێك سیستەمی کۆماری رژێمی میرنشینی و عەشیرەتی تێکدا، جارێکی دیکە قۆناخی یاخیبوون دەستی پێکردووە، ئەمەش سەبارەت بە خۆیان رێگای لەپێش ئەنجامی ئێجگار تێکدەرانە کردەوە. لەهەمانکاتدا بەهۆی چەمکی نەتەوەپەرستی دەوڵەتی ناوەندی عەرەبەکانی ئێراق و فارسەکانی ئێران، کوردان دووچاری سەرکوتکردنێکی دژوار هاتن. دواتریش کوردان دووچاری شاڵاوێکی مەزنی توانەوە بوونەوە.

لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا کوردان وەکو چەوساوەترین گەلی رۆژهەڵاتی ناوین هەوڵدەدەن لەسەر پێ بمێننەوە. سیستەمی پارچە پارچەیی و دەرەبەگایەتی تیرەگەرێتی و خێڵەکی، بۆتە هۆکار و ئەنجامی بەدواکەوتوویی مانەوەیان. بەهیچ جۆرێك نەیانتوانیوە خۆیان لە دەستدرێژییەکانی ناوەوە و دەرەوە رزگار بکەن. ئایدیۆلۆژی نەتەوەپەرستی و ئایینی وەکو گەلانی دراوسێ، لە پێشکەوتنی سیاسیدا رۆڵێکی پۆزەتیفانەی نەبینی. لە کاتێکدا ئایینی ئیسلامی، نەتەوەپەرستی عەرەب و فارس و تورکەکانی وەکو میللەت و نەتەوە بەهێز کرد و کردنی بە خاوەن دەوڵەت، وەلێ بۆ کوردان رۆڵێکی سەرەکی لە تواندنەوە و پلیشاندنەوەیدا بینیوە. کوردان نەیانتوانیوە ئایینی ئیسلامی دەرەبەگایەتی و ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستی سەرمایەداری بۆ

خۆیان بکەن بە چوارچێوەیەکی میللی، ئەو هەوڵانەی ئەنجامیش دراون لە تاقیکردنەوەی مارژینالّ بەولاوە تێپەڕیان نەکردووە. وەکو گەلێکی پەرێشان و نەدار دەژیت و گەلێکە هەرە زێدە دووچاری خیانەتەکانی شارستانییەت هاتووە. لاوازییەکانی بواری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی، بەردەوام لەلایەن بەهاکانی دەرەبەگایەتی و عەشیرەتگەرایی لەسەر پێیان رادەگیرێ. نەیانتوانیوە بۆ ئاستێکی بەرزتری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی گەشە بکەن.

ئەم کورتە پێناسانە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن وەرچەرخانی دیموکراسییانە تاکە رێگای رزگاربوونە لە رابردوو و رۆژگاری ئەمڕۆشماندا. بە گشتی تێپەڕاندنی نەتەوەپەرستی و ئایین، رووخانی دەرەبەگایەتی و عەشیرەتگەرایی بە شێوەیەکی خێرا، ئەو دیاردە سەرەکییانەن کە دەرفەتی گەشەکردنی دیموکراسییانەی کوردان دەرەخسێنن و زیادی دەکەن. پێوانەکانی شارستانییەتی دیموکراسی کە لە تەواوی جیهاندا دەردەکەوێتە پێش، کاریگەرییەکی زیاتر دەکاتە سەر ئەم قۆناخە. ناچارکردنی ئێراق لەلایەن تەواوی جیهانەوە بۆ ئەنجامدانی دیموکراتیزەبوون، دیموکراسییەتی ئیسلامگەرایی ئێران، وەرچەرخانی دیموکراسییانەی هاوچەرخی تورکیا، دەبێتە هۆکاری ئەوەی ئابلۆقەکەی چواردەورەی لەجیاتی رۆڵێکی نیگەتیف، رۆڵێکی پۆزەتیفانە ببینن. تەواوی ئەم وەرچەرخانە ناوخۆیی و دەرەکییە گرنگانە، دەرفەت بۆ کوردان دەرەخسێنێ لەمیانەی پێوانەکانی دیموکراسی بۆ یەکەمین جار کێشەکانیان چارەسەر بکەن. بە هەمان شێوە بەخۆشیان لەجیاتی فاکتەرێکی پارچەبوون و یاخیبوون دژ بە دراوسێکانی، لەسەر بنەمای دیموکراتیزەبوون بوونەتە گەرەنتی یەکێتیەکی پتەو. هەرچەندە قۆناخی دیالەکتیکی سەبارەت بە هەردوو لایەن، بەرەو وەرچەرخانی دیموکراسییانە خێراتر بێت؛ ئەوا ئاراستەکردنی کێشەی کورد بەرەو رێبازی چارەسەری دەبێتە ناچارییەك. ئەم رێبازەش رێگای یاخیبوون و پارچەبوون نییە، بە پێچەوانەوە رێبازی ئاشتی و دیموکراسی و تەباییە. کوردان بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا لەگەڵ تەواوی ئەو گەلانەی بە یەکەوە لەگەڵیاندا دەژی، لە هەنگاوەکانی دیموکراتیزەبووندا دەرفەتی هەمئاهەنگی و سەرکەوتن بەدەست دێنێ.

لەم قۆناخەدا مێژوو رۆڵێکی بێ هاوتا دەخاتە ئەستۆی گەلی کورد. ئیتر مانەوەی لەنێو رەوشی سنوورە پارچەکراوەکاندا بووە بە فاکتەرێکی پۆزەتیف. تەنانەت نەگەیشتنی بە ئاستێك کە نەتەوەپەرستی ژەهراوی کردبێت، بووە بە دەسکەوتێك. کاتێك گەلی کورد وەرچەرخانی دیموکراسییانە ئەنجام بدات، ئەوا ئەو گەل و وڵاتەش ناچاری چارەسەری دیموکراسییانە دەکات کە لەگەڵیدا دەژی. لە رابردوودا جوڵانەوەی کورد وەکو ئامرازی پارچەبوون و گەمەکانی دەرەوە دەبینرا، بەڵام ئێستا بە پێچەوانەوە بۆتە گەرەنتی ئاشتی و ئازادی و برایەتی. بۆتە فاکتەرێکی بەهێزی یەك پارچەیی وڵات و بناخەی هەمیشەیی یەکێتی دەوڵەت. ئیتر هەر شوێن و دەوڵەتێکی گەلی کوردی لێبێت پێشکەوتنێك بە بیری مرۆڤدا دێت، کە لەسەر بنەمای ئازادییەکی شەرەفمەندانە و پێوانە دیموکراسییەکان دەست بەکارە. ئیتر چارەنووسی نێوچاوانی کوردان، نەزانی و یاخیبوون و سەرکوتکردن و جینۆساید نییە، بەڵکو دەبێتە وشیاری دیموکراسییانە و کۆمەڵگای مەدەنی گەشەسەندوو و یەکێتی ئازادانە.

کوردان لەمیانەی ئەم ئەرکە مێژووییانەوە دەبنە خاوەنی هەنگاوەکانی وەرچەرخانی دیموکراسییانە، لە ئێران لەژێر سایەی کۆماری ئێرانی دیموکراسی یان فیدراسیۆنی ئێرانێکی دیموکراسییانە، لە ئێراقیش لەمیانەی فیدراسیۆنی دیموکراسییانە دەبن بە زامنی سەرەکی بۆ ئێراقێکی دیموکراسی یان فیدراسیۆنی ئێراقێکی دیموکراسییانە، لە تورکیاش رۆڵێکی سەرەکی لە ئاواکردنی کۆماری دیموکراسییانە و عیلمانییەت دەبینن. لە سوریاشدا هەرگیز ناتوانرێ لە خولّقاندنی سوریایەکی دیموکراسییانەدا رۆڵیان بچووك بکرێتەوە. واتا کوردە دیموکراسیخوازەکان دەبنە گەرەنتییەکی رێبازی فیدراسیۆنی رۆژهەڵاتی ناوین و هێزی گەلەری بنچینەیی لە وەرچەرخانی دیموکراسی و ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوین. هەڵسان بەو رۆڵەی کە مێژوو خستوویەتیە سەرشانی کوردان لەمیانەی جێبەجێ کردنی ئەرکی وەرچەرخانی دیموکراسییانە بە شێوەیەکی رێکخراو و وشیارانە و جوڵانەوەیەکی شایستە بە سەرۆکایەتی ستراتیژی راستەقینە، بە ئاقاری سەرکەوتندا دەڕوات.

لە رۆژهەڵاتی ناویندا گەلانی ئەرمەن و ئاشووری و بە رەچەڵەك قەفقاسی هەن، رۆڵی ئەم گەلانەش هاوشێوەی رۆڵی کوردانە. تەواوی هەلومەرجەکانیش ئەم گەلانە ناچار دەکات وەکو تاکە رێگای رزگاری لەپێناو وەرچەرخانی دیموکراسییانە دەست بەکار بن. بە ئەندازەی گەشەکردنی وەرچەرخانی دیموکراسییانەی ئەو دەوڵەتانەی تێیدا دەژین، دەرفەت و تواناکاری پێشخستنی قەوارەی کولتووری و ئازادی خۆی دێتە ئاراوە. چەندە وەرچەرخانی دیموکراسییانە لە رۆژهەڵاتی ناویندا گەشە بکات، لە بەرژەوەندی ئەواندایە. هەرچەندە ئەم گەلانەی لەلایەنی چەندایەتییەوە سنووردار بن، بەڵام لە ئاستی گواستنەوەی کولتووری و دەوڵەمەندی و هەمە رەنگی وەرچەرخانی دیموکراسییانە، خاوەنی بەهایەکی مەزنە.

کاتێك لەسەر بنەمای ئەم شیکردنەوانە بە شێوەیەکی گشتگیر تەماشای رۆژهەڵاتی ناوین بکرێ، دەبینرێ کە لە گەلێك ناوچەکانی جیهان پاشکەوتووترە. زۆر دوور لە رابردووە مێژووییە مەزنەکەی بەڕێوە دەچێت. لەم مێژووە بێ ئاگایە و تەنانەت بە کەنار ئەم راستینەیەدا دەرباز نابێ کە شایستەیەتی. لەلایەنی هەندێ گرووپی مارژینالّەوە بەڕێوەدەبردرێت کە نە پشت بە بەهاکانی شارستانییەتی ئەوروپا دەبەستێ و نە ریشەکانی رۆهەڵاتی ناوین، لەمیانەی رێبازی سەربەخۆخوازی ساختە و هەرسکردنێکی نزیك بە تەسلیمیەت بەرژەوەندییەکانی خۆیان رێکخستووە. هەرچەندە بە دەگمەن هەندێ رێبەرایەتی دەرکەوتبن کە شایستەی مێژوو بن، بەڵام دوور بوون لەوەی فشار بخەنە سەر پێکهاتەی گشتی. ئەگەر رۆژهەڵاتی ناوین بە شێوەیەکی گشتگیر، رۆشنگەری و رێنسانس ئەنجام نەدات، ئەوا ئاستەمە بتوانێ ئەم تابلۆیە تێکبدات. بەڵام لە حاڵەتێکدا تەواوی جیهان بەرەو یەکێتی هەرێمی و نێودەوڵەتی ئاراستەیان گرتووە، ئەوا هێندە دوور وەستانی رۆژهەڵاتی ناوین لە هەنگاوەکانی یەکێتی و ستراتیژییەکی هاوبەش، لە بەرژەوەندی هیچ وڵاتێك و گەلێکدا نییە. هەروەها مێژووی رۆژهەڵاتی ناوینیش ئەم ئاڵۆزی و پارچە پارچەییە پەسند ناکات، چونکە مێژوویەکە زۆر لە یەکتری نزیکن و هەروەکو بڵێی لەژێر پەیڕەوی یەك فیدراسیۆندایە. هەلومەرجە ناوخۆیی و هەرێمییەکانی وڵاتە مێژووییەکان، پێبەپێ رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراسییانە دەکەنە ناچارییەك.

لە کاتێکدا قۆناخی سەبارەت بە دادگایی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا دەستپێدەکات، پێشخستنی ئەم شیکردنەوانە بۆ من مانای دیکەش لەخۆوە دەگرێت. لە کاتێکدا لە رۆژهەڵاتی ناوین بەدوای مافدا دەگەڕام، هاتنم بۆ ئەوروپا بە نیازی رێککەوتن بوو لەگەڵ ئەو ئیمپریالیزمەی فشار و گوشاری دەکردە سەرم. هەوڵدان لەپێناو دۆزینەوەی دەرفەت و تواناکاری چارەسەرییەکی ماقووڵانە بە گوێرەی پێوانەکانی دیموکراسییەتی ئەوروپا، لەپێشەوەی ئەوە دەهات کە بەرەو چیاکان سەری رێ بگرم. کە ئەمەش قوربانییەکی زیاتری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. لە راستیدا چیاکان فەنتازیای راستەقینەی خەونەکانم بوون. چڵ ساڵ ئارامم گرت تا لە چیا بگێرسێمەوە. بەڵام چوونێك کە رێگای لەپێش مەینەتی و قوربانییەکی زیاتر لە نێو ریزەکانی هەڤاڵان و گەلەکەمان دەکردەوە، نەدەبوو ببێتە بژارێکی تاکە کەسی. بەرپرسیارێتی و چەمکی ئەخلاقی من رێگای بەمە نەدا. راستە مەزەندەی ئەوەم نەدەکرد لەمیانەی ئەم بۆچوونانەوە گرتنەبەری رێگای ئەوروپا بە تراژیدیایەك ئەنجامگیر دەبێ. هەروەها راستە کە من ئەگەری ئەوەم رەچاو نەکرد کە خیانەت و بەرژەوەندیخوازی بەرامبەر ئەم رەوشە ئۆقرە ناگرێت و بەمجۆرە رادەبێتە سەرپێیان. پێوایان و کێشایان، ئەملا و ئەولایان کرد، دواتر بە خیانەت و سپڵەییەوە منیان فرێدایە وڵاتی هۆڤان لە ئەفریقیا. هەروەکو بانگەشە دەکەن منیان خەڵەتاند و بە کارامەیی بە پاکێتکراویی کردمیان بە دیاری تاوەکو لە ئیمرالی بمخەنە ناو تابووت، بەمجۆرە بەرژەوەندیە شڵەژاوەکانی خۆیان خستە ژێر گەرەنتییەوە.

ئەگەر یاسا هەبێت، ئەوا ئەم رەوشە لەگەڵ یاسای ئەوروپا ناکۆکە. بینینی هەڵوێستی دادگا وەکو پێوانەیەکی ئەوروپا بۆ من بایەخدارترە. بەڵام ئەوەی لەمە گرنگتربوو، بینیم ئەگەر وەکو کەسێکی تەسلیمکار بچوومایە ئەوروپا ئەوا جێگام دەبۆوە. وەلێ من نەمدەتوانی شتێکی بەمجۆرە پەسندبکەم، تەنیا ئەگەر دژە بیرۆکەیەکم بدۆزیبایەوە دەمتوانی پەیوەندی لەگەڵ ئەوروپا ببەستم. ئەمەش تەنیا گرێدراوی خولّقاندنی دژە بیرۆکەی رۆژهەڵاتی ناوین بوو بەرامبەر بە شارستانییەتی ئەوروپا لەسەر بنەمای پابەندبوون بە بنەما مێژووییەکانی. هەوڵمدا ئەمە شیبکەمەوە و بەدیبێنم. هەرچەندە سنووردارێش بێت لەو باوەڕەدام سەرکەوتنم بەدەست هێنا. لەو باوەڕەدام وەڵامێکی گشتی ئەو بۆچوون و رەخنانەی گەلێك لە دۆستان و

هەڤاڵانم داوە کە بەهۆی نەبوونی تواناکاری نەیانتوانی پێمی بگەیەنن. ئەمەش پێویستییەك بوو. هەرچەندە هەندێ کەم و کوڕیش لەخۆوە دەگرێت، بەڵام لەو باوەڕەدام پێویستییەکانی بەرپرسیارێتی خۆم جێبەجێ کردووە.

ئەو بۆچوون و رەخنانەی پێشکەشم کردووە گەوهەری گەلاڵەی بەرگرینامە لەخۆوە دەگرێت و لە ناو سیستەمی ژووری ئینفرادی لەژێر کاریگەری پیلانگێڕییەکی سەخت و دژوار هەوڵی تەواوکردنی دەدەم. هەوڵدەدەم بەشی دووەمی بەرگرینامەکە ئامادە بکەم. لەم بەشەدا زیاتر هەوڵ دەدەم کێشەکانی پەیڕەوی مێژوویی کوردان و پەیوەندی کورد ـ تورك، چارەسەری دیموکراسی و چۆنێتی پێشکەوتنی پیلانگێڕی و واتاکەی و یاسای ئەوروپا و بەهای دادگایی مافی مرۆڤی ئەوروپا، تاوتوێ بکەم و بگرمە دەست. هەر رەخنەیەکی پێشبخرێت هێزم پێدەبەخشێ. چەواشە نەکردن و هەڵوێستی زانستییانە سەبارەت بەو بابەتانەی تاوتوێم کردووە جێگای بایەخە. زیاتر لایەنەکانی ئەزموون و فێربوونم رەچاو کرد. هەوڵمدا رێچکە و پەیڕەو پێشبخەم. زیاتر پێویستی بەو مێشکانە هەیە کە دەزانن بیر بکەنەوە. ئەو بابەتانەم زیاتر روون کردەوە کە بە گرنگم دەبینی، لەو باوەڕەدام کە ئەنجامێکی ئەرێنی لێدەکەوێتەوە.

لەوانەیە هەندێ هەڵسەنگاندنم سەبارەت بە ئایین و خودا چەواشە بکرێت. بەڵام هەر لە ئێستاوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە لە هەموو شتێك زیاتر سەبارەت بەم بابەتە خاوەن هێز و توانام و سوورم لەسەر قووڵکردنەوەی شۆڕشی ئایدیۆلۆژی. شۆڕشی هزری لای من زۆر گرنگ و جێگای بایەخ پێدانە. هەروەها باوەڕیم بەوە هەیە دواتر ئەو ویژدانە گەشە دەکات کە دەزانێ گوێڕایەڵی بکات و ئازادە. تاوەکو شۆڕشی هزری و ویژدانی ئەنجام نەدرێت، ئەوا ئەمە لەولاوە بهێڵین کە ببین بە شۆڕشگێڕ، بەڵکو تەنانەت مرۆڤێکی وریا و بە ئەخلاقیش نایەتە ئاراوە. دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە من ئاسوودەم چونکە وەڵامی هەموو ئەو کەسانەم داوەتەوە کە بە گوێرەی ئاستی جیاوازی خۆیان بە گەلەکەمانەوە پەیوەستدار دەبن.

ئەم هەڵسەنگاندنەم پێشکەش بە قوربانییەکانی ئەم بێ ئامانییانە دەکەم، لە سەرووی هەمووشیانەوە شەهیدانی زیندان. هەروەها تا رادەیەك وەڵامی ئەو کەسانەشم داوەتەوە کە بە شێوەیەکی رەسەن و قووڵ گرێدراوی کەسێتی منن، هیچ لایەنێکی تایبەت بە خۆمم نەماوە و تەنیا ئەوە نەبێ لە هەموو کاتێك زیاتر ببم بە موڵکیان. گەورەترین خۆشەویستی و سڵاوی خۆم پێشکەش دەکەم.

ـ مرۆڤایەتی سەردەکەوێت!..

**٢ تەمووزی/٢٠٠١**

**ئیمرالی**

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان**